عەلی وەردی

# لێکۆڵینەوەیەک لە سروشتی کۆمەڵگای عێراقی

وەرگێڕانی:
فەیسەڵ خەلیل



عەلی وەردی

# لێکۆڵینەوەیەک لە سروشتی کۆمەڵگەی عێراقی

وەرگێڕانی
فەیسەڵ خەلیل

ناوەندی ئاوێر بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
ژمارەی بڵاوکراوە: ٢٨٧

AWER
Nawandi Awer

لێکۆڵینەوەیەک لە سروشتی کۆمەڵگەی عێراقی

نووسەر: عەلی وەردی

وەرگێڕانی فەیسەڵ خەلیل

دەرهێنانی هونەری ناوەوە: لاوین خەلیل هیدایەت مام شێخ

بەرگ: ئاکار جەلیل کاکەوەیس

تیراژ: (١٠٠٠) دانە

نرخ: (٩٠٠٠) دینار

شوێنی چاپ: چاپخانەی ڕۆژهەڵات/هەولێر

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٧٥٣) ی ساڵی ٢٠١٥ی پێدراوە.

ناوەندی ئاوێر
بۆچاپ و بڵاوکردنەوە
ناونیشان: هەولێر - پشت باریزگا - بەرانبەر دەرگای قەڵات

ژمارەی موبایل: 07504209495 - 07504242101

ئیمەیل: Nawendi.awer@yahoo.com
فەیس بووک: www.facebook.com/nawendi Awer

ئەم کتێبەم پێشکەش دەکەم بەوانەی بە بیرۆکە بەرزەکان سەرقاڵن، هەوڵیش دەدەن لە کۆمەڵگاکەی خۆیان جێبەجێی بکەن، بەچاوپۆشین لەسەر سروشتی کۆمەڵگا و بارودۆخەکەی.
ئێستا کاتی ئەوە هاتووە لە کۆشکی بلوورین دابەزن و پێویستیەکانی واقیعی کۆمەڵگاکەی خۆیان لەبەرچاو بگرن.

عەلی وەردی

## پێشەکی

ئەم کتێبەی کە ئێستا دەیخەمە بەردەستی خوێنەر، لەگەڵ ئەو کتێبانەی بەدواوەی دێن، بریتین لەپوختەی لێکۆڵینەوەیەکی درێژ وسەخەت. من زیاتر لە بیست ساڵ دەبێت توێژینەوە لە بارەی کۆمەڵگای عێراق دەکەم. لەساڵی ١٩٥٠ یشەوە، ئەم توێژینەوەیە زیاتر وردەبێتەوە دەبێت. ئەمەش ئەو ساڵە بوو کەوەك مامۆستای کۆمەڵناسی لە کۆلیژی (ئاداب و علومی) بەغدا دامەزرام.

لێرەدا دەبێت ئاماژە بۆ ئەوە بکرێت، من پێشتر لە هەندێك کتێب وموحازەرە گشتییەکانم لەبابەتی توێژینەوە، لەبارەی کۆمەڵگای عێراقی نزیك بوومەتەوە، لەوانە:

١-لەساڵی ١٩٥١ موحازەرەیەکی گشتییم لەهۆڵی (مەلیکە عالیە) پێشکەش کرد، بەناونیشانی (کەسێتی تاکی عێراقی) ئەم موحازەرەیە، دوای زێدەکردنی وەك کتێبێکی بچووك لەهەمان ساڵ بلاوکرایەوە.

٢- لەساڵی ١٩٥٤ کتێبی (واعیزی سوڵتانەکان) بلاوکرایەوە، کە لەبەشەکانی پێشەوەیدا، باسی سروشتی کۆمەڵگای عێراقم کردووە، لەسەروبەندی دەرکەوتنی ئیسلامدا. لەگەڵ باسکردنی ئەو هۆکارە کۆمەلایەتیانەی کاریگەریان لەسەر پێکهاتەی کەسێتی تاکی عێراقی هەبووە.

٣- لەساڵی ١٩٥٨ دەستەی توێژینەوەی عەرەبی لەزانکۆی ئەمریکی لەبەیروت، بانگهێشتیان کردم بۆ پێشکەشکردنی موحازەرەیەك لەسەر بابەتی" گومبوون لەداهاتە ئاکارییەکان لەولاتانی عەرەبی" لەم توێژینەوەیە، بەشێوەیەکی تایبەت زیاتر جەختم لەسەر ئاکاری خەلکی عێراق کردۆتەوە. موحازەرەکەشم لە مانگی حوزەیرانی هەمان ساڵ لەگۆڤاری (الابحاث) بلاوکرایەوە کە هەر لەلایەن زانکۆی ناوبراو دەردەچوو.

٤- لەساڵی ١٩٥٩ لە کۆنگرەی جیهانی کۆمەڵناسی بەشداربووم، کە لە شاری شتریزای باکووری ئیتاڵیا ئەنجام درا. لەو کۆنگرەیەدا توێژینەوەیەکم لەبارەی (بیابانشینی و کاریگەرییەکەی لەسەر کۆمەڵگای عێراق) پێشکەش کرد. لەوێ هەلی ئەوەم بۆ رەخسا گەنگەشە لەگەڵ دوو زانای گەورەی کۆمەڵناسی بکەم لەبارەی توێژینەکەمەوە و سوودێکی زۆرم لەوان بینی.

٥-لەساڵی ١٩٦٢، بانگهێشت کرام بۆ ئەوەی لەفیستڤاڵی ئیبن خەلدون ئامادەم، کە لەقاهیرە لەژێر چاودێری ناوەندی مەرکەزی قەومی بۆ توێژنەوەی کۆمەڵایەتی و تاوانناسی ئەنجام درا. لەوێ موحازەرەیەکم پێشکەشکرد تیایدا هەوڵمدا تیۆری ئیبن خەلدون تاوتوێ بکەم لەرووی گرنگەیەکەی بۆ تێگەیشتن لەکۆمەڵگای عەرەبی و کۆمەڵگای عێراقی بەشێوەیەکی تایبەت. ئەو مەرکەزە موحازەرەکەی من و تەواوی موحازەرەکانی دیکەی لەکتێبێکی تایبەت چاپ کردبوو بە ناونیشانی (کارەکانی فیستڤاڵی ئیبن خەلدون).

٦- هەروەها لەساڵی ١٩٦٢، چەندین موحازەرەم لە پەیمانگای باڵای توێژینەوەی عەرەبی لە قاهیرە، پێشکەش کرد. پەیمانگاکە دواتر ئەو موحازەرانەی بەناونیشانی " لۆژیکی ئیبن خەلدون لەژێر رۆشنایی شارستانیەت و کەسێتیەکەی" وەك کتێبێك بلاوی کردەوە. لەو کتێبە و لەموحازرەکان بانگەشەم بۆ پێویستبوونی دانانی " کۆمەڵناسی عەرەبی " کرد، کە رەگوریشەکەی لە تیۆرەکەی ئیبن خەلدونەوە وەرگیرابێت. لەتوێژینەوەی دیاردە کۆمەڵایەتیە جیاجیاکانی کۆمەڵگای عەرەبی پشت بەو تیۆرە ببەسترێت.

مەبەستم لەناوهێنانی توێژینەوەکانی پێشوو، ئەوەیە سەرنجی خوێنەر بۆ ئەوە رابکێشم کە ئەو بۆچوونانەی لەو توێژینەوانە هاتووە کۆتایی نین، هەندێکیان گۆڕاون، هەندێکی دیکەش وەك خۆیان ماونەتەوە. ئەمەش بابەتێکە پۆزشی بۆ ناهێنمەوە، چونکە توێژینەوەی زانستی دەکرێت بگۆڕێت و پێشبخرێت. ئەمەش بەپێی گۆڕانی ئەو زانیاریانە دەبێت، کە جار لەدوای جار توێژەر وەریاندەگرێت. بۆیە تکام لەخوێنەر ئەوەیە سەرسام نەبێت لەوەی: (ئەوەی لەم کتێبە گوتراوە جیاوازە لەوەی لەتوێژینەوەکانی پێشووترم هاتووە).

لەراستییدا، من لەمیانەی توێژینەوەی دوورودرێژم بۆ کۆمەڵگای عێراقی، زۆرجار دژی خۆم بوومەتەوە. لەوانەیە ئەمڕۆ بۆچوونێکم هەبێت، بەیانی وازم لێ هێناوە. دواتر گەڕاومەتەوە سەری. قوتابیەکانم تێبینی ئەوەیان کردبوو، کاتێک بینیان میتۆدی خوێندن لەبابەتی کۆمەڵگای عێراق ساڵ لەدوای ساڵ دەگۆڕم. بەدووریشی نازانم دوای دەرچوونی ئەو کتێبە، زۆرێک لەو بۆچوونانە بگۆڕم کە تێیدا هاتووە. لەوانەشە خوێنەر لەکتێبی داهاتوومدا بۆچوونی پێچەوانە ببینی.

سەرچاوەی کتێبەکە:

لەنووسینی ئەم کتێبە وکتێبەکانی داهاتوو، پشتم بەچەندین سەرچاوەی جۆراوجۆر بەستووە کە دەکرێت بەمشێوەیەی خوارەوە پۆلێن بکرێن:

١- کتێب و وتار و بڵاوکراوە: بەمدواییە ژمارەیەکی زۆر لەوانە بڵاوکراوەتەوە. دەمەوێت بەتایبەتی ئاماژە بەو توێژینەوە زانستیانە بکەم کە خاوەنەکانیان بۆ وەرگرتنی بڕوانامەی دکتۆرا پێشکەشیان کردووە. هەندێکیان وەک کتێب چاپکراون، وەک کتێبەکەی دکتۆر فازڵ جەمالی، دکتۆر مەتا عەقراوی، دکتۆر شاکر مستەفا سەلیم، کتێبەکەی محەمەد سەلمان حەسەن، چەندانی دیکە، کە هەر هەموویان بەشێوەیەک لەشێوەکان توێژینەوەن لەبارەی کۆمەڵگای عێراقەوە.

٢-راپۆرتی قوتابیان: ئەمەیان ساڵانە لەبارەی کۆمەڵگای عێراقەوە داوام لەقوتابیان دەکرد ئامادەی بکەن. لەمیانەی ئەو ساڵانەدا ژمارەیەکی زۆر لەو راپۆرتانە لەلام کەڵەکەبووە. نکۆڵی لەوە ناکەم هەندێك لەو راپۆرتانە هیچ ویوچن وبەهای زانستیان نییە،بەڵام بەشێکیان، کە بێگومان ئەم جۆرەیان کەمە، تێبینی ودەرئەنجامی کۆمەڵایەتی بەسوود لەخۆیانەوە دەگرن. بەهەرحاڵ ئەم جۆرە راپۆرتانە، ساڵ لەدوای ساڵ هەلێکی زۆریان بۆ رەخساندنم، بۆ زێتر وردبوونەوە لە کۆمەڵگای عێراق. قوتابییەکانیش لەسەرتاسەری عێراق لەدوور ونزیکەوە، تەنانەت هەندێکیش لەوڵاتانی عەرەبییەوە دەهاتن. جا راپۆرتەکانیان لە بارەی نەریت وبەهای ناوچەکانیان کەم تا زۆر زەین رۆشن دەکاتەوە. من کاتێک ئەو کتێبە پێشکەش دەکەم دەبێت ئیعتراف بە چاک وپاڵپشتی ئەو قوتابیانە بکەم لەبەدەستهێنانی ئەو زانیاریانەی لەو کتێبە هاتووە.

٣- گفتوگۆکانی تەلەفزیۆن: ئەوەیان لە ساڵی ١٩٦٠ لەتەلەفزیۆنی بەغدا ئەنجامم دەدا. ناونیشانی ئەوگفتوگۆیانە بریتی بوو "تۆ دەپرسی ئێمە گەنگەشەی دەکەین" . لەمیانەی ئەو بەرنامانە ژمارەیەکی زۆری نامەم بۆ هات، کە خاوەنەکانیان لەبارەی کێشە کۆمەلایەتیەکانەوە پرسیاریان دەکرد. سوود وەرگرتنم لەو نامانە کەم نەبوو. ئێستاش دەیانپارێزم و بە سەرچاوەیەکی دەزانم بۆ توێژینەوە لەبارەی کۆمەلگای عێراقەوە. ناوەڕۆکەکانیان بریتین لەو کێشە جۆراوجۆرانەی هەندێك لەخەڵکی عێراق گلەییان لەبارەوە هەیە، بەتایبەتی ئەوەی نوێ. ئەمەش ململانێیەکی دەروونییە و لەژێر باری ئەو کێشانەوە بەدەستیەوە دەناڵێن. جێگەی داخی منە کە دەڵێم بەرپرسان لەو بەرنامانە رازی نەبوو، دڵیان ئاوی نەدەخواردەوە و فرمانی راگرتنیان دا. بەمەش لەو نامانە دابڕام کە بۆ دەهات[1].

٤- تێبینیەکانی خۆم : ماوەیەکی کورت نییە لەوە راهاتووم چەندین لایەنی کۆمەڵگای عێراق بگەڕێم، گوێ لە قسەی خەڵکی عەوام بگرم. بەتایبەتی قسەی عەمامە بەسەرەکانیان. زۆر پەرۆشی ئەوەم. لەئەنجامی ئەو پەرۆشییەم شەکەتی وشەرمەزاریم بینیوە. زۆرێك لەخەڵکی عێراق ناتوانن لەوە بگەن قسەی خەڵکی عەوام سەرچاوەیەکە بۆ زانست. ئەوان لەوە راهاتوون وا سەیری زانست بکەن ئاستێکی بەرزی هەیە وناکرێت بۆ ئاستی حەمباڵ و بەقاڵ دەبەزێت، بۆیە ئەگەر ببینن کەسێکی خوێندەوار تێکەڵ بەخەڵکی رەش ورووت دەبێت و گوێ لە قسەوقسەلۆکیان دەگرێت، ئەوا ئەوان نکوڵی لەو پیاوە خوێندەوارە دەکەن وسوکایەتی پێ دەکەن.

لەراستیدا کۆمەڵناسی بەسروشتی خۆی، سادە وساکارە. زۆرترین زانیارییەکانی خۆی لەخەڵکی رەش ورووت و تاوانبار و ئاژاوەکانیان وەردەگرێت. ئەوان بە ئەنگی وشانازییەکانیانەوە، بە هاوکاری ورکابەرییان، راستگۆترین نواندنی بەها

---

[1] یەکێك لە رۆژنامەکانی بەغدا راپرسییەکی لەبارەی چاکترین بەرنامەی تەلەفزیۆنی ئەوکات ئەنجام دابوو. ئامانجی راپرسییەکە ئەوەبوو : بەرنامەی " تۆ دەپرسی ئێمە گەنگەشەی دەکەین چاکترین بوو. ماوەیەکی زۆر بەسەر ئەو راپرسیە تێپەڕنەبوو، بەرنامەکە بێ پۆزش وەستا. ئەمەش شتێکی سەرسوڕهێن نییە لە ولاتە ئەمیتە !

باوەکانی کۆمەڵگان، بەمەش ئەوان باشترن لەخوێندەوارەکان. خوێندەوار مەیلی بۆ خۆهەڵکێشان وخۆدەرخستن هەیە بەپێچەوانەی ئەوەی لەناخی دایە. کەچی کەسێك لەعەوام ناتوانێ ئەو گرێ و بەهایانە بشارێتەوە کە لەناخی هەیە. ئەمەش لەو کاتەی رکابەری دەکات و جنێو دەدات، یان ئەوکاتەی شانازی دەکات و هاوکاری دەکات، دەردەکەوێ.

کێشەی زۆرێك لەخەڵکی عێراق ئەوەیە لەمە ناگەن و درکی پێناکەن. وەك دەردەکەوێت ئەوان تا ئێستا لەچوارچێوەی عەقڵی کۆن دەژین. کەواتە ئەوان وا دەزانن، دەبێت زانست لەئاستی جەماوەر بەرزتر بێت. هەرچەندەش بەرزبێتەوە و هەڵکشی ئەوا بەهاکەی زیاتر دەبێت. ئەم تێگەیشتنەش رەگەکەی لەسروشتی ئەو چینە وەرگیراوە کە لەکۆندا پەرەی بە زانست دەدا .(واتە چینی دەسەڵاتدارە خۆشگوزارەنەکان). ئەم چینە زانستی وەك جوانکارییەك دەویست بۆ ئەوەی خۆی پێ دەربخات و خۆی لە عەوام گەورەتر بکات. کەچی ئێستا دەوڵەتی ئەم چینە نەماوە، مەبەستیش لەزانست ئەوەیە هۆکارێك بێت بۆ خزمەتکردنی جەماوەر نەوەك رووکەشی و خۆهەڵکێشان بێت بەسەر خەڵکەوە.

**رەخنەیەکی قبوڵ نەکراو:**

هەندێك لەرەخنەگران، رەخنەی ئەوەیان لێگرتووم، گوایە من لەتوێژینەوە کۆمەڵایەتییەکەم شێوازی ئاماری سیستەماتیك جێبەجێ ناکەم کە لەئەمریکا و وڵاتانی دیکەی پێشکەوتوو پەیڕەو دەکرێت. ئەو رەخنەیە قبوڵ ناکەم سەرەڕای ئەوەی لەرووکەشدا ماقوڵە. کۆمەڵگای عێراقی لەکۆمەڵگای ئەمریکی جیاوازە. لەوێ توێژەر دەتوانێ لەدەرگاکان بدات و هەر پرسیارێك بەخەیاڵی دابێت لە کابانی ماڵ بپرسێت. ئەوانیش رێزی دەگرن و لەزۆربەی کات وەڵامی دروستی دەدەنەوە. کەچی لەلای ئێمە بارودۆخەکە تەواو جیاوازە.

لەمێژە عێراق بەدەست ئەو کەلێنە فراوانە دەناڵێنێ، کە لەنێوان گەل و حکومەت هەیە. گەل حکومەت بەو دوژمنە دەزانێ کە هیچ سوودێکی نەبێت و هەر زیانی لێ دەبارێ. لەنێو عەوامی خەڵکدا بەروونی تێبینی ئەوەم کردووە. بۆیە ئەوان کاتێك دەبینن ئەفەندییەك بۆلایان دەچێ و قەڵەم ودەفتەری بەدەستەوەیە،

ئەوا وا دەزانن بۆ باج کۆکردنەوە یان بۆ بەسەربازکردن هاتووە. یانیش دەیانخاتە زیندانەوە. لەبەرئەوەش وا ڕاهاتوون بەهەموو شێوازێك لەوەڵامەکانیان درۆ بکەن، نەوەك تووشی شتێکی نەخوازراو بن.

جا کاتێك توێژەرێکی کۆمەڵایەتی دەچێتە لایان بە داردەستی حکومەتی دەزانن، چونکە ئەو لەجلوبەرگ ئەفەندییە و قەڵەم ودەفتەری بەدەستەوەیە. ئەگەرهاتوو توێژەر جلی ئاسایی ئەوانی پۆشی. ئەوا وا دەزانن سیخوڕە وحکومەت بەسیخوڕی ناردوویەتی. لەبەرئەمانە کاتێك من دەمەوێ توێژینەوەیەك بکەم ، هەوڵ دەدەم متمانەیان بەدەستبهێنم بەر لەوەی دەست بەپرسیار بکەم. من بەشێوەیەکی هەرەمەکی پرسیارم لێ دەکردن، لەرێگای وروژاندن و پەیدانی جۆش وخرۆش و شانازی هانی ئەوانم دەدا، وەڵام بدەنەوە.

بەبۆچوونی من دروسترین رێباز بۆ توێژینەوە لەکۆمەڵگای عێراق، ئەو رێبازەیە کە زانای بەناوبانگی ئەڵمانی ماکس ڤیبەر دایهێناوە وئەم رێبازەش پشت (بەتێگەیشتن) پێکهێنانی (نموونەیی) [2] دەبەستێت. ئەمەیان گونجاوە بۆ سروشتی کۆمەڵگاکەی ئێمە و بارودۆخە تایبەتەکەی. بەڵام سەبارەت بە رێبازە ئەمریکیەکە ئەوەیان گونجاو نییە، چونکە تووشی کێشەی وهەڵەی ئەوتۆمان دەکات، ئێمەی دوورین لێیان. هەرچۆنێك بێت، پێویستە هیوای بەکارهێنانی ئەو رێبازە بخوازین. ئەمەش کاتێك دەبێت کە کۆمەڵگای عێراق لەرووی ناوەرۆك و رووخسار هاوشێوەی کۆمەڵگای ئەمریکی بێت. ئەمەش هیوایەکی دوورە.

**کۆمەڵگای عێراقی و عەرەبی:**

رەخنەیەکی دیکە لەلایەن رەخنەگرانی دیکە، رووبەرووم کرایەوە. ئەوان پێیانوایە دەبێت یەکەمجار توێژینەوە لەبارەی کۆمەڵگای عەرەبی بکەین. کەچی سەبارەت بەعێراق ئەوان پێیانوایە ئەمە تەنها بەشێکە لە کۆمەڵگا گەورەکەی عەرەب. دەشڵێن سەرەتا دەبێت هەمووەکی تاوتوێ بکرێت ئینجا بەشەکی.

من لەم بۆچوونەدا تەواو لەگەڵیان جیاوازم. لێرەدا دەمەوێ لێیان بپرسم: چۆن دەکرێت توێژینەوە لەبارەی کۆمەڵگای گەورە بکەین، بێئەوەی توێژینەوە بۆ هەر

---

[2] Barnes (History of Sociology) p.290-292

بەشێکی بچووکی بکەین. وەك لە شێوازی نوێ (ئیستقرا) ناسراوە[٢] توێژینەوەی بە تاوتوێکردنی بەشەکان دەست پێدەکات و دواتر بەوانە دەگاتە تێگەیشتنێك لەبارەی هەمووەکی. کەچی ئەو رەخنەگرانە دەیانەوێ بگەڕێنەوە سەر شێوازی ئەنجامسازی (استنتاج)ی کۆن. ئەمەش بابەتێکە لەگەڵیان کۆك نیم.

بێگومان هەندێك سیفاتی گشتی بۆ عەرەب هەیە، لەهەموو وڵاتانەکانیان، لەگەڵئەوەشدا دەبێت ئیعتراف بەوە بکەین کە چەندین سیفەتی دیکە هەیە لەوڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی دیکە جیاوازە. ئێمە ناتوانین لەو سیفەتانە بگەین بە جیاواز ولێکچووەکانیەوە، ئەگەر توێژینەوە بۆ هەر وڵاتێك نەکەین بەتەنیا. دواتریش توێژەران دێن هەموو وڵاتەکان بەیەکترەوە بەراورد دەکەن، بۆ ئەوەی ئەنجامە خوازراوەکانیان دەست بکەوێت.

یەکێك لەتایبەتمەندییەکانی نیشتیمانی عەرەب ئەوەیە پانتاییەکی فراوانی گۆی زەوی دەگرێتەوە، هەر لەزەریای ئەتڵەسییەوە بۆ کەنداوی عەرەبی دەکشێ، بەشێوەیەك خۆر لە تێپەڕبوونی بەو خاکەدا زیاتر لەسێ کاتژمێر دەخایەنێ. زەمانێکی زۆر بەسەر ئەونیشتیمانە تێپەڕیوە کە گواستنەوە و گەیاندن لەنێوان لایەنە دوور لەیەکترەکانی زۆر زەحمەت بووە. لەگواستنەوە وشتر و بارگیر و کەشتی چارۆگەداری هێواش بەکارهاتووە. ئەمانە چەندین رۆژ و مانگی خایاندووە.

ئەم دوورییەی وڵاتانی عەرەبی لەیەکتر، وایکردووە هەر وڵاتێك لەبارودۆخی تایبەت بەخۆی بناڵێنێ و جیاوازی لەگەڵ بارودۆخی وڵاتانی دیکە هەبێت. بۆ نموونە فەتحکارێکی وڵاتانی عەرەبی نەیتوانیوە هەموو ناوچەکانی راستەوخۆ لەژێر دەسەڵاتی خۆی بهێڵێتەوە. لەبەر ئەمەشە دەبینین هەر وڵاتێکی عەرەبی مێژووی تایبەتی خۆی هەیە، لەلایەنی سیاسی و ئابووری و ئایینی و هەموو لایەنەکانی دیکەوە.

---

[٢] (ئیستقرا) و (ئیستنتاج) دوو شێوازی ئەرگۆمێنتسازی لۆژیکن. یەکەمیان لە بەشەکانەوە بۆ هەمووەکی دەچێت. کەچی دووەمیان لە هەمووەکییەوە بۆ بەشەکان دەچێت و دەیەوێ حوکمی لۆژیکی لە هەمووەکی (الکلی) بەسەر بەشەکان بەگشتی بکات . وەرگێڕ

ئەمەش زۆر بەروونی لە جیاوازی شێوەزارەکانی ولاتە جیاوازەکانی عەرەبی دەردەکەوێت. لەمارسیلیا لەساڵی ١٩٥٠ دوو پیاوی جەزائیریم بینی، لەخەڵکی عەوام بوون و خوێندەوار نەبوون. لەقسەکانیان هیچ شتێك تێنەگەیشتم وەك ئەوەی بەزمانی عەرەبی قسە نەکەن. وەك دەریش دەکەوێت جیاوازی شێوەزارەکان ئەستەمی بڕی پەیوەندی کۆمەڵایەتی نێوان ولاتەکان زیاتر دەکات.

ئەوەی شایەنی باس بێت هۆکارە نوێییەکانی گواستنەوە، بڵاوبوونەوەی کتێب و رۆژنامەو ئێزگەکان، وایکردووە ولاتە عەرەبییەکان لەیەکتر نزیك ببنەوە. بێگومان ئەمەش وادەکات بەرەبەرە جیاوازییە کۆمەڵایەتیەکان و زمانەوانییەکان کەمتر بێتەوە. پێشبینیش دەکرێت تاڕادەیەك جیاوازییەکان نەمێنێ. جا ئەمە زۆر دەخایەنێ یان کەم. بەلام لەگەڵئەوەشدا دەبێت ئەوە لە بیرنەکەین کە ئێمە لەقۆناغی ئێستا دەژین و ئەو جیاوازییانەش هێشتا ماونەتەوە و ناکرێت بەکەم بزانرێن. ئەمەش دروست نییە کێشەکانی ولاتێك لەژێر رۆشنایی توێژینەوەمان بۆ ولاتێکی دیکە چارەسەر بکەین.

ئەرکی نەتەوەییە کە کێشەکانی ولاتێك لەژێر رۆشنایی بەها وبارودۆخی تایبەتی خۆی چارەسەر بکەین. گشتاندنی رەهاش لەو بوارەدا گونجاو نییە.

## ئاراستەیەکی نوێ

ماوەیەکی زۆر دوور نییە، چەندین کتێب تایبەت بەتوێژینەوەی کۆمەڵگای عەرەبی دەردەچێت. چەند ساڵێك لەمەوبەر کۆنگرەیەك لەسەر ئاستی ئەکادیمی لە ئەسکەندەریە بەسترا. مەبەست دانانی میتۆدێك بوو بۆ توێژینەوەی کۆمەڵگای عەرەبی. بابەتی کۆمەڵگای عەرەبی خستە کۆلیژە جیاجیاکانی کۆماری یەکگرتووی عەرەبی. وا پێدەچێ زانکۆی بەغداش هەوڵ دەدات لەگەڵ ئەو ئاراستە نوێیە بێت.

ئەو ئاراستەیە هەرچۆنێك بێت بەرهەمی سوودبەخشی دەبێت. بەلامی ئەوەی تێبینیم کردووە زیاتر بە ئاراستەی هۆشیارکردنەوە و رێنمایی دەبێت نەوەك توێژینەوەی بابەتیانە و واقیعیانە. زۆرترین ئەو بلاوکراوانەی لەو بارەیەشەوە دەرچووە بەمەبەستی ئەوە نووسراوە نەوەیەکی گەنجی نەتەوەیی و هۆشیار

دروست بکات. لەوانە بۆ نموونە ئامـاژە بـە یـەکێکیان دەکـەن کـە لەوانەیـە گرنگترینیان بێت و کۆمەڵ مامۆستای زانکۆی قـاهیرە بەشداریان تێدا کـردووە، ناونیشـانەکەی " کورتەیـەك لـە توێژینـەوەی کۆمـەڵگای عـەرەبی" یـە. لەپێشەکییەکەی هاتووە:

"دوای ئەوەی چوار ساڵ ئەو مادەییەمان لەمەزنترین کۆلیژەکان وتووتەوە. ئێستا دەتوانین بڕیار لەسەر ئەوە بدەین کە ئەزمونەکەمان بەراستی سەرکەوتوو بـووە. دانانی بابەتی کۆمەڵگای عەرەبی لە میتۆدی خوێندنی زانکۆکان ئامـانجی خۆی بەدەستهێناوە کە بریتی بوو لەدروسکردنی لاوانی وشیار و رۆشنبیر، کـە بڕوایـان بەخوا و عـەرەبێتی هـەبێت. بزانێ چی هەیە و چی لەسـەرە. زانیاری لـەبارەی بـارودۆخی نیشـتیمانی عـەرەبی هـەبێت. لەگـەڵ زانینـی ئـاواتی ئـەو نەتەوەیـە لەکۆمەڵگایـەکی عـەرەبی تەندروست و یـەکانگیر. هـەر تاکێك تیایدا هەست بـە ئادەمیزادبوونی خۆی و کەرامەتی خۆی و کەرامەتی نەتەوەکەی بکات"[4].

گومانم لـەوە نییـە ئـەو رێبـازە (ئامۆژگار)ییـە لەتوێژینـەوەی کۆمـەڵگای عـەرەبی گرنگ و بەسوودە. بەتایبەتیش ئەوەمان لەبەرچاوگرت کە ئەو نووسینانە بۆ ئـەوە نووسراوە، بخرێتە بەردەستی ئەو قوتابیانەی لە قۆناغی یەکەمی خوێنـدنی زانکۆ دان. بۆیە دەبێت بەشێوازێکی رێنمایی کردن و ئامۆژگاریی بێت، بۆ ئەوەی چاوی قوتابیـان لـەوە بکاتـەوە کـە ئـەرکێکیان لەبـەردەم نیشـتیمانە گەورەکـەیان لەسەرشـانە. لەگەڵئەوەشدا پێموایە ناکرێت لـەلای ئـەو توێژینـە ئامۆژگارییانـە بوەستین و بەڵکو دەبێت بەرەو توێژینەوەی قوڵتر بچین کە نزیکتر بێت لە میتۆدی کۆمەڵناسی نوێ.

مـن لـەوە دەترسـم ئەگـەر زێـدەڕۆیی لـەو ئاراسـتەیە بکـەین وەك واعیزەکـانی سوڵتانمان لێ بێت. کە عەقڵی خەڵکیان پڕ دەکرد لە نموونەی یوتـۆپی. خۆشیان چاویان لەواقیعی کۆمەڵگا دەنوقاند. کە نەیاندەتوانی لەو نموونە باڵایانە بگەن

[4] (الوجيز في دراسة المجتمع العربي) ص: ص ز

## بەشی یەکەم

### ململانێی نێوان بیابانن‌شینی و شارستانێتی

لەمیانەی توێژینەوەم بۆ کۆمەڵگای عێراقی. بۆ هەر لایەکی جیاوازی ڕۆیشت بم، لەهەر کات وشوێنێکدا، تێبینی دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییم کردووە، کە بەدیاردەی ململانێی نێوان بیابانن‌شینی وشارستانێتی ناوی دەبەم.

زانایانی شوێنەوار لەسەر ئەوە کۆکن کەعێراق لانکەی شارستانیەتێك بووە، بەکۆنترین شارستانی جیهان دادەنرێت. لەو تایبەتمەندیەشدا میسر هاوبەشی عێراقە. هەرچەندە ناکۆکی لەنێوان زانایان هەیە، لەسەر ئەوەی کامیان پێشتر بووە، کەچی ئێمە لێرەدا بەلامانەوە گرنگ نییە عێراق لەو بوارەدا پێشەنگ بێت، بەڵکو ئەوەی بەلامانەوە گرنگە، ئەوەیە بزانین عێراق هەر لەسەرەتای مێژووی مرۆڤایەتی شارستانیەتێکی گەشەسەندووی بەخۆیەوە بینیوە. جا دوای ئەمە گرنگ نییە ئەم شارستانییەتە یەکەم بێت یان دووەم.

دوای ئەوەی جارجارە شارستانیەت ڕووی لەعێراق کردۆتەوە، ماوەیەکی زۆری بەسەر تێپەڕیوە کە لەسەروبەندی دامەزراندنی دەوڵەتی عەباسی، عێراق بوو بەمەڵبەندی شارستانیەتی جیهانی، تەنانەت بەغدادی پایتەخت بوو بە بۆتەیەکی کۆمەڵایەتی مەزن پوختەی داهێنانی مرۆڤایەتی لەکولتوری ئەو کاتی تێدا دەتوایەوە.

لەلایەکی دیکەوە عێراق، کەوتۆتە سەر کەناری یەکێك لە سەرچاوەکانی بیابانن‌شینی، ئەویش کەنداوی عەرەبییە. جا عێراق هەر لەسەرەتای مێژووی خۆی دا تاکو ئەمڕۆ یەك لەدوای یەك تەوژمی بیابانن‌شینەکان ( البدو) ڕووی تێدەکات. هەندێك لەو (بەدو)انە لەڕێگای هێرشی سەربازبووە وهەندێکی دیکەیشی لەڕێگای کۆچکردنی بەرەبەرە بووە. هەردوو جۆری ئەم تەوژمانە کەم یان زۆر کاریگەری

لەسەر کۆمەڵگای عێراقی دەبێت و بەهای بیابانشینی تێدا بڵاودەبێتەوە و هەوڵدەدات بە هەموو توێژ و چینەکانی ئەم کۆمەڵگایە شۆڕببێتەوە.
لێرەدا دەبینین گەلی عێراق کەوتۆتە نێوان دوو سیستەمی دژبەیەکتری بەها کۆمەڵایەتیەکان. بەهای بیابانشینی بیابانی دراوسێ هاتووە وبەهای شارستانیتیشی لەکولتورەکەی شارستانێتی کۆن بۆ ماوەتەوە. ئەوەش شتێکی چاوەڕوانکراوە، لەحاڵەتێکی وەهادا گەل ئەوە لەدوای ئەوە لە ململانێیەکی کۆمەڵایەتی و دەروونی بژیت. لەلایەک ناتوانێ ماوەیەکی زۆر لە بەها شارستانییەکانی دڵنیابێتەوە، چونکە بیابان ناوە ناوە تەوژمی خۆی بۆدەهێنێ و ئەمەش دڵنیابوونە کۆمەڵایەتیەکەی نیگەران دەکات. لەلایەکی دیکەشەوە ناتوانێت (بەدو) بێت وەك کوڕی بیابان، چونکە شارستانیەتە گەشەسەندووەکەی بە بوونی ئاو و بەپیتی خاکەکەی ناچاری دەکات بەهای، بیابانشینی بگۆڕێت بۆئەوەی لەگەڵ بارودۆخە تایبەتەکەی بێت.
بۆیە شیاوە گەلی عێراق بەگەلێکی سەرسام وەسف بکەین، دوو ڕێگای پێچەوانەی لەبەردەم کراوەتەوە، ناچارە لەیەك کاتدا بەهەردووکیان بڕوات. کاتێك بۆماوەیەك لەڕێگاییەکیان دەڕوات، ئەوا بۆماوەیەکی دیکە دەچێتەوە سەر ڕێگاکەی دیکە.

**سروشتی( پێچەوانەبوون ):**

ئەوەی لەبابەتی بیابانشینی وشارستانێتی جێگای سەرنج بێت، ئەوەیە هەردووکیان لەزۆر بەهای کۆمەڵایەتی پێچەوانەوەی یەکترن، ئەمە بابەتێکە بەوردی لەشوێنێکی دیکە تاوتوێی دەکەین. لێرەدا تەنها ئەوەندە بەسە بڵێین ئامانجی سەرەکی کە بیابانشینی بەدوای دەگەڕێت تەواو پێچەوانەی ئەوەیە شارستانیەت کۆششی بۆ دەکات.

دوو بوار هەیە ئەو پێچەوانبوون ودژبەیەکتری نێوان شارستانیەت وبیابانشینی، بەڕوونی تێدا دەردەکەوێت، ئەوانیش بواری دەوڵەت و پیشەگەرییە. لەبواری یەکەمدا دەبینین بەدو بەهۆی سروشتی پێکهاتە کۆمەڵایەتییەکەیەوە مەیلی پاشەکشەی لەدەوڵەت هەیە و لەملکەچبوونی رادەکات. دەمارگیری هۆز لەبیابانشیندا شوێنی دەوڵەت دەگرێتەوە وئەرکەکانی ئەنجام دەدات. کەسی

بەدو شانازی تەواو بەهۆزەکەی دەکات، هەربۆیە هۆز بە هۆی مانەوەی خۆی وسەرچاوەی کەرامەتی خۆی دەزانێ، کەچی دەوڵەتی لەتێڕوانینی ئەودا تەنها سیستەمێکە بۆ سەرشۆڕی و پێدانی باج. زۆر شەرمە بۆ کەسی بەدو ملکەچی دەوڵەت بێت بۆ ئەوەی باج بدات و ئەگەریش سەرپێچی کرد بە قامچی لێی بدات. ئەو شانازی بەوە دەکات سەرانە لەکەسانی دیکە وەردەگرێت، جا ئامادە نییە بەهەر کەسێکی بدات. بەتێڕوانینی ئەو پێدانی سەرانە یان باج ئیعترافکردن بە کۆیلایەتی وسەرشۆڕی.

دەتوانین لەبارەی پیشەگەرییشەوە هەر ئەمە بڵێین. مەبەستمان لەپیشەگەری ئەوەیە مرۆڤ پیشەیەك ئەنجام بدات و بژێوی خۆی بەهۆی پیشەکەی وبەدەست وپارەقەی نێوچەوانی بەدەست بهێنێ. کەچی کەسی بەدو پیشەگەری بە سەرشۆڕی وسوکایەتی دەزانێت، وا دەردەکەوێت وشەی پیشە لەزمانی عەرەبی دا (المهنه) لەوشەی (المهانه) وەرگیراوە کە مانای سوکایەتی دێت، یان هەردووکیان سەر بەیەك چاوگن. بەدو کەسێکە ڕێز لە لەتالان و داگیرکردن دەگرێت. رقی لەو بژێویەیە کە لەڕێگای کارکردنەوە بێت. بۆیە لەدێرزەمانەوە بینیومانە شەرم لەوە دەکات ببێتە بەرگدروو و سەنعەتکار و بەقاڵ یان مامۆستا و کاسب، یان هەر پیشەیەکی دیکە کە لەشارستانیەتدا ناسراوە. بەتێڕوانینی بەدو ئەو کەسانە سەرشۆڕن، ئەگەر تۆزێك پیاوەتیان هەبێت دەبێت واز لەو پیشە بێزراوانە بهێنن وشمشێریان هەڵکێشن بۆ ئەوەی بژێوییەکی بەرێز پەیدا بکەن کە وەك هی ئەو شایەنی پیاو بێت.

**دیاردەی هەڵکشان وداکشان:**

کاتێك کەسێك توێژینەوە لەبارەی مێژووی کۆمەڵایەتی عێراق دەکات، هەر لەسەدەکانی کۆنەوە تا ئێستا، دەبینێ بەهای بیابانشینی ماوەیەك گەشە دەکات وماوەیەکی دیکەش کەم دەبێتەوە. ئەمەش بەپێ بارودۆخی دەوڵەت دەبێت لەرووی لاوازی وبەهێزییەوە. دەوڵەت بنەمایەکی گرنگی شارستانییەتە. ئەگەرهاتوو لەوڵاتێکدا دەوڵەت بەهێز بێت بەشێوەیەك بتوانێ سەرکوتی ململانێی ناوخۆ بکا، لەدز و ڕێگر بدات، ئەوا بەرهەمی کشتوکاڵی و بازرگانی و پیشەسازی

دەبوژێتەوە، شارەکان ئاوەدان دەبنەوە وخەڵك بەپیشەکانی خۆیانەوە سەرقاڵ دەبن ولەهیچ شتێك ناترسن. ئەمە چەند جارێك لەعێراق روویداوە. بەشێوەیەك بەهاکانی لەکورتی دەدەن و ئەوبەها شارستانیانە شوێنیان دەگرنەوە کە لەسەر گوێڕایەڵی وپیشگەری وەستاوە.

کەچی لەهەندێك قۆناغی دیکەی مێژووی عێراق دەوڵەت لاوازە، ناتوانێ سەر وماڵی خەڵك بپارێزێت. لەوکاتەشدا دەبینین خەڵك ناچار دەبێت پەنا بباتە بەر بەهاکانی بیابانشینی، هەرچەندە دەوڵەتیش لاواز بێت ئەوا خەڵك زیاتر دەست بەو بەهایانەوە دەگرن. بۆیە دەمارگیری هۆزگەرایی ودیاردەی تۆڵەسەندنەوە و پەنابردن بەریەکتر و لەگەڵ رۆیشتن و فریاکەوتن و میوانداریکردن، ئەو جۆرانە بەشێوەیەك لەلایان زیاد دەبێت، کە بەتەواوی دەسەڵاتی بەسەر پێکهاتەی کۆمەڵایەتیان دەبێت. ئەمەمان زۆر بەرۆشنی لەسەردەمی عوسمانیەکان بینی، تا ئەمرۆش هەندێك پاشماوەی کۆمەڵایەتی ئەو دیاردانە دەبینین- کە لەبەشەکانی داهاتوودا باسیان دەکەین.

دەکرێت ئەمەی سەرەوە بە دیاردەی هەڵکشانی و داکشانی نێوان بیابانشینی وشارستانێتی لەعێراق ناوببەین. تەوژمی بیابانشینی دێت وبەسەر کۆمەڵگای عێراقی زاڵ دەبێت ودواتر بەرەبەرە پاشکشە دەکات وتەوژمی شارستانێتی دەردەکەوێتەوە.

کێشەی عێراق ئەوەیە کاتێك تەوژمی بیابانشینی تێدا پاشەکشە دەکات، ناتوانێ خۆی بەخێرایی لەگەڵ شارستانیەت بگونجێنێ. ماوەیەکی زۆر یان کەم دەست بە بەهاکانی بەدو دەگرێت، ئەمەش بەپێی ئەو بارودۆخەی ئەوکات رووبەرووی دەبێتەوە. بەشێوەیەکی گشتی سروشتی بەها کۆمەڵایەتیەکان ئەوەیە کەماوەیەکی زۆر کارا دەبێت تەنانەت دوای رۆیشتنی ئەو هۆکارانەی هاوکاری مانەوەی دەکەن. خەڵك کاتێك لەبەهایەکی دیاریکراو راهاتوون ئەستەمە بتوانن بەکتوپڕی دەستبەرداری بن. گومان لەوە دانییە بەرەبەرە لەلایان لاواز دەبێتەوە دوای نەهانی هۆکارەکان، بەڵام ئەمەش پێویستی بە زەمەنێك هەیە، لەماوەی ئەو زەمەنەدا ململانێ لەنێوان بەهای نوێ وبەهای کۆن دروست دەبێت ولەئەنجامی

ئەو ململانێیەش چەندین کێشەی کۆمەڵایەتی دەردەکەوێت کە جێگای ئەوە نیین بەکەم بزانرێن.

**وڵاتانی عەرەبی :**

ئەو دیاردەی هەڵکشان وداکشانی لەعێراقمان بینی، بەشێوەیەك لەشێوەکان نزیکەکەی یان هاوشێوەکەی لەزۆربەی وڵاتانی عەرەبی دەدۆزینەوە.

کاتێك لەبەردەستمان نەخشەی جیهان دەکەینەوە، سەرنجی نیشتیمانی عەرەبی دەدەین، تێبینی دیاردەیەکی جوگرافی سەرنجراکێش دەکەین، زیاتر لە ریزپەڕێك (شان) دەچێت. ئەو نیشتیمانە گەورەترین درێژبوونەوەی بیابانی لەسەر گۆی زەوی لەخۆیەوە دەگرێت. لەرۆژهەڵاتەوە لەچیاکانی ئێران دەستپێدەکات ولەرۆژئاوا لەکەنارەکانی زەریای ئەتڵەسی کۆتایی دێت. هیچ شتێك دوولایەنەکەی لەیەکتر جیاناکاتەوە تەنها دەریایەك نەبێت، کەلێنێك لەنێوانیان دروست دەکات. ئەویش دەریای سوورە.

نکۆڵی لەوە ناکەین، گۆی زەوی ناوچەی بیابانی دیکەی لەخۆیەوە گرتووە، کە لەدرێژی و گەورەییدا، نزیکە لەناوچەی عەرەبی. لەوانە ئەوەی دەکەوێتە باکوری کیشوەری ئاسیا، لەچینەوە لەرۆژهەڵات درێژ دەبێتەوە تا لەرۆژئاوا بەدەریای خەزەر دەگات. ئەم ناوچەیە لەلایەکەوە لەناوچەی عەرەبی دەچێت وئێستاشی لەگەڵ دابێت سەرچاوەیەکی هەڵقوڵانی بەدوەکانە، بەڵام لەلایەکی دیکەوە جیاوازی لەگەڵ ناوچەی عەرەبی هەیە و جیاوازەیەکەشی کەم نییە.

چەندین هۆکار وایکردووە ناوچەی عەرەبی، لەهەندێك پانتایی خۆیدا ناوە ناوە شارستانیەتی گەشەسەندو بەرهەم بهێنێ. پێشتر ئاماژەمان بۆ شارستانەیتی میسر وعێراق کرد. لەو بارەیەوە دەکرێت ئاماژە بۆ شارستانیەتەکانی یەمەن و شام وتونس ومەغریب و ئەوانی دیکە بکرێت. لەراستیشدا ناوچەی عەرەبی لە هیچ قۆناغێکی مێژووی درێژی عەرەب خاڵی نەبووە لە شارستانیەتێك. ئەمەش وەك روونە بەپێچەوانەی ناوچەکەی ئاسیایە.

دەتوانین لەمەدا بگەینە ئەو ئەنجامەی کە ناوچەی عەرەبی بەوە لەسەرجەم ناوچەکانی دیکەی جیهان جیادەکرێتەوە، کە سەرچاوەکانی بیابانشینی

وشارستانیەتی بەشێوەیەکی تایبەت ولەمەودایەکی فراوان بەیەکەوە کۆکردۆتەوە، بۆیە راستە ئەگەر بگوترێن کۆمەلگای عەرەبی یەکێك لەو کۆمەلگایانەی زۆرترین مەینەتی ململانێی نێوان بیابانشینی وشارستانێتی بەخۆیەوە بینیوە و بەم دووانەش کاریگەر بووە.

**جیاوازی لە پلە :**

کە پێشتر وتمان ناوچەی عەرەبی یەکێکە لەو ناوچانەی جیهان کە زۆرترین مەینەتی بەدەست ململانێی نێوان بیابانشینی وشارستانێتی بینیوە، مەبەستمان ئەوە نییە کە ئەمە لەو لایەنەوە تاکە ناوچە بێت لەجیهاندا. لەراستیدا زۆر ناوچەی جیهان هەیە بەشێوەیەك لەشێوەکان شتێك لەو ململانێیەی بەرکەوتووە، بۆیە ئەوەی ئێمە دەمانەوێ سەرنجی خوێنەری بۆ رابکێشین ئەویە ناوچەی عەرەبی لەگەڵ ناوچەکانی دیکەی بە پلەی توندی ململانێیەکە و بە بەردەوامبوونی لەنەوە دوای نەوە، جیادەکرێتەوە.

با نموونە ناوچەی بیابانی ئاسیا وەربگرین کە پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد، لەراستیدا ئەو ناوچەیە لەهەندێك قۆناغی مێژوویدا خاڵی نەبووە لەم ململانێیە. ئەو ناوچەیە لەرۆژهەلاتەوە نزیکە لەشارستانیەتی چین. لەرۆژئاواشەوە شارستانیەتی (ولاتی دوای رووبار)[*] . ئەم دوو شارستانیەتە زۆرجار بەدەست شەپۆلی بیابانشینەکان نالاندوویانە کە لەمێژوودا بەچەندین ناوی جۆراوجۆر هاتوون وەك مەغۆل و تەتەر و تورك و قرغیز...

دەتوانین بلێین هەر وەك ئەمانەی سەرەوە ناوچەی دیکەی جیهان، وەك لە ئێران و هیندستان و باشووری ئەفریقیا، پانتایی بیابان دەبینین ولەنزیکیان شارستانیەتی کۆن ونوێ دروست بووە. لەوحاڵەتەشدا دەبێت پێشبینی ململانێی نێوان بیابانشینی وشارستانیەت بکەین. لەگەڵئەوەشدا نابێت لەبیری بکەین کە ئەم ململانێیە لەو جۆرە نەبووە کە ناوچەی عەرەبی بینیویەتی، چونکە زۆرجار

[*] (ولاتی دوای رووبار) شارستانیەتێك بووە لەناوەراستی ئاسیا لەمێژوودا لەلایەن ئەوروپییەکان بە (ترانساوکسانیا) ناسراوە، مێژوونووسە عەرەبەکانیش بە(ولاتی دوای رووبار) (بلاد ما وراء النهر) ناویان بردووە. وەرگێر

شارستانیەت لەو ناوچانە توانای وەرگرتنی شەپۆلەکانی کۆچەری هەبووە، توانیویەتی بەماوەیەکی کورت بیانتوێنێتەوە. بەشێوەیەك کاریگەری گەورەی کۆمەڵایەتیان نەمێنێ.

بۆ نموونە شارستانیەتی چین وەربگرە، هێندە فراوان وچڕ بووە توانیویەتی هەزمی شەپۆلەکانی مەغۆل بکات ولەبۆتەی چینی گەورەدا بیانتوێنێتەوە. ئەمەم بەروونی لەکاتی سەردانێکم بۆ چین بینی لەساڵی ١٩٥٨. بەشێوەیەك هیچ شوێنەوارێکی شەپۆلی بیاباننشینەکانم نەبینی کە پێشتر روویان کردبووە چین. دەتوانین چاکەی ئەمەش بۆ شورا مەزنەکە بگێرینەوە کە پاشاکانی چین لەکۆندا بۆ خۆپاراستن لە هێرشی مەغۆلەکان دروستیان کردووە. تەنانەت خودی شوراکە بەلگەیەکی بەرهەستە کە شارستانیەتی چین لەئاستێکی فراوان و چڕ دابووە، بۆیە توانیویەتی ئەو کارە مەزنە ئەنجام بدات.

کەچی لەناوچەی عەرەبی بابەتەکە جیاوازە. لەبەرئەوەی ئەو شارستانیەتانەی تێیدا دروستبووە لەچەند ناوچەیەکی پەرژ وبلاوبووە. وەك ئەوەی لەمێرگێك بن چوار دەوری بیابان بێت. بۆیە ململانێی نێوان بیاباننشینی وشارستانیەت توند ویەك لەدوای یەکتر بووە. ئەمەش وایکردووە شارستانیەتی و بیاباننشینی جار لەدوای جار لەهەڵکشان وداکشان دابێت.

**تیۆریکی هەڵە:**

یەکێك لەو تیۆرانەی لەنێوەندی زانستیدا، لەلای نەوەی رابردوو رەواجی هەبوو، تیۆرێك بوو لەبارەی بیاباننشینی و پەیوەندی بەو بابەتی ئێستای ئێمەوە هەیە. پوختەی تیۆرەکە ئەوەیە: بیاباننشینی قۆناغێکی کۆمەڵایەتیە هەموو نەتەوەکان بەر لەچوونیان بۆ قۆناغی شارستانیەت پێیدا تێپەڕ دەبن.

ئەوەی شایەنی باسە ئەم تیۆرە، لەتیۆرە بەناوبانگەکەی (گەشەکردن) وەرگیراوە،کە لەسەردەمی (داروین)ەوە لەنیوەی دووەمی سەدەی رابردوو، بۆتە مۆدەیەکی زانستی. ئەو کاتە زانایان وایانزانی کە کۆمەڵگای مرۆڤایەتی وەك هەر زیندەوەرێك دەبێت لەمێژووی خۆیدا، بەزنجیرەیەك قۆناغی حەتمی تێدەپەڕێت، ئەو قۆناغانەش وەك ئەوان خەیاڵیان کردووە. بەقۆناغی سەرەتایی دەست

پێدەکات کە مرۆڤ لەسەر راوکردن وکۆکردنەوەی بەروبوومە خۆرسەکەکان دەژیت. دواتریش قۆناغی بیابانشینی دێت کە مرۆڤ بەشوانکارەیی دەژیت. دواتر قۆناغی کشتوکاڵ و قۆناغی پیشەسازی ...

ئێستا هەڵەی ئەم تیۆرە دەرکەوتووە، بەتایبەتی لەوەی پەیوەندی بە بیابانشینی هەیە. زانایان ئەمڕۆ ئارەزوویان هەیە بڵێن بیابانشینی قۆناغێکی مەرجدار نییە بۆ گەشەسەندنی کۆمەڵایەتی، لەچارەنووسی هەر نەتەوەیەک نییە لەمێژوودا بەو قۆناغە تێپەڕێت. بەڵکو بیابانشینی لەواقیعدا سیستەمێکی کۆمەڵایەتیە وتەنها لەبیابان دەبێت. نە دەگۆڕێت ونە گەشەدەکات، تا بیابان مابێت دەمێنێ، بەڵام کاتێك بۆ ژینگەیەکی دیکە دەردەچێت ئەوا بەرەبەرە دەگۆڕێت، ئەوکات بەرەو کشتوکاڵ، بازرگانی، پیشەسازی دەچێت، بەپێی بارودۆخی پێویست.

ئەمە وامان لێدەکات بڵێین بیابان وبیابانشینی هاوواتای یەکترن. ئەو نەتەوەیەی کە لەبیابان ناژیت ناتوانێ بژێوی خۆی لەسیستەمی بیابانشینی دابین بکات. ئەو نەتەوەیە لەسەرەتا لەقۆناغی راوکردن و کۆکردنەوە دەژیت و ئەگەرهاتوو بژێوی ئەستەم بوو بەهۆی هەر هۆکارێکەوە ئەوا ناچار دەبێت ئەو قۆناغە جێبهێڵێ و بەپێی سروشتی زەوییەکەی بۆ قۆناغێکی دیکە بچێت. لەزۆربەی حاڵەتەکانیش ناتوانێت سیستەمی بیابانیشی وەربگرێت ئەگەرهاتوو خاکەکەی بیابان نەبوو.

جێگای داخە ئەم تیۆرە، سەرەڕای ئەوەی دواجار هەڵەکانی دەرکەوت، کەچی هێشتا لەهەندێك ناوەندی زانستیمان باوە. هێشتا هەندێك لەنووسەران لەوڵاتی ئێمە کاری پێدەکەن گوایە بەدروستی دەزانن. یەکێك لەوان دکتۆر عەلی حوسنییە کە دەڵێ" عەرەب لە جاهلیەت لە قۆناغی کۆچەری دەژیان، ئەمەش قۆناغێکی کۆمەڵایەتی ئاساییە، نەتەوەکان کاتێك بەرەو شارستانیەت دەچن پێیدا تێپەڕدەبن"[٦].

---

[٦] علی حسنی الخربوطلي (المجتمع العربي) ص ١٥٣

لەوانەیە پێویستمان بەوە نەبێت، بڵێین ئەم تیۆرە کۆسپی بۆ تێگەیشتمان لە راستی کۆمەڵگای عەرەبی ومێژووەکەی وسروشتی پێکهاتەکەی دروستکردووە. جگەلەمە بۆمان ئەستەم دەبێت درك بەتایبەتمەندییەکانی کۆمەڵگای عەرەبی بکەین، کە بەو تایبەتمەندیانە لەکۆمەڵگاکانی جیا دەبێتەوە، ئەگەرهاتوو بیابانیشنی بەدیاردەیەکی گشتی بزانین کە هەموو کۆمەڵگاکانی مرۆڤایەتی تێدا هاوبەشە.

هەڵەیەکی دیکە هەیە لەبارەی بیابانشینی لەلایەن هەندێك کۆمەڵناس تێبنیم کرد لەفیستڤاڵی ئیبن خەلدون کە ساڵی ١٩٦٢ لەقاهیرە ئەنجام درا. ئەوان پێیانوایە گرنگترین خەسڵەتەکانی بیابانشینی بریتیە لەگواستنەوە وجێگیرنەبوون لە زەوی. بەمەش کەسی بەدو بە قەرەج و ئەسکیمۆ و دەشوبهێنن ئەمەش هەڵەیەکی گەورەی زانستیە، پێویستە خۆمانی لێ بەدوور بگرین.

لەراستیدا بیابانشینی یان بەدوێتی کولتورێکی کۆمەڵایەتی خۆی هەیە، لە سروشتی ژیانی بیابانەوە هەڵقوڵاوە، بۆیە بە کولتوری قەرەجەکان وئەوانی دیکە ناچێت کاتێك بەکۆچکردنی هەمیشەیی وەسف دەکرێت. لەبارەی بابەتەکانی دیکەشەوە جیاوازی زۆر هەیە، لەبەشەکانی داهاتوودا تاوتوێی دەکەین.

بەراوردکردن و پۆلینکردن:

دەکرێت بگوترێت ململانێنی نێوان بیابانشینی وشارستانیەتی جیاوازی جۆر وتوندی کارلێکردنی هەیە، لەولاتێکی عەرەبی بۆ ولاتێکی دیکە جیاوازە.

بەهەرحاڵ دەتوانین سێ جۆر پۆلینکردنی سەرەکی لەم رووەوە بۆ ولاتانی عەرەبی بکەین. جۆری یەکەمی پۆلینکردنەکە ئەو ولاتانەیە کە تارادەیەکی زۆر لەعێراق دەچن. لەوەی بیابانشینی وشارستانیەتی لەتەك یەکترن. هەندێك جار شارستانیەت بەسەر زاڵ دەبێت وهەندێك جاری دیکەش بیابانشینی. لەم پۆلەدا زۆربەی ولاتانی عەرەبی جێگایان دەکرێتەوە وەك ئەردەن و شام ومەغریب و تونس و جەزائیر و یەمەن. بەبروای من عێراق لەسەرووی هەموو ئەو ولاتانەیە لەرووی توندی ململانێیەکە و دووفاقیدا. ئەمەش لەبەرچەندین هۆکارە کە دواتر دێینەوە سەری.

پۆلی دووەم ئەوەیە کە بیابانئشینی توندترە وکاریگەری بەسەر شارستانیەتی زیاترە، بۆیە ململانێ تێیدا دەرناکەوێت تەنها لەچوارچێوەیەکی تەسك نەبێت. نموونەکانی ئەم پۆلە نەجد وئەحسا وعەسیر ولیبیا، بەشی بیابانی جەزائیر وعومان وحەزرەمەوتە. تایبەتمەندییەکانی ئەو ناوچانە ئەوەیە دانیشتوانیان کەمە و زۆرینەش (بەدو)ن. سیمای شارستانیەتی تێدا نییە تەنها بەشێکی کەم نەبێت لەو مێرگانەن کە ئاو وبیریان تێدایە ولەدەوروبەری ئەم ئاوانەش شاری بچووك دروست دەبن وخەڵکەکەی بەکشتوکاڵ وبازرگانییەوە خەریك دەبن. ئەو جۆرە خەڵکە لە نەریت وبەها کۆمەڵایەتیەکانیان جیاوازیان لەهۆزە بیابانئشینەکانی دەوروبەریان نییە.

هەندێك جار لەو ناوچانە چەند دەوڵەتێك دروست دەبن، بەلام لەواقیعدا ئەوانە دەوڵەت نین بەمانا شارستانیەتە ناسراوەکەی. لەوانەیە ئەگەر شیاو بێت بگوترێت کۆمەڵێك شێخایەتی بەهێزن لەسەر بنەمای دەمارگیری بەدو. دەوڵەت بەمانا شارستانییەکەی دروست نابێت، تەنها لەو ناوچانە نەبێت کە بەرهەمی ئابووریان رێکخراوە، جا کشتوکاڵ بێت یان پیشەسازی، بەمەش دەوڵەت دەتوانێ پاڵپشتی خۆی بکات، بەو باجانەی ساڵ لەدوای ساڵ وەریدەگرێت.

ئەوەی ماوە پۆلی سێیەم وپۆلی کۆتاییە لەولاتانی عەرەبی. ئەم پۆلە پێچەوانەی پۆلی دووەم کەپێشتر باسمان کرد. بەشێوەیەك شارستانیەت بەهێزترە وکاریگەری بەسەر بیابانئشینی هەیە وزیاتر بەناو ژیانی کۆمەڵایەتی شۆڕبۆتەوە. لێرەدا دەبێت ئیعتراف بەوە بکەین بەشی دەگمەن لەولاتانی عەرەبی لەم پۆلەدا تەنها میسرە ئەویش رووە دەریاییەکەی (الوجه البحري). کەچی رووی سەرەوەی کە بە (الصعيد) ناسراوە ئەوە دەتوانرێت لەپۆلینکردنی یەکەم دابنرێت و تارادەیەکی زۆر لە عێراق دەچێت[7].

[7] لەمێژوودا، جوگرافیای میسر بۆ دوو بەش دابەش دەکرێت (الوجه البحري) کە بە (الوجه السفلي) ناودەبرێت لەسەرووی قاهیرەوە دەگرێتەوە تا دەگاتە سەر دەریای ناوەڕاست، بەلام بەشەکەی دیکە کە بە (الوجه القبلي) یان (مصر العليا) ناودەبرێت ئەوا بەشی باشووری قاهیرەیە و بەشی باشووری ولاتەکەیە کە بە (صعيد) ناودەبرێت. وەرگێر

ئەوەی شایەنی باسکردنە، ئەو پۆلینکردنە تەواو و گشتگیر نییە. بابەتەکە لەوەی باسمان کردووە فراوانتر وقوڵترە. ئەمەش وامان لێدەکات داوا لەتوێژەرانی وڵاتانی عەرەبی بکەین توێژینەوە لەبارەی کۆمەڵگا تایبەتەکەی خۆیان بکەن، لەپێناو ناسینی هەریەکەیان بەتەنیا لەچوارچێوەی گشتی عەرەبیدا.

**لەپێناو کۆمەڵناسی عەرەبیدا:**

لەیەکێك لەکتێبەکانی پێشووم[8]، پێشنیارێکم کردبوو، لێرەدا دەمەوێ دووبارەی بکەمەوە. پێشنیارەکەم ئەوەیە توێژەرانی عەرەب دەبێت لەنێوخۆیاندا رێك بکەون بۆ دانانی سۆسیۆلۆژیایەکی تایبەت بەخۆیان.

ئەوەی دەبێت سەرنجی پێبدرێت، ئەوەیە سۆسیۆلۆژیایەی (کۆمەڵناسی) کە ئێستا لەزانکۆ بیانییەکان دەخوێنرێت، هێشتا سیماکەی تەواونەبووە. هێشتا هەندێك لەبنەما وکۆڵەگەکانی کاریگەرە بەو دەورویەرە کۆمەڵایەتیەی تێیدا گەشەی کردووە. ئەگەر دروست بێت دەڵێم هێشتا کۆمەڵناسی، نەگەیشتۆتە ئاستی زانستەکانی دیکە، کە ماوەیەکی زۆرە گەشەیان کردووە، وایان لێهاتووە لەسەر بنەمای گشتی چەمکەکانی خۆیان بونیاد دەنێن، بەشێوەیەك لەهەموو کات وشوێنێك جێبەجێ بکرێن.

کۆمەڵناسی نزیکەی سەد ساڵێك دەبێت پەیدابووە. ئەم تەمەن بەچاو تەمەنی زۆربەی زانستەکانی دیکە بچووکە. جێگای داخە دەبین هەندێك لەبرایانمان لەنووسەر وتوێژەران، درك بەم بابەتە ناکەن و تێناگەن. بۆیە دەبینین یەکێك کۆمەڵناسی لەزانکۆیەکی بینای دەخوێنێ، کە دەگەڕێتەوە کۆمەڵگاکەی خۆی دەیەوێ توێژینەوەی پیت بەپیت بکات لەژێر رۆشنایی ئەوەی لەوێ خوێندویەتی. جیاوازی نێوان کۆمەڵگاکەی و ئەو کۆمەڵگایە لەبیر دەکات کە تێیدا خوێندویەتی. وا تێدەگات ئەو دیاردە کۆمەڵایەتیانەی لەوێ خوێندویەتی (یاسای گشتی)ین، بەبێ جیاوازی بۆ هەموو کۆمەڵگاکانی جیهان دروستە.

نکۆڵی لەوە ناکەین کۆمەڵناسی نوێ چەندین تیۆری گرنگی تێدایە رێگا لەبەردەم توێژەری کۆمەڵایەتی رۆشن دەکاتەوە بۆ هەرکوێیەکی گۆی زەوی بچێت. لەگەڵ

[8] علي الوردي (منطق ابن خلدون في ضوء حضارته و شخصيته) الفصل الثالث عشر.

ئەمەشدا نابێت وەك دەستورێکی داخراو سەیری بکەین وکوێرانە لاسایی بکەینەوە.

لەمیانەی خوێندنی زانستیم لە ویلایەتە یەکگرتووەکان، تێبینی ئەوەکرد زانایانی کۆمەڵناسی بایەخێکی زۆر بە بابەتی بیابانشینی نادەن. لەمەشدا گلەییان لێ ناکرێت، ئەوان شوێنەواری بیابانشینی لەولاتی خۆیان نادۆزنەوە. لەسەریانە زیاتر بەو بابەتانەوە سەرقاڵ بن کە پەیوەندیان بەو کۆمەڵگایەی خۆیانەوە هەیە. لەکەسانی بیانی ئەوانەی بایەخیان بەم بابەتە داوە، زانایانی کۆمەڵناسی نین، بەڵکو زۆرینەیان رۆژهەلاتناس وگەشتیار وهاوشێوەی ئەو جۆرە کەسانەن. ئەوانیش سەرەڕای کۆششە گرنگەکانیان تووشی هەڵەی زانستی زۆر بوونەتەوە. ئەمەش توێژەرانی عەرەب دەخاتە بەردەم ئەرکێکی قورس، چونکە ئەوان بەرپرسن لەئەنجامدانی توێژینەوەی بیابانشینی وململانێیەکانی لەگەڵ شارستانیەت. بۆیان گونجاو نییە پێشبینی بکەن کەسانی دیکە ئەم توێژینەوەیە ئەنجام بدات وڕێچکەیان بۆ خۆش بکات، ئەوانیش بێن لەدواوە ڕێگەی ئەوان بگرن.

**گرنگی ئیبن خەلدون:**

ئیبن خەلدون بە دوو خەسڵەت جیادەکرێتەوە، هیچ کەسێك لە نێو توێژەرانی کۆمەڵناسی هەموو نەتەوەکان هاوتای نییە. یەکەم توێژەر بوو لە جیهان ، توێژینەوەی واقیعی دوور لە ئامۆژگاری لەبارەی کۆمەڵگاوە ئەنجام داوە. بەمەش بە پێنج سەدە بەر لەزەمەنی خۆی کەوتووە. خەسڵەتی دووەم، هەتا ئێستاش مەزنترین کەسە توێژینەوەی لەبارەی کۆمەڵگای عەرەبی لەسەر بنەمای سروشتی پێکهاتە تایبەتەکەی ئەنجام داوە. واتە لەسەر بنەمای ئەو ململانێیەی لەنێوان بیابانشینی و شارستانێتی تێیدا دەگوزەرێ.

کاتێك تاوتوێی تیۆرەکەی ئیبن خەلدون دەکەین، دەبینین زۆربەی لایەنەکانی لەبارەی بەراوردکردنی نێوان بیابانشینی و شارستانێتییە. کەچۆن لە ململانێی کەوتۆتە نێوانیان. بۆیە دەکرێت بگوترێت، ئەم تیۆرە سەرەڕای کۆنییەکەی، چاکترین سەرچاوەیە بۆ توێژینەوە لە کۆمەڵگای عەرەبی. ئەو تیۆرە لە سروشتی

ئەو کۆمەڵگایە هەڵقوڵاوە، وەك ئەو تیۆرانە دیکەی کۆمەڵناسی، لەو کۆمەڵگایانە هەڵقوڵاون کە تێیدا دەرکەوتوون.

هەرچۆنێك بێت ئەوەی لەبارەی ئیبن خەلدونەوە دەیڵێین، مانای ئەوە نییە تیۆرەکە تەواو دروستە بەهەموو وردەکارییەکانیەوە. بەڵکو نموونەی هەموو تیۆرە مەزنەکان دەبێت هەڵە وکەموکوڕی لەخۆیەوە بگرێت، هەروەك چۆن داهێنان و رەسەنایەتیش لەخۆیەوە دەگرێت.

یەکێك لەو هەڵانە ئەوەیە کاتێك توێژینەوەی لەبارەی ململانێی نێوان بیابانشینی وشارستانێتی کرد لەکۆمەڵگای عەرەبی، پێیوابوو ئەو ململانێیە لەگشتی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی هەیە، بۆیە دەبینین هەوڵ دەدات شرۆڤەی مێژووی مرۆڤایەتی هەموو بەوە بکات گوایە گوزراشتکردن لەخولانەوەی هاوشێوەی یەك لەدوای یەك، عەرەبیش لەمەدا جیاوازی لەگەڵ نەتەوەکانی دیکە نییە. ئەو پێیوایە هەر خولێك لە ئەنجامی هێرشی بەدوەکان بۆ سەر شارستانێتی هاوسێیان دەستپێدەکات، دواتر دەوڵەتێکی گەشەسەندوو دروست دەکەن، بەڵام دواتر ئەو دەوڵەتە هەڵدەوەشێتەوە و بەرەبەرە لاواز دەبێت لەئەنجامی خۆشگوزەرانی و رابواردندا. تا لەکۆتاییدا لەئەنجامی هێرشێکی نوێ بیابانشی لەناودەچێت. بەمشێوەیە یەك لەدوای یەك دەوڵەت دروست دەبێت و لەناودەچێت.

شتێکی شارەوە نییە ئەم تیۆرەی ئیبن خەلدون تارادەیەکی زۆر بۆ مێژووی کۆمەڵگای عەرەبی دروستە، کەچی زۆر کەم بۆ مێژووی هەندێك کۆمەڵگای دیکە شیاو دەبێت، وەك پێشتریش بینیمان. بەهەرحاڵێك بێت، نابێت بۆ تەواوی کۆمەڵگاکانی مرۆڤایەتی گشتاندنی بۆ بکرێت.

جگە لەمەش ئیبن خەلدون کەوتۆتە هەڵەیەکی دیکەوە. ئەو پێیوایە عەرەب توندترین نەتەوەن بۆ بیابانشینی ودووری لە شارستانیەت. لەبەر ئەمەش دەبینین عەرەب بەهەموو ئەو خەسڵەتانە وەسف دەکات کەدژی شارستانییەتن لە کاولکاری و وەحشیگەرایی و توندوتیژی ...هتد. هەر ئەم وەسفانەشی وایکرد هەندێك

لەنەتەوەخوازەکانی عەرەب لەم سەردەمەدا بەخراپ وەسفی بکەن و پێشنیاری سوتاندنی کتێبەکانی و هەڵتەکاندنی گۆڕەکەی بکەن بەناوی نەتەوەییەوە[٩].

سەیر ئەوەیە ئیبن خەلدون ئەو بۆچوونە توندڕەوانەی لەبارەی عەرەبەوە وتووە، کەچی خۆی لەسەردەمێك ژیاوە وەحشیگەرایی مەغۆل وکاولکارییەکانیان لەهەموو شوێنێك بینراوە و باسکراوە. تەنانەت کاتێك ئیبن خەلدون لەشام بووە تەیمورلەنك هێرشی کردۆتەوە سەر ئەو ناوچانە. هەموو کاولکاری وسوتاندن و کوشتارییەکانی بینیوە کەلەسەر دەستی وەحشیەتگەری تەتەر ئەنجام دراوە[١٠]. ئیبن خەلدون دەیزانی تەیمورلەنك چی بەسەر شارەکانی دیکە هێناوە، دەشیزانی هۆلاکۆ و جەنگیزخان بەر لەو چیان ئەنجام داوە.

لەراستیدا عەرەب لە هەموو فەتحکردنەکانی خۆیاندا، هێندە کاولکاری و کارەساتیان ئەنجام نەداوە. هەندێك نەتەوەی فەتحکراو شاهیدی ئەوەیان بۆ دەدەن کە جوامێری ومروەتی عەرەب کەم نەبووە[١١]. وەك دەردەکەوێت دوو هۆکار وای لە ئیبن خەلدون کردووە عەرەب بەوە وەسف بکات، گوایە نەتەوەیەکە زۆرترین کاولکاری و بیابانشینی هەبێت.

یەکەمیان: هەوڵی ئیبن خەلدون بووە بۆ خۆ نزیککردنەوە لە تەیمورلەنك بۆ وەرگرتنی پلەوپایە. نابێت ئەوەش لەبیر بکەین کە ئیبن خەلدون لەژیانی تایبەتی خۆی دا زۆر هەلپەرست بووە. دەیویست لەپاشاکان نزیك بێتەوە و لەپێناو ئەواندا هەقی دەکرد بەناهەق[١٢].

دووەمیان: ئەوەیە ئیبن خەلدون لەمەغریب گەورە بووە ودرکی بە بری ئەو کاولکارییە کردووە کاتێك هۆزە عەرەبییەکان ماوەیەکی دوور نییە لەکاتی داگیرکردنی ئەوێ ئەنجامیان داوە. ئەمەش لە ئەفسانە مللییەکان بە (تەغریبەی بەنی هیلال) ناسراوە. جا وەك دەردەکەوێت ئیبن خەلدون لەدەروبەرێکی کۆمەڵایەتی وەها ژیاوە پڕبوو

---

[٩] ساطع الحصري (دراسات عن مقدمة ابن خلدون) ص١٥١

[١٠] ابن خلدون (التعريف) ص٣٧٤

[١١] ادوار بروان ( تاريخ الادب في ايران من الفردوسي الى السعدي) ترجمة ابراهيم الشواربي ـص ٥٥٢

[١٢] علي الوردي (منطق ابن خلدون....) الفص الحادي عشر

لەنەنگییەکانی ئەو هۆزە کاوڵکارانە، بۆیە لەبۆچوونەکانی بەشێوەیەك لەشێوەکان کەوتۆتە ژێر کاریگەری ئەو بارودۆخەوە.

لەواقیعدا هۆزە عەرەبییەکان مەغریبیان بەتەواوەتی وێرانکرد[12]. لەگەڵئەوەشدا ناتوانین کاوڵکارییەکانیان لەئاستی کاوڵکارییەکانی مەغول و تەتەر هەژمار بکەین، چونکە ئەوانە سەرەڕای ئەوەی تێکدەربوون، ئەوا درندە وسەربڕیش بوون. تەنها بەداگیرکردنی شار نەدەوەستان بەڵکو دەیانویست سەرجەم دانیشتوانی شارەکەش بکوژن.

بۆیە دەتوانین بڵێین عەرەب بەشێوەیەکی گشتی کەمتر لە مەغول وتەتەر کەوتبوونە ژێر کاریگەری بیاباننشینی. هۆکاری ئەمەش ئەوەیە هەر لەکۆنەوە بیاباننشینی وشارستانێتی لەناوعەرەبدا لەململانێی بوون، بۆیە ئەوان زیاتر لەمەغول وتەتەر، نزیکترن لەوەی لەشارستانیەت بگەن و خێراترن بۆ گونجان لەگەڵیدا. لەبەشی داهاتوو دێینەوە سەر ئەو بابەتە.

**لانکەی شارستانیەت:**

وتمان یەکەم شارستانیەت لەجیهان ئەوەیە کە لەمیسر وعێراق دەرکەوتووە. ئەمەش نزیکەی پێش شەش هەزار ساڵ بووە. ئەو پرسیارەی لێرەدا ڕووبەڕوومان دەبێتەوە ئەوەیە: بۆچی شارستانیەت لەو دوو وڵاتە بەر لە وڵاتانی دیکە جیهان دەرکەوتووە؟

هەندێك لەتوێژەران لەسەدەی ڕابردوو هەوڵیان داوە، وەڵامی ئەم پرسیارە بدەنەوە، بەگوتەی ئەوەی سیفەتی ئەم دوو وڵاتە زۆری ئاو، بەپیتی خاکەکە وکەشوهەوای مامناوەند بوو، لەئەنجامی ئەمەشدا کشتوکاڵ پەیدابووە، کە ئەمەش بنەمای شارستانیەتە. لەڕاستیدا ئەم وەڵامە سەرەڕای ئەوەی لەرووکەشدا ماقوڵە، کەچی کێشەکەمان بەتەواوی چارەسەر ناکات. ئێمە نکۆڵی لەکاریگەری ئاو وخاك وکەشوهەوا ناکەین لەگەشەکردنی کشتوکاڵدا، بەڵام ئەو خەسڵەتانە بەس نییە بۆ دروستبوونی شارستانیەت. وەك دەزانین لەجیهاندا زۆر وڵات هەیە هاوشێوەی عێراق

[12] محمد فهمي عبداللطيف (أبوزيد الهلالي) ص ٥١-٥٤

ومیسر ئەم خەسڵەتانەی تێدایە. ئەی بۆچی لەزووەوە هاوشێوەی ئەم دوو وڵاتە شارستانیەتی تێدا دروست نەبووە؟

مێژوونووسی بەناوبانگ ئارنولد توینبی لەمبارەیەوە تیۆرێکی هەیە، دەکرێت بەچاکترین چارەسەری بزانین بۆ ئەم کێشەیە. پوختەی تیۆرەکەی ئەوەیە ئەو ناوچە بیابانە فراوانەی ئەمڕۆ دەیبینن لەزەریاوە بەرەو کەنداو کشاوە، لەسەرەتادا وەها نەبووە. توێژینەوە نوێیەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن ئەم ناوچەیە ڕۆژێك لەڕۆژان بارانی زۆر بووە و بەپیت بووە، جۆرەها رووەك و گیانەوەری تێدابووە، دانیشتووانی لەسەر راوکردنی ئاژەڵان وکۆکردنەوەی بەروبوومەکان دەژیان وبەمشێوەیە نەبووە هەندێك بیابانشین و هەندێك شارستانی بێت وەك ئەوەی پێشتر باسمان کرد.

ئەم ناوچەیە بەمشێوەیە بووە، بەنزیکەی دە هەزار ساڵ لەمەوبەر. ئەمەش ئەو چاخە بووە کە زانایان بە (چاخی چوارەمی سەهۆڵبەندان) ناوی دەبەن. لەم چاخەدا سەهۆڵبەندانی جەمسەر بەرەو باشوور کشاوە تا نزیکبووتەوە لە باکووری ناوچەی عەرەبی، بۆیە بای جەمسەریی لەهەموو وەرزەکانی ساڵدا بەو ناوچەیەدا هەڵیکردووە. لەئەنجامی ئەمەش باران زۆر دەبێت و گژوگیا وگیانلەبەران زیاد دەکەن.

لەبەر هۆکارێك کە تائێستا نازانین، سەهۆڵبەندان بەرەبەرە بەرەو باکور قەتیس دەبێت. بەهۆکاری ئەمەش باران کەم دەبێتەوە وبەتێپەڕبوونی ڕۆژگار ناوچەکە وشك دەبێت. توینبی دەڵێ دانیشتوانی ناوچەکە ڕووبەرووی کێشەیەك دەبنەوە، پێشتر نەیانزانیوە. بەو کێشەیە بواری بژێویان لەبەردەم تەسك دەبێتەوە وبۆیە بیر لەوە دەکەنەوە سەرچاوەیەکی دیکەی بژێوی بدۆزنەوە و نازو نیعمەتی ژیانی پێشووتریان نامێنێ.

هەندێك لەدانیشتووانی ناوچەکە ناچار دەبن، دوو شێوازی نوێ بۆ ژیان دابهێنن کە جیاوازبووە لەوەی پێشوو لێی ڕاهاتبوون، ئەم دوو شێوازەش کشتوکاڵ و شوانکارەییە. ئەوانەی ویستیان لەبیابان بمێننەوە ئەوا مەڕومالاتیان پەروەردە دەکرد و بەدوای لەوەڕگا دەگەڕان. کەچی ئەوانی دیکە بۆلای سەرچاوە ئاوییەکانی نزیك

خۆیان دەچوون و خاکەکەیان بۆ کشتوکاڵ دەکێڵا، بەمشێوەیە شارستانیەت لەلای ئەوان دروست بوو[١٤].

## چیرۆکی ئادەم:

هەندێك لەتوێژەران ئارەزوو دەکەن بڵێن، چیرۆکی ئادەم کە لە کتێبە پیرۆزەکان باسکراوە. تەنها چیرۆکێکی رەمزئامێزە ئاماژە ئەو رووداوە مێژوویانە دەکات کە پێشتر باسمان کرد. پوختەی چیرۆکەکە ئەوەیە: ئادەم و حەوای هاوسەری لە بەهەشت بەناز ونیعمەتەوە دەژیان ودواتر سەرپێچی خودایان کرد بەهاندانی شەیتان... خودا لەبەهەشتی وەدەرنان، بەمەش بژێویان بەماندووبوون و ئارەقەی نێوچەوان پەیدا دەکرد. خودا دواتر دوو کوری بەوان دا، ئەوانیش هابیل و قابیل بوون. هابیل پیشەی شوانکارەیی دەکرد وقابیل پیشەی کشتوکاڵ. شەڕ دەکەوێتە نێوانیان و لەئەنجامدا قابیل هابیلی برای دەکوژێت.[١٥]

یەکێك لەو توێژەرانەی بایەخیان بەو چیرۆکە داوە، توینبی مێژوونووسە. بەبروای توینبی ئەو بەهەشتەی ئادەم وژنەکەی تێیدا ژیاون، بەرلەکەوتنیان بۆ زەوی. ئاماژەیە بۆ ئەو حاڵەتە پڕ دڵنیابوونەی کەخەڵك بەر لەچڕبوونەوەی چاخی سەهۆڵبەندان تێیدا ژیاوە. ئەو ململانێیەی لەنێوان قابیل وهابیلیش دروست دەبێت، بریتیە لەو ململانێیەی لەنێوان بیابانشینی و شارستانێتی پەیدا دەبێت.[١٦]

توێژەرێکی دیکە کە بایەخی بەچیرۆکی ئادەم داوە، ئەویش ئەندازیاری ناسراو (ولیام ویلکۆکسە). ئەو لەم ڕێگایەدا دوورتر لە توینبی ڕۆیشتووە. ئەو ویستویەتی بەوردی شوێنی بەهەشتی (عەدەن) دیار بکات. بەلێکۆڵینەوەکانی بەوە گەیشتووە بڵێت ئەو بەهەشتە لەعێراق بووە، بەدیارکراویش لە فوراتی ناوەڕاست بووە.

عێراقییەکان ویلکۆکس دەناسن، ئەو بوو سەرپەرشتی دروستکردنی پردی (هیندیە)ی کرد. حکومەتی عوسمانی لەساڵی ١٩٠٨ بانگهێشتی کردبوو بۆ ئەوەی تاوتوێی پرۆژەکانی ئاودێری بکات لەعێراقدا. ویلکۆکس ئەمەی بەهەلزانی بۆ ئەوەی

---

[١٤] Toynbee(A study of history)-Somervell abridgement –VOL I, p 68-74

[١٥] ناوی (قابیل) م بەکارهێناوە بەوپێیەی کە لەکێتبە مێژووییە عەرەبیەکان هاتووە، کەچی ناوە بنەرەتییەکە لەتەورات هاتووە (قابین). سەیری (سفر التکوین) بکە ئسحاحی چوارەم. عەلی وەردی

[١٦] Toynbee (op.cit) VOL I,p 65-66

توێژینەوە لەبارەی شوێنی ئەو چوار رووبارە بکات کەبەپێی تەورات خاکی بەهەشتیان تێرئاو کردووە. ئەمانیش حداقل و فورات و جیجون و فیشونە. لەکۆتایی دا ویلکۆکس گەیشتە ئەو بۆچوونەی ئەو رووبارانە تەنها رووبارەکانی سەقلاویە و بەنداوی حیلە وبەنداوی هیندیە و نزماییەکانی حەبانییە و ئەبی دبس کەلەکاتی لافاو پڕ ئاو دەبن.[17]

## بۆچی عێراق؟

جا لەگەڵ ئەم بۆچوونەی ویلکۆکس کۆک بین یان ناکۆک بین. کاتێک ئێمە گوێ لە تەواوی قسەکانی دەگرین لەبارەی بابەتەکەوە، ئەوا هەست دەکەین، لەگەیشتن بە بۆچوونەکەی هەندێك لەسەرهەقە. من قەناعەت دەکەم ویلکۆکس راست دەکات کە وتویەتی بارودۆخی عێراق وایکردووە لەهەموو ولاتانی جیهان گونجاوتر بێت بۆ ململانێی نێوان بیابانشینی و شارستانیەت.

هەلی ئەوە بۆ ویلکۆکس رەخساوە لەمیسر بژی وتوێژینەوە لە خاك ورووبارەکەی بکات، ئەمە بەر لەهاتنی بۆ عێراق بوو. بەمەش توانیویەتی بەراورد لەنێوان سروشتی ئەم دوو ولاتە بکات، کە یەکەم شارستانیەتی جیهانی تێدا دەرکەوتووە. بەبڕوای ئەو عێراق لەلایەکەوە لەمیسر دەچێت ولەلایەکی دیکەشەوە لەو جیاوازە. لەلایەنی یەکەمەوە دەبینین شارستانیەت لەکاتێکی نزیک لەیەکتر لەمیسر وعێراق دەردەکەوێت. لەلایەنی دووەم دەبینین عێراق بارودۆخە تایبەتەکەی وای لێدەکات زیاتر گونجاو بێت بۆ شۆڕبوونەوەی بەدوەکان و ململانێیان لەگەڵ شارستانیەت.

ویلکۆکس لەبارەیەوە دەڵێ" نیل لەهەموو رووبارەکانی جیهان هاوسەنگترە. ئەو ماوەیەکی باش بەر لەنزمبوونەوە وبەرزبوونەوە هۆشیاری دەدات وبەشێوەیەکی لەناکاو هەڵسوکەوت ناکات. هێندە قوڕ ولیتە لەگەڵ خۆی هەڵدەگرێت کە بەشی چاککردنی زەوییەکان بکات و نەبێتەهۆی داپۆشینی بەنداوەکان. جگە لەمەش خاڵییە لە سوێری. وەك نەریتێکی خۆی لە مانگی ئاب وئەیلول وتشرینی یەکەك لەهەموو ساڵێك لافاو دەکات بەمەش دەبێتە هۆی تێرئاوکردنی کێڵگە زستانی و هاوینیەکان. لەنێو تەپۆلکەکانیشی بەردی لمی وکلسی هەیە کە کەرەستەی بیناسازی لێ دروست

---

[17] وليم ويلكوكس (من جنة عدن الى عبور نهر الاردن) تعريب محمد الهاشمي ص ١٢-١٣

دەگرێت، کەچی دیجلە وفورات بێ ئاگادارکردنەوەی پێشینە بەرزدەبنەوە وبەبەردەوام بەشێوەیەکی لەناکاو هەڵسوکەوت دەکەن. پێنج هێندەی نیل قوڕ ولیتە لەگەڵ خۆیان دەهێنن. لافاوەکانیان لە ئازار ونیسان و ئایار روودەدات. ئەمەش بۆ کشتوکاڵی زستانە زۆر درەنگە و بۆ کشتوکاڵی هاوینەش زۆر زووە. بڕێکی زۆریش سوێریی وخوێ لەگەڵ خۆیان هەڵدەگرن و بەنێو بیابانی گەچ و خاکەسوێرەکان تێدەپەڕن"[18].

سەرەڕای ئەمەش ویکۆکس دەڵێ" خاکی عێراق لێژییەکەی لە خاکی میسر زیاترە. لەمیسر خاك لەهەر میلێك یەك پێ نزم دەبێتەوە. کەچی لەعێراق لەیەك میلدا پێنج پێ نزم دەبێتەوە"[19]. بێگومان زۆر لێژبوونەوەی زەویش دەبێتەهۆی تیژڕەو بوونی رووبارەکە. ئەمەش واتای ئەوەیە رووبارەکە توانایەکی زۆری هەیە لەتێکدانی بەنداو وتێپەڕبوون بەزەوییە کشتوکاڵییەکان. بەبۆچوونی ویلکۆکس ئەمە دەبێتە هۆکاری زیادبوونی کێشەی نێوان جووتیاران وشوانکاران. یان کێشەی نێوان قابیل و هابیل. جووتیارەکان دەیانەوێ بەنداو لەسەر کەناری رووبارەکان دروست بکەن بۆ ئەوەی کێلگە کشتوکاڵییەکانیان لەمەترسی نقوم بوون رزگار بکەن، چونکە بوونی هەر کەلێنێك لەو بەنداوانە کارەساتێکی گەورە بۆ ئەوان دەخوڵقێنێ. کەچی لەبەرژەوەندی شوانکارەکانە کەلێن لە بەنداوەکان دروست بێت. لەوانەشە خۆیان هەوڵ بدەن ئەو کەلێنانە لەبەنداوەکان دروست بکەن لەوشکەساڵیدا. ئەمەش دەبێتە هۆی تێراوبوونی مەڕومالآتەکانیان.

ویلکۆکس دەڵێ دژایەتی نێوان هابیل و قابیل بەردەوام دەبێت، وەك ئەوەی لەتەورات هاتووە خودا قوربانیەکانی هابیلی قبوڵ دەکرد ورقی لەقابیل وقوربانییەکانی دەبوییەوە. ئەم دژایەتیەش لەنێوان ئەو دوو برایە بەردەوام دەبێت. قابیل جارێك وادەزانێ براکەی بەنداوەکەی تەقاندووە، بۆیە دەچێتە لای وده‌یکوژێت. تورەیی خوداش لەو تاوانە زۆر گەورە بوو[20].

---

[18] أحمد سوسة (فيضانات بغداد في التاريخ) ج۱ ص ۱٤۷-۱٤۸

[19] وليم ويلكوكس (المصدر السابق) ص ۱۹-۲۰

[20] وليم ويلكوكس (المصدر السابق) ص۱۷

ویلکۆکس پێیوایە ئەو دژایەتی لەنێوان دوو براکە لە کۆنترین سەدەکانی مێژوو هەبووە، هەتا سەردەمی نوێیش ماوەتەوە. ئەو بۆمان دەگێڕێتەوە لەساڵی ١٩٠٩ دژایەتی نێوان هابیل وقابیلی بەچاوی خۆی بینیوە. لەمانگی ئایاری ئەم ساڵەدا، کاتێك لافاوی فورات دەگاتە ئەوپەڕی. ویلکۆکس لە کەناری چەپی تێپەڕ دەبێت، لەباکورەوە لەلای رومادی و هیت. دەبینی پەنجا سەر مەڕ لەدۆڵێك دەڕوات لەدەرەوەی ناوچە بیابانیەکە. ئەو مێگەلە هۆکارێك دەبێت بۆ ترس ونیگەرانی لەدڵی جووتیارەکان. رۆژی دواتر، لەکاتی گەڕانەوەی بەکەشتیەك لەرێگای رووبارەوە، بەدوای یەکەوە گوێی لەدوو تەقە دەبێت. لەدوورەوە دەبینی ژمارەیەك سوارچاك وخەڵك بە پیادە بەرەو شوێنی رووداوەکە رادەکەن، هەندێکیان بێڵ وهەندێکیان تفەنگیان بەدەستەوەیە، ئامادەییان هەیە بۆ بەرگرکردن لەدژی شوانکارەکان ونەهێشتنی ترسی لافاوەکە.

کاتێك ویلکۆکس لەگەڵ یەکێك لە شێخەکان کۆدەبێتەوە، لێی دەپرسی" بۆچی زەوییەکان لەنێوان خۆتان دابەش ناکەن، بەشێکیان پڕ ئاو بکەن وبەشەکەی دیکەی بۆ کشتوکاڵی گەنم وجۆ تەرخان بکەن؟" شێخەکە وەڵامی دەداتەوە" ئێمە ناتوانین لەنێوان خۆمان رێکبکەوین، بەڵام هیوای ئەوە دەخوازین سیستەم و یاسا لەو وڵاتە پەیدا بێت، بۆ ئەوەی جێگای ئەو رقوکینە بەردەوامە بگرێتەوە..." هەروەها شێخ دەڵێ" ئەگەر لەوڵات یاسایەکی گونجاو هەبێت، ئەوا جووتیارەکان کە زۆرینەن لەوڵات موکڕ دەبن لە رێزگرتنی ئەو یاسایانە"[٢١]

**گۆڕینی رێڕەوی رووبارەکان:**

لێرەوە ئەمە روون دەبێتەوە، بارودۆخی رووبارەکان لەعێراق جیاوازییەکی زۆری لەگەڵ بارودۆخەکەی میسر هەیە. لەعێراق رووبارەکان بەردەوام پێویستیان بەوە هەیە پاك بکرێنەوە. کەمتەرخەمی لەمە دەبێتەهۆی ئەوەی رۆژ لەدوای رۆژ قوڕ ولیتە لەرێڕەوی رووبارەکە کەڵەکە بن. ئەمەش لەلایەك دەبێتەهۆی دروستبوونی مەترسی لافاو ولەلایەکی دیکەشەوە دەبێتەهۆی گۆڕینی رێڕەوی رووبارەکە. بۆیە ئێمە ئەگەر سەیری نەخشەی رووبارەکانی عێراق بکەین لەمێژوودا، ئەوا بەردەوام لەگۆڕان دایە.

[٢١] وليم ويلكوكس (المصدر السابق) ص ١٨

جارێك لەوێ جارێکی دیکەش لەشوێنێکی دیکەیە[٢٢]. ئەمەش بابەتێکە ئەنجامی کۆمەڵایەتی زۆر گرنگی هەیە، بەتایبەتی لەرووی ململانێی بیاباننشینی وشارستانێتیدا. ئەمەمان بەروونی لەسەردەمی عوسمانییەکان بینی کاتێك حکومەت لاواز بوو وسیستەمی ئاودێری فەرامۆشکرا بوو. بۆ نموونە قوڕ ولیتە لە رووباری (الغراف) کەڵەکە بوو، ئاوی رووبارەکە کەم بوو،ئەمەش وایکرد ئاوی دیجلە بەرەو عمارە بچێت لەوێش ئەهوار ولافاوی یەك لەدوای یەك دروست بوو. نموونەی ئەمەش هەر لە فورات روویدا کاتێك ئاوەکەی لەزێی حیلە بەرەو لقی هیندیە چوو، بۆیە لایەك تووشی وشکانی بوو، لایەکەی دیکەش نقومی ئاو بوو.

بێگومان ئەم گۆڕانکارییانەش لەڕێڕەوی رووبارەکان، بووە هۆی زیادبوونی ململانێی نێوان هۆزە عێراقیەکان. هۆزێك دەبینی زەوییەکانی وشکهەڵاتووە لە ئەنجامی گۆڕانی ڕێڕەوەکە، بۆیە دەبێت هەوڵی کۆچ کردن بدات بۆ زەویەکی دیکە. لەوێش لەگەڵ ئەو هۆزە رووبەرووی یەکتر دەبنەوە کەپێشتر زەوییەکانی بەکارهێناوە. دەتوانین بڵێین هۆزە عێراقییەکان لەسەر زەوی کشتوکاڵی ململانێ دەکەن وەك چۆن بەدوەکان لەسەر لەوەرگاکانی بیابان ململانێیان دەکەن. ئەمانەش وا دەکات پەیوەندیە دەمارگیرییەکانی هۆزە عێراقییەکان زیاتر بێت وداگیرکردن وتۆڵەکردنەوە لەنێوانیان بلاوبێتەوە. لەوانەشە هەندێك لە هۆزەکان ناچاربووبن سەرلەنوێ بگەڕێنەوە سەر ژیانی شوانکارەیی.

وا باوەڕ دەکرێت ئەوەی لەسەردەمی عوسمانییەکان لەعێراق روویداوە، هاوشێوەی ئەوانە بووە کە لەسەردەمە کۆنەکان روویدابوو. بۆ نموونە ئاماژە بۆ ئەوە دەکەین مێژوونووسان بۆمان دەگێڕنەوە کە چی بەسەر عێراق هاتووە لەکاتی مردنی ئەسکەندەر. دکتۆر ئەحمەد نەسیم سوسە دەڵێ" لەئەنجامی مردنی ئەسکەندەر شڵەژانی سیاسی باڵی بەسەر وڵات کێشا، کەئەمەش بەهۆی بێبەشبوونی وڵات بوو لەسەقامگیری سیاسی کەهۆکاری سەرەکی ئەمەش گەشەکردنی سیستەمی ئاودێرییە. لەئەنجامیشدا سیستەمی عەشایەری لەوڵات بەرپابوو. ئەم بارودۆخە بەردەوام بوو تاساسانییەکان هاتن، ئەوانە سەقامگیرییەکی سیاسیان هەبوو. بۆیە

[٢٢] گوردن هستد (الاسس الطبيعية لجغرافية العراق) تعريب جاسم محمد الخلف ص ٦٢-٦٤

لەدوای لەناوبردنی سیستەمی عەشایەر دەسەلاتێکی یەکگرتوو دانرا و کۆلگەیەکی بتەویان بۆ بوژانەوەی ئاودانی دانا، کە پان ودرێژی وڵاتی گرتەوە..."[٢٣]

**گرنگی دەوڵەت:**

پێشتر وتمان شارستانیەت بەبوونی دەوڵەت جیادەکرێتەوە، ئەمە لەکاتێکدا بیابانشینی بەبوونی دەمارگیری هۆزگەری دەناسرێتەوە. لەتوانای دەوڵەتە رێگری لەململانێی نێوان خەڵك بکات، وایان لێ بکات بەتێپەربوونی رۆژگار دەمارگیری بەرتەسکیان لەیادبکەن. لەسەرووی ئەمەشەوە هەر دەوڵەتە بایەخ بە کاروباری کشتوکاڵی وبازرگانی وپیشەسازی دەدات. بەمەش خەڵك سەرقاڵی کارە جیاجیاکانیان دەبن وشارستانیەتیش بەوان گەشەدەکات و پەرەدەستێنێ.

ئەوەی شایەنی باس بێت، عێراق لەزۆر قۆناغی مێژوویی خۆیدا دەوڵەتی بەهێزی بەخۆیەوە بینیوە کە کاریان بۆ گەشەکردنی شارستانیەت کردووە، بەڵام ئەو قۆناغانە زۆر بەردەوام نەبوون. هەر قۆناغێك لەوان قۆناغێکی دیکەی ململانێی وئاژاوەگێری بەدواوە دەهات وەك ئەوەی لەسەردەمی عوسمانییەکان یان ئەوەی لەسەردەمی مردنی ئەسکەندەر بینیمان.

یەکێك لەو هۆکارانەی لەمەدا هاوکاربووە، ئەوەیە عێراق لەسەر لێواری بیابانە، نە دەریا نە چیایەك جیای ناکاتەوە. ئەمەش وایکردووە بیابان جار لەدوای جار شەپۆلی بەدوەکان برژێنێتە عێراقەوە. دەشتوانرێت بگوترێت ئەو شەپۆلانەی بەدوەکان هەلی دروستبوونی دەوڵەتێکی چەسپاو ودرێژخایەن نادات.

کاتێك لەم لایەنەوە عێراق بەمیسر بەراورد دەکەین، دەبینین جیاوازی نێوانیان کەم نییە. ئێمە نکۆڵی لەوە ناکەین کە میسر زۆربەی لایەنەکانی بە بیابان دەور دراوە، بەڵام ئەو بیابانەی دەوری میسری داوە، وەك ئەو بیابانە نییە کە بەعێراقەوە لکاوە. ئەوەی میسر لەزۆرحاڵەتدا لە لمێکی رووت پێکهاتووە کە هەموو جۆرەکانی ژیانی تێدا ئەستەمە، لەبەر ئەمەش ئەو بیابانە سەرچاوەیەکی گرنگ نییە لەسەرچاوەکانی بیابانشینی وبەدوەکان. کەچی عێراق لەسەر لێواری بیابانێکە، لەمێژوودا بە مەزنترین سەرچاوەکانی بەدو ناسراوە لەجیهاندا. هەر ئەمەش بە دوورگەی عەرەب دەناسرێت.

---

[٢٣] أحمد سوسة (المصدر السابق) ص ٢٠٤

**تۆفانەکەی نوح:**

چیرۆکی تۆفانەکەی نوح، وەك چیرۆکی ئادەم وکورەکانی (هابیل و قابیل) لە کتێبە پیرۆزەکان هاتووە. ئەوەی جێگای سەرنجە زۆر ئاماژە شوێنی ئەو تۆفانە لەعێراق دیار دەکەن. پشکنەرانی شوێنەواری عێراقی کۆن چەند چیرۆکێکیان دۆزیوەتەوە تارادەیەك لەو چیرۆکەی تۆفان دەچێت کە لەکتێبە پیرۆزەکان هاتووە. هەندێك لەزانایان دەیانەوێ بڵێن ئەو چیرۆکە رەمزی لافاوێکی گەورەیە لە زەمەنێکی زۆر کۆندا لەعێراق روویداوە. لەوانەشە گەورەترین لافاو بێت دانیشتوانی عێراقی کۆن بینیویانە، بەشێوەیەك رووداوەکانی ئەم لافاوە نەوە دوای نەوە لەیادەوەریان ماوە. ئەمەش یادی لافاوەکەی بۆ ماوەیەکی درێژ نەمر کردووە. سەرچاوەی ئیلهامی زۆر نووسەر و شاعیری ئەو سەردەم بووە.[٢٤]

وەك دەردەکەوێت پێغەمبەر نوح، ئەو کاتە لەعێراق ژیاوە. بەر لەکارەساتەکەش پێشبینی رووداني کردووە. ئەو ئاگاداری خەڵکی دەکردەوە و هۆشیاری دەدات واز لە دوژمنایەتی ناوخۆیان بهێنن و رقیان لەیەکتر نەبێتەوە، بەڵام ئەوان گوێڕایەڵی نەبوون. لەوانەیە بە ململانێیە کۆنەکەیان خەریك بن، کە پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد. شوانکارەکان هێرشیان دەکردە سەر بەنداوی رووبارەکان وهەوڵی رووخاندنیان دەدا وجووتیارەکانیش بەرپەرچیان دەدانەوە. بەمەش شەڕ لەنێوانیان هەڵدەگیرسا. ئەمە لەکاتێکدا مەترسی تۆفان بێهودە لێیان نزیك دەبوویەوە.

تەورات ئاماژە بۆ ئەوە دەکات جیهان بەر لەتۆفان پڕبووە لەدوژمنایەتی وستەم.[٢٥] هەروەها قورئانیش لەچەند ئایەتێکی خۆی دا ئاماژەی بەو رووداوە داوە. قورئان باسی ئەوە دەکات قەومەکەی نوح بەدکار بوون، ستەمکار و زۆردار بوون، خودا نوحی بۆ رەوانەکردن، بۆئەوەی داوای خوداپەرستی لێ بکات و داوای دوورکەوتنەوە لەخراپە و زۆرداریان لێ بکات. بەڵام ئەوان گوێیان لێ نەگرت وگاڵتەشیان پێکرد، بۆیە خودا فرمانی پێکرد کەشتیەك دروست بکات بۆئەوەی خۆی

---

[٢٤] أحمد سوسة (المصدر السابق) ص ١٦٥- ١٦٦

[٢٥] التوراة، سفر التكوين، الاصحاح الثالث عشر

ولایەنگرەکانی پێ دەرباز بکات لە نقووم بوونێك، کە بەسەرخەڵك دێت لە ئەنجامی بەدکارییەکانیان.[26]

ویلکۆکس دەڵێ" رکابەری نێوان گروپە جیاوازییەکان وئەنجام نەخوزراوەکانی ئەو رکابەریانە مەترسی خەستە نێو دڵی هەندێك لەبیرمەندان  کە نوح یەکێك لەوان بوو. نوح لە ئەنجامی بابەتەکە ترسا بۆیە ئامادەکاری کرد بۆ رووبەرووبونەوەی رووداوە تۆقینەرەکە، کەپێشتر پێشبینی کرابوو، بۆیە کەشتیەکی لەداری حور دروست کرد کە لەکەنارەکانی فورات زۆرە. بەقێر سواقی دا. ئەو قیرە لەهیت دەرهاتبوو. بەهمان شێوەی کە ئەمرۆ (قوفەی)[27] لە فورات پێ دروست دەکرێت"[28]

دواجار تۆفانەکە روویدا وەك نوح پێشبینی کردبوو، کەشتیەکەی بەوانەی لەسەری بوو سەر ئاو دەکەوت. بە ئاراستەی ئاو وبایەکە دەڕۆیشت. بەبۆچوونی ئەحمەد سوسە" دواجار دوای نیشتنەوەی تۆفانەکە لەیەکێك لەبەرزاییە بیابانیەکانی نزیك نەجەف جێگربوو. ئەمەش ئەو بەرزایانەبوو کە شەست و پێنج مەتر لە رووی دەریاوە بەرز بوو"[29]

سەرەڕای ئەمەش دکتۆر ئەحمەد سوسە دەڵێ" کەشتیەکەی نوح ئەو رووداوەمان بەبیر دەهێنێتەوە کە لە سەردەمی رەشید لەساڵی ١٨٦ کۆچی روویداوە. ئەو کاتە لافاوێکی گەورە روویدا رەشید ناچار بوو شوێنی خۆی وکەسوکار و ژنانی حەرەم و سامانەکەی لەکۆشك بگوازێتەوە بۆ کەشتیەك. لەوێ مایەوە تا ئاستی رووباری دیجلە نزم بوویەوە، جا گەڕایەوە سەر وشکانی"[30].

---

[26] القران ، سورة هود، وسورة الشعراء، وغيرهما.

[27] جۆرە بەلەمێکی بچووکە – وەرگێر

[28] وليم ويلكوكس (المصدر السابق) ص٢١

[29] أحمد سوسة (المصدر السابق) ص ١٧٠- ١٧١

[30] أحمد سوسة (المصدر السابق) ص ١٦٦

# بەشی دووەم

## بیابانشینی چییە؟

قسەمان لەسەر ململانێی بیابانشینی و شارستانیەت کرد، بەشێوەیەکی تایبەت لەعێراق و بەگشتی لە نیشتیمانی عەرەبی. لێرەدا دەبێت پرسیارێك رووبەروومان بێتەوە: بیابانشینی چییە؟ ئەی شارستانیەت چییە؟ ئێمە ناتوانین لە توێژینەوەکەمان بەردەوام بین، ئەگەر لە سروشتی هەر یەکەیان نەگەین[٣١].

زەحمەتە پێناسەیەکی تێروتەسەلی شارستانیەت بکەین، چونکە دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی گۆڕاوە، بەپێی کات و شوێن سیما و تایبەتمەندییەکانی دەگۆڕێت. کەچی بیابانشینی پێناسەکەی ئەستەم نییە، چونکە زۆربەی کات ناگۆڕێت و بەپێی گۆڕانی کات و شوێن گۆڕانکاری زۆری بەسەردا روونادات. ئەو هەر لەو دۆخەیە کە سەد ساڵ لەمەوبەر یان سەدان ساڵ لەمەوبەر هەیبووە. هەروەها لەناوچە جیاجیاکانیش هەر هاوشێوەی یەکترە. هەر ئەمەش وا لە توێنبی مێژوونووس کردووە بیابانشینی بە (شەرستانیەتی چەقبەستوو) وەسف بکات[٣٢].

بەهەرحاڵ کاتێك لەچەمکی بیابانشینی تێدەگەین، ئەوا دەتوانین بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ شتێك لەبارەی شارستانیەتەوە تێبگەین. شارستانیەت لەزۆرێك لەخەسڵەتەکانی پێچەوانەی بیابانشینە، بۆیە دەکرێت کەم یان زۆر بەهۆی بەراوردکردنی بە بیابانشینی خەسڵەتەکانی روون بێتەوە.

**روونکردنەوەیەك لەبارەی زاراوەکە:**

---

[٣١] وەك دەزانرێت پێشتر وشەی (البداوه) لە زمانی کوردی بە (کۆچەری) تەرجەمە کراوە. پێموایە ئەگەر ئەم وشە کوردییە لەهەموو شوێنێك لەبەرامبەر (البداوه) دروست بێت. ئەوا لەو کتێبەدا کارێکی هەڵە و نازانستی دەبێت لەوەرگێڕاندا، چونکە عەلی وەردی لەبەشی یەکەمی ئەو کتێبە وەك بینیمان داکۆکی لەوە دەکات (البداوه) تەنها پەیوەستە بە بیابانەوە. بۆیە ناکرێت ئەمە وشەی کۆچەری بەکاربهێنین، چونکە لەگەڵ کۆمەڵێك چەمکی دیکە تێکەڵ دەبێت. لەبەر ئەوە وشەی (بیابانشینی) مان بەکارهێناوە، بۆ کەسێکیش کە لەبیابان بژی، وشەی (بیابانشین) یان هەر وشەی (بەدو) ی عەرەبیمان بەکارهێناوەتەوە. وەرگێڕ

[٣٢] Toynbee(A Study of history)-Somervell abridgement –VOL .I, p. 164

بەر لەوەی دەست بکەین بەتاوتوێکردنی چییەتی بیابانشینی، دەبێت نارۆشنی لــە زاراوەیــەکی زانســتی دوور بخەینــەوە کــە پەیوەندییــەکی تونــدوتۆڵی بــە بابەتەکەمانــەوە هەیــە. ئــەویش زاراوەی (culture) ئــەم زاراوەیــە وایلێهــاتووە گرنگییــەکی گــەورەی لەکۆمەڵناســی وزانســتەکانی پەیوەســت بەکۆمەڵناسییەوە هەبێت. جێی داخە دەبینین نووســەرانی عــەرەب لــە وەرگێڕانــی ئــەو زاراوەیــە بــۆ زمــانی عــەرەبی جیاوازیــان هەیــە. هەنــدێکیان وشــەی (رۆشــنبیری) (الثقافة) بەکاردەهێنن، هەندێکی دیکەش وشەی (شارستانیەت) (الحضارة) بەکاردەهێنن.

من ئارەزووی ئــەوەم نییــە وشــەی (شارســتانیەت) بــەکاربهێنم. هۆکارەکــەش ئەوەیە وشەی(الحضارة) لە زمانی عــەرەبی لــەدێر زەمانــەوە بــەمانای (شارنشــینی) بەکارهاتووە. ئیبن خەلدون وسەرجەم مێژوونووس وتوێژەر وئەدیبانی عەرەب بەم مانایــە وشــەکەیان بــەکاریان هێنــاوە. ئــەوان وا راهــاتوون خــەڵك بــۆ دوو توێــژی پێچەوانەی یەکتر پۆلین بکەن ئەوانیش : بیابانشین و شارنشینە، بۆیــە مــن حــەز دەکەم مانای کۆنی ئەو وشەیە بپارێزم. لەلای من شارنیشنە. لــە بەشــەکانی ئــەم کتێبەشدا هەروا بەکارهاتووە.

ســەبارەت بــە وشــەی (رۆشــنبیری) کــە ئێســتا زۆرێــك لەنووســەرانی میســر وشوێنەکانی دیکە بەکاری دەهێنن لەبری (culture) من دەمــەوێ لەگــەڵیان بڕۆم، بــەڵام هــەرحاڵ ئــەم وشــەیەش بــێ کــەموکوڕی نییــە. ئــەو وشــەیە لەبــەکارهێنانی گشتیدا بەمانای مەعریفە و یان رێکبوون و پێگەیشتنی زانستی دێت. ئەگــەرهاتوو خــەڵك کەســێکیان بەرۆشــنبیر وەســف کــرد ئــەوا مانــای ئەوەیــە رێکوپێکــە یــان بەشێوەیەکی قوڵ وپێگەیشتوو ئاگاداری مەعریفەی نوێیە.

ئەو بەکارهێنانە باوەی رۆشنبیری، کاتێك بــەمانا زانستیەکەی بــەکاردێت، ئــەوا تێکەڵی ونارۆشنی لەلای خوێنەر دروست دەکات. بۆئەوەی ئەم نارۆشنییە دروست نەبێت من هەوڵ دەدەم (رۆشنبیری کۆمەڵایەتی) بۆ واتــای (Culture) بــەکاربهێنم.

بەمەش دەتوانرێت جیاکاری بۆ مانا زانستیەکە ومانا باوەکەی ئەو زاراوە گرنگە بکرێت [٣٣].

رۆشنبیری کۆمەڵایەتی چییە؟

رۆشنبیری کۆمەلایەتی بۆ نەتەوەیەك وەك کەسێتییە بۆ تاکێك. چۆن هەر تاکێك کەسێتی تایبەت بەخۆی هەیە. بەو کەسێتیە لەتاکەکانی دیکە جیادەکرێتەوە. بەهەمان شێوە هەر نەتەوەیەك لەنەتەوەکان رۆشنبیریەکی کۆمەڵایەتی تایبەتی دیارکراوی هەیە ولە رۆشنبیری نەتەوەیەکی دیکە ناچێت.

دەکرێت وا پێناسەی رۆشنبیری کۆمەڵایەتی بکرێت، کە کۆمەڵێك نەریت ورێسا و بیرکردنەوەیە کە لە لای هەر نەتەوەیەك هەیە. ئەمەش هەموو لایەنەکانی ژیان دەگرێتەوە لەلایەنی ئایینی، ئاکاری، یاسایی، هونەریی، پیشەسازی، زمانەوانی، ئەفسانەیی...هتد. [٣٤] دەبێت ئەوە بزانین رۆشنبیری کۆمەڵایەتی کۆمەڵەیەکی سادە نییە لەچەند بەشێکی جیاجیا پێکهاتبێ، بەڵکو هەمووەکی یەکانگیر وپەیوەستە بەیەکترەوە، بەشێوەیەك یەکەکانی نێوانیان بەهێزەوە کار لەیەکتر دەکەن، بەمەش دەبێتە خاوەن سروشتێکی نوێ کە پێشتر وەها نەبووە کە بەتەنیا بووە.

خاتوو روس بندیکت لەم بارەیەوە بۆچوونێکی گرنگی هەیە. ئەم رۆشنبیری کۆمەڵایەتی بە پێکهاتەیەکی کیمیایی دەشوبهێنێ. لەمەش نموونەی بارود دەهێنێتەوە. بارود ئاوێتەیەکی کیمیاییە لە کبریت وخەڵوز و نتراتی پۆتاسیۆم پێکهاتووە. هیچ یەکێك لەو ماددانە توانای تەقینەوەی نییە، بەڵام کاتێك کارلێك دەکەن. ئەوا پێکهاتەی بارود دەردەچێ و کە توانایەکی زۆر بۆ تەقینەوە هەیە [٣٥].
لەنموونەی ئەمە رۆشنبیری کۆمەڵایەتی پێك دێت. ئەو ئاوێتەیەك لەخودی خۆی

---

[٣٣] لەوانەیە وشەی (رۆشنبیری ) لەهەندێك شوێن بەکارهێنابێ. ئەمە تەنها لەپێناو کورتکردنەوە بووە. تکام لەخوێنەر ئەوەیە بەمانا زانستیەکەی تێی بگات لەهەر شوێنێکی ئەم کتێبە. عەلی وەردی

[٣٤] Sutherland & Woodward (Introductory Sociology)p. 19

[٣٥] Ruth benedict (Patters of culture)p.42-43

دا. کۆمەڵێکی سادە نییە لە بەشی جیاجیا. ئەو خاوەن کۆمەڵێك تایبەتمەندییە کە لە تایبەتمەندی هەر بەشێکی پێکهاتەکانی جیاوازە[٣٦].

ئەم راستییە زانستییە زۆر گرنگە. لە توێژینەوەمان بۆ بیاباننشینی زۆر سوودبەخش دەبێت. بۆ نموونە دەزانرێت بیاباننشینی زۆر رێز لەسیفەتی بەخشندەیی دەگرێت، بەڵام کاتێك تاوتوێی سروشتی بەخشندەیی دەکەین لە بیاباننشینی ئەوا دەبینین لەسروشتی ئەو بەخشندەییە ناچێت کە لەشارستانیەت و ژیانی سەرەتایی هەیە، بەڵکو شتێکی دیکەیە، چونکە سروشتی بیاباننشینی هەڵگرتووە و رەنگی ئەوێی وەرگرتووە. دەکرێت ئەمە لەبارەی هەموو سیفەتەکانی دیکەی بیاباننشینی بگوترێت. ئێمە هاوشێوەی هەر یەکەیان لە رۆشنبیرییەکانی دیکە دەدۆزینەوە، بەڵام لێکچوونەکە تەنها لەناو وشێوەی دەرەوەیە، کەچی لەناوەڕۆکدا سیفەتە بیاباننشینەکە جیاوازە لە هاوشێوەکە (لەناودا) لەهەر رۆشنبیرییەکی دیکە.

لەوانەیە ئەمە وایکردبێت کە هەندێك لەگەشتیار ورۆژهەڵاتناس لەکاتی توێژینەوەی بیاباننشینی بکەونە هەڵەی گەورەوە. ئەوان بەچاویلکەی رۆشنبیرە بیانیەکەی خۆیان سەیری دەکەن، ئەمەش وا دەکات ناواقیعیانە تێی بگەن، بەڵام ئەگەرهاتوو لەچوارچێوەی رۆشنبیری تایبەتی خۆیان سەیریان بکردایە، ئەوا درکیان بەدەکرد کەوتونەتە چ هەڵەیەکەوە.

**خەسڵەتی رۆشنبیری بیاباننشینی:**

هەر رۆشنبیرییەکی کۆمەڵایەتی خەسڵەتێکی گشتی هەیە، لە رۆشنبیرییەکانی دیکە پێی جیادەکرێتەوە. ئەمەش لەلایەن زانایانی کۆمەڵناسی وئەنترۆپۆلۆگیا بە (pattern of culture) دەناسرێت. لێرە پێویستە پرسیار بکەین: ئایا خەسڵەتی گشتی رۆشنبیری بیاباننشینی چییە؟.

[٣٦] جارێك هەوڵم دا زاراوەی (پێکهاتەی کۆمەڵایەتی) لەبری ( رۆشنبیری کۆمەڵایەتی) بەکاربهێنم. لەبەر ئەوەی کاریگەر بووم بەتیۆرەکەی رۆس بندیکت، بەڵام دواجار ناچاربووم وازی لێبهێنم و زاراوەی (رۆشنبیری کۆمەڵایەتی) بەچاکتر بزانم. عەلی وەردی

ئەوەی جێگای داخە، تێبینی ئەوە دەکەین تا ئێستا رۆشنبیری بیابانشینی، لەژێر رۆشنایی توێژینەوەی کۆمەڵناسی نوێ، توێژینەوەی لەبارەوە نەکراوە. زۆرینەی توێژەرانیش بریتی بوون لەگەشتیار ورۆژهەڵاتناسان وەک پێشتر ئاماژەمان بۆکرد. هەرچەندە ئەوان لەو بارەیەوە توێژینەوەی زۆر و زەوەند و بەسوودیان پێشکەش کردووین، کەچی ئەو توێژینەوانە بەمانای تەواوی وشەکە زانستی نین. ئەوان کۆششیان کردووە بۆ ئەوەی بەشەکانی رۆشنبیری (بەدو و بیابانشینی) باس بکەن، بێئەوەی لێی قوڵ ببنەوە، تا لەخەسڵەتە گشتی وشاراوەکەی بگەن.

یەکێك لەرۆژهەڵاتناسان کە ئەویش براونە دەڵێ" چاکخوازییە سەرەکییەکان (فەزیلەت) لە بیابانشینی بریتیە لە ئازایەتی وبەخشندەیی ومیوانداری ودڵسۆز بۆ هۆز وتۆڵەکردنەوە"[٣٧]. مۆریش هەوڵی داوە ئەو فەزیلەتانە لەدووان چڕ بکاتەوە ئەوانیش)شەرەف و تۆڵەکردنەوەیە) [٣٨]. کەچی گۆلدزی هێر تەنها لەیەك فەزیلەت کورتیان دەکاتەوە ئەویش مروەتە (المروءة) ئەمەش چەندین جۆر لەخۆیەوە دەگرێت وەك: ئازایەتی کەسی، شەهامەتێکی بێسنوور، بەخشدەیی ئاشکرا دەستبلاوی، دڵسۆزی تەواو بۆ هۆز، دڵرەقی لەتۆڵەکردنەوە، تۆڵەکردنەوە لەو کەسەی کە بەگوفتار یان رەفتار هێرش دەکاتە سەر خۆی یان کەسێکی نزیکی یان هۆزەکەی[٣٩].

**مەیلم بەلای گریمانەیەکە :**

لەخوێنەرانی ناشارمەوە، هەر لەسەرەتای توێژینەوەی بیابانشینی هەوڵم داوە، لەو کێشەیەدا بەبڕیاری یەکلاکەرەوە بگەم، کەچی سەرکەوتوو نەبووم. من دڵنیام چارەسەرکردنی زۆر پێویستە بۆ تێگەیشتن لە سروشتی کۆمەڵگای عەرەبی وعێراقی. کۆششم کرد لەتوێژینەوە بۆئەوەی لەو پێناوەدا بە گریمانەیەکی تێروتەسەل بگەم. لە بووچوونێکەوە چوومە سەر بۆچوونێکی دیکە. جار لەدوای جار، ناشزانم لە کۆتایی دا بەکوێ دەگەم.

---

[٣٧] Browne (A Literary History of Persia ) VOL. I, P 190

[٣٨] Ibid,vol p. 193

[٣٩] أحمد أمين (فجر الاسلام) ص ٧٦-٧٧

لەوبارەیەوە مەیلم بەلای گریمانەیەکە. لەوانەشە دوای کۆتایی چاپکردنی ئەو کتێبە بۆچوونەکەم بگۆرِم. بەهەرحاڵ من پێموایە کرۆکی رۆشنبیری بیابانشینی یان خەسڵەتە گشتیەکەی، دەکرێت لەیەك وشەدا کورت بکرێتەوە ئەویش (خۆزاڵکردنە).

بۆ ئەوەی لەم بابەتە بگەین دەبێت بڵێین هەر رۆشنبیرییەکی کۆمەڵایەتی چەند پێکهاتەیەك، یان چەند تەوەرێکی بەشەکی، لەخۆیەوە دەگرێت. ئەمەش لەلایەن زانایانی کۆمەڵناسی بە (Cultural Complexes). هەر پێکهاتەیەکیش لەمانە لەچەند خەسڵەتێکی جۆراوجۆر پێکدێت کە بە (Culture traits) ناودەبرێت.

بەبروای من پێکهاتەکانی رۆشنبیری بیابانشینی سیانن: ١- دەمارگیری ٢- داگیرکردن(الغزو) ٣- مروەت. جا تێبینی ئەوە دەکرێت خەسڵەتی زاڵبوون لەهەر سێ پێکهاتەکە هەیە. تاکی (بەدو) یەکەمجار دەیەوێ بەهێزی هۆزەکەی زاڵ بێت. دووەمیش بەهێزی کەسێتیەکەی، سێیەم و دواجاریش بەهۆی مروەتەکەی لەکەسانی دیکەوە بالاتر بێت.

ئەو سەرەتا دەیەوێ سەر بەهۆزێك بێت، تا پارێزگاری لێ بکات، بۆیە دەمارگیر دەبێت بۆی ولەپێناوی پەنادەباتە بەر تۆڵەکردنەوە، چونکە درك بەوە دەکات ناتوانێت بێ هۆز لە بیابان بژیت کە بەتەواوی لەدەسەڵاتی حکومی خاڵییە. دووەم جاریش دەیەوێ پێگەیەکی بەرزی لەناو هۆزەکەی خۆی هەبێت وکەسوکاری شانازی پێوە بکەن، بۆیە پێویست دەکات ئازا وبەهێز بێت وفریادرەس وجوامێر بێت. جا کاتێك هۆزەکەی ناوچەیەك داگیر بکات، یان رووبەرووی داگیرکەر بێتەوە، ئەوا دەبێت لەکاتی جەنگەکە لەسەرووی کەسانی دیکەوە بێت. ژیان لەبیابان کەسی لاواز وترسنۆکی ناوێ، کە لەجەنگدا لەدواوەی هۆزەکەی بێت. ئەگەر کەسەکە وابێت ئەوا ملکەچ و بێزراو دەبێت و پەنا وپێگەی لەبیابان نابێت.

پیاوی بەدو دواجار پێویستی بەوە هەیە مروەتێکی زۆری هەبێت. تەنها ئازایی وفریادرەسی و جوامێری(شەهامەت) لەجەنگدا نابێتەهۆی بەدەستهێنانی پێگەیەکی بەرز، بەڵکو دەبێت بۆ خەڵك بسەلمێنێ بەهێز وخۆسەپێنەرە لەجەنگ وئاشتیدا. لەئاشتیدا دەبێت پاریزگاری وبەهانای هەرکەسێکەوە بێت کە پەنای بۆ

دەبات، جا ئەو کەسە میوان یان کەمدەرامەت یا دراوسێ بێت، یان هاوڕێ و کەسێك بێت خۆی دەخیلی ئەو کردبێت. بۆیە هەر سوکایەتیەك رووبەرووی ئەو کەسە پانەبەرە بێتەوە ئەوا بە سوکایەتی خۆی دەزانێ.

پاڵەوانێتی پیاوی بەدو لەجەنگدا بە ژمارەی دەستکەوت وغەنیمەکانی پێوانە دەکرێت، بەڵام تەنها ئەو پێوەرەش بەتەنیا بەس نییە، بەڵکو دەبێت جگە لە تاڵانکەر، بەخشندەش بێت. بۆیە لەدێرزەمانەوە وەها وەسفی پیاوی (بەدو کراوە کە" تاڵانکەر و بەخشندەیە" ( بەعەرەبیەکەی: نهاب و وهاب) بۆیە قرچۆکی لەلایەنی کەسی بەدو نیشانەی ترس ولاوازییە. کەسی ئازا وبەهێز قرچۆك نییە، ئەوەی هەیبێت لە میوان وئەو کەسانەی خەرج دەکات کەخۆیان دەخیلی کردووە. لەوەش دڵنیایە بەئازاییەتی خۆی غەنیمە ودەستکەوتی دیکەی دەبێت. ئەو وتەشی لەسەر زار دەبێت" ئەوەی دەستت خەرج بکە، بەیانی دێتەوە رێگات".

**چەند ئاماژەیەك لەشیعری جاهلییەوە:**

لەراستیدا شیعری جاهیلی وەك گەنجینەیەکی پڕ بەهای زانستیە وایە، دەتوانین بۆ توێژینەوە لەخەسڵەتی رۆشنبیری بیابانشینی سوودی لێ وەربگرین. ئێمە لێرەدا بایەخ بەوە نادەین کەدکتۆر تەها حوسێن و ئەوانی دیکە چیان لەبارەی شیعری جاهلی وتووە، ئەو وتبووی ئەو شیعرانەی گەیشتۆتە دەستمان زۆربەیان( ئینتحال کراون) (واتە خاوەنی راستەقینەیان دیار نییە ودراونەتە پاڵ کەسانی دیکە)[40]، ئەگەر ئەو ئینتحالکردنەش راست بێت ئەوا لەرووی کۆمەڵایەتیەوە هەر سوودی بۆ ئێمە دەبێت، چونکە ئەو کەسانەی ریوایەتیان کردووە و ئینتحالیان کردووە نەیانتوانیوە لە چوارچێوەی بەها کۆمەڵایەتیەکانی بیابانشینی دەربچن. کەسەکە ناچاربووە شیعرێکی هاوشێوەی شیعرەکانی جاهیلی بهێنێ بۆ ئەوەی لەناو خەڵك برەوی پێ بدات وخەڵك باوەڕی پێ بکەن.

[40] (في الادب الجاهلي) یەکێکە لەکتێبە بەناوبانگەکانی بیرمەندی گەورەی عەرەب تەها حوسێن، ئەو لەسەر ئەم کتێبە رووبەرووی چەندین گرفت بووەیەوە. یەکێك لەبووچوونەکانی ئەوەیە ئەو شاعیرانەی بەناوی ئەوانەی شیعری جاهیلی بڵاوکراوتەوە، کەسانی راستەقینە نین. ئەمەشی بە (انتحال) وەسف کردووە – وەرگێڕ

هەرچۆنێك بێت ئێمە کاتێك تاوتوێی شیعری جاهیلی دەکەین، تێبینی زۆرێك لەسیماکانی رۆشنبیری بیاباننشینی دەکەین. بۆ نموونە لێرەدا بەشێك لەقەسیدەکەی عەمرو بن کەلسوم وەردەگرین، لەقەسیدەکی شانازی بە هۆزەکەی دەکات. ئەو قەسیدەیە پڕیەتی لە نەفەسی خۆزاڵکردن. ئێمە چەند دێرێکی دەگوازینەوە:

"نُطاعنُ ما تراخى النّاسُ عنّا — ونضربُ بالسّيوفِ إذا غُشينا
ورِثْنا المجدَ قد علمتْ معدٌّ — نُطاعنُ دونهُ حتّى يَبينا
نَجُذُّ رؤوسَهم في غيرِ بِرٍّ — فما يدرونَ ماذا يتّقونا
بشُبّانٍ يرونَ القتلَ مجداً — وشيبٍ في الحروبِ مُجرّبينا
ألا لا يعلمُ الأقوامُ أنّا — تضعضعْنا وأنّا قد ونينا
ألا لا يجهلنْ أحدٌ علينا — فنجهلَ فوقَ جهلِ الجاهلينا
ونُوجدُ نحنُ أمنعَهم ذِماراً — وأوفاهم إذا عقدوا يمينا
وأنّا المانعونَ لما أردْنا — وأنّا النّازلونَ بحيثُ شِينا
وأنّا التّاركونَ إذا سخطْنا — وأنّا الآخذونَ إذا رضينا
وأنّا العاصمونَ إذا أُطعْنا — وأنّا العازمونَ إذا عُصينا
ونشربُ إنْ وردْنا الماءَ صفْواً — ويشربُ غيرُنا كدراً وطينا
إذا ما الملْكُ سامَ النّاسَ خسْفاً — أبينا أنْ نُقرَّ الذّلَّ فينا
ملأنا البرَّ حتّى ضاقَ عنّا — وماءَ البحرِ نملؤهُ سفينا
إذا بلغَ الفطامَ لنا صبيٌّ — تخرُّ لهُ الجبابرُ ساجدينا"[41]

" هەموو ئەو دێرانەی سەرەوە و دێرەکانی دیکەی قەسیدەکەی ئیبن کەلسوم بریتیە لە شانازیکردن بە هۆزەکەی و پیاهەڵگوتن بە قارەمانێتی هۆزەکەی و چۆنیەتی وەڵامدانەوەی دوژمنانی هۆز– وەرگێر".

خوێنەر واهەست نەکات ئەم قەسیدەیە لەشیعری جاهیلدا ریزپەڕە. لەراستیدا هەرچەندە لەتوێژینەوەی شیعری جاهیلی قووڵ بینەوە ئەوا لەناوەرۆکە کۆمەڵایەتیەکە چەندین دێری هاوشێوەی قەسیدەکەی ئبن کەلسوم دەدۆزینەوە. هەموو دێرەکانی ئامازەیەکە بۆ رەوتێکی توندی زاڵبوو بەسەر دەروونی پیاوی بەدو، کەهەردەم بۆ هێز وخۆزاڵکردن وشانازیکردن هانی دەدات. ئەو شانازی بەهۆزەکەی دەکات لەبەرئەوەی بەسەر هۆزەکانی دیکە زاڵبووە. ئەو شانازی بەخۆی دەکات چونکە پایەی لەهاورێیاکانی زیاترە لە ئازایەتی و زۆری

[41] الحسين بن أحمد الزوزني (شرح المعلقات السبع) ص ١٤٧- ١٦١

دەستکەوت. دواجار ئەو شانازی بەخۆی دەکات چونکە مروەتی لەگەڵیان هەیە و کەس لەوچاکتر نییە.

**کەسێتی بەدو:**

بەشێوەیەکی گشتی، کەسێتی دروستکراوی رۆشنبیری کۆمەڵایەتییە. بەڵکو لەزۆربەی حاڵەتەکە وێنەیەکی بچووکراوەی رۆشنبیری کۆمەڵایەتییە. تاك تازە چاوی بەژیانەوە هەڵێناوە، دەبینی رۆشنبیری کۆمەڵایەتی دەوری داوە وبەسەریدا زاڵ بووە بە بەها وپێکهاتە وخەسڵەتە گشتییەکانیەوە. کەواتە ئەو تاکە کەسێتیەکەی لەسنووری ئەو قاڵبە دروست دەبێت کە رۆشنبیرە کۆمەڵایەتیەکە بۆی دروستکردووە. ئەو دەبینی کەسانی دەوروبەری بەپێی بەهاکانی رۆشنبیرییەکە شانازی دەکەن وجنێو دەدەن. بۆیە ئەو هەست بە ئارەزوویەکی زۆر دەکات، بۆ بەدەستهێنانی بەهای شانازی کردن بەخۆی و دوورکەوتنەوە لە بەهای ناحەزبوون.

نکۆڵی لەوەناکەین تاکەکان لەپلەی نواندنی رۆشنبیری کۆمەڵایەتی لەیەکتر جیاوازن. هەندێکیان زۆر سەرکەوتوون، هەندێکیش سەرناکەون. هەندێکی دیکە لەنێوان ئەم وئەویان دایە، بەڵام هەرهەموویان حەز دەکەن ئەو شانازییە بەدەست بهێنن کە رۆشنبیرە کۆمەڵایەتیەکە دیاریکردووە ولەنەنگی دووربکەونەوە. وەك سیمنەر ئاماژەی بۆ دەکات" ئەم رۆشنبیرییە بریتیە لە نیگەرانییەکە بەرەو گونجاندن و رێکەوتن"[٤٢]

بۆیە کاتێك توێژینەوەی لەبارەی بەدوەکانی بیابان دەکەین، ئەو نیگەرانییە بەرەو گونجاندن لەگەڵ رۆشنبیرییەکە بە رۆشنی دەبینین. هەندێکیان گەیشتۆتەی ئەوپەڕی مەبەست وەك (حاتەمی تای) و( عەنتەرەی عەبسی) هەندێکی دیکەش بە ئاستی جیاجیا بەو ئامانجەکانیان گەیشتوون. کەچی فاشیلەکە بێگومان چارەنووسی قێزەون دەبێت، دواتر تووشی دەردەسەری دەبێت، جا زوو یان درەنگ.

[٤٢] Sutherland & Woodword (op.cit) p, 35

مەیلی خۆزالکردن، کە وەك خەسلەتێکی گشتی رۆشنبیری بیابانشین گریمانەمان کرد، زۆر یان کەم کاریگەری روونە لەسەر هەموو پیاوێکی بیابان. وەك بینیمان پیاوی بەدو لەدڵەوە دەیەوێ لەهەموو بوارەکانی ژیان سەرکەوتوو بێت، نەوەك ژێرکەوتوو. ئەو دەیەوێ بەهێزی خۆی، بەهێزی هۆزەکەی، بە مروەتی خۆی زاڵ بێت.

خەریکە بڕوام پەکلایی بێتەوە لەوەی مروەتی کەسی بەدو، شتێك نییە تەنها رووخسارێکی خۆزالکردنە. لەبەر ئەوەشە بۆ کەسێکی بەدو ئەستەمە شایەنی بەزەیی وچاودێریی بێت و لەلایەن کەسێکەوە چاکەی لەگەڵ بکرێت. ئەمە لەتێروانینی ئەو مانای لاواز و دەستەمۆبوونە. بەپێچەوانەشەوە دەبینین، شانازی بەوە دەکات کەسێك بێت داوای چاکەیەکی لێ بکات و داوای داڵدەدانی بکا. ئەمەش بە نیشانەی سەرفرازی و بەتوانایی خۆی دەزانێ.

پوختەی قسەکانمان لەوبارەیەوە ئەوەیە، مەیلی خۆزالکردن بەسەر کەسێتی بەدو زاڵ بووە. هەر بەپێی ئەمەش سەیری بابەتەکان دەکات. ئەو دەیەوێ تالانکەر بێت نەوەك تالانکراو، هێرشبەر بێت نەوەك هێرشی بکرێتەسەر، بەخشندە بێت نەوەك قرچۆك. داواکەر بێت نەوەك داواکراو، فریادرەس بێت نەوەك هانابەر، توانادار بێت نەوەك تاوانەی کەسێکی دیکەی بەسەرەوە بێت. پارێزەر بێت نەوەك پارێزراو، بەرپرس بێت نەوەك بەرپرسیارێتی لەسەر بێت، تکای لێبکرێت نەوەك تکاکار، سوپاسگوزاری بۆ بکرێت نەوەك خۆی سوپاسگوزاربێت... هتد.

کلیکی کەسێتی بەدو لەوانەی سەرەوە دەردەکەوێت و دروشمەکەشی ئەوەیە" دەستی باڵا چاکترە لەدەستی نزم".

## تێبینییەکی گرنگ:

لێرەدا پێویستە لەسەرمان تێبینیەك دەربخەین، کە خاڵی نییە لەگرنگی. ئەو تێبینیەم لە قەسیدەیەکی فەرزدەق دۆزیوەتەوە کەتێیدا ستایشی ئیمام عەلی کوڕی حوسێن دەکات و دەڵێ:

مــا قــال لا قــط إلا في تشهده                    لــولا التــشهد كــانت لاؤه نــعم

( واتە: هەرگیز نەیگوتووە (لا: نەخێر) تەنها لە گوزارشتی شەهادە نەبێت کە دەڵێ" أشهد أن لا إله إلا الله" ئەگینا هەموو (لا) یەکی عەلی کوڕی حوسێن بریتیە لە (نعم: بەڵێ) :- وەرگێڕ).

لەراستیدا کە بۆ یەکەمجار گوێبیستی ئەو دێڕە بووم، ئەوا تێگەیشتنی بەلامەوە ئەستەم بوو. نەمتوانی لەوە بگەم کەچۆن دەکرێت پیاوێك، هەرچەندە سامان و دەسەڵاتی هەبێت، داوای هەموو خەڵك جێبەجێ بکات. بۆ هەموو داوایەك بڵێ (بەڵی). بەڵام کاتێك توێژینەوەی لەبارەی بیابانشینی کرد، درك بەوە کرد ئەو کارە بەجۆرێك لەجۆرەکان دەکرێت.

پێشتر لەو دێڕەی فەرەزدەق نەدەگەیشتم، چونکە من بەتێڕوانینی ئەو کۆمەڵگایە سەیرم دەکرد، کە تێیدا پەروەردە بووم. گریمانەی بوونی پیاوێکی زێدەڕۆ لەبەخشدەیی کرد لەکۆمەڵگای خۆمان وەك ئەوەی فەرەزدەق وەسفی کردووە، جا خەیاڵی ئەو قەرەباڵغیەم کرد، کە لەبەر دەرگاکەی دروست دەبێت. ئەوا لەهەموو لەیەکەوە داواکاری پێشکەش دەکرێت و بەهەڵپەوە بەدەوری کۆدەبنەوە. هەر یەکێك لەوان داوایەکی تایبەتی دەبێت و بەهەموو هۆکارێك تکای لێ دەکات. بەمشێوەیە پیاوەکە ناچار دەبێت لەبەریان رابکات یان دەرگایان بەروو دابخات. ئەوان زۆرن، هەرچەندیش داوای هەندێکیان جێبەجێ بکرێت ئەوا داواکاران ژمارەیان زۆرتر دەبن.

ئەم بابەتە زۆر لەکۆمەڵگای ئێمە وئەو کۆمەڵگایانە روودەدات، کە تازە کەم یان زۆر شارستانیەتیان پێگەیشتووە. زۆرجار بینیومانە کەسێك لەشارەکانی عێراق بە مەروەت وبەخشندەیی دەناسرێت، بەڵام ئەمە لەبیابان دەگمەنە یان بەتەواوی نییە.

کەسی بەدو ئەوەندەی بەمروەت و بەخشندەیە ئەوا هێندەش بەفیز و بەشکۆ و نەفس بەرزە. ئەم دوو لایەنە لەکەسێتی بەدو هاوسەنگە، بەشێوەیەك دەکرێت کەسێك بە زێدەڕۆیی بەخشندەیی بەناوبانگ بێت، بێئەوەی خەڵك ئاپورە لەبەردەرگای دروست بکات و هەڵپەیان بێت.

دیوەخانی کەسی بەدو هەردەم کراوەیە، خواردن بۆ هەر میوان و ڕێبوارێك پێشکەش دەکرێت، بەخێرهاتنی گەرم و ڕووی خۆش لەمیوان دەنرێت. بیانییەکان بەمە سەرسام دەبن. ئەگەر ئەمە لەوڵاتی ئەوان بووایە ئەوا پڕ دەبوو لەهەژار و نەدار تەواوی ژیانیان لەوێ نەدەڕۆیشتن. کەچی لەبیابان کەسێك ناچێتە میوانخانە ودیوەخانەوە تەنها لەکاتی زۆر پێویست نەبێت. وەك ئەوەی لەسەفەرێکی دوور دابێت و شەوی بەسەرداهاتبێ و ئەویش لە یەکێك لە هۆزەکان نزیك بێت. ئەوا دەچێتە دیوەخانی شێخ و لەوێ دەحەوێتەوە، یانیش بە خواستی خۆی بۆ ماڵێك دەچێت. بەڵام ئەو ڕەتی دەکاتەوە، زیاد لەپێویست لەماڵ یان دیوەخانێك بمێنێتەوە.

لەیەکێك لەو چیرۆکانەی لەبارەی حاتەمی تای هاتووە، دەگوترێت حاتەم لە بیابان تووشی پیاوێك بوو برسیەتی هەرەسانی کردبوو. پیاوەکە حاتەمی نەدەناسی. حاتەم بەپیاوەکەی گوت" بۆچی ناچیتە لای حاتەم، خۆراك وشوێنی حەوانەوەت دەستدەکەوێ؟" پیاوەکە بەو جۆرە وەڵامی دەداتەوە، برسێتی پێ باشترە لەوەی منەتباری کەسێك بێت. ئەمەش لەوتەکەی شەنفەرا نزیکە کەدەڵێ:

**استف ترب الارض کیلا یری له    علي من الطول امرؤ متطول**[42]

"واتە: پێی باشترە خاك و خۆڵ قوت بدات، نەوەك منەتباری کەسێك بێت – وەرگێر".

لەنیشانەکانی فیز ونەفس بەرزی پیاوی بەدو ئەوەیە هەردەم پێداگری دەکات لەوەی دیاری و خواردن ڕەت بکاتەوە. ئەمەش بۆتە نەریتێکی پەیرەوکراو. تەنانەت زۆرێك لەو نەریتانە بۆ خەڵکی عێراق ماوەتەوە. وا باوە لەنێوانیان، ئەوەی دیاری دەبەخشێ پێداگری دەکات و ئەویتریش ڕەتی دەکاتەوە. دەمەقاڵێ و هێنان و بردنێکی سەیر دروست دەبێت– وەك دواتر دەیبینین.

ئەمە زۆر بەڕۆشنی لە دیوەخانی پیاوی بەدو تێبینی دەکرێت. خانەخوێ هەوڵ دەدات پاروو لەدوای پاروو بخاتە دەمی میوانەکەیەوە" تکایە بخۆ... توخوا لەمە بخۆ.. لەبەر خاتری من بخۆ...". میوانەکەش بێهودە دەشڵەژێ وهەوڵ دەدات.

[42] أحمد محمد الحوفي ( الحياة العربية في الشعر الجاهلي) ص ٢٣٦

جارێکیان گەشتیارێك تووشی حاڵەتێکی لەمشێوەیە دەبێت وتێوەدەگلێ ودواتر دەرشێتەوە. گەدەی گەشتیاری رۆژئاوایی لەو جۆرە خۆراکە چەورانە رانەهاتووە...

فیزی پیاوی بەدو گەیشتۆتە ئەو ئاستەی رەتی دەکاتەوە پرسیارێکی سادە لەکەسانی دیکە بکات. بۆیە لەیەکێك لەپەندەکانی بیابانشین هاتووە" پرسیار شەرمەزارییە تەنانەت ئەگەر ( رێگا لەکوێیە؟) بێت".

**دوو لایەنی هاوسەنگ:**

دەتوانین بەشێوەیەکی گشتی بڵێین: رۆشنبیری بیابانشینی دوو لایەنی پێچەوانەی یەکتری هەیە. بەڵام هەردووکیان هاوسەنگن. بینیمان پیاوی بەدو دەیەوێ تاڵان وداگیرکاری بکات. لەهەمان کاتیشدا بەخشندەیی وپارێزگاریی هەیە وبەمروەتەوە بەهانای هەرکەسێك دەچێت شتێکی بخوازێ.

لەراستیدا ناکرێت بێ هاوسەنگی ئەم دوو لایەنە، ژیانی بیابانشینی دروست بێت و بەردەوام بێت. ئەگەر گریمانەی ئەوە بکەین لایەنی یەکەم بەتەنها بەسەر رۆشنبیری بیابانشینی زاڵ بێت، ئەوا ژیان دەبێتە ئاژاوە، خەڵك وەك گورگ دەکەونە گیانی یەکترەوە بێ هیچ بەربەستێك، بێگومان ئەمەش ژیانی کۆمەڵایەتی قبوڵی ناکات. ئەگەریش گریمانە بکەین لایەنی دووەم، واتە لایەنی مروەت، بەسەر ژیانی بیابانشینەوە زاڵ بێت ئەوا ئەو ژیانە بەرەوفەنابوون دەچێت.

ژیانی کۆمەڵایەتی لەهەموو قۆناغ و بەهەموو شێوەکانیەوە دەبێت هەردوو لایەنی رکابەری و هاوکاری هاوسەنگ بێت[11]. لەمەشدا جیاوازی لەنێوان بیابانشینی وجۆرەکانی دیکەی رۆشنبیری کۆمەڵایەتی نییە، بەڵکو ئەو جیاوازییەی هەیە لەنێوان رۆشنبیرییە جیاوازەکان ئەوا لەرووی سروشتی هاوسەنگییەکە و جۆری لایەنەکانی هاوسەنگیەکەیە.

دەکرێت ژیانی کۆمەڵایەتی لەم لایەنەوە وەك تەرزووی کارەبا سەیر بکەین، دوو جەمسەری سالب (نیگەتیڤ) و موجەب (پۆزەتیڤ) بەیەکتر دەگەن، بۆ ئەوەی

[11] Ogburn & Nimkoff ( Handbook of Sociology)p. 232-233

تەزووی کارەبا دروست بێت و مەبەستەکە بێتەدی. بەمشێوەش ژیان لەبیابان ...ر شوێنێکی جیهان بەڕێوەدەچێت.

لایەنی نێگەتیف لە ژیانی بیابانئنشینی بریتیە لە دەمارگیری وحەزکردن ...داگیرکاری وتالآن و هێرشکردن. کەچی لایەنی پۆزەتیف بریتیە لە مروەت بەهەموو شێوازە جیاوازەکانیەوە. ئەگەر ئەم دوو جەمسەرە نەبوایە ئەوا تەزووی ژیان لە بیابان دەوەستا.

**وەبیرهێنانەوە:**

لەوانەیە یەکێك بپرسێت" ئایا ئەو رۆشنبیریە کۆمەلآیەتیەی توێژینەوەمان لەبارەیەوە کرد، لەسەر هەموو نەتەوە بەدوەکانی جیهان جێبەجیّ دەبێت، یاخود تەنها لەسەر بیابانئنشینی و بەدوەکانی عەرەب جێبەجیّ دەبێت؟"

ئەستەمە بتوانم بەوردی وەلآمی ئەم پرسیارە بدەمەوە، چونکە من توێژینەوەیەکی تەواوم بۆ بیابانئنشینەکانی دیکە نەکردووە. لەراستیدا بیابانئنشینی عەرەب بەتەنها دەتوانرێت توێژینەوەیەکی قولّ وفراوانی بۆ بکرێت، چونکە ئەمەیان پەیوەندییەکی پتەوی بەمێژووی ئیسلامەوە هەیە. بۆیەش سەرچاوە و توێژینەوەی لەبارەوە زۆرە. کەچی بیابانئنشینەکانی دیکە مێژوویان نارۆشنە. بەشێوەیەکی رێژەیی توێژینەوەیان لەبارەیەوە کەمترە.

هەرچۆنێك بێت من ئارەزووی ئەوە دەکەم بلّێم، هەموو رۆشنبیرییەکانی بیابانئنشین، بەشێوەیەك لەشێوەکان خەسلّەتی (خۆزالّکردن)یان بەسەر زالّە، بەلآم ناوەرۆکی ئەو خەسلّەتیان لەرووی سروشتی پێکهاتە و هاوسەنگییەکەی، لەیەکتر جیاوازە.

پێکهاتەی رۆشنبیری بیابانئنشینی دەکەێتەوە ژێر کاریگەری سروشتی جوگرافییەوە[٤٥]. بەپێی ئەمەش دروستە بگوترێت، رۆشنبیرییەکانی بیابانئنشین، بەپێی سروشتی بیابانەکە وپێگە و بری پەیوەندیان بەشارستانیەتی دەوروبەریان لەیەکتر جیاوازە.

---

[٤٥] Jamali(The new Iraq)p. 17

بۆنموونە کاتێك بەراوردێك لەنێوان ئەو بیابانە دەکەین کە بیابانشینی عەرەبی تێدا دروستبووە، لەگەڵ ئەو بیابانەی مەغۆلی تێدا دروست بووە، جیاوازیەکی زۆریان لەنێواندا هەیە، ئەو جیاوازیانەش لەو دیاردانەی خوارەوە دەردەکەوێت:

١- ئەوەی تێبینی بیابانی عەرەبی بکات، دەبینێ شوێنە جوگرافییەکەی گرنگیەکی کۆمەڵایەتی هەیە، چونکە یەکەم: دەکەوێتە نێوان سێ کیشوەرەوە، ئەوانیش ئاسیا وئەورووپا وئەفریقیایە. ئەو ڕێگایانەی پێدا تێپەڕ دەبێت کە ئەو کیشوەرانە بەیەکترەوە دەبەستنەوە. دووەم چەندین دەریا ودوو کەنداو وچەند ڕووبارێکی درێژ لەخۆیەوە دەگرێت ئەمەش وادەکات پەیوەندی دەریاوانی لەگەڵ هەموو دونیا هەبێت. کەچی شاراوە نییە بیابانی مەغۆل وەك ئەوەیە لەدونیا دابڕاو بێت.

٢- بیابانی عەرەبی دەکەوێتە ناوچەیەکی گەرمەوە. بەشێوەیەکی گشتی ساردی کەمترە لە بیابانی مەغۆل. کەچی بیابانی مەغۆل نزیکە لەناوچەی جەمسەری، ئەمەش وادەکات بەرووی هەڵکردنی بای سەهۆڵبەندانی ئەو ناوچانە کراوە بێت، بۆیە دەکرێت بگوترێت ڕەحمەتی ژیان لەوێ ئەستەمترە لە بیابانی عەرەبی.

٣- گرنگتر لەهەموو ئەمانە بیابانی عەرەبی دەکەوێتە نزیك سەرچاوەی شارستانیەتە دێرینەکان و زێدی ئایینە کتێبیەکان. پەیوەندییەکی بتەوی لەگەڵ ئەو شارستانیەت و ئایینانە هەیە. دواجاریش بینیمان بانگەوازی گەورەکەی ئاینی لەخۆیەوە دەگرێت، کە ئەویش بانگەوازی ئیسلامە. بەدوەکان لەوجیهانە دەرچوون و ئەو بانگەوازیان هەڵگرتبوو، بەمەش گۆڕانێکیان لەمێژووی جیهان ئەنجام دا، دەگمەنە هاوشێوەی بدۆزینەوە.

**بەراورد لەنێوان دوو دەرچوون:**

مێژووی شارستانیەتی جیهان دوو ڕووداوی بیابانشینی بەخۆیەوە بینیوە کە بەدوو مەزنترین ڕووداوە کۆمەڵایەتیەکان دادەنرێت، ئەوانیش دەرچوونی بەدوی عەرەبە بەرەو جیهان لە ئەنجامی بانگەوازی ئیسلامدا. دواتریش بەشەش سەدە

دەرچوونی مەغۆلـە بـەرەوجیهان لەئـەنجامی جوڵانەوەیـەکی جەنگیزخانـەوە، لەئەنجامی ئەم دوو دەرچوونەش دوو ئیمپراتۆریەتی مەزن دروست بوون.

هەندێك لەرۆژهەڵاتناسان و مێژوونووسیان هـەوڵیان داوە بـەراورد لـەنێوان ئـەم دوو دەرچوونە بکەن. لـەکۆتایی گەیشتنە ئـەوەی بڵێن هـەردووکیان لەسروشتدا هاوشێوەن، محەمەد جیاوازییەکی زۆری لەگەڵ جەنگیزخان نیـە. ئەمـە هەڵەیـەکی گەورەیە ئێمە لەگەڵیان نین. لەراستیشدا جیاوازیەکی زۆر گەورە لـەنێوان ئـەم دوو دەرچوونە و لەنێوان ئەو دوو پیاوە هەیە کە بوار بۆ پێوانەکردنیان نییە.

کاتێـك توێژینـەوە لـەبارەی رەفتـاری بیاباننشـینی عـەرەب دەکـەین لەفەتحکردن، لەگـەڵ رەفتـار بیاباننشـنی مـەغۆلی بـەراورد دەکـەین، ئـەوا ئاستی جیاوازی نێوان لەپێکهاتـەی رۆشـنبیریيە کۆمەڵایەتیەکـە دەردەکـەوێت. خەریکـە باوەرِم وابێت کە عەرەب مروەتیـان زیاتر بـووە ودڵرەقـی و کاولکاریـان لەمـەغۆل کەمتر بووە. وەك پێشتریش ئاماژەمان بۆ کرد.

نکۆڵی لەوە ناکەین عەرەب زۆرێك لەوڵاتانی فەتحکراویان کاولکرد، تاڵانیان کرد وخەڵکیان دیلکرد و خوێنیان رشت. بەڵام ئەوەی لەو رێگایەوە ئـەنجامیان دا، زۆر لـەوە کـەمترە کـە مەغۆلـەکان ئـەنجامیان داوە. لێـرەدا بابەتەکـە رێژەییـە. بـەراوردکردنیش دەبێـت رەچـاوی کاولکـاری وخوێنرِشـتن بکـات و بـرِی هاوسـەنگبوونی مـروەت و ئاکـاری سوارچاکی بکـات. داگیرکـاری بـەمروەت، تـاڵان وکاولکـاری دەکـات، بـەڵام خـۆی لەهـەتکردنی ئـابرِوو و هێرشـکردنە سـەر بێدەسەڵاتان دەپارێزێ. ئەو کەسـە دەکـوژێ کـە شمشـێری بـەروو هەڵدەکێشـێ، بەڵام کاتێك خۆی دەداتە دەستەوە ئەوا لێی خۆش دەبێت ودەشیپارێزێ.

بـارۆن دۆسـۆنی مێـژوونووس، کـە پسـپۆرە لەمێـژووی مـەغۆل، لـە بـارودۆخ وداگیرکارییـەکانیان قـوڵ بۆتـەوە، کتێبێکـی لـەبارەی مەغۆلـەکان نووسـیوە، بەسەرچاوەیەکی گرنگ دادەنرێت. ناونیشانەکەی بریتیـە " مێژووی مـەغۆل لـە جەنگیزخانـەوە تـا تەیمورلـەنك" لـەو کتێبـەدا بـارۆن لـەبارەی مەغولەکانـەوە دەڵێ"... لەدڵرەقیدا لەتوندترین گەلانی هەمەجییان تێپەرِاندووە. لەپرێکدا هەموو ئەو کەسانەیان دەکوشت کە لەوڵاتی داگیرکراو دەکەوتە دەستیان. پیاوێك یان ژن

ومنداڵێك نەدەما. شار ولادێیان سوتاند. ماڵی ئاوادانیان کردە کەلاوەی چۆڵ.... لەوانەیە یەکێك پێیوابێت مێژوو زێدەڕۆیی لەوەسفکردنی کارەسات وبەدکاری ئەوان کردووە، بەڵام هەموو ئەو سەرچاوانەی لەچەندین وڵاتی جیاجیا لەبارەی ئەوانەوە نووسراوە. بەتەواوی لەسەر ئەوە کۆکن ئەوان لە دڵڕەقی و دوژمنکاری یەکەم بوون. لەنەریتی مەغۆلەکان بوو، دوا پاشماوەی خەڵکی ئەو وڵاتانە بدزن کە داگیریان دەکردن و بەتوندترین شێوەش ئازاری خەڵکیان دەدا. بەشێویەك ئەگەر یەکێك سەری خۆی لەشمشێری ئەوان نەجات دەدا، ئەوا نەیدەتوانی خۆی لە ستەمی ئەوان دەربازبکات. حکومەتەکەیان کاری دەکرد بۆ بڵاوکردنەوەی بەدکاریی، هەموو شتێکی لەناودەبرد کەپەیوەندی بەشەرەف وخانەدانی هەبووایە. لەهەموو شتێکی بەدکاری و بەدڕەوشتی نزیك دەبوویەوە... بۆیە مێژووی مەغۆل بە وەحشیگەری و ملهوریان بووە تۆمارێك بۆ کۆمەڵێك رووداوی ترس و توقاندن"[46]

مێژوونووسێکی دیکە هەیە هەمان ئەو قسانەی لەبارەی مەغۆلەوە کردووە، ئەو مێژوونووسەش پسپۆڕە لە مێژووی مەغۆل ناوی هارولد لامبە، خاوەنی کتێبی (جەنگیزخان)ە. لامب داگیرکارییەکانی مەغۆل بە گێژەلوکە و بومەلەرزەی جیهانی وەسف دەکات. دەڵێ "ئەوان بەعەقڵێك بەجیهان تێپەڕبوون، هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ عەقڵی ئاژەڵ نییە و گوێ بە ئازاردانی مرۆڤ نادات، کە هەموو شتێکی نوێ و بریقەداری بڵاوکردۆتەوە. ئەوان وەك منداڵ هەڵدەچوون کە لەمانای بەرپرسیارێتی ناگەن"[47]

زانای کۆمەڵناسی بەناوبانگ، گۆستاڤ لۆبۆن، هەوڵی داوە بەراوردێکی نێوان عەرەب و داگیرکارانی دیکە بکات لە سەدە کۆنەکاندا. لەکۆتایی دا دەڵێ" عەرەب دادپەروەرتر و بەخشندەتر وسوارچاکتر بوون، لەو وڵاتانەی داگیریان کردووە زیاتر لەکاولکاری هەوڵیان داوە هاوکاری گەشەکردنی شارستانیەت بکەن"[48]

---

[46] ادوارد براون( تاريخ الادب في ايران من الفردوسي الى السعدي) – ترجمة ابراهيم الشواربي –ص ٥٥٢-٥٥٣

[47] Harold lamb ( The Crusades, The flame of Islam)p, 337

[48] غوستاف لوبون ( حضارة العرب) – ترجمة عادل زعيتر –ص ٢٢-٥

ئیدوارد براونی رۆژهەلاتناس ئامازەی بە بۆچوونێکی وەها کردووە کاتێك باس لە داگیرکردنی ئێران دەکات لەلایەن هەر یەکە لەمەغۆل و عەرەبەوە و بەراوردیان دەکات بەیەکترەوە. براون دەڵێ" فەتحکردنی ئێران لەلایەن عەرەبەوە هۆکارێك بوو بۆ کاولکاری و ناخۆشی ئەو ولاتە. بەلام عەرەب بەقسەی دوژمنە ئیسپانییەکانیان " سوارچاك وپالەوان ونەرمونیان و رەفتاربەرزن". لەراستیدا زۆرێك لەکاولکارییان لەئێران ئەنجام دا. بەلام لەگەڵ خۆشیان چاکە وسوودیان هێنا. ئەمەش بەپێچەوانەوەی کارەکانی مەغۆل بوو کە لەئێران و چەندین ولاتی دیکە ئەنجامیان دابوو. مەغۆل بەمردن سزای هەرکەسێکیان دەدا کە رووبەروویان دەبێتەوە، کەچی ئەو کەسانەی ملکەچیان دەبوون هەر سزاکەیان مردن بوو.. دڵرەقی مەغۆل بەئەنقسەت بوو بۆ ئەوەی ترس بخاتە دڵی دوژمنانی بۆ ئەوەی دەستەوەستان بن لەترسان و نەتوانن بەرگری و داکۆکی لەخۆیان بکەن. پێیانوابوو بۆ سەلامەتی سوپا سەرکەوتووەکەیان واباشترە تەنها کاولکاری و تەنووری پڕ لەجەستەی سووتاو بەجێبهێڵن. ئەوان لەوە دەترسان یەکێك لەدوای جەنگەوە لەژیان بمێنێ و دواتر ئاژاوە و نیگەرانیان بۆ دروست بکات"[49].

**شرۆڤەکردن و رەخنە:**

لەشرۆڤەکردنی جیاوازی گەورەی نێوان رەفتاری عەرەب لە فەتحکردن و رەفتاری مەغۆل لەداگیرکردن، دوو بۆچوونی باو هەیە، ئەوانیش شرۆڤەکردنی نەتەوەیی وشەرۆڤەکردنی ئایینین.

شرۆڤەکردنی نەتەوەیی ئەو جیاوازییە دەداتەپاڵ ئەوەی گوایە عەرەب بە سروشتی خۆیان خاوەن چاکە وفەزیلەتن. دەکرێت بەرێز مەحمود شوکری ئالوسی بەیەکێك هاوڕایانی ئەو رێبازەی شرۆڤەکردن دابنێین. بەبڕوای ئەو جیاوازی نێوان نەتەوەکان لەرووی خەسڵەت وئاکارەوە، بۆ عەقڵیان دەگەڕێتەوە لەجیاوازییە سروشتییەکەیدا. ئەو دەڵێ" لەبەر ئەوەی عەرەب تەواوترین عەقڵ وهۆشیان

---

[49] ادوارد براون (المصدر السابق) ص ٥٥٢- ٥٥٤

هەیە.پاراوترین زمانیان هەیە، زۆرترین تێگەیشتنیان هەیە ئەوانە فەزیلەتیان بۆ دەهێنێ. کاری چاکیان بۆ دەمێنێتەوە"[50].

پێویستمان بەوە نییە بڵێین، ئەو جۆرە شرۆڤەکردنە، زەمانی خۆی بەسەرچووە، چونکە لەسەر جۆرێك لە ( لەخۆبایی نەتەوەیی) دانراوە، کۆمەڵناسی نوێ قبوڵی ناکات. ئێستا روون بۆتەوە عەقڵی نەتەوەکان وخەسڵەت و ئاکاریان لەرووی سروشتە بنەڕەتییەکەوە هیچ جیاوازیان نییە. بەڵکو بەپێی بارودۆخی مێژوویی وکۆمەلایەتی جۆراوجۆر دەگۆڕێن.

ئەوەی جێگای سەرنج بێت، نووسەرێکی تورك دەیەوێ مەغۆل مەزن بکات لەسەر بنەمای "لەخۆبایی نەتەوەیی" وەك ئەوەی ئالوسی بۆ مەزنکردنی عەرەب کردویەتی، ئەو نووسەرە تورکە دەڵێ" مەغۆلی کۆن خاوەن عەقڵی بەرز بوون"[51].

کەچی شرۆڤەی دووەم لەبارەی جیاوازی رەفتاری عەرەب و مەغۆل لەداگیرکردندا، ئەوەیە کە بە شرۆڤەکردنی ئاینی ناومان برد. لایەنگرانی ئەو شرۆڤەکردنە دەڵێن ئاینی ئیسلامی کە لەلایەن عەرەبەوە لەکاتی فەتحکردندا بانگەوازی بۆ دەکرا. هەر ئەم ئاینە وایکردووە کەمتر دڵڕەق بن ومروەتیان زیاتر بێت لەمەغۆل. بەبروای من ئەم بۆچوونە ماقوڵە. لەکتێبەکەشم بەناوی (گاڵتەجاری عەقڵی مرۆڤ) کە لەساڵی ١٩٥٥ بلاوکراوەتەوە، ئاماژەم پێکردووە. لەراستیدا محەمەد گیانێکی تەژی لەبنەماکانی دادپەروەر ویەکسانی بە یاران ونەهلی بەیت داوە. ئەمانەش لەگەڵ سوپای فەتحکاری ئیسلامی کلیلی دڵنیایی بوون. بەپێی توانایان رێگریان لە خوێنرێژی و ستەمکاری و کاولکاری دەگرت..[52]

من هێشتا مەیلم بەلای ئەو شرۆڤەکردنەوە هەیە کە چەندین ساڵە وەرمگرتووە، بەلام لێرەدا دەمەوێ بوەستم و پرسیار بکەم:" ئەگەر ئەو بانگەوازخوازانەی دادپەروەری و یەکسانی، کە لەگەڵ سوپای عەرەبیمان بینی، لەگەڵ سوپای مەغۆل بووایە، ئایا لەتوانایان هەبوو کاریگەریان لەسەر سوپا هەبێت و ئەو رێگرییە بکەن کە توانایان لەگەڵ سوپای عەرەبی ئەنجامی بدەن؟".

---

[50] محمود شكري الالوسي (بلوغ الارب في معرفة أحوال العرب) ج١، ص ١٤٦

[51] فؤاد الصياد ( المغول في التاريخ) ص٢٣٥

[52] علي الوردي (مهزلة العقل البشري) الفصل الثاني عشر

بەلای منەوە دوو هۆکار هاوکاری عەرەبیان کردووە بۆ ئەوە زیاتر لە سوپای مەغۆل بەرەحمەتر بن. یەکەمیان: هۆکاری ئایینیە کە پێشتر باسمان کرد. هۆکاری دووەم ئەوەیە هەر لەرۆژگاری جاهیلیەتەوە خەسڵەتی مروەت لەبیابانیشنی بەهێزبووە. بۆیە دەکرێت بگوترێت ئەو مروەتە توندەی لەلایەن سوپای عەرەبی هەبووە، وایکردووە ئامادەیی دەروونیان هەبێت. بۆ کاریگەر بوون بە بانگەوازخوازەکانی ئایینی کە ئەوانیان دەپاراستن لەهەڵە. ئەگەرهاتوو ئەو بانگەوازخوازانە لەگەڵ سوپای مەغۆلیان دەبوون ئەوا دروسترین بۆچوون ئەوەیە کاریگەریان نەدەبوو.

وتمان بیابانی مەغۆل دەکەوێتە ناوچەیەکی ساردەوە، هەردەم رووبەرووی بایە ساردەکەی جەمسەر دەبێتەوە. ئەمەش بابەتێکە گرنگیەکی زۆری کۆمەلایەتی هەیە. لەبەر ئەمە مەغۆل ناچاربووە خێوەت وجلوبەرگیان ئەستوور بێت. ئەوان پێویستیان بەخۆرێکاکی چەور هەیە؛ بۆ ئەوەی گەرمۆکەی پێویست بە لەشیان بدات تا بەرگەی سەرما بگرن[53]. وەك دەردەکەوێت ئەم هۆکارانە وایکردووە، مەغۆل زیاتر بایەخ بەلایەنی ماددی بدات، نەوەك بابەتی مەعنەوی وەك مروەت وناوبانگی باش. بۆیە لەوانەیە ستەمی ژیان هۆکار بێت لەوەی؛ ئەو مەیلەی هەڵچوون وخۆسەپاندن کە بەرۆشنی لەبیابانشینی عەرەبی هەبوو، لەلای مەغۆلەکان دووهێندە بێت.

**ئەوانەی بانگەوازیان بۆ بنەماکانی ئیسلام دەکرد:**

باسی ئەوەمان کرد کەسانێك هەبوو کاریگەریان لەسەر کەمکردنەوەی دڵرەقی وکاولکاری لەلایەن سوپای عەرەبیەوە هەبوو. شایەنی باسە ئەوانە لەهۆزە بدوەکان نەبوون تا بیابان ژیابن. بەڵکو ئەوان ئەو کەسانە بوون کە لەسەرەتادا بە (موهاجیر و ئەنسار) دەناسران. واتە خەڵکی مەککە و مەدینە بوو. دوای ئەوانیش (تابعین) هاتن، مەزندە دەکرێت ئەوانیش زۆرینە خەڵکی شارەکان

---

[53] هارولد لامب (جنكيزخان) ترجمة بهاء الدين نوري-٥-٦

بووبن[٥٤]. سیفەتی دیار لەلای زۆربەی سەحابەکان و تابعین ئەوەبوو کەم یان زۆر کاریگەر بوون بە بەهاکانی شارستانیەت.

ئەمەش بەڵگەیەکە، بۆ ئەوەی بیابانی عەرەبی وەك بیابانی مەغۆل نەبووە لە جیهانی شارنشینی دابڕاو بێت، بەڵکو بەپێی تێپەڕبوونی رۆژگار پەیوەندی لەگەڵ شارستانیەتەکانی دەوروبەری هەبووە. ئەمەش یەکێکە لەو هۆکارانەی وا دەکات فەتحکردنەکانی عەرەب زیاتر بونیادنەری شارستانیەت بێت، نەوەك تێکدەری شارسانیەت بێت، بەپێچەوانەی داگیرکردنەکانی مەغۆل.

وەك دەردەکەوێت، کاتێك مەغۆل بەرەو داگیرکردنی جیهان دەردەچن، لەبەرامبەر جیهان هەستیان بەسەرسامی کردووە، لەوانەشە لەبەرامبەر هونەرەکانی شارستانیەت وخۆشگوزەرانی هەستیان بەترس کردبێت. مێژوونووس پرسی سایکس لەوبارەیەوە دەڵێ" خۆشەویستی مەغۆل بۆ کاولکار بۆ سروشتە سەرەتاییەکەی دەگەڕێتەوە. بەشێوەیەك کاتێك چوونەتە شارێکی شارستانی، دەستیان بەکاولکاری کردووە، بەهۆی ئەوەی ترسیان لەو شارە هەبووە. هەر لەبەرئەمەشە دەبینین کاتێك مەغۆل دەگەنە ولاتی چین، بینیان شارساتنیەتی هەیە، ئەمەش وایکرد رقیان لەدژی ئەوان هەڵڕێژن و پیاو و ژن و منداڵەکانیان بکوژن، لادێکان دەسوتێنن و شارە ئاودانەکان دەکەنە بیابانێکی چۆڵ، بەشێوەیەك شارێکیان لەدوای خۆیان جێنەهێشت کاولّ نەبێت و پڕ لە لاشەی کوژراوەکان نەبێت"[٥٥].

---

[٥٤] احمد امین (فجر الاسلام ) ص ١٥٢- ١٥٥

[٥٥] Percy Sykes(history of persia) vol II P 55-56

## بەشی سێیەم

## بیابانشینی ومەیلی شەڕخوازی

لەوانەیە زێدەڕۆیی نەبێت، ئەگەر بڵێم بەدوەکان لەهەموو نەتەوەکانی دیکەی جیهان، ئامادەییان لەپێناو ڕکابەری و ڕق و کوشتار هەیە. ئەوان لەمەدا لەهەموو نەتەوە سەرەتایی وشارنشینەکان توندترن. ئەمەش بابەتێکی سەیر نییە. ئەگەرهاتوو توێژینەوە لەبارەی سروشتی ژیان بکەین لەبیابان، ئەوا ئەمەی سەرەوە بە بابەتێکی ئاسایی دەزانین ومایەی سەرسوڕمان نییە. بەر لەهەموو شتێك دەبێت بزانین، ئەو بنەڕەتەی شێوازی بژێوی لەبیابان لەسەر پێك دێت، لەپلەی یەکەمدا بریتییە لە شوانکارەیی. ئەم شێوازەش لە رووی ئەنجامە کۆمەلآیەتییەکانەوە جیاوازی لەگەڵ شێوازی راوکردن وکۆکردنەوەی بەروبومەکان هەیە، کە لەنێو نەتەوە سەرەتاییەکان باوە. هەروەها جیاوازیشی لەگەڵ کشتوکاڵ وپیشەسازی و بازرگانی هەیە، کە لەنێوە نەتەوە شارشتانییەکان هەیە.

ئێمە لەوێ بیابانێکی زۆر فراوان دەبینین، تەنها چەند گژوگیایەکی لێرەولەوێ؛ لێ دەڕوێت. ئەمەش لەئەنجامی بارانێکی کەمەوە، بۆیە کەسی بەدو ناچاردەبێت پانتاییەکی فراوان ببڕێت بۆ گەیشتن بەو گژوگیایە و لەوەڕاندنی ئاژەڵەکانیان.

لە زۆربەی کاتدا لەوەڕگاکانی بیابان کەم و وشکن، پێویستی ئەو دانیشتوانانە دابین ناکات کە بەردەوام زیاد دەبن. دروستە بڵێین بەدو زۆرترین زاوزێ دەکات و زیاد دەبێت. لەوانەیە هۆکارەکە ئەوە بێت بیابان دەرد ونەخۆشی تێدا کەمە، هەر لەبەرئەمەشە ڕێژەی مردنی سروشتی لەزۆرینەی ناوچەکانی دیکە کەمترە. ئەمەش سەرچاوەی کێشەکەیە. بەدوەکان نەوە لەدوای نەوە ژمارەیان زیاتر دەبێت، کەچی لەوەڕگاکانیان ناتوانرێت زیاد بێت، بەگوێرەی باران دەبێت و بارانیش لەبیابان کەم و دەگمەنە. تەنانەت هەندێك لەتوێژینەوە زانستیەکان ئاماژە بۆ

ئـەوە دەکـەن ڕێـژەی بارانبـارین لـە بیابانـەکان لەگـەڵ دوورکەوتنـەوەی چـاخی سەهۆڵبەندان کەمتر دەبێتەوە، هێشتا ئەم کەمبوونەوەیە بەردەوامـە تـا سـەدەی ئێستامان.

بەمشـێوەیە بارودۆخەکـە پـڕ دەبێـت لەناسـەقامگیری وتەنگـەژە وئەمـەش دەبێتەهۆی دروستبوونی کوشتن وبڕین لەنێوان دانیشتوانی بیابـان، هـەر ئەمـەش بوو وایکرد داگیرکردن لەپێکهاتە سـەرەکییەکانی رۆشـنبیری بیابانشـینی هـەژمار بکەین. (فلیپ هەتی)ی مێژوونووس دەڵێ" داگیرکردن(غەزاکردن) لەژیانی بیابانـدا سوودی بۆ (بەدو) هەیە،چونکە ئـەو کوشـتارانەی ئەنجامدەدرێت ژمـارەی ئـەم دەمانە کەم دەکاتەوە کە خۆراك دەخۆن"[56]. هەروەها دەڵێ" دانیشـتوانی بیابـان لـەژیانی ئاسـایی خۆیـان هـەردەم لەسـەر لێـواری برسـێتی دایـە. لەبەرئەمەشـە شەڕخوازی لەلایەی ئـەوان وەك حاڵـەتێکی زهنـی هەمیشـەیی لێهاتووە. کوشـتار وەك کلیلـی سـەقامگیرییە بـۆ ڕێگـرتن لـەزیادبوونی دانیشـتوان بەوشـێوەیەی لەسەرووی بەرهەمە کەمەکانەوە بێت"[57]. واتە ئەوان کاتێك نـاتوانن سـەرچاوەکانی داهاتیان زیاد بکەن، ئەوا ڕێگایان لەبەردەم والآیە بۆ ئـەوەی ژمـارەی کەسـەکان کەم بکەنەوە. ئەمەش وەك نـەریتێك لـە جـەنگ وداگیرکارییـەکان ڕوودەدات نـاوە ناوە کوشتاری لێ دەکەوێتەوە.

یەکێك لەشاعیرانی جاهیلی لەستایشی هۆزەکەی دەڵێ:

**قوم إذا نبت الربيع لهم　　نبتت عداوتهم مع البقل.**[58]

(واتە: هۆزێکە لەگەڵ سەوزایی بەهار، دوژمانیەتیان لەگەڵ گیا دەڕوێ– وەرگێڕ)

شاعیرێکی دیکەش دەڵێ:

**ونحن أناس لا حجاز بارضنا ... مع الغيث ما نلقى ومن هو غالب**[59]

(واتە: ئێمە خەڵکانێکین شاخ لەزەوییەکەمان نییە، بەیەك دەگەین و کێ زاڵ بێت باران لەگەڵ ئەودایە.. وەرگێڕ)

---

[56] Philip Hitti (History of The Arabs )p.25

[57] Ibid, p89

[58] نوری حمودی القيسي (الفروسية في الجاهلية) ص ٤٤

[59] المصدر السابق ص٤٩

**بەراوردێك:**

بێگومان مەیلی شەڕخوازی وهێرشکردن وتاڵانکردن، لەلای هەموو نەتەوەکانی جیهان هەیە، ئەمە لەسروشتی گشتی مرۆڤایەتییە، بەڵام بەپێی بارودۆخی تایبەتی هەر کۆمەڵەیەك خەڵك زیاد دەبێت وکەم دەبێت. بۆ نموونە مرۆڤە سەرەتاییەکان ئەوانەی لەسەر راوکردن وکۆکردنەوە دەژین، هێرش دەکەنە سەریەکتر ویەکتر دەکوژن، بەڵام کەمتر لە بەدوەکان ئەمە ئەنجام دەدەن. مرۆڤە سەرەتاییەکان بەشێوەیەکی رێژەیی لەگوندی جێگیر دەژین، لەنزیك خۆیان بوارێك بۆ راوکردن وکۆکردنەوەی بەرهەمە خۆرسکەکان دەدۆزنەوە. بۆیە ئەو هۆکارانەی پاڵنەرن بۆ بەریەکەوتن وکوشتار لەلای ئەوان کەمترە نەوەك لەلای بەدوەکان.

کاتێك تاوتوێی نەتەوە شارستانیەکانیش دەکەین، دەبینین مەیلی شەڕخوازی کەمترە ولاوازترە لەنەتەوەکانی دیکە، چونکە وەك ئیبن خەلدون ئاماژەی بۆ دەکات، ئەو حکومەتەی لەنێوان شارنشینەکان دروست دەبێت، وا دەکات ئەوان مەیلیان زیاتر بۆ خۆشگوزەرانی هەبێت و کەمتر بەرەو کوشتار و کێبرکێ توند برۆن[٦٠].

زۆرجاریش کوشتار وداگیرکاری لەنێوان حکومەتە جیاجیاکانی ولاتانی شارستانی روودەدات، بەڵام ئەمانە لەسەردەستی سەربازی راهێنراو دەبێت، کەچی عەوامی خەڵك مەیلیان بۆ جەنگ وداگیرکاری نییە تەنها لەبارودۆخی تایبەت نەبێت. رکابەری لەزۆربەی کاتدا لەنێوان شارنشینەکان بەشێوەی رکابەری ئاشتیانە دەبێت، خوێنی تێدا نارژێت وماڵی تێدا تالان ناکرێت — وەك دواتر باسی دەکەین.

**دەوڵەت و بیابانشینی:**

حکومەت یان دەوڵەت بەمانایەکی گشتی، لەشارستانیەت نەبێت دروست نابێت، زۆر دەگمەنە دەوڵەت لەژیانی سەرەتایی وبیابانشینی دروست بێت.

وەك زانای کۆمەڵناسی سیمز ئاماژەی بۆ کردووە،دەوڵەت تەنها لەکۆمەڵگایەك دروست دەبێت، کە بەرهەمهێنانی لە بەکاربردن زیاتر بێت.[٦١] دەوڵەت هەردەم

---

[٦٠] ابن خلدون (المقدمة) ص ١٢٥-١٢٦

[٦١] Newell Sims ( Society and Its Surpuls)p. 223-228

لەسەر کۆکردنەوەی باج بەڕێوە دەچێت. کۆمەڵگاش ناتوانێ باج بدات، تەنها ئەو کاتە نەبێت بەرهەمە ئابوورییەکەی لەپێویستی بژێوی زیاتر بێت. ئەم بابەتەش ئەنجام نادرێت تەنها لەشارستانیەت نەبێت، کە بەرهەمهێنان تێیدا رێکخرا وفەراهەمە. بۆیە زۆر ئەستەمە دەوڵەت لەبیابان دروست بێت، بەرهەمهێنان وەك بینیمان بەشی دانیشتوانەکەی ناکات. لەگەڵئەوەشدا هەندێك لەمێژوونووسان دەگێڕنەوە گوایە دەوڵەتی سادە لەجاهیلیەت لە بیابانی عەرەب دروست بووە، لەوانە دەوڵەتی کیندە، ئەو دەوڵەتە هێندە سەرانەی لەهۆزە بەدوەکان وەرگرتووە، دواجار نەیتوانیوە ماوەیەکی زۆر بمێنێتەوە، دواجار هۆزەکان لەدژی راپەڕین وبەیەکجاری لەناویان برد[62].

بەهەرحاڵ ئێمە ئێستا دەوڵەتێکی بەهێز لەبیابانی عەرەبی دەبینین، ئەویش شانشینی عەرەبی سعودیایە. بەڵام نابێت ئەوە لەبیر بکەین ئەم دەوڵەتە پشت بەوەرگرتنی باجی هۆزە بەدوەکان نابەستێ، بەڵکو پشت بە باجی کشتوکاڵ وشارەکان دەبەستێ. بەمدوایەش داهاتێکی زۆر وزەوەندی نەوتی هەیە، بۆیە دەوڵەت بەهێز بووە. ئەگەر ئەو داهاتە نەبووایە ئەوا لەوانەبوو چارەنووسی دەوڵەتی سعودیا وەك چارەنووسی دەوڵەتی کیندە بوایە.

**دەمارگیری هۆزگەرایی:**

دەتوانرێت بگوترێت هۆز لەبیابانشینی شوێنی دەوڵەت دەگرێتەوە. تاك لەهۆزدا ئاسایش وزامن بوون وچاودێری دەدۆزێتەوە. ئەگەر کەسێك لەبیابان سەر بەهۆزێکی بەهێز نەبێت ئەوا رووبەرووی لەناوچوون دەبێتەوە هەر چەندە خودی خۆی ئازا وبەهێزیش بێت[63].

تاکی بیابانشین زۆرجار پشت بە ئازایی وهێزی خۆی دەبەستێ، بەڵام هەندێکجار ئەمە بەس نییە، ئەو لەرێگاکانی بیابان رووبەرووی مەترسی دەبێتەوە، بەتەنیا ناتوانێ خۆی نەجات بدات. هۆزی بەهێز زۆرجاران کەسەکانی خۆی دەپارێزێت بۆ هەر کوێیەك بچن. ئەو هۆزە هەڕەشەی تۆڵەکردنەوە دەکات ئەگەر

[62] جواد علي (تاريخ العرب قبل الاسلام) ج ٢ ص ٢٤٦-٢٤٧

[63] Philip Hitti (op. cit) p 26-27

یەکێکیان هێرشی بکرێتەسەر. ئەگەر کەسێك بەدەستی تاکێکی هۆزێکی دیکە بکوژرێت ئەوا هۆزی کەسە کوژراوەکە داوای تۆڵە دەکات. ئەگەریش نەیتوانی کەسی بکوژ بکوژێت ئەوا هەر کەسێکی دیکەی هۆزەکە دەکوژێت.

ئەوەی شایەنی باس بێت، بە بڕی ئەوەی تاکێك چاوەڕوانی پاراستن لەهۆزەکەی دەکات، لەبەرامبەریشدا هۆزەکە داوای فیداکاری ودڵسۆزی لەتاکەکە دەکات. هۆزەکە بەخێرایی پارێزگاری لەتاکەکە دەکات و تۆڵەی دەکاتەوە. تاکەکەش بەفریای هۆزەکەی دەچێ ولەکاتی کارەساتدا قوربانی لەپێناو هۆزەکەی دەدات. ئەمەش بەرژەوەندی هاوبەشە لەنێوان تاك وهۆزەکە، ئەو بە هۆزەکەی بەهێز دەبێت، لەبەرامبەریشدا هۆزەکەی بەم بەهێز دەبێت.

فریاکەوتنی رەها یەکێکە لە خەسڵەتەکانی بیابانشینی، ناکرێت دەستبەرداری بێت. ئەگەر هۆزێك داوای فریاکەوتن لە کەسێك بکات، ئەوا کەسەکە نابێت دوودڵی بکات وپرسیار بکات، بەڵکو دەبێ بە پەلە چەکەکەی هەڵگرێت وبەدوای هۆزەکەی رابکات بۆ هەر ئامانجێك. هۆزیش نابێت پرسیار بکات ودوودڵ بێت لە فریاکەوتنی یەکێك لە کوڕەکانی کە هانایان بۆ هێناوە. یەکێك لە شاعیرانی جاهیلی ستایشی ئەو خەسڵەتە دەکات و دەڵێ:

**لا يسالون أخاهم حين يندبهم في النائبات على ما قال برهانا**

(واتە: لەو کاتەی براکەیان هانایان بۆ دەبات، لەبەر ناخۆشییەك ئەوا داوای بەڵگەی رووداوەکە لەبراکەیان ناکەن– وەرگێڕ)

شاعیرێکی دیکەش دەڵێ:

**اذا استنجدوا لم يسألوا من دعاهم لاية حرب أم باي مكان** [64]

(واتە:کاتێك کەسێك هانایان بۆ ببات، ناپرسن بۆ کامە جەنگ و بۆ کامە شوێن– وەرگێڕ)

---

[64] عمر الدسوقي (الفتوة عند العرب) ص١٢٧

## گرنگی رەچەڵەکناسی لە بیابانشینیدا:

هیچ نەتەوەیەك نییە بەقەد بەدوەکان بایەخی بەرەچەڵەکناسی دابێت، لەو بارەیەوە فلیپ هیتی دەڵێ" نەتەوەیەك نییە لەجیهان، جگە لە بەدوەکان، کە رەچەڵەکناسیان گەیاندۆتەوە ئاستی زانستەکان"[٦٥].

لەراستیدا ناسینی رەچەڵەکەکان وەزیفەیەکی کۆمەڵایەتی گرنگی لەرۆشنبیری بیابانیشنی هەیە. هەر بەناسینی رەچەڵەك کەسی بەدو کەسانی هۆزەکەی لەکەسانی دیکە جیادەکاتەوە. هەر بەمەش دەزانێ تۆڵە لەکێی کورەکانی هۆزەکانی دیکە بکاتەوە. دیارنەبوونی رەچەڵەکی کەسێك لە بیابان ئەوا مانای ئەوەیە هۆزێکی نییە بیپارێزێ و تۆڵەی بۆ بکاتەوە، بۆیە ئەو کەسە ناچارە هاوپەیمانی لەگەڵ یەکێك لەهۆزەکان بکات بۆ ئەوەی بەتێپەربوونی رۆژگار رەچەڵەکی ئەو وەربگرێت.

بەدو پێیوایە هۆکاری بایەخدانی بەرەچەڵەکناسی بۆ ئەوەی سیفەتی ئەو تاکە دیاربکات کە لەوانە. بەدوەکان باوەریان وایە مرۆڤ هەموو سیفەتەکانی خۆی لەباوکییەوە وەردەگرێت. لەوانەیە ئەمەیان بەپێی ئەزمونی خۆیان وەرگرتبێ بەتایبەتی لەگەڵ ئەسپ. ئەوان تێبینیان کردووە ئەسپ سیفەتەکانی لەباوکییەوە دەمێنێتەوە. بۆیە ئەوەندەی بایەخ بە رەچەڵی مرۆڤ دەدەن، هێندەش بایەخ بە رەچەڵەکی ئەسپ دەدەن. ئەوان نازانن ژینگەی کۆمەڵایەتی کاریگەری لەسەر پێکهاتەی کەسێتی مرۆڤ هەیە.

لەحاڵی حازردا، بەسەرهاتێك لەبارەی کەسێکی بەدو هەیە، من لەچەندین کەسەوە گوێبیستی بوومە. پوختەکەی ئەوەیە پیاوێکی بەدو زەواجی لەگەڵ ژنێکی خاوەن رەچەڵەك کردووە. لەرۆژانی زاوایەتی دا دەیەوێ ئاژەڵێك راو دەکات و لەژێر عەباکەی دەشارێتەوە بۆ ئەوەی دایکی نەیبینێ. ئەو دەیەوێ ژنەکەی بەتەنیا لە نێچیرەکەی بخوات، بێئەوەی دایکی بزانێ. بەڵام ژنەکە تورە دەبێت وداوای تەڵاق دەکات. بەوباوەرەی منداڵەکانی وەك باوکیان ئەو رەفتارە ناحەزیان دەبێت، بۆیە بەشێوەی باوکیان، مامەڵە لەگەڵ دایکیان دەکەن.

---

[٦٥] Philip Hitti (op. cit )p. 28

دەگوترێت ژنەکە داوای تەڵاق شوو دەکاتەوە وپیاوەکەش ژن دەهێنێتەوە. منداڵەکانی هەریەکەشیان هەر ئەو سیفەتانەیان دەبێت کە ژنەکە پێشبینی کردبوو.

ئەوەمان بەلاوە گرنگ نییە، چیرۆکەکە خەیاڵییە یان واقیعیە. گرنگ ئەوەیە بەدوەکان لە دانیشتنەکانی خۆیان باسی دەکەن و متانەیان پێیەتی، ئەمەش بەڵگەیەکە بۆ ئەوەی ئەوان باوەڕیان وایە کوڕ سیفەتەکانی لەباوکییەوە وەردەگرێت. ناتوانین لەوەدا گلەییان لێ بکەین، ئەوان درك بەوە دەکەن بەهۆی خەسڵەتی هێزی و زاڵبوون توانیویانە لەو بیابانە سەختە بمێننەوە، بۆیە دەیانەوێ لەلای خۆیان و منداڵەکانیان پارێزگاری لەمانەوەی ئەو خەسڵەتانە بکەن. نایانەوێ بەتێکەڵبوون لەگەڵ (خوێنی لاوان) ونی بکەن. لەیەکێك لە پەندەکانیان هاتووە " رەچەڵەك هەڵخەڵەتێنەرە".

بەهەرحاڵ بایەخدان بەڕەچەڵەك یەکێك بووە لەهۆکارەکانی نانەوەی دوژمنایەتی و رکابەری لەنێوان هۆزەکانی بەدو، جورجی زێدان لەوبارەیەوە دەڵێ" لەنێوان پشت وسکی هۆز ولەسەرووی هۆزەکەشەوە دەمارگیری رەچەڵەك کۆیان دەکاتەوە– لەنزیکەوە بۆ نزیك، لەدوورەوە بۆ دوور– دوو پۆل لەپشتێك لەدژی پشتێکی دیکە کۆدەبنەوە، هەر چەندە لەیەك سکیش بن، دوو سك لەدژی یەك سەرخێڵ کۆدەبنەوە هەرچەندە هەمووشیان لەیەك هۆزن. بۆ نموونە من و براکەم لەدژی ئامۆزاکەم، من و ئامۆزاکەمە لەدژی کەسانی بێگانە. جا ئەوانە هەر یەکەیان شانازی بەخۆیانەوە دەکەن و باسی خراپی خەڵك دەکەن. چەندین شانازیکردن بەخۆیانەوە هەیە کەباسکردنی درێژە دەکێشێ. بەناوبانگترین رووداوی رکابەری لەنێوان عەرەب ئەوەبوو لەنێوان هۆزەکانی قەحتانی (یەمەنی) و هۆزەکانی عەدنانی روویان داوە..."[٦٦]

لەراستیدا ململانێی نێوان قەحتانییەکان و عەدنانییەکان مێژوویەکی دوورودرێژی هەیە. شەڕ وئاژاوەی نێوانیان هەموو ئەو وڵاتانەی گرتۆتەوە کە فەتحکردنی ئیسلامی پێگەیشتووە. بۆ نموونە لەئەندەلوس جەنگێك بەرپا بوو چەندین ساڵ

[٦٦] جرجي زيدان (التمدن الاسلامي) ج ٤ ص ١٤

خوێن ڕژا. هۆکاری ئەم شەڕەش ئەوەبوو پیاوێکی عەدنانی گەلامێوێکی لەڕەزی پیاوێکی قەحتانی لێکردبۆوە. ئەو دوژمنایەتە تا سەردەمێکی نزیک لە ئێستا بەردەوام بوو. لەسەرەتای سەدەی هەژدەمیش چەند جەنگێك لەنێوان عەدنانی و قەحتانییەکان روویدا[٦٧].

**پاراستنی ئافرەت لە بیابانشینیدا:**

زێدە بایەخدان بە رەچەڵەك وایکردووە بەدوەکان بایەخ بە پاراستنی ئافرەت بدەن لەرووی ئاکار و پاکیزەییەوە. ئافرەت لەلای ئەوان دەفری رەچەڵەکە. بۆیە ئەگەر دەفرەکەش پیس بێت ئەوا ناوەڕۆکیشی پیس دەبێت. بەدو بەر لەهەموو شتێك دەیەوێ ئافرەتێکی بەرەچەڵەك بۆ کورەکەی دەست نیشان بکات. ئەوان رەچەڵەکی ئافرەتیان پێ باشترە لەجوانییەکەی. بۆیە لەیەکێك لە پەندەکانی پێشینانیان هاتووە (ایاكم وخضراء الدمن) (مەبەست لەو پەندە ئەوەیە: خۆتان لەو ئافرەت بگرن، بەرووخسار جوانە ، بەرەچەڵەك خراپە – وەرگێڕ) مەبەست لەو پەندە هۆشیاریدانە لە ئافرەتی نارەسەن وجوان، بۆیە ئەوا ئەم جۆرە ئافرەتە بە گوڵێکی جوان دەشوبهێنن کە لەسەر زبڵدانێك روابێ.

بەدو تەنها بەوەندە وازناهێنێ بەڵکو موکڕ دەبن لەوەی ئافرەتەکە دەبێت لەوپەڕی داوێنپاکی و ناوبانگی باش بێت. وەك دەردەکەوێت نەتەوەیەك نییە لە جیهاندا وەك ئەوان پێداگری لەسەر داوێنپاکی ئافرەت بکاتەوە. ئەوان نەرمی ناوێنن لە کوشتنی ژنێك کە گومان لەرابردووەکەی بکرێت. کەسێکیش چاوپۆشی لەمە بکات ئەوا نەنگیە و خۆی و منداڵەکانیشی ناپارێزرێن.

ئێستا لەبیابان هۆزێکی (رەچەڵەك نادیار) هەیە بە سەڵبە( الصلبة) دەناسرێت[٦٨]. دەگوترێن ئەو هۆزە لەپاشماوەی سەڵیبیەکانن. ئەم هۆزە لە بیابان زۆر بێزراون بەشێوەیەك هێرش ناکەنەسەر کەس وکەسیش هێرشیان ناکاتە سەر. بەدوەکان خۆیان لەوە بەدوور دەگرن شەڕیان لەگەڵ بکەن و دەستدرێژیان بکەنەسەر. ئەوەی ئەو هۆزە پێی ناسراوە ئەوەیە ژنەکانیان زۆر جوانن، بەڵام

[٦٧] Philip hitti (op. cit)p 280-281
[٦٨] Jamali (The New Iraq) p17

بەدوەکان خۆیـان لـەوە بـەدوور دەگـرن زەواجیـان لەگـەڵ بکـەن، چـونکە لـەوە دەترسن خوێنی منداڵەکانیان پیس نەبێت.

جگـە لەمانـەش ئـەم هـۆزە پیشـەگەری دەکـەن؛ وەك بەرگـدروو و ئاسـنگەری و پزیشکی .. هتد. کە ئەمەشیان لەلای بەدوەکان بێزراوە. هەنـدێك لەژنەکانیشـیان کاری فاڵچیەتی و لەوانەشە هەندێکیان کاری لەشفرۆشی بکەن. بـەڵام بەهـەر حـاڵ ئەوان کاریان لەبیابان مەیسەر دەبێت و کەس ستەمیان لێ ناکات. چـونکە لاوازن، بەدو نایەوێ هێرش بکاتە سەر لاوازەکان.

ئـەوەی شـایەنی بـاس بێـت، ژن یەکێکـە لـەهۆکارەکانی نانـەوەی شـەڕ ونـاژاوە لـەنێوان هۆزەکـانی بیابـان، ژنـی بـەدو لەشـەڕەکان تـالآن دەکرێـت، هاوشـێوەی تالآنکردنی کەلوپەل وحوشتر ، بەڵام هۆزی تالآنکراو لـەتالآنکردنی ژنـەکانی زیـاتر هەست بەشـەرمەزاری دەکـات نـەوە لـەتالآنکردنی کەلوپەلـە ماددییـەکان. بـەپێی گوتەی (حاتەمی تای) (سامان دێ و دەڕوا) کەچی ئافرەت شەڕەفی پیاوە ئەگـەر نـاوی بزرێـت، ئەمـە چـاك نابێتـەوە. دەکرێـت بگـوترێن یـەکێك لـەگرنگترین هۆکارەکـانی ئـەوەی پاڵنـەرە بـۆ بـەهێزبوون و پاڵـەوانبوونی پیـاو، پاڵنـەری پاراستنی ژنە لەسوکایەتی و تـالآنکردن. هـەر ئـەم هۆکارانـەش بـووە وایکـردووە هۆزەکانی جاهیلیەت، راستەوخۆ دوای لەدایکبوون، کچانیان زیندەبەچاڵ بکەن.

ژنانی بەدو لەوە ڕاهاتوون لەجەنگەکاندا لەدوای پیاوەکانیان برۆن وهانیان بدەن. هەندێکجاریش وا ڕوودەدات ژنەکان بەکردەیی خۆیان لەشـەڕەکان بەشدار دەبـن. ئەگـەریش یـەکێك لـەو ژنانـە پاڵـەوانێتی نوانـدن، ئـەوا پێگـەی کۆمەڵایـەتی بەرزدابێتەوە وخوازبێنی خۆی یـان خـوازبێنی کچەکانی زۆر دەبێـت. ئەوکاتـە بـە دایکێکی مەزنی دەزانن کە کوڕانی پاڵـەوانی دەبێـت. وەك چـۆن ئەسـپی ڕەسـەن وەچەی نایاب دەنێتەوە.

وەك لەسەردەمی ئێستامان زانراوە، هۆزەکانی بەدو لە جەنگـەکانیان، کچێکی تایبەت بەکاردەهێنن بە ( العماریە –سەرخێڵ) دەناسرێت. دەبێت کچێکی جوان بێـت وخـاوەن ڕەچـەڵەك ورەسـەنایەتی بێـت. ئـەو کچـە سـواری کـەژاوەی سـەر حوشتر دەکرێت و سەری خۆی دادەپۆشێ. لەجەنگدا پێش هۆزەکەی دەکەوێت بۆ

ئەوەی هانیان بدات. لەکاتی جەنگەکە ناوی یەکە یەکەی پیاوەکان دەبات و سەرفرازی رابردوویان وەبیردەهێنێتەوە. ئەگەر یەکێکیش بیەوێت لەجەنگەکە رابکات ئەوا گلەیی لێ دەکات و هەستی جوامێری و قارەمانێتی دەجولێنێ[69].

هەروەها دەبێت باسی ئەوە بکرێت، کە پیاوی بەدو لەبەرامبەر ژنی بەرەچەڵەك وجوان، زۆر هەستیارە، پیاو بەشانازی بەسەر بڵندی بەبەردەمی تێدەپەرێ، بۆ ئەوەی بەپیاوەتی وپاڵەوانێتی خۆی سەرنجی رابکێشێت. لەوانەشە لەبەردەمیدا کەسێتی دیکە بنوێنێ کە خۆی لەکاتەکانی دیکە لێی رانەهاتووە. زۆرجاریش شێتانە خۆی دەخاتە ناو جەنگەوە بۆ ئەوەی سەرنجی ئەو کچە بەدەست بهێنێ، کە سەیری دەکات.

ژنی بەدو سڵ لەوە دەکاتەوە شوو بە پیاوی ترسنۆك بکات، ئەو مێردێکی سەربەرز و پاڵەوانی دەوێ بۆ ئەوەی سەرخۆی لەنێو ژنانی هۆزەکەی پێ بەرزبکاتەوە. عەباس عەزاوی مێژوونووس بۆمان دەگێرێتەوە، ژنێك لە هۆزی (بەنی لام) هەبووە، هاوسەری یەکێك لەسەرکردەکانی هۆزەکە بووە. کاتێك مێردەکەی دەمرێت، لەگەڵ شووبراکەی زەواج دەکاتەوە. ئەو پیاوە لەرووخسار زۆر بە برا مردووەکەی چووە، بەڵام لە ئازایەتی و بوێری لەداگیرکردن وەك براکەی نەبووە. ژنەکە لەمە تورە دەبێت و شیعرێکی بەزمانی بەدو لەبارەیەوە دادەنێت و دەڵێ:

**الزول زوله و الحلايا حلاياه    و الفعل ما هو فعل ضافي الخصائل**

مەبەستی ئەوەیە مێردی ئێستا لە رووخسارە جوانەکەی لە مێردە مردووەکەی دەچێ، بەڵام خەسڵەتە باشەکانی ئەوی تێدا نییە. پیاوەکە ئەمە بە سوکایەتیەکی قبوڵنەکراو دەزانێت. سوور بوو لەسەر ئەوەی کارێك ئەنجام بدات جێی پەسەندکردنی ژنەکەی بێت. بۆیە دەچێتە غەزا وداگیرکردن، دەسکەوتێکی زۆر دەهێنێتەوە. ئەو کاتە ژنەکە هەست بەوە دەکات لەئازایەتیش ئەم پیاوە لەمێردی پێشووی دەچێت و پێی رازی دەبێت.[70]

---

[69] عباس العزاوي (عشائر العراق) ج١ ٣٥٧-٣٦٠

[70] المصدر السابق ج ١ ص ٣٥٠

## پیشەگەری و غەزاکردن:

پێشتر ئاماژەمان بۆ ئەوەکرد بەدو زۆر رقی لەپیشەگەری دەبێتەوە. ئەوان رقیان لەبەرگدروو وسەنعەتکار و تیژکەرەوەی شمشێر وپێستەچی وسەرتاش وهەموو ئەوکەسانە دەبێتەوە کە بژێویان بەدەست وشارەقی نێوەچەوان دابین دەکەن. ئەوان پێیانوایە ئەمە نیشانەی ترسنۆکی و لاوازییە، کەسی بەهێز و پاڵەوان بەتێروانینی ئەوان بژێوی خۆی بەهێزی بازوو و شمشێرەکەی پەیدا دەکات.

هەروەها رقیان لەپیشەی فیکریە، وەك ئەوەی رقیان لەپیشەی دەست دەبێتەوە. مامۆستا لەلای ئەوان بێزراوە، هەروەها نووسەر وفەلەکناس و گۆرانبێژ ومۆسیقاژەن وپزیشك، تەنانەت رقیان لەو کەسانەش دەبێتەوە کە لە رەچەڵەکناسی وکەشناسی و شوونهەلگریی بژێوی دابین دەکەن.

مامۆستا حافز وەهبە دەڵێ" بەدو ئەگەر رقی لەیەکێك ببێتەوە ولەبەری هەموو جنێوەکان، تاکە جنێوی پێ بدات ئەوەیە پێی دەڵێ( کوری پیشەگەر) جارێك وا رێکەوت مەلیك عەبدولعەزیز ئەم جنێوەی بەیەکێك لە میرەکان دەدات. هاوسەری میر گوێبیستی جنێوەکە دەبێت و دەڵێ" من لەگەڵت نازیم، چونکە تۆ کوری پیشەگەری ئەوەك کوری هۆز، کوری سعود درۆ ناکات"[71].

بەدو ئێستا ئەگەر بیەوێ لە بژێوی یەکێك بپرسێت. ئەوا وەك کەسی شارنیشین ناپرسێ" لەگەڵ کارت چۆنی؟" بەڵکو دەڵێ" لەگەڵ بازووت چۆنی؟" ئەگەر بژێوی پیاوێك ئەستەم بێت ئەوا شمشێرەکەی هەڵدەگرێت و دەچێتە غەزاکردن. جا ئەگەر دەستکەوتی زۆر بوو ئەوا سەرەرای پەیداکردنی بژێوییەکەی پێگەشی لەناو هۆز بەرز دەبێتەوە.

عەبدولجەبار راوی بەسەرهاتێك دەگێرێتەوە، پوختەکەی ئەوەیە: شێخێك لەشێخەکانی هۆز دوو ژنی هەبووە، یەکێك لە ژنەکانی فەرامۆش کراوە ولەوپەری شوێنی هۆزەکە، لەخانوویەکی بچووك ژیاوە، بەلام ئەوەی دیکە بەختەوەرە لەگەڵ منداڵەکانی لەماڵی شێخی گەورە لەناوەراستی هۆزەکە دەژیت. ژنی یەکەم

[71] حافظ وهبة (جزيرة العرب في القرن العشرين) ص ١٢٣

کـورێکی هـەبووە، دایکەکـە هـەردەم کوڕەکـەی هـان داوە بچـێتە دیوەخـانی باوکییەوە ولەگەڵ میوانەکان دابنیشێ. کوڕەکەی لەمیانەی گوێگرتنی بۆ پیاوانی هۆز هەست بەوە دەکات ناتوانێ پێگەی لـەلای باوك و هۆزەکـەی هـەبێت تـەنها ئـەوە نـەبێت داگیرکارییـەك (غەزایـەك) بکـات دەسکەوت بەدەست بهێنـێ، بۆیـە بەتـەنها دەچـێتە غـەزاکردن، وا ڕێکـەوت دوای نوانـدنی پاڵـەوانێتی و نەبـەردی لـەهۆزێك ئەسـپ و رمێـك و کچـێك تـاڵان دەکـات. کاتێـك بەودەسـتکەوتانە دەگەڕێتەوە نـاو هۆزەکـەی دایکی بە شـادی وهەلهەلـەوە پێشـوازی لـێ دەکـات ودەبێتە جێی سەرنجی خـەڵك.، بەمـەش خـۆی و دایکـی پێگـەیان لـەلای باوکیـان بەرزتر دەبێتەوە...[72]

عەبدولجـەبار راوی دەڵـێ" غـەزاکردن لـەلای بـەدوەکان پەسـەندکراو وسەرفرازییە، بەگلەیی وکەموکوڕی دانانرێت. ئەو داگیرکردن و غەزاکردنە جیاوازی لەگـەڵ رفانـدن وفێـل ودزی هەیـە. زۆرجـار پیـاوی بـەدو خۆبەخشـانە دەچـێتە غەزاکردن و خۆی تووشی زەحمەتی دەکاتـەوە، سامان و گەنجینـەی دوو هێنـدە دەسـکەوتەکانی غەزاکـەی دەبەخشـێ ئەمـەش بـۆ ئـەوەی ناوبـانگی چـاك لـەناو قەومەکەی بەدەست بهێنێ. ئەوکاتەش شاعیران ستایشی دەکەن وخەڵکیش باسی دەکەن. بەسـەرهاتێك لـەبارەی فـەرحان دەگێڕنـەوە، کە باپیرە گـەورەی هـۆزی شەمەر بوو، ئەو هۆزەش لەعێراق ناوبانگی هەیە. دەڵـێن ڕۆژێـك چـووتە گونـدێکی باکووری بەغدا، لەوێ پیاوانی زەبەلاح دەبینێ، پرسیاریان لێ دەکات " ئێوە غەزا دەکەن؟" ئەوانیش وەڵامی دەدەنەوە گوایە ناتوانن غەزا بکـەن، چـونکە ئەمـەیان نەکردۆتـەوە پیشـەی خۆیان. کەچی فـەرحان پاشا دەڵـێ" هێـرش بکەنـە سـەر ئەوانەی لەخۆتان بچووکترن"[73]. مەبەستی ئەوەبوو ئەگەر ئـەوان لاوازن و نـاتوانن غەزا بکەن، ئەوا با هێرش بکەنە سەرکەسانی لاوازتر لەخۆیان.

[72] عبدالجبار الراوي (البادية) ص ٢٤٢ ـ٢٤٦
[73] المصدر السابق ص٢٤١

### مافی مولکداری:ی

مولکداری لەشارستانیەتدا ماف وسنووری دیاریکراوی هەیە، دەوڵەت سەرپەرشتی جێبەجێکردنی دەکات. زۆرجار چەند شێواز بۆ تۆمارکردنی مافەکان وسەلماندنیان هەیە، بەشێوەیەك یاری کردن بەو تۆمارانە کارێکی ئەستەمە، بەڵام لە بیابانشینیدا ئەوا بابەتەکە تەواو پێچەوانەیە. ئەمەش لەبەر بڵاوی دیاردەی داگیرکردن وتاڵانکردنە، لەگەڵ نەبوونی دەوڵەت.

چەندین پەند لەناو بەدوەکان هەیە، ئاماژە بۆ ئەم دیاردەی سەرەوە دەکات لەوانە" حەلال ئەوەیە بەدەستت بێت" یان " هەق بەشمشێرە ئەوەی نەیتوانێ شاهێدی دەوێ". چەندین پەندی دیکە بۆ ئەم بابەتە هەیە، هەموویان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن بەدو بەپێچەوانەی شارنشین لە مانای مولکداری دەگات.

لەراستیدا پیاوی بەدو سڵ لەوەدەکاتەوە جگەلە بەکارهێنانی شمشێر وخۆزالکردن، بەشێوازی دیکەی مافەکانی وەربگرێت. ئەو رقی لەشارنشینەکان دەبێتەوە کاتێك بۆ وەرگرتنی مافەکانیان پەنا بۆ دادگاکان دەبەن. شارنشین بەتێروانینی ئەوان (لوسکە)ن، دەوڵەتی ئەخلاقی ئەوانی تێکداوە.

ئەگەر بەدو مولکێکی هەبێت، ئەوا دەبێت بەشمشێر داکۆکی لێ بکات، بەڵام ئەگەر لاوازبوو لەمەدا، ئەوا کەسانی دیکە هێرشی دەکەنەسەر و بەسەر مولکەکەی زاڵ دەبن. بۆیە شاعیری بەناوبانگی جاهیلی (زوهێر بن ئەبی سولما) لەو بارەیەوە دەڵێ:

ومن لم يذد عن حوضه بسلاحه    يهدم ومن لا يظلم يظلم [74]

(واتە: ئەگەر کەسێك بێ چەك بەرگری لەخۆی نەکات، ژێر دەکەوێ. ئەوەی ستەمیش نەکات ستەمی لێ دەکرێت– وەرگێر)

مەزنترین شت لەلای پیاوی بەدو ئەوەیە شانازی بەدەسکەوتەکانی بکات کە لەرێگای کوشتار وخۆزالکردن بەدەستی هێناوە. ئەو دەسکەوتانەی بەچاکترین مولکی حەلال دەزانێت. جا کاتێك کەسێکی شارستان بێت وپێی بڵێ دەسکەوتەکانی حەرامن و خوا لێی قبوڵ ناکات، ئەوا پیاوی بەدو سەرسام دەبێت

---

[74] الحسين بن أحمد الزوزني (شرح المعلقات السبع) ص ١٠٤

و نکۆڵی دەکات. ئەو بڕوای وایە خودا وەک ئەو ڕێز لەئازایی دەگرێت و بەها بۆ دەستکەوتەکانی دادەنێت.

هەر لەو سەردەمە نزیکانەمان بینیمان، بەدوەکان بەماڵی تاڵان خێر بۆ گیانی مردووەکان دەکەن. ئەوان هێرشی بەرەبەیان بەچاکترین هێرشکردن دەزانن، گوایە لەخوداوە نزیکە. هۆکارەکەش ئەوەیە بەرووناکی ئەنجام دەدرێت و بەڵگەیە بۆ بوێری و قارەمانێتی ئەوان. پیاوی بەدو لەوە تورە دەبێت ئەگەر پێ بگوترێت" خوا ئەو هێرشانەی لێ حەرام کردووی" عەباس عەزاوی ئەم پرسیارە لەپیاوێکی بەدو دەکات و ئەویش وەڵامی دەداتەوە و دەڵێ" لەهێرشی بەیانیان حەلالتر هەیە، ئەو لەڕۆژی ڕووناک ئەنجام دەدرێت، چۆن ئەم جۆرە هێرشکردنە لەمن حەرامە".[75]

**ناولێنان لە بیابانشینی:**

ئەو ناوانەی لەتاکەکانی کۆمەڵگایەک نراوە، وەک جنێوەکانی عەوام وایە، بەڵگەن بۆ بەها کۆمەڵایەتیە باوەکانی ناو کۆمەڵگاکە. کاتێك توێژینەوەی لەبارەی سروشتی ناوەکانی بەدوی جاهیلیەت دەکەین، دەبینین لەم ڕووەوە ماناکانیان ڕوونە.

پرسیار لەبەدوێکی جاهیلیەت کرا: بۆچی منداڵەکانتان بەناوی بێزراو ناودەنێن وکەچی کۆیلەکانتان بەناوی خۆش ناودەبەن؟ لەوەڵامدانەوە وتی: بۆ دوژمن ناو لەمنداڵەکانمان دەنێین و بۆ خۆشمان ناو لەکۆیلەکانمان دەنێین"[76].

یەکەم تێبینمان لەبارەی ناوەکانی جاهیلیەتەوە ئەوە دەبێت زۆربەیان ئاماژە بۆ (بتەو)یی دەکەن: وەك (**حجر، صخر، جندل، فهر جبل-**) یانیش ئاماژە بۆ هێز و زاڵبوون دەکەن وەك (**مالك، غانم، غالب، غارم، فاتك، منازل، مقاتل، طارق، سيف، حرب، ضرار.. هتد**). ئەوەی جێگای سەرەنجە ئەوەیە زۆربەی ناوەکان لەناوی ئاژەڵانی زیانەبەخش ودڕندە وەرگیراوە، کە ئەمەش نموونەی لەنێو نەتەوەکانی دیکە نییە. وەك (**اسد،**

[75] عباس العزاوی (المصدر السابق) ج ٢ ص ٢٣
[76] محمود شكري الالوسي (بلوغ الارب في معرفة احوال العرب) ج ٣ ص ١٩٣

**سبع، لیث، ذئب، نمر، فهد، دب، کلب، ثعلب، هر، ضبع، حیة، حنش، سرحان، اسامة، ابی جهل، نزك (کرکدن) فزر (ببر) دلدل (قنقذ) حریش ...)**[77].

سەیر ئەوەیە هەرچەندە بەدوەکان زۆر ئەسپیان خۆشدەوێ، بەڵام زۆر دەگمەنە کەسێك بەناوەکانی ئەسپەوە ناو بنێن. بۆ نموونە کەسێکمان نەبینی ناوی (حصان) بێت. یان دەگمەنە ببینین کەسێك بەناوەکانی حوشتر وبارگیر و هەر ئاژەڵێکی دیکە ناوبنرێت کە بۆ سواربوون وبارهەڵگرتن بەکاربێت. وەك دەردەکەوێت ئاژەڵێك رێگە بدات کەسانی دیکە سواری پشتی بێت و یان بارهەڵبگرێت. ئەوا لەتێروانینی ئەوان ئاژەڵێکی زەلیلە. ئەوان رێز لە ئاژەڵی سەرکێش دەگرن کەهێرش بکاتە سەرکەسانی دیکە، نەوەك رێگە بدات هێرشی بکرێتەسەر. وەك ئەوەی سواری بن و لێی بدەن و یان بۆ سوودی تایبەت بەکاربێنن.

هەر لەبەر ئەمەشە بێزراوترین ئاژەڵ بەلای ئەوانەوە( کەر)ە، ئەوان ئەو ئاژەڵە بەوە دەزانن کە بەرگەی زۆرترین ملکەچی و سەبری بۆ زۆرترین ئازار هەیە. خراپترین جنێو پیاوی بەدو پێی بدرێت، ئەوەیە پێی بگوترێت کەر . یەکێك لە بێزراوترین ئەو نازناوانەی کە مەروان محەمەدی دوایین مەلیکی ئەمەوییەکانی پێناودەبرا: ( مەروانە کەر) بوو. مەزندە ئەوەش دەکەین مەروان دوودڵ نەبوو هەر کەسێك بکوژێت ئەو نازناوە لەبەردەمی ئەو بهێنێ.

یەکێك لە شاعیرەکانی جاهیلی دەڵێ:

| | |
| --- | --- |
| **إنّ الهَوانَ حمارُ القَوم يَعرفُهُ** | **والحُرُّ يُنكِرُهُ والرَّسلَةُ الأُجُدُ** |
| **ولَن يُقيمَ عَلى خَسفٍ يُسامُ بِه** | **إلاّ الأذلاّنِ عَيرُ الأهلِ وَالوَتَدُ** |
| **هَذا عَلى الخَسفِ مَربوطٌ بِرُمَّتِه** | **وَذا يُشَجُّ فَما يَرثي لَهُ أَحَدُ**[78] |

---

[77] مانای هەندێك لەم ناوانە: **أسد**، : شێر **سبع**: هەر ئاژەڵێکی درەندە ددان و نینۆنکی تیژ بێت **لیث**: شێر **ذئب**: گورگ **نمر، فهد**: پڵنگ **دب**: ورچ **کلب**: سەگ **ثعلب**: رێوی **هر**: پشیلە **ضبع**: کەمتیار **حیة**: مار **حنش**: ماری رەش **سرحان**: گورگ **اسامة**: شێر **ابی جهل**: پلنگ **نزك (کرکدن) فزر** : پڵنگ **دلدل (قنقذ)**: ژوژك **حریش** : مارەزیو یان هەزارپێ- وەرگێر

[78] احمد محمد الحوفي (الحياة العربية من الشعر الجاهلي) ص ٢٨٠

( ئەو چەند بەیتە باس لە زەلیل بوونی کەر دەکات، شاعیر پێیوایە سەرەڕای هەمو نەهامەتیەکان دواجار کەسێك بەزەیی بەکەر نایەتەوە– وەرگێڕ)

وا خەیاڵ دەکەم، رقی بەدو بۆ کەر وایکردووە، رقی لە هەر مرۆڤێك بێت کە لە رەفتاردا بە کەر بچێت. واتە سوودی هەبێت و زیانی نەبێت. بۆیە ئەو پیاوەی دەیەوێ پێگەیەکی بەرێزی لەلای ئەوان هەبێت ئەوا توانای سوود وزیانی هەبێت لەیەك کاتدا. بۆیە شاعیرێکی جاهیلی دەڵێ:

**ولكن فتى الفتيان من راح أو غدا ... لضرّ عدو أو لنفع صديق**[79]

( واتە: ئەو گەنجەی دێت و دەچێت. دەبێت زیانی بۆ دوژمن هەبێت و سوودی بۆ دۆست هەبێت –وەگێڕ)

لەواقیعدا توانای زیان گەیاندن وسوودبەخشی دوو بابەتی هاوواتای یەکتر لەلای کەسی بەدو، وەك بەخشندەیی وئازایی، ئەوانە بەدەگمەن نەبێت ئەگینا لەیەکتر جیاناکرێنەوە. ئەگەر وا رێکەوت پیاوێکی بەدو بکەوێتە بارێکی نالەبارەوە سەرپشکی بکەن لەهەڵبژاردنی سوودبەخش وزیان بەخش ئەوا خۆی بەشایەنی ئەوە دەزانێت زیانبەخشەکە هەڵبژێرێ. یەکێك لەشاعیرەکانی جاهیلی دەڵێ:

**اذا انت لم تنفع فضر  يرجى الفتى كيما يضر وينفعا**[80]

(واتە: ئەگەر ناتوانی سوودبەخش بی، ئەوا زیانبەخش بە. مەبەستی پیاو لەوەدایە زیان بگەینێ یان سوود بگەینێ- وەرگێر)

یان شاعیرێکی دیکە دەڵێ:

**ومن لم يكن ذئبا على الارض أجرد  كثيرُ الاذى ، بالت عليه الثعالب**

(واتە: ئەگەر کەسێك گورگ نەبێت و زیانی لەسەر زەوی نەبێت، ئەوا رێوییەکان دەوری دەدەن– وەرگێر)

بۆیە ئەو پیاوەی هەموو کارەکانی سوودبەخش بێت ئەوا پیاوێکی زەلیلە. کەواتە وا باشترە بۆ پیاوی بەدو کاتێك نەیتوانێ سوودبەخش بێت، ئەوا زیانبەخش بێت، بۆئەوەی زەلیلی لەخۆی و هۆزەکەی دووربخاتەوە. دەکرێت ئەمە لەبارەی هۆزەکانیش بگوترێت، ئەگەر هۆزێك ناوبانگی باشی نەبوو، ئەوا

---

[79] محمود شكري الالوسي (المصدر السابق) ج ١ ص ٦٣

[80] علي الوردي (اسطورة الادب الرفيع) ص ١٦٣

هێرش دەکات و ڕێگری دەکات، ئەوا تەنها دەسکەوتی لەو کارە نابێت، بەڵکو بەلایەنی کەمەوە، ناوبانگی لەزیانبەخشی دەبێت.

**کەرامەتی پیاوی بیابانشینی:**

پیاوی بیابانشین هەستێکی زۆری بۆ کەرامەتی خۆی هەیە. بەرگەی هیچ سوکایەتیەك ناگرێت، هەرچەندە سوکایەتیەکە بچووکیش بێت، چونکە لەوە دڵنیایە ئەو سوکایەتیە بچووکە هی گەورەتری بەدواوە دێت، لە بیابان هیچ کۆت وسنوورێك نییە بۆ خەڵك، بۆئەوەی بەرپەرچی سوکایەتی ودەستدرێژکردنیان بداتەوە.

کەسی بەدو زوو تورە دەبێت و سزای توندە، ئەمەش لە زۆر هەستکردنیەتی بەکەرامەتی خۆی. ئەو هەر زوو شمشێر هەڵدەکێشێ بۆ کەسێك بۆی بچێت. ئەو سڵکردنەوە و دوودڵی لەکاتی تورەبوون نییە، چونکە پێیوایە ئەمانە بەڵگەی ترسنۆکی و بێ هێزیە. هەر ئەمەش وایکردووە ئەوان ریز لەو پیاوە بگرن کە (فاتك) وەسفی دەکەن، فاتیك کەسێکە زوو لێدەدا و زوو دەکوژێ هەر کەشتێکی بەمێشك دا هات و فرمانی پێ بکات. یەکێك (فاتیك) بەوە وەسف دەکات (ئەگەر ویستم دەیکەم)[81]

کاتێك مێژووی جاهیلیەت دەخوێنینەوە، دەبینین پریەتی لە جەنگی کاولکار و شەڕی دوور ودرێژ لەبارەی رەچەڵەکەوە. کە لەئەنجامی ئەو هەستکردنی زۆر بەکەرامەت و هەڵچوونی پیاوی بەدو روویان داوە. ئالوسی شەڕێکی توندی رەچەڵەك دەگێرێتەوە، لەجاهیلەت روویداوە. هۆکاری ئەو جەنگە زۆر بێ مانا وبچووك بووە. پوختەی بەسەرهاتەکە ئەوەیە سێ پیاوی بیابانشین سەفەرێك دەکەن. یەکێکیان فرازی دەبێت ودووەمیان تەغلوبی دەبێت، ئەویتریشیان لەهۆزی کەلبی دەبێت. بەیەکەوە کەرێکی کێوی راودەکەن، فرازییەکە دەچێت هەندێك کاری تایبەت ئەنجام بدات، دوو هاورییەکەی گۆشتی کەرەکە دەبرژێنن ودەیخۆن. دواتر (کێر)ی کەرەکە بەبرژاوی بۆ فرازییەکە هەڵدەگرن بۆ ئەوەی بیخوات. کاتێك فرازیەکە دەگەرێتەوە دەیخوات وئەوانیش پێدەکەنن. فرازییەکە

[81] محمد حبیب البغدادي (المحبر) ص ١٩٢

هەڵدەچێ وشمشێرەکەی رادەکێشی وفرمان بە دوو کەسەکە دەکات لەگەڵ بخۆن. یەکێکیان رەتی دەکاتەوە، ئەوا سزاکەی کوشتن دەبێت، بەلاَم دووەمیان گۆشتەکە دەخوات و نەجاتی دەبێت.

دەبوایە ئەویش نەیخوات، نەوەك بەرگەی ئەو سوکایەتییە بگرێت. دەبوایە بمرێت وەك هاورپییەکەی، بەلاَم ئەو ترسنۆك بوو تێکشا، لەئەنجامیش خۆی و هۆزەکی بوونە مایەی سووکایەتی نێوان هۆزەکان. چەندین شاعیریش لەبارەی ئەوەوە قەسیدەی داشۆرینیان دەنوسی[٨٢]. چاکترین مەزندە ئەوەیە، ئەو پیاوە لەکارەکەی پەشیمان بۆتەوە. ئەو لەمردن رایکرد بەلاَم تووشی شەرمەزاریی بۆیەوە. لەلای کەسی بەدو مردن باشترە لەشەرمەزاربوون.

تیسگەری توێژەر لەبارەی (بەدو)ی ئەو سەردەمەمان دەڵێ" ئەوان قین لەدڵ نین، بەلاَم کاتێك پێیانوابوو سوکایەتی بەشەرەفیان کراوە، ئەوا رقیان هەڵدەستێ ولەسەر تۆڵەکردنەوە موکڕ دەبن. لە پیاوێکی بەدو بدە یەکسەر یان دواتر دەتکوژێت. ئاسانە کەسی بێگانە بێنەوەی مەبەستی بێت سوکایەتی پێ بکات. جارێکیان دەستم خستە ملی ئیبن قبینە، ئەو بەتوڕییەوە رووی لەمن کرد و پرسیاری ئەوەی لێکردم ئایا من بە کۆیلەی دەزانم.. بیرۆکەیەکم لەبارەی ئەو کارەمەوە نەبوو. کارەکە بەهەڵەبوو."[٨٣].

**گوێڕایەڵی و فرمانڕەوایی:**

کەسی بەدو لەهەموو کەسێك زیاتر حەز لە سەرۆکایەتی و فرمانڕەوایی دەکات. لەهەموو کەسێکیش زیاتر لە گوێڕایەڵی وملکەچ بوون رادەکات. لەپەندێکی بەدوەکان هاتووە" فرمانڕەوایی ئەگەر لەسەر بەردیش بێت"." **الامارة ولو على الحجارة**". فرمانڕەوایی لەتێڕوانینی ئەوانەوە نیشانەی زاڵبوونە. گوێڕایەڵیش مانای ژێردەستیە. ئەوان گوێڕایەڵی شێخەکەی خۆشیان نابن، بەڵکو لەپێناو فریاکەوتن وشانازییەوە هاوکاری یەکتر دەکەن. ئەگەرهاتوو شێخ و سەرۆك هۆز بەشێوەی

---

[٨٢] محمود شكري الالوسي (المصدر السابق) ج١ ٢٩٧-٢٩٨

[٨٣] ولفريد ثيسيغر (رمال العرب) – تعريب هاجر و عبدالستار ص ١٦٩

فرمان و بەبچووك زانین داوای شتێکی لێ کردن، ئەوا سەرپێچی دەکەن و ڕووبەڕووی دەبنەوە.

فەرەزدەقی شاعیر(الفرزدق) ستایشی هۆزەکەی خۆی دەکات و دەڵێ:

**اذا نحن سرنا سارت الناس خلفنا وان نحن أومانا الى الناس توقفوا**

(واتە : کاتێك ئێمە دەڕۆین خەڵك بەدوامانەوە دەڕوا، کاتێك ئێمەش فەرمان دەکەین خەڵك دەوەستن- وەرگێڕ)

مەبەستی شاعیر ئەوەیە هۆزەکەی، سەرۆکەکانی فرمانی خۆیان بەسەر تەواوی هۆزەکان سەپاندووە. بەمەش ئەو ئاماژە بۆ کێشەیەکی گەورە دەکات کە بیابانشینی بەدەستەوە دەناڵێنێ ئەویش ڕکابەرییە لەسەر فرمانڕەوایی. هۆزەکان کاتێك ملکەچی سەرۆك دەبن، ئەوا بارودۆخێك وەهای سەپاندووە، ناتوانرێت ماوەیەکی زۆر بەردەوام بێت، ئەوا هۆزەکان بەدوای هەلێك دەگەڕێت بۆ ئەوەی لەسەرۆك یاخی بن و ڕووبەڕووی ببنەوە. ئەوان سەرۆکایەتیان دەوێ وەك چۆن سەرۆك داواکاری فرمانڕەواییە. زۆرجاریش لەمە پارچە پارچەبوونی هۆزەکە ورکابەریی دروست دەبێت.

هەر ئەمەشە وایکردووە، هۆزەکانی بیابانیشن، مەیلیان بەلای دابەشبوون بێت، کاتێك ژمارەیان لەسەرووی ئاستێکی دیاریکراو تێپەڕدەبێت. ئەو کاتە رکابەری ودژایەتی لەنێوان سەرۆکی پشتەکانی ناو یەك هۆز دروست دەبێت، دواجار شەڕ لەنێوانیان ڕوودەدا. بەسەرهاتەکانی جاهیلەت چەندین جەنگی تێدایە کە لەنێوان دوو پشتی یەك هۆز ئەنجام دراوە.

ئیبن خەلدون ئەمە خولیایەی بەدوەکان بە(ڕکابەریی لەسەر سەرۆکایەتی) ناودەبات و دەشڵێ ئەمە لەناو بەدوەکان زۆر باوە. تەنانەت وایلێهاتووە بەدو فرمانڕەوایی رادەستی کەسی دیکە ناکات، تەنانەت ئەگەر باوك و برا و سەرۆك هۆزەکەشی بێت، تەنها ئەگەر لەبەر ئابڕووی خۆی ناچار بێت. ئیبن خەلدون پێشیوایە هەر ئەم سیفەتە یەکێکە لەو هۆکارە سەرەکیانەی کە وادەکات پیاوی بەدو بۆ حوکمڕانی وڵاتانی شارستانی گونجاو نەبێت، چونکە ئەمە وا دەکات ببێتە فرە دەسەڵات و فرە فرمانڕەوایی، لەئەنجامیشدا دەستی دەسەڵات لەسەر

رەعیەت و باج و فرمانەکان جیاواز دەبێت، کە دواجار دەبێتە هۆی تێکدانی کۆمەڵگا و کەمکردنەوەی گەشەکردن[٨٤].

ئۆلێری رۆژهەڵاتناس پاڵپشتیەکی گەورە ئەم بۆچوونەی ئیبن خەلدون دەکات و دەڵێ" کەسی بەدو هەستێکی زۆری بۆ کەرامەتی شەخسی هەیە. لەهەر شێوەیەك لەشێوەکانی دەسەلاّت هەڵدەچێ. ئەمەش وا دەکات سەرۆك هۆزەکەی یان سەرکردەی جەنگەکانی، لەیەکەم رۆژی سەرۆکایەتی خۆی بەسەر ئەو ، پێشبینی ئیرەیی و رق و خیانەتی لێ بکات. تەنانەت ئەگەر دۆستێکی زۆر نزیکیشی بێت. هەڵچوونی بەدو بۆ سەر هەر دەسەلاّتێك یەکێکە لەو نهێنیانەی زنجیرەی ئەو تاوان و ناپاکیانەمان بۆ شرۆڤە دەکات کە بەشێکی گەورەی مێژووی عەرەب پێك دەهێنێ. نەزانینی ئەو نهێنیەش زۆربەی ئەوروپییەکانی ئەو رۆژگارەمانی خستە هەڵەوە، چەندین قوربانیان دا، کەدەکرا نەیدەن. زەحمەتی فرمانڕەوایی کردنی عەرەبە و رەتکردنەوەی ملکەچی بۆ دەسەلاّت، ئەمانە ئاستەنگ بوون لەبەردەم ئەوەی عەرەب بەرەو شارستانیەتی رۆژئاوا بروات"[٨٥].

## حەزکردن بە ئازادی :

ئۆلێری ئەو خولیایەی پێشتر باسمان کرد بۆ حەزکردن بە ئازادی دەگێڕێتەوە. کەچی من مەیلم بەلای بۆچوونەکەی ئیبن خەلدونە کە بۆ کێبڕکێی فرمانڕەوایی گێڕاوەتەوە. ئازای چەمکێکی شارستانیەتی لە ئەنجام شۆرشە نوێیەکانی میللەتانەوە هاتووە، بەشێوەیەك وایلێهاتووە شارنشینەکان بەبالای ئازادی هەڵ دەدەن و سرودی بۆ دەڵێن. بروایان وایە ئازادی مەبەستێکە هەموو بونەوەرێك دەیخوازێ بە باڵندە وئاژەڵ و مرۆڤیشەوە. لێرەوە بینیمان هەندێك لەشارنشینەکان بەتایبەت لەولاّتانی عەرەبی ستایشی بەدوەکان دەکەن گوایە زۆر حەز لە ئازادی دەکەن.

بە بروای من بەدوەکان لەماناى ئازدی ناگەن، بەمانا شارستانیەتە نوێیەکەی. کە ماناکەی بریتیە لەوەی مرۆڤ لە گوفتار ورەفتار ئازاد بێت، تا ئەو ئاستەی

---

[٨٤] ابن خلدون (المقدمة) ص ١٥٠

[٨٥] De lacy O'Leary ( Arabia before Muhammad)p. 20-21

هێرش نەکاتە سەر ئازادی کەسانی دیکە. ئەمەش مانایەکە زەحمەتە پیاوی بیابانشین قبوڵی بکات، چونکە ئەو دەستدرێژی دەکات و زوڵم دەکات، هەروەك چۆن غەزادەکات و بەخشندەشە. ئەو مەیلی هەیە هێرش بکاتە سەر ئازادی کەسانی دیکە بۆ ئەوەی هێز و پاڵەوانی خۆی دەربخات. هەردەمیش شانازی بەوە دەکات کە هێرش دەکاتە سەرکەسانی دیکە و کەس هێرشی نەکردۆتەوە سەر. هەر بەم شێوەیە عەمرو بن کەلسوم ستایشی هۆزەکەی دەکات و دەڵێ:

**بغاةً ظالمون وما ظُلمْنَا ولكنا سنبدأ ظالمينا** [86]

(واتە: ئێمە زۆردارین و زوڵم دەکەین، بەڵام زوڵممان لێنەکراوە — وەرگێر)

یەکێك لەپیاوانی بەدو لە بازارەکانی سەردەمی جاهیلیەت دادەنیشێ وقاچەکانی درێژ دەکات وتەحەدای خەڵك دەکات، بەوەی کەسێك بوێری بەشمشێر قاچی ببڕێتەوە. یەکێك لە ئامادەبووان بەپەلە شمشێرەکەی هەڵدەکێشێ و قاچی پیاوەکە دەبێت. لەئەنجامی ئەمە ئاژاوەیەکی گەورە دروست دەبێت.

جارێك وا روودەدات پیاوێك میز دەکات و پیاوێکی دیکە سەیری دەکات و دەڵێ" هەرگیز وەك ئەمڕۆ عەورەتی وەها ناشرینم نەدیوە" ئەویش بەجنێوێکی ناشرینتر وەڵامی دەداتەوە. هەردوو پیاوەکە لەجنێودان بەردەوام دەبن. تا حاڵەتەکە بەوە دەگات هەردوو هۆزەکە لەشەڕێ ئەم دوو پیاوە بەشدار دەبن. گوترا و گووتیان ئەمە زۆری کێشا، ناتوانین لێرەدا ئاماژەی بۆ هەمووی بکەین[87].

پوختەی قسەکانمان ئەوەیە بەدو بە مانا شارستانی و نوێیەکە لە وشەی ئازادی ناگات. کاتێك کەسانی شارنشین بانگەشەیان بۆ ئازادی کرد وپەرۆشی بوون، لەبەر ئەوە بوو کەوتنە بەر چەپۆکی فرمانڕەوای زۆردار پێچەوانەی خواستی ئەوان حوکمڕانی دەکرد، کەچی بەدو کەسێك نییە بەسەریان زاڵ بێت وستەمیان لێبکات و پێچەوانەی ئارەزووی ئەوان بێت. ئەوان خوازیاری فرمانڕاوین زیاتر لەوەی خوازیاری ئازادی بن. ئەم بابەتەش بۆ ئێمە سوودبەخشە لە تێگەیشتن لەهەندێك سیمای کۆمەڵگای عێراقی لەرووی سیاسی و کۆمەڵایەتییەوە.

---

[86] أحمد محمد الحوفي ( المصدر السابق) ص ٢٧٢

[87] محمود شكري الآلوسي (المصدر السابق ) ج ١ ص ٢٩٠

## تاکگەرایی لە بیابانشیندا

فلیپ هیتی مێژوونووس، پێیوایە تاکگەرایی یەکێکە لە خەسڵەتەکانی پیاوی بەدو، دەشڵێ تاکگەرایی و دەمارگیری هۆکاری یەکلاکەرەوە بوون لە هەڵوەشاندنەوە و کەوتنی دەوڵەتی ئیسلامی[88].

لێرەدا دەوەستم بۆ ئەوەی بپرسم: مەبەستی فلیپ هیتی لە وشەی تاکگەرایی چییە؟ ئەگەر مەبەستی لەو وشەیە ئەو تاکگەراییە بێت، کە لە شارستانیەتی نوێ ناسراوە، لەزمانی ئینگلیزی بە (Individualism) دەناسرێت. بەبڕاوی من ئەمەیان زۆر لەسروشتی بیابانشینی دوورە.

تاکگەرایی بە مانا نوێیەکەی واتە هەر تاکێك بەرپرس بێت لەخودی خۆی و لەگوفتار ورەفتاری خۆی. کەسێك لە خزم وکوڕانی گەڕەك وشار وهۆزەکەی بەشێوەیەك لەشێوەکان لێ پرسینەوەی لەگەڵ نەکات. بۆ نموونە ئەگەر تاکەکە تووشی شەرمەزاری بوو ئەوا هۆزەکەی بایەخی پێنادەن. ئەگەر تاوانێکی لەدژی کەسێك ئەنجام دا ئەوا هۆزەکەی داواکراو نین. ئەمەش لە جنێودانی وڵاتانی پێشکەوتوو بەدی دەکرێت. دەگمەنە بە هۆی ئابڕووچوونی دایك وباوك و خوشك و ئامۆزا جنێو بەتاکێك بدرێت. بۆ نموونە پێ دەگوترێت: ناپاك، دز، بەدرەوشت، فێڵباز. بەڵام لەبیابانشینی بابەتەکە تەواو پێچەوانەوەیە. هەر یەکێك لە تاکەکانی هۆز کارێکی نەخوازراو ئەنجام بدات، ئەوا رەنگدانەوەی بۆ تەواوی هۆزەکە دەبێت، هەموو هۆزەکە لەنێو خەڵك هەست بەشەرمەزاری دەکات. بینیمان چۆن هۆزی فرزاری کەوتە سەرزاری جنێودەران، تەنها لەبەر ئەوەی پیاوێکیان (کێر)ی کەرە کێوییەکەی خواردبوو. جا جنێوی بەدوەکان هەرهەمووی لەبارەی ئەوەیە کەیەکێك لەکەسە نزیکەکان تووشی شەرمەزاری بووە. لەوانەیە خودی کەسەکە بێ عەیب بێ، کەچی عەیبەکە بەهۆی کەسێك لەبەر یەکێك لە ئەندامانی هۆزەکەی یان کەسێك لەباب وباپیرانی بەدوای دەکەوێ.

نەریتی تۆڵەکردنەوە بەروونی ئەمەمان بۆ روون دەکاتەوە. ئەگەر یەکێك لە تاکەکانی هۆز تاوانێکی ئەنجام دابێت ئەوا سەرجەم هۆزەکە تاوانبار دەبێت، هەر

[88] Philip Hitti (Op.cit) p 27-28

یەکێك لەتاکەکانی هۆزەکە سزای ئەوە وەردەگرێت، کە یەکێك لە کەسوکارەکانی ئەنجامی داوە. ئەمەش قورئان رەتی کردۆتەوە و قبوڵی ناکات، لەقورئان هاتووە" ولا تزر وازرة وزر اخرى"[٨٩]

کەواتە بۆمان دەردەکەوێت، رەوتی جەماعی لەبیابانشینی شوێنی رەوتی تاکگەرایی شارستانیەت دەگرێتەوە. بۆیە بەدو دەڵێ" ئێمە" لەبری ئەوەی بڵێ" من".

## جەنگی شمشێر و زمان:

وتمان مێژووی جاهیلیەت پڕیەتی لە شەڕ وململانێی کە لەبەر هەستیاری بەدو بە کەرامەتی خۆی هەڵدەگیرسێت. هەر سوکایەتیەك تووشی یەکێك لە تاکەکانی هۆز ببێتەوە ئەوا تەواوی هۆزەکە رووبەرووی سوکایەتی دەبێتەوە. ئەو هۆزەش ناچارە بەهەموو ئامرازە رەخساوەکان رووبەرووی ئەو شەرمەزاریەوە بێتەوە. شەڕەکانی هۆز کە لەو ئەنجامەدا روودەدا دوو جۆرە: یەکیان لەنێو عەرەبدا بە (المنافره) ناودەبرێت ئەوا بریتە لە جنێودان ووتنی شیعری داشۆرین و هەجو. جۆرەکەی دیکە بە (اليوم) ناودەبرێت کە لەبری زمان شمشێر بەکاردێت.

هەر چۆنێك بێت، بەدوەکان زمان بەگرنگترین چەکی خۆیان هەژمار دەکەن، لەوانەشە لەشمشێر بەزەبرتری بزانن. ئەوان بەشمشێر و هەندێکجاریش بەزمان شەڕ دەکەن، زۆربەی جاریش بەهەردوو چەك شەڕ لەگەڵ یەکتر دەکەن.

وەك زانراوە خەڵکی جاهیلیەت ئاهەنگیان بەبۆنەی دەرکەوتنی شاعیرێك لەنێویاندا دەگێرا." ئەگەر شاعیرێك لەهۆزەکە دەردەکەوت، هۆزەکانی دیکە پیرۆزباییان دەکرد، خواردن دروست دەکرا، ژنان موسیقایان دەژەنی وەك ئەوەی لەبوك گواستنەوە بن. پیاوان و کوران مزگێنیان بەیەکتر دەدا، لەبەر ئەوەی ئەو شاعیرە پارێزگاری لە ئابڕۆیان دەکات، کارەکانیان نەمر دەکات، ناویان بەرز رادەگرێ. ئەوان پیرۆزباییان لەیەکتر نەدەکرد تەنها، بە لەدایکبوونی کوڕێك و دەرکەوتنی شاعیرێك و زانی ئەسپێك نەبێت"[٩٠]

---

[٨٩] القران. سورة الانعام ، الاية: ١٦٤

[٩٠] احمد محمد الحوفي (المصدر السابق) ص ١١٠

شاعیری بیابانشین داکۆکی لەهۆزەکەی دەکات، وەك چۆن سوارچاکێکی پاڵەوانی داکۆکی لێ دەکات. ئەویان بە شمشێر، ئەویتریان بەزمان. ئەمەش هۆکارە شارەوەکەیە وایکردووە خەڵکی جاهیلیەت بایەخ بە شیعر و قسەی رازاوە بدات. ئەم بایەخدانەی عەرەب تا ئێستاش ماوەتەوە. دروستە بڵێین عەرەب یەکێکە لەو نەتەوانەی زۆرترین بایەخ بەشیعر دەدات و زۆر پێی کاریگەر دەبێت. ئەمەشیان لە جاهیلیەتەوە بۆ ماوەتەوە. پارێزگاریشی لێ دەکەن سەرەڕای گۆڕانی بارودۆخ و هەلومەرجە جیاوازەکان.

**رۆژگاری عەرەب:**

ئەبوفەرەجی ئەسفەهانی کتێبێکی تایبەت بە رۆژگاری عەرەب نووسیوە، مەبەست لەو رۆژانەیە کە جەنگی وێرانکەر لەنێوان هۆزەکانی جاهیلیەت روویداوە. ئەم رۆژگارەش بریتی بووە لە هەزار وحەفسەد رۆژ.[٩١] کاتێك هۆکاری ئەو رۆژگارانە دەپشکنین دەبینین، لە ئەنجامی سوکایەتیەکی سادەیە، رووبەرووی پیاوێك بۆتەوە، ئەویش زۆر تورە دەبێت، دەیەوێ زوو بەربەرچی ئەو سوکایەتیە بداتەوە. ئەوکاتەش جەنگ لەنێوان دوو هۆزەکە بەرپا دەبێت و تەنانەت هۆزە هاوپەیمانەکانیش بەشدار دەبن.

بۆ نموونە جەنگی بەسوس یەکێکە لە بەناوبانگترین رۆژەکانی عەرەب، ئەو شەڕە لەپێناو حوشترێك هەڵگیرساوە کە لەلایەن شێخێکی بەنی تەغلوب پێکراوە. پیاوێکی بەنی بەکریش بەمە تورەبووە و دەچێتە لای شێخەکە دەیکوژێ. ئەو ئاژاوە کوێرە هەڵدەگیرسێ کە نزیکەی چل ساڵ دەخایەنێ هەزاران بریندار و کوژراوی لێ دەکەوێتەوە.

دەکرێت هەمان شت لەبارەی جەنگی (داحس و الغبراء) بڵێین، ئەم جەنگەش ناوبانگی لەجەنگی بەسوس کەمتر نییە. هۆکاری راستەوخۆی ئەم جەنگە کێبرکێی سوارچاکییەك بوو لەنێوان هۆزی عەبسی و زوبیانی، ئەوکاتە مشتومڕ لەنێوان خاوەنی ئەسپەکان دروست دەبێت، هۆزەکان و هاوپەیمانەکانیان لە جەنگێکی سەخت بەشدار دەبن کە هیچی کەمتر نییە لە جەنگی بەسوس.

---

[٩١] محمود شكري الالوسي (المصدر السابق) ج ٢ ص ٦٨

دەتوانرێت بڵێین ئەو سوکایەتیە سادەیە کە دەبووە هۆی هەڵگرسانی ئەو شەڕە گ ڕانە وەك کڵەپەیەك بوو بەر بەرمیلی بارود بکەوێت. دەروونی بەدو هەردەم ئامادەیی تێدایە بۆ شەڕ وکوشتار، وەك بارودێکە بۆ تەقینەوە، تەنها پێویستی بەکڵپەیەکی بچووکە بۆ ئەوەی وشك و تەڕ بەیەکەوە بسوتێنێ.

**پوختەیەکی مێژوویی:**

ئەنجامدانی بەردەوامی شەڕ لە بیابانشینی وایکردووە، بەدو توانای سەرکەوت و خۆسەپاندنی هەبێت کاتێك بەرەو جیهانی شارستانیەت دەردەچن و داگیری دەکەن. شارنشینی ناتوانن خۆیان لەبەرامبەر کشانی ئەوان رابگرێ تەنها لەچەند حاڵەتێکی کەم نەبێت. بەدوەکان لەکاتی داگیرکردنە فراوانەکانیان لە ئاستێك بوەستن، تەنها ئەو کاتە نەبێت کە لەنێوخۆیان دەکەونە ململانێی خێڵەکی، بەڵام ئەگەرهاتوو لەنێوخۆیان یەکگرتوو بن، ئەوا دەتوانن دەست بەسەر هەموو دونیا دابگرن.

لەراستیدا بەدوەکان بەرەو جیهان دەرناچن، تەنها لەچەند حاڵەتێکی دەگمەن نەبێت. هۆکارەکەش ئەوەیە ئەوان زیاتر بەشەڕی هۆزەکانی ناو بیابانەوە سەرقاڵن. بەلای ئەوانەوە زەحمەتە لەیەك بەرەدا یەکگرتوو بن بۆئەوەی لە چوارچێوەی بیابان بەرەو جیهان دەربچن.

یەکەم رووداوی لەمجۆرەش لە بیابانی عەرەبی لەسەر دەستی ئەم پیاوە مەزنە بوو کە ناوی محەمەد کوڕی عەبدوڵلایە. لێرەدا بواری ئەوە نییە باس لە مەزنی ئەم پیاوە بکەین. ئیعتراف بەوە دەکەم کەم توانام لە وردبوونەوە لە نهێنی مەزنییەکەی. خەڵکانی دیکەش لەمەدا کەم توانان. لێرەدا دەکرێت هەر ئەوەندە بڵێین، دوای خەباتێکی زۆر توانی هۆزە دژ بەیەکەکان بکات بەیەك نەتەوە و بەرەو جیهان ئاراستەیان بکات. بەشێوەیەك لەماوەیەکی کەم توانیان ئیمپراتۆریەتێکی گەورە دابمەزرێنن.

لەکاتی لەدایکبوونی ئەم پیاوە بیابانی عەرەب هەر لەسەر ئەو ئاراستەیە دەڕۆیشت کە لە دێرزەمانەوە لێی راهاتبوو، بەڵام لەکاتی مردنیدا ئەوا بیابان کودەتایەکی گەورەی بەخۆیەوە دەبینی کە هاوشێوەی لەمێژوودا دەگمەنە.

دەگوترێت جەنگیزخان دوای چەند سەدەیەك لە بیابان مەغۆلی دروست کرد. هاوشێوەی ئەوەی محەمەد لە بیابانی عەرەب ئەنجامی دابوو. ئەمەش هەڵەیەکی گەورەیە وەك لەبەشی پێشوودا ئاماژەمان بۆ کرد و فەتحکردنی عەرەب و داگیرکارییەکانی مەغۆلمان بینی. بینیمان جیاوازییەکی گەورەیان لەنێواندا هەیە. جەنگیزخان هۆزەکانی مەغۆلی یەکگرتوو کرد و بەرەو داگیرکردنی جیهان سەرکردایەتی کردن. بەڵام ئەمەی تەنها لەپێناو داگیرکاری کرد. لەمەشدا جگە لە شانازیکردن بە فراوانکردنی داگیرکاری و زۆری دەستکەوت، مەبەستێکی دیکەی نەبوو. کەچی محەمەد هۆزەکانی عەرەبی لەپێناو ئاینێکی نوێ یەکخست، ئەم ئایینەش بانگەوازی بۆ بنەماکانی دادپەروەری و یەکسانی دەکات.

ئێمە نکۆڵی لەوە ناکەین، هۆزەکانی عەرەب لەپێناو شانازیکردن بەداگیرکردن و دەسکەوت بەرەو جیهاد دەچوون.بەڵام دەبێت ئیعتراف بەوەش بکەین بانگەوازخوازانی ئاین بەناو هۆزەکان بڵاوبوونەوە لە وڵاتانی فەتحکراودا، گیانی دادپەروەری و یەکسانیان بڵاو دەکردەوە، لەمەشدا سەرکەوتنێکی گەورەیان بەدەستهێنا.[٦٢] لەسەدەی هەژدەمدا، لەبیابانی عەرەب پیاوێك بەناوی محەمەد کوڕی عەبدولوەهاب دەرکەوت، دەیویست لاسایی محەمەد بکاتەوە لە یەکخستنی هۆزەکانی بیابان لەپێناو ئایندا. دواتریش بەرەو جیهانی شارستانیەت ئاراستەیان بکات، بەشێوەیەکی کەم توانی سەربکەوێت، بەڵام دواجار بزووتنەوەکەی رووبەرووی شکست بوویەوە. دەکرێت ئەو شکستەش بخەینە پاڵ دووهۆکار:

یەکەم: محەمەد عەبدولوەهاب فەقیهێکی لاساییکەرەوە بوو. پێغەمبەرێکی بلیمەت نەبوو لەشێوەی محەمەد کوڕی عەبدوڵڵا کە لەسروشتی کۆمەڵگاکەی و زەمەنی خۆی گەیشتبوو. دەیزانی لەناو کۆمەڵگاکەی بڕوات و چارەسەری کێشە هەنووکەیەکانی بکات. کەچی محەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب شتێکی لەدونیاکەی نەدەزانی جگە لە ئەزبەرکردنی کتێب و سوننەت نەبێت، بەشێوەیەکی شکڵی پابەندبوو بەو ئایینەوە. جیاوازییەکی زۆریش لەنێوان بلیمەت و لاساییکەرەوە هەیە.

---

[٦٢] علي الوردي ( مهزلة العقل البشري) ص ٣٥٠-٣٦٧

دووەم: محەمەد عەبدولوەهاب لەسەردەمێك بوو، شارستانیەت چەند جۆری هۆکارەکانی جەنگ و چەکی داهێنابوو کەپێشتر خەڵك نەیاندەناسی. یەکەمجار بارودی داهێنا، دواتریش ئۆتۆمبیل و فرۆکە، بۆیە شارستانیەت لەتوانای هەبوو بەرەنگاری بەدوەکان ببێتەوە، کاتێك بەناوی داگیرکردنەوە لەبیابان دەردەچوون. تەنانەت دواتر توانی لەناوی خودی بیابان بکەوێتە راونانی بەدوەکانەوە.

بەهەرحاڵ شەپۆلی وەهابییەکان نەیتوانی لەدەرەوەی بیابان پەلبهاوێژێ. چەندجارێك هەوڵی ئەمەیان دا، بێهوودە بوو. دواجار تەنها هێرشیان دەکردە سەر چەند شارێکی لێواری بیابان. دانیشتوانێکی زۆری ئەم شارانەیان کوشت و سامانەکانیان تاڵانکرد. دواتر بۆ بیابان گەڕانەوە و سرودی سەرکەوتنیان دەچڕی. گوایە ئەمەی کردیان جیهاد بوو لەپێناوی خودا !

**جەنگ لەبیابانیشی و شارستانیەتی:**

دوای ئەوەی تاوتوێی بابەتی سروشتی جەنگی بیابانشینی کرد و ئاماژەمان بۆ پاڵنەرەکانی کرد. ئەوا دواجار دەمانەوێ بە سروشتی جەنگی شارستانیەتی بەراوردی بکەین. لەراستیدا جەنگێکی زۆر لەنێوان شارنشینەکان هەڵدەگیرسێت. لەوانەشە هۆکارەکانی بێ مانا بێت و زیتر نەبێت لەوەی لە رۆژگارەکانی عەرەبی جاهیلی بینیمان. بۆ نموونە جەنگی یەکەمی جیهان لەئەنجامی گوللەیەکی قوتابیەکی سربی بوو کە ئاراستەی جێنشینی نەمسای کرد. ئەو گوللەیە وەك تیرێك بوو کە شێخی بەنی تەغلوبی لە وشترێکی بەسوس بگرێت..

ئەمە راستە، بەڵام نابێت ئەوە لەیاد بکەین، لەم بابەتەدا جیاوازییەکی گەورە لەنێوان خەسڵەتی شارستانی وخەسڵەتی بیابانشینی هەیە. رۆشنبیری بیابانشینی وەك پێشتر باسمان کرد، لەسەر بنەمای خۆزاڵکردن دادەمەزرێت. واتە جەنگ و کوشتار پێکهاتەیەکی سەرەکی ئەم رۆشنبیرییەیە. هەر ئەمەش وایکرد جەنگ لە بیابانشینی هەمیشەیی بێت و ئاگرەکەی خامۆش نەبێت. ماوەیەك ناوەستێ لەنوکەوە دەست پێدەکاتەوە. بەهای بیابانشینی بەهەموو پێکهاتە و خەسڵەتەکانیەوە لەدەوری مەزنکردنی غەزا و سوارچاکی و خۆسەپاندن و شەڕ دەخولێتەوە. ئاستێك بۆ ئەم بەهایانە نییە. بیابانشینی لە برسیەتیەکی هەمیشەیی

دایە، بۆیە دەبێت کێبڕکێی مانەوە تێیدا توند بێت.[٩٣] بەشێوەك لاوازی تێدا ون دەبێت وبەهێزی تێدا دەمێنێتەوە. یەکێك لە شاعیرەکانی جاهیلیەت ئەو بارودۆخەی لەدوو دێرە شیعردا نیشان داوە و دەڵێ:

**يغار علينا واترين فيشتفى ... بنا إن أصبنا أو نغير على وتر**

**قسمنا بذاك الدهر شطرين بيننا ... فما ينقضي إلا ونحن على شطر**[٩٤]

(واتە: دوژمنان هێرشمان دەکەنەسەر و تۆڵەی خۆیان دەکەنەوە، یانیش ئێمە هێرشیان دەکەین سەر، زەمەنمان لەنێوان خۆمان کردۆتە دوویەش، یان ئەوان هێرش دەکەنە سەرمان و سەردەکەون،یانیش ئێمە هێرش دەکەین و سەردەکەوین – وەرگێڕ).

کەچی شارستانیەت لەسەر بنەمایەکی دیکە بونیادنراوە. خەڵك بۆ بەدەستهێنانی بژێوی خۆیان پەنا بۆ پیشەی جۆراوجۆر دەبن، یان پیشەی فیکرین ویانیش پیشەی دەستین. بەشێوەی ئاشتەوایی کێبڕکێ لەسەر پیشەکانیان دەکەن، بێئەوەی خوێن برژێت و ماڵ تالآن بکرێت. حکومەتێکیان هەیە کاردەکات بۆ گەشەپێدانی بەرهەم لەلای دانیشتوان بۆ ئەوەی داهاتی باج زیاتر بێت. جگەلەمەش حکومەت هەوڵ دەدات. هەر ململانێیەکی توندی نێوان خەڵك سەرکوت بکاتەوە، بۆئەوەی بەرهەمهێنان لاواز نەبێت و باج کەم نەبێتەوە.

سەبارەت بەو جەنگانەی لەنێوان شارستانەکانیش هەڵدەگیرسێ، ئەوا زیاتر سیاسیە نەوەك کۆمەڵایەتی. مەبەستم ئەوەیە ئەوا جەنگانە لەنێوان دەوڵەتانی جیاجیاوە لەئەنجامی ململانێ لەسەر بەرژەوەندی و ئامانجەکانیانەوە دروست دەبێت. هەر دەوڵەتێك دەیەوێ سامان ودەسەلآتی لەسەر حسێبی دەوڵەتانی دیکەوە زیاتر بێت. بۆیە کاتێك هەست دەکات توانای هەیە ئەو جەنگێك بەرپادەکات.

نکۆڵی لەوە ناکەین دەوڵەتانی شارستانی، لەم لایەنەوە لە هۆزەکانی بیابان دەچن، هەرهەموویان لەپێناو مانەوە رکابەری دەکەن، بەڵام سروشتی جەنگ لەبیابانئشینی جیاوازی لەشەڕی شارستانیەت هەیە. لەوانەیە هەڵە نەبم ئەگەر بڵێم جەنگ لەبیابان

[٩٣] Jamali (op.cit) p.29

[٩٤] أحمد محمد الحوفي (المصدر السابق) ص٢٦٠

بنەڕەتە وئاشتی تێیدا حاڵەتێکی راگوزەرە، کەچی لەشارستانیەت ئاشتی بنەڕەتە و جەنگ راگوزەرە.

شارستانیەت ناتوانێ لەحاڵەتی جەنگی هەمیشەیی گەشە بکات، چونکە ژیانی ئابووری شارستانێتی تەنها بە ئاشتی دەژی، بۆیە کاتێك دەکەوێتە جەنگێکەوە دەیەوێ بەزووترین کات کۆتایی بهێنێ وسەر لەنوێ بگەڕێتەوە سەر ژیانی ئاشتیانە. بەکورتی دەتوانین بڵێین، ژیانی ئابووری لەشارستانیەت لەسەر بنەمای کێبڕکێی هێمن ئەنجام دەدرێت، کەچی لەبیابانشینی لەسەر بنەمای خۆزاڵکردنی توند دەبێت.

ئەمڕۆ تێبینی ئەوە دەکرێت سەرجەم دەوڵەت بانگەشەیەکی بەرز بۆ ئاشتی دەکەن. ئەمە مانای ئەوە نییە دەوڵەتان دەیانەوێ تەماعکاری و ئامانجە دژەکانیان لەگۆڕ بنێن، یان واز لە رکابەری مانەوە دەهێنن، چونکە رکابەری بۆ مانەوە لەسروشتی مرۆیی حەتمیە و ناتوانێ لێی دەرباز بێت، بەڵام دەوڵەتان بەمدواییە درکیان بەوە کردووە، کێبڕکێی ئاشتیانە لەژێر چاودێری یاسایەکی نێودەوڵەتی وگشتی باشتر و بەسوودترە لە شێوازە کۆنەکەی جەنگ.

ئەو بانگەشە بەرزەی ئاشتی لەنێو دەوڵەتانی شارستانیەتدا، دەبێت رۆژێك لەرۆژان بەری هەبێت. جا زوو یان درەنگ، رۆژێك دێت یاسایەك بەسەر دەوڵەتانەوە زاڵ دەبێت. وەك چۆن یاسا بەسەر دانیشتوانی هەر یەکێك لەو وڵاتانە زاڵە. بەمەش نەبێت ئومێدێك بۆ گەشەکردنی شارستانی مرۆیی نییە.

**تێبینی کۆتایی:**

شەڕ وکوشتارمان بە یەکێك لەگرنگترین سیماکانی بیابانشینی دانا. ئەمەش لەسروشتی رۆشنبیری بیابانشینی هەڵقوڵاوە. ئەگەر وانەبێت ئەوا کەسێکی بەدو لەبیابان نامێنێ، چونکە بیابان بەرهەمی کەمە، دەبێت دانیشتوانی هێرش بکەنەسەر یەکتر ویەکتر تالآن بکەن بۆ ئەوەی بژین.

ئەگەر بینیمان بەدوەکان واز لە غەزاکردن و کوشتار دەهێنن، ئەمە مانای ئەوەیە ئەوان بەرەو خۆ دەربازکردن لە رۆشنبیری بیابانشینی وبەرەو جیهانی شارستانیەت دەچن. ئەمەش ئێستا کەم یان زۆر لەهەندێك ناوچەی بیابانشینی روودەدات. تێبینی

ئەم دیاردەیە لە نەجد و عێراق و لیبیا وجەزائیر دەکرێت. ئەمانەش زۆرترین ناوچەی بیابانی جیهانیان لەخۆیەوە گرتووە.

داهێنانە نوێییەکان، لە ئۆتۆمبیل وفرۆکە وتۆپ و تفەنگ..هتد. وایکردوە بتوانرێت دەسەلات بەسەر ئاسایشی بیابان فەرز بکرێت و کۆنترۆڵی شەڕ وکوشتار بکرێت. شارستانیەتی نوێ دەتوانێ بەناخی بیابان شۆڕ بێتەوە، بەشێوەیەك وایکردووە بەدو بەرەبەرە فێری پیشەکانی شارنشینی بێت.

ئەمەش مانای ئەوەیە رۆشنبیری بیابانشینی زوو یان درەنگ بەرەو نەمان و لەناوچوون دەچێت. ئەو ناتوانێ ماوەیەکی زۆر خۆی لەبەردەم تەوژمی بەهێزی شارستانیەت بگرێت. رۆشنبیری بیابانشینی کاتێك لەسەدەکانی پێشوودا خۆڕاگر بوو، لەبەر ئەوەبوو لەناخی بیابانەکەی خۆیدا گۆشەگیربوو، نەوە دوای نەوە دەژیا، لەشێوازێکی نەگۆڕدا. ئەوکات شارستانیەت توانای نەبوو تێیدا شۆڕبێتەوە و کاریگەری لەسەر هەبێت. تەنانەت زۆرجار بەدوەکان لەبیابان دەردەچوون و کاریگەریان بەسەر شارستانیەتەوە دەبوو، بێئەوەی شارستانیەت بتوانێ بەرپەرچیان بداتەوە. بەلام ئێستا بارودۆخەکە پێچەوانە بۆتەوە. سەردەست ژێردەستە و ژێردەستیش بۆتە سەردەست.

لەوانەیە یەکێك بڵێ: ئەگەر رۆشنبیری بیابانشینی وەك دەڵێی بەرەو لەناوچوون دەچێت، کەواتە بۆ ئێمە خۆمان بەتوێژینەوەی سەرقاڵ بکەین؟

لەراستیدا ئێمە بەتوێژینەوە لەبارەی رۆشنبیری بیابانشینی، بۆ ئەوەمان نییە کات بەچیرۆك و قسەکانی بەدوەکان بەسەربەرین، وەك هەندێ کەس پێیانوایە. بەڵکو دەمانەوێ لەخودی خۆمان بگەین. بیابانشینی لەدێرزەمانەوە کاریگەری خۆی لەسەر مێژوو و پێکهاتەی کۆمەڵگاکەمان داناوە. لەبەر ئەوە ئێمە ناتوانین لەو کاریگەریە بگەین ئەگەر توێژینەوەیەکی ورد بۆ ئەم رۆشنبیرییە نەکەین.

ئەمرۆ دانیشتوانی نیشتیمانی عەرەب دەگاتە ٨٠ ملیۆن کەس. رێژەیی هۆزەکانی بەدو بە چارەگێکی دانیشتووان مەزندە دەکرێت. ئەوەش شاراوە نییە ئەم رێژەیە لەولاتێکەوە بۆ ولاتێکی دیکە جیاوازە. بۆ نموونە لەسعودیا هۆزەکان لە ٧٥٪

دانیشتووان پێکدەهێنن. لەعێراق ٪۲، لە سوریا ٪۱.٥ کەچی لەمیسر بەرێژەیەکی زۆر کەمە. لەوانەیە لە ٪۰,٥ ی دانیشتوان بێت.

لەواقیعیشدا کاریگەری بیابانشینی لەنیشتیمانی عەرەب تەنها لەو هۆزانەوە قەتیس ناکرێت، بەڵکو دانیشتوانی گوندەکانیش دەگرێتەوە، ئەگەر بەرێژەیەکی کەمتریش بێت، تەنانەت بەشێوەیەك لەشێوەکان کاریگەری بەسەر دانیشتوانی شارەکانیشەوە هەیە.

ئەمەش زۆر بەروونی لەعێراق تێبینی دەکرێت، کە لەبەشەکانی داهاتوودا باسی دەکەین. خەڵکی گوندەکان نیوەی دانیشتوان پێك دەهێنن. ئەوانیش لەبارودۆخێکی کۆمەڵایەتی دەژین، لەزۆر رووەوە لە بەدوکان دەچن. کەچی بەشەکی دیکە دانیشتوانیش خەڵکی شارن، ئەوانیش کەوتوونەتە ژێر کاریگەری بەهای بیابانشینی، ئەمەش لەئەنجامی بەریەککەوتنیان لەگەڵ هۆزەکانی بیابان و هۆزە لادییەکانی دەوروبەریان. ئەگەر دروست بێت دەڵێین زۆرێك لەوان بەرووکەش شارنشینە و لەناوەرۆکیشدا بەدوە. ئەمەش وایکردووە هەندێك سیمای دووفاقی کەسێتی لەنێوایان دا بەربڵاو بێت.

****

زانایانی کۆمەڵناسی وا راهاتوون، دانیشتوان بۆ دوو جۆر پۆلین بکەن: خەڵکی لادێ و خەڵکی شار، بەڵام لەوڵاتانی ئێمە دەبێت جۆرێکی دیکە زیاد بکرێت ئەوش هۆزە کۆچەکەرەکانی بەدوەکانە. هەر یەکێك لەو جۆرانە لەوڵاتی ئێمە لە بارودۆخی کۆمەڵایەتی تایبەت بەخۆی دەژی، کەچی هەر هەموویان کاریگەرن بە بەهای بەدوەکان، جیاوازی نێوانیشیان تەنها لە بری کاریگەربوون بە بەهاکە وکارلێکردنیەتی لەگەڵ بەهاکانی شارستانی.

دەگەرێمەوە سەر ئەو قسەیەم ودەڵێم زۆر پێویستمان بەوە هەیە کۆمەڵناسییەکی تایبەت بەخۆمان دابنێین، هیواشم وایە توێژەرانی عەرەب ئاورێك لەمە بدەنەوە و لەپێناویدا هاریکار بن.

# بەشی چوارەم

## قوڵاییەکانی رۆشنبیری بیابانشینی

پێشتر وتمان زۆرێك لەتوێژەرانی بیانی، ئەوانەی تاوتوێی بابەتی بیابانشینیان کردووە بە رۆژهەڵاتناس و گەشتیارەوە، بەشێوەیەکی واقیعیانە لە بیابانشینی نەگەیشتوون. لەئەنجامی ئەمەشدا کەوتونەتە هەڵەوە و ژمارەی هەڵەکانیشیان کەم نییە. ئەوان لەدەرەوە سەیری بیابانشینیان کردووە و نەچوونەتە قوڵاییەکانیەوە. ئەوان بەتێروانینی رۆشنبیری بیانی سەیریان کردووە، بۆیە بەپێی بەها وپێوەرەکانی خۆیان شرۆڤەیان کردووە، بەڵام ئەگەر بە تێروانینی رۆشنبیرە تایبەتەکەی بیابانشینی سەیریان بکردایە، ئەوا مەزندە دەکرا تووشی ئەو هەڵانە نەدەبوون.

جێی داخە هەندێك لەتوێژەرانی عەرەبیش دەکەونە ئەو هەڵانەوە، کە بیانییەکان تێی کەوتوون. لەوانە لەبەر لاسایی کردنەوەی بیانییەکان بێت، چونکە تا ئێستا لەلای هەندێك کەس بیانی بەکەسێکی دوور لەهەڵە دەناسرێت و زیاد لەپێویست گەورە دەکرێت. دیارە ئەو کەسانە درك بەوە ناکەن بیانیەکانیش مرۆڤن و وەك ئێمە هەڵە دەکەن.

**بۆچوونی ئۆلێری:**

یەکێك لەو توێژەرانەی لە تێگەیشتنی بیابانشینی هەڵەی کردووە، ئۆلێری رۆژهەڵاتناسە. ئەم رۆژهەڵاتناسە کۆمەڵێك وەسفی بۆ بیابانشینی کردووە، لەواقیعدا دوورە. ئەو کتێبێکی لەبارەی عەرەبی جاهیلیەت نووسیوە تێیدا هاتووە" پیاوی بەدو، لەرووی سۆزدارییەوە قاڵبگیرە، خەیاڵی کەمە. زیاتر بایەخ بە مادده دەدات، زیاتر لەوەی بایەخ بەلایەنی مەعنەوی بدات. تەماعکارە،

تێڕوانینێکی ماددی بۆ شتەکان هەیە، تاکە پێوانەی بەو ئەنجامەوە بەندە کە شتەکە چەند سوودی بەرهەستی بۆی هەیە"[95].

لێرەدا وا دەردەکەوێت ئۆلێری بەتێڕوانینی گەشتیارێك یان بازرگانێك سەیری بیابانشینی بکات، لەلایەن بەدووەکانەوە ڕێگری لێ کرابێت و سامان و جلوبەرگی تالان کرابێت. بۆیە ئەو بڕیارە توندەی لەبارەی بەدووەکان داوە. ئێمە نکۆڵی لەوە ناکەین پیاوی بەدو تالانکەرە، پێشتریش ئاماژەمان بۆ کرد. بەدو زۆر حەز لە تالان دەکات، بەڵام لەراستیدا ئەو حەزەی لەبەر بەها ماددیەکە نییە، بەڵکو ئەمە توانای مروەت وبەخشندەیی پێ دەدات. وەك پێشتریش وتمان" پیاوی بەدو تالانکەری بەخشەرە".

ئەگەر ئۆلێری لەناو بەدووەکان دەژیا، بەقوڵی لەرۆشنبیری کۆمەلایەتی ئەوان تێدەگەیشت، ئەوا بۆچوونەکەی پێچەوانەی ئێستا دەبوو. بەدو کاتێك تالان دەکەن وبەدەستکەوتەکانیانەوە دەگەڕێنەوە ناو هۆزەکانیان، بۆئەوەی لەگەڵیان بەخشندەیی ئەنجام بدەن یانیش لە میوان و دراوسێکانیان خەرجی بکەن.

لەراستی لانادەم ئەگەر بڵێم، بەدووەکان لەهەموو کەسێك زیاتر حەز لەناوبانگی باش دەکەن. بۆیە دەبینین یەکێك لەوان قوربانی بەخۆی وهەموو شتەکانی خۆی دەدات، بۆئەوەی لەناو خەڵکدا بەبەخشندە وبەمروەت بناسرێت.

گرنگترین هۆکاریش کە دەبێتە هۆی ئەوەی پیاو بتوانێت فرمانڕەوایی وناوبانگ لەناو بەدووەکان بەدەست بهێنێ، ئەوا دەبێت ئازا وبەخشندە بێت، واتە تالانکەر وبەخشەر بێت. ئەو لەرێی هێز وئازاییەتیەوە دەسکەوتی دەبێت، دواتر ناوبانگ وفرمانڕەوایی لەرێی بەخشندەیی و مروەتەوە بەدەست دەهێنێ. عەبدولجەبار راوی باسی هۆزی شەمەڕ دەکات کە یەکێکە لە هۆزە بەناوبانگەکانی عێراق، دەڵێ" عجیل یاوەر فرمانڕەوایی هۆزی لەرێگای داگیرکردن وبەخشندەیی بەدەست هێنا، ئەو غەزای دەکرد و لەغەزاکانیشی سەرکەوتوو دەبوو، دواتر دەستکەوتەکانی بەسەرماڵەکانی شەمەڕ دابەش دەکرد"[96].

---

[95] de lacy o'leary (Arabia Before Muhammad)p. 20

[96] عبدالجبار الراوي (البادية) ص ٢٢٨

**فەراهەمبوون لە بیبانشینیدا :**

پیاوی بەدو لەمانای فەراهەمبوون وگلدانەوە ناگات، وەك ئەوەی پیاوی شارنشین تێی دەگات. شارنشین لەوە دەگات چاکترین رێگا بۆ ئەوەی بژێویی وکەرامەتی خۆی لەرۆژانی داهاتوودا مسۆگەر بکات، ئەوەیە پار وسامان بەهەموو جۆرەکانییەوە بۆ خۆی گلّ بداتەوە، لەمەشدا دروشمی ئەوە دەبێت" پارەی سپی بۆ رۆژی رەش". جا ئەگەرهاتوو رۆژێك لەرۆژان تووشی ناخۆشی بوو، ئەو پارە فەراهەمبووە دەردەهێنێ ولەپێداویستیەکە خەرجی دەکات، بەمەش کەرامەت و ژیانی خۆی دەپارێزێ.

کەچی بەدو لەمە ناگات و قبوڵی ناکات. پارە بۆ ئەو سوودی نابێت کاتێك برسێتی رووی تێدەکات. شاراوە نییە بەدو لەژیانیدا زیاتر لەهەر شتێك لەبرسێتی دەترسێ. ئەو ناتوانێ پارە بخوات یان خۆراکێك لە بیابان بکرێت، بۆیە ئەو دەیەوێ ناوبانگ کۆبکاتەوە نەوەك پارە. لێرەشەوە وتەکەی حاتەمی تای هاتووە، کاتێك هاوسەرەکەی لەبەر زێدەڕۆیی لەبەخشندەیی گلەیی لێکردووە وئەویش وەڵامی دەداتەوە و دەڵێ:

**أ ماوي ! ان المال غاد و رائح  ويبقى من المال الاحاديث و الذكر**[97]

(واتە: حاتەم ناوی ژنەکەی دەهێنێ دەڵێ: ئەی ماویە سامان دێت و دەڕوا، ئەوەی لەسامان دەمێنێتەوە تەنها ناوبانگە– وەرگێر)

لەوانەیە یەکێك بپرسێت: کاتێك برسێتی توند دەبێت، سوودی ناوبانگ بۆ کەسی بەدو چییە؟ لەراستیدا ناوبانگ سوودێکی زۆری لەژیانی (بەدو)دا هەیە. لەلایەکەوە دەتوانێ فرمانڕەوایی ولایەنگر بەدەستبهێنێ، بەمەش دەتوانێ شەڕ وتالآنکاری بکات. لەلایەکی دیکەشەوە وا لەخەڵك دەکات لەکاتی نەهامەتی بەهانای بچن. وەك لەو پەندە هاتووە" بەزەییتان بە سەرۆك هۆز بێتەوە لە لاوازیدا". بەدوەکان لەو حاڵەتدا فریای یەکتر دەکەون وکەسی بە بەخشندەش بە(جابر عثرات الکرام) وەسف دەکەن[98].

---

[97] أحمد محمد الحوفي (الحياة العربية من الشعر الجاهلي) ص ٢٥٠

[98] چیرۆکی(جابر) یەکێکە لەچیرۆکە بەناوبانگەکانی عەرەب، لەبارەی بەخشندەییەوە، لێرەدا دەرفەت نابێت باسی بکەین –وەرگێر

بەلام پیاوی قرچۆك و رەزیل، گلەیی لێ دەکرێت وبەخۆپەرست و پولەکی دەناسرێت. خەڵك لێی دوور دەکەوێتەوە و جێگای رق و سوکایەتی خەڵك دەبێت، بۆیە زۆر رووبەرووی دەستدرێژی و تالانکاری دەبێتەوە. ئەگەریش رۆژێك تووشی نەهامەتی بێت کەس بەفریای ناکەوێ. سەرەرای دۆراندنی سامانی، ناوبانگیشی دەدۆرێنێ. شاعیرێکی جاهیلی ئاماژەی بۆ ئەمە کردووە و دەڵێ:

**ومن يك ذا فضل فيبخل بفضله على قومه يستغن عنه ويذمم**[99]

(واتە: ئەوەی سامانی هەبێت و لەگەڵ قەومەکەی بەخیل بێت، ئەوا وازی لێ دەهێنن و گلەیشی لێ دەکەن– وەرگێر)

یەکێك لەگرنگترین شێوەکان ماڵ وسامان لەلای بەدو، بریتیە لەوەی چەند بارگیر ووشتری هەیە. ئەمەش فەراهەم ناکرێت لەشێوەی گلدانەوەی پار وسامان لەشارستانییەتدا. هەردەم ئەو سامانەی بەدو رووبەرووی داگیرکردن وتالانکاری دەبێتەوە. وەك بینیمان لەو رۆژگارەمان بەدوەکان سامان بە(چڵکی دەست) وەسف دەکەن، گوایە دێت و دەروا. کەواتە لەبەر ئەمە بەدو کۆکردنەوەی ناوبانگ بەگرنگتر دەزانێ نەوەك کۆکردنەوەی سامان.

بۆچوونێکی دیکەی ئۆلێری:

ئۆلێری پیاوی بەدو بە بێوەفا وەسف دەکات. تەنانەت زیاتر لەمەش پێیوایە بەدو رقی لەهەرکەسێك دەبێتەوە چاکەی لەگەڵ بکات، چاکەکردن هەستی ملکەچی ولاوازی پێگەی لەلا دەوروژێنێ، وا هەست دەکات قەرزاری ئەو چاکەکارەکە دەبێتەوە." ئەمەش وا دەکات سەرۆك هۆزەکەی یان سەرکردەی جەنگەکانی، لەیەکەم رۆژی سەرۆکایەتی خۆی بەسەر ئەو ، پێشبینی ئیرەیی ورق وخیانەتی لێ بکات. تەنانەت ئەگەر دۆستێکی زۆر نزیکیشی بێت. هەڵچوونی بەدو بۆ سەر هەر دەسەلاتێك یەکێکە لەو نهێنیانەی زنجیرەی ئەو تاوان وناپاکیانەمان بۆ شرۆڤە دەکات، کەبەشێکی گەورەی مێژووی عەرەب پێك دەهێنێ. نەزانینی ئەو نهێنیەش زۆربەی ئەوروپییەکانی ئەو رۆژگارمانی خستە هەڵەوە، چەندین قوربانیان دا، کەدەکرا نەیدەن. زەحمەتی فرمانرەوایی کردنی عەرەبە

[99] الحسين بن أحمد الزوزني (شرح المعلقات السبع) ص ١٠٣

ورەتکردنەوەی ملکەچی بۆ دەسەڵات، ئەمانە ئاستەنگ بوون لەبەردەم ئەوەی عەرەب بەرەو شارستانیەتی رۆژئاوا بڕوات"[١٠٠] لێرەدا دەبینین ئۆلێری پێیوایە ئەوروپیەکان لەتێگەیشتنی بیابانشینی هەڵەیان کردووە، درکیش بەمە ناکات خۆی لەهەموویان زیاتر کەوتۆتە هەڵەوە.

بەهەرحاڵ، بە بۆچوونی من بەدو دوور نییە لە ئاکاری وەفاداری، لەوانەشە وەفادارییەکی زۆری هەبێت. ئەمەش لەژێر رۆشنایی ئەو توێژینەوەیەی بۆ خەسڵەتی رۆشنبیری بیابانشینی ئەنجامان داوە سەیر نییە. کەسی بەدو وەك پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد نایەوێ کەسێك بەهۆی شتێکەوە لەسەرووی ئەو بێت، ئەو دەیەوێ چاکە لەگەڵ خەڵکەوە بێت، نەوەك خەڵك چاکەی لەگەڵ بکەن. باشتربوون واتە هێز وزاڵبوون. بۆیە بەدو دەیەوێ چاکەکردن رەت بکاتەوە، بەپێی توانای خۆی ، خودی خۆی زیاتر ئەنجامی بدات. ئەمەش وای لێکردم وەفاداری بە خەسڵەتێکی رۆشنبیری بیابانشینی بزانم.

لەگەڵ ئەوەشدا نکۆڵی لەوە ناکەین، بەدو لەوانەیە رقی لەکەسێك ببێتەوە چاکەی بەسەروە بێت، لەوانەیە رق وکینە لەو کەسە هەڵگرێت. ئێمە لەو لایەنەوە لەگەڵ ئۆلێری کۆکین، بەلام تا ئەو خاڵە لەگەڵی ناڕۆین کەپێی گەیشتووە، تا بەدو بەناپاك و زاڵم وەسف بکەین. دەکرێت بگوترێت پیاوی بەدو لەبەرامبەر چاکەکاری هەست بەململانێی نێوان دوو پاڵنەری دژ بەیەکتر دەکات. لەلایەك هەست بەرق و ئیرەیی دەکات لە بەرامبەر چاکەکار و بە زاڵبووی دەزانێ، لەلایەکی دیکەوە هەست بە پێویستی بەوەفاداری دەکات بۆ ئەو چاکەکارە، چونکە نایەوێ قەرزار و ژێرکەوتە بمینێتەوە.

بەهەرحاڵ، ناکرێت لەسەر رق وکینەی لەچاکەکار، گلەیی لە بەدو بکەین، چونکە چاکەکاری بەدو لەزۆر لایەنەوە سروشتی فیز وخۆهەڵکێشان لەخۆیەوە دەگرێت. ئەمەش وادەکات رق وئیرەیی بکەوێتە دڵی ئەوکەسەی چاکەی لەگەڵ کراوە. چاکەکار زۆربەی کات، بە پاڵنەری بەزەیی ومرۆڤایەتی ونزیکبوونەوە لەخودا چاکە ناکات، بەڵکو بە پاڵنەری حەزکردن بەناوبانگ وفرمانڕەوایی

---

[١٠٠] de lacy o'leary (op. cit)p. 20- 21

چاکەکاریی دەکات. زۆرجاریش تێبینی ئەوە دەکەین، هەست بکات یان نا، دەیەوێ کاریگەری چاکەکەی بەسەر خەڵکەوە بزانێت. بەواتەیەکی دیکە ئەو زیاتر دەیەوێ شانازی بەچاکەکارییەکەی بکات، نەوەك بۆئەوەی بێت بەزەیی بەخەڵك بێتەوە. لەوانەشە زێدەڕۆیی نەبێت بڵێین پاڵنەری ڕەحمەت ومرۆڤایەتی ونزیکبوونەوە لەخودا لەخەسڵەتە دەگمەنەکانی بیابانشینە. خۆسەپاندن ورکابەری توند بۆ مانەوە لەوێ، ڕێگەنادات ئەو هەست و سۆزە ناسکانە دەربکەون.

ئەگەر چاکەکاری بەدو، حەز دەکات شانازی بەچاکەکانی بکات، ئەوا دەبێت لەبەرامبەردا پێشبینی ئەوە بکەین ڕووبەڕووی ڕق وئیرەیی ئەو کەسە دەبێتەوە کەچاکەی لەگەڵ کردووە. ئەمە هەقیقەتێکی دوولایەنەیە، هەر یەکەیان ئەویتر تەواو دەکات و بێ ئەویتر نابێت. بەڵکو هاوسەنگ و تەواوکەری یەکترن!

شاعیرێکی جاهیلی دەڵێ:

**ومن يجعل المعروف في غير أهله     يكن حمده ذما عليه و يندم**[101]

(واتە: کەسێك چاکە لەگەڵ غەیرە کەسوکاری خۆی بکات، ئەوا چاکەکەی گلەیی لێ دەکرێت وپەشیمان دەبێتەوە – وەرگێڕ)

لێرەدا دەبینین شاعیر باسی دوو کۆمەڵە خەڵك دەکات، یەکیان گلەیی لەچاکەکار دەکات ودەیەوێ ناوی بزڕێنێ. کۆمەڵێکی دیکە لەوانەیە ئەم کارە نەکات. ئەو دوو کۆمەڵە خەڵکە هەردووکیان لە بیابان بوونیان هەیە. کەسانێك هەن بە پاڵنەری وەفاداری کار دەکات ڕووبەڕووی ئیرەیی دەبنەوە. کەسانێکی دیکەش هەن پێچەوانەی ئەمانەن. هەموویان لەیەك سروشتن، بەڵام جیاوازی نێوانیان لە زاڵبوونی یەکێك لەپاڵنەرەکان دایە.

لەیەکێك لە پەندەکانی بەدوەکان هاتووە" خۆت لەشەڕی ئەوکەسە بپارێزە چاکەت لەگەڵ کردووە". لەوانەیە خوێنەر ئەم پەندەی بەلاوە سەیر بێت، چونکە ئەو دەبینی لەلایەك بەدوەکانی هانی مروەت دەدەن، لەلایەکی دیکە خەڵك لەئەنجامدانی مروەت هۆشیار دەکەنەوە. وا خەیاڵ دەکەم ئەمە تەنها دژایەتیەکی

[101] الحسين بن أحمد الزوزني ( المصدر السابق) ص ١٠٣

رووکەشە، ئەگینا رۆشنبیری بیاباننشینی هەمیشە هانی مروەت دەدات، سەرەڕای ئەوەی ئەم مروەتە ئەنجامی خراپی لێ دەکەوێتەوە. وەك ئەوەی بەکەسێك بڵێی: چاکە لەگەڵ خەڵك بکە، گوێ بەوە مەدە خراپەت لەگەڵ دەکەن. بەمروەتی سەرفرازی و سەربڵندییە، باجەکەشی گەورەیە. وەك شاعیرێك دەڵێ" لەپێناو هەنگوین، دڕکی هەنگ قبوڵ دەکەین".

ئیرەیی لەبیاباننشینیدا:

ئیرەیی خەسڵەتێکی مرۆییە هیچ کەسێك نییە خالی بێت لێی، هەرکەسێك بێت، جا لەبەرئەوەی رکابەریی و کێبڕکێ لەژیانی کۆمەڵایەتی هەیە، ئەوا دەبێت ئیرەییش روویەك بێت لەرووەکانی. لەوانەیە ئیرەیی لەلای کەسانێك وخەڵکانێك لاواز یان بەهێز بێت، بەپێی جیاوازی هۆکارە دەروونی وکۆمەڵایەتیەکانیان، بەڵام دەبێت لەهەر هەموویان هەبێت.

پەندێکی باو هەیە دەڵێ" چاو حەز ناکات لەخۆی راستر ببینێ" یانیش دەڵێ" دوژمنی مرۆ ئەو کەسەیە کاری ئەو دەکات". نموونەی ئەم جۆرە پەندانە لەهەموو زمانەکانی جیهان زۆرە، هەموشیان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە مرۆڤ بەشێوەیەکی گشتی جۆرێك لەرقی هەیە لەو کەسانەی رکابەری لەسەر شتێك لەگەڵ دەکەن یان لەو باڵاترن، ئەمەش بەئیرەیی و حەسادەت ناودەبرێت.

هەرچۆنێك بێت، دەتوانرێت بگوترێت ئیرەیی لە بیاباننشینی بەهێزتر وتوندترە نەوەك لەشارستانیەت، ئەمەش چەندین هۆکاری جیاجیای هەیە، کە بەمانەی خوارەوە پوختیان دەکەینەوە:

یەکەم: هەرچەندە ئیرەیی لەشارستانیەت بەهێز بێت، شارنشینان لەسەر ئاکاری موجامەلە وخۆهەڵواسین لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان راهاتوون. ئەوان ئەگەرهاتوو ئیرەییان هەبوو ئەوا هەوڵدەدەن بەدەموورووی شیرین و دروزنانە ئیرەییان بشارنەوە. کەچی بەدو دژی ئەو نەریتەیە، درۆ وخۆهەڵواسین بە نیشانەکانی لاوازی وملکەچی دەزانێت. حکومەت نییە سەرکوتیان بکات و باجیان لێ وەربگرێت، بۆیە ناچار نییە، ئاکاری ملکەچی و درۆ وفرتوفێڵ بەکاربهێنن، وەك ئەوەی شارنشینەکان لێی راهاتوون. بەدو بەراشکاوی و رووبەرووبوونەوە

راهاتووە، بۆیە بەلای ئەستەمە کەفوکوڵی سۆزی خۆی سەرکوت بکات. ئەو ئەگەر رقی لەیەکێك بێتەوە یان ئیرەیی پێ ببات، ئەوا بەروونی لەسیمای دیارە. دوودڵ نییە لەوەی وشەی بریندارکەر وجنێو بە بەرامبەرەکەی بدات. زۆرجاریش شەڕ وپێکدانان لە رۆژگاری جاهیلەت لەئەنجامی ئەمە روویداوە، وەك لە بەشی پێشوو بینیمان.

دووەم: شارستانیەت، بەتایبەتی کۆنەکەی، بەخەسڵەتێك جیا دەکرێتەوە، ئەویش بوونی سیستەمی چینایەتییە. ئەو سیستەمەش دەتوانێ مەیلی ئیرەیی لەلای خەڵك لاواز بکات. تاك هەستی بەوە دەکرد زەحمەتە چاو لەپێگەی ئەوکەسە ببڕێت کە ئاستی چینایەتیەکەی لەو بەرزترە، بۆیە قەناعەت ورەزامەندبوون بە بەشی خودا بەسەری زاڵ دەبوو. بۆیە دەکرێت بگوترێت کێبرکێ لە شارستانیەت بەشێوەیەکی رێژەیی، لەچوارچێوەیەکی بەرتەسك ئەنجام دەدرێ، ئەو چوارچێوەیەش چەندین لەبەرچاوگرتن وکۆتە چینیەتییەکانی خەڵك دیاریان کردووە.

کەچی لەبیابانشینی بارودۆخەکە جیاوازە. بەدوەکان تەنها کەمێك لەبارەی سنووری چینایەتی دەزانن. سیستەمی هۆزگەری لەلای ئەوان بەهێزترە لەسیستەمی چینایەتی. ئەوان لەناوەوە هەست بەوە دەکەن کە لەیەك پشت و رەچەڵەکن، کەسێك جیاوازی لەوانی دیکەی هۆزەکەی نییە، تەنها بەهۆی چەند توانستێکی کەسی نەبێت وەك بەخشندەیی وئازایەتی وئەمجۆرە خەسڵەتانە. نکۆڵی لەوە ناکەین هەندێکجار فرمانڕەوایی هۆز لەلایەن خێزانێکی دیاریکراو قەتیس دەبێت، بەڵام ئەمە بابەتێکی جێگیر نییە بەپێی تێپەڕبوونی رۆژگار دەگۆڕێت. دواتر فرمانڕەوایی لەخێزانێکەوە بۆ خێزانێکی دیکە دەگوازرێتەوە. ئەو خێزانەی پیاوێکی بەتواناى بۆ سەرۆکایەتی لێ هەڵدەکەوێ، ئەوا بێگومان پێگەکەی لەناوهۆز بەرزدەبێتەوە، زوو یان درەنگیش فرمانڕەوایی لەدەست ئەو خێزانە نامێنێ. ئەمەش مانای ئەوەیە کێبرکێ لەسەر پێگەی بەرز لە بیابان توندە، ئەمەش دەبێتەهۆی ئیرەیی لەنێوانیان. ئیبن خەلدون ئاماژەی بۆ ئەو دیاردەیە کردووە و دەڵێ" ئەوان رکابەری لەسەر فرمانڕەوایی دەکەن، بەدو

فرمانڕەوایی رادەستی کەسی دیکە ناکات، تەنانەت ئەگەر باوك وبرا وسەرۆك هۆزەکەشی بێت، تەنها ئەگەر لەبەر ئابرووی خۆی ناچار بێت."[102]

سێیەم: شارستانیەت لەسەردەمی نوێدا، دەیەوێ ئەو کۆتەی چینایەتی کەم بکاتەوە، کە لەرابردوودا هەبوو. بۆیە زۆرێك لەخەڵك دەتوانن بەپێی توانای کەسی وباروئۆخی تایبەتیان بەپلەکانی چینایەتی بەرزببنەوە. لەمەشدا ئەو کێبرکێی وئیرەییان لەنێودا نییە کە لەناو بەدوەکان هەیە. دەتوانین هۆکاری ئەمەش بۆ سروشتی شارستانیەتی نوێ بگێڕینەوە. ئەو هۆکارانەی چاپ وگواستنەوە وگەیاندن کە لەشارستانیەتی نوێ فەراهەم بووە، وا دەکات کەسێکی دەرکەوتوو لەسەرتاسەری وڵاتەکەی ولەسەرتاسەری جیهانیش لایەنگر وسەرسامی بۆ پەیدابێت. لەنێو ئەو هەوادار ولایەنگرانە بێگومان کەسانێکی بەئیرەیی هەن دەیانەوێ پیلانگێری بۆ کەسە بەناوبانگەکە بکەن، بەڵام کاتێك ئەو کەسانە بەراورد دەکرێن بە لێشاوی هەواداران ئەوا زۆر کەمن، بۆیە ناچارن لەبەرامبەر ئەو تەوژمە ئیعتراف بە دەرکەوتنی کەسەکە بکەن.

بەهەرحاڵ، ئەستەمە ئەمە لەبیاباننشینی بدۆزینەوە. لەراستیدا ئێمە نکۆڵی لەوە ناکەین کەسانێك هەبوو لەناو بەدوەکان ناوبانگێکی فراوانیان لەبیابان پەیداکرد، بەڵام ئەوانە ژمارەیان کەمە، زۆرجاریش دوای مردنی ئەو ناوبانگەیان وەرگرتووە. لەژیانیاندا ئیرەییان زیاتر لە سەرسامبوون بینیوە.

کەسێکی بەدو هەرکە بەهۆی توانستە کەسییەکانی خۆی بەرز دەبێتەوە، ئەوا کەسانی بەئیرەیی وحەسود لەدەوروبەری زیاد دەبن، ئەوان دەیانەوێ رێگری لێ بکەن و بەسەری زاڵ بن. هەر یەکێك لەوان لەخۆی دەپرسی: بۆچی ئەوکەسە پایەی لەمن بەرزتر بۆتەوە؟ ئایا ئەو لەمن باشترە وئازایەتی وبەخشندەیی لەمن زیاترە؟ ئەو کاتە هەست دەکات، مەیلی ئەوەی هەیە بەدوای نەنگییەکانی پیاوەکە بگەڕێت وبەنهێنی وئاشکرا لەبەهای کەم بکاتەوە.

هۆزەکانی بیابان، بەشێوەیەکی رێژەیی بچووکن، تاکەکانی بەشێوەیەکی شەخسی یەکتر دەناسن. ئەم جۆرە ناسینەش ئاستی ئیرەیی لەنێوان تاکەکان

[102] ابن خلدون (المقدمة) ص ١٢٦

بەرزەکاتەوە. هاوشێوەی ئەمەش لەلای شارنشینەکان دەبینن کاتێ لەیەک گەڕەک دەژین، بەڵام جیاوازییەکە ئەوەیە شارستانیەت توانستی ئەوەی بەتاک بەخشیوە بەرەوجیهانێکی فراوان بچێت، پێگەی بەرز بەدەست بهێنێ، بێئەوەی کوری گەڕەک رێگری لێ بکات. کەچی لەبیابان تاک ناتوانێ لەپەیوەندی هۆزەکەی بپچڕێت، دەگمەن نەبێت. ئەو لەناو هۆزەکەی لەدایك دەبێت ولەوێش دەمرێت. هەر لەوێش مەینەتی حەسودەکان دەکێشێ. فەتاك و سەعلوکەکان نەبێت توانیان لەهۆزەکانیان دەربچن، ئەوانیش ژمارەیان کەم بوو.

**دووڕوویی لە بیابانشینیدا:**

وتمان بەدو مەیلیان بۆ راشکاوی وتەحەدیکردن هەیە، بۆیە رووخۆشی درۆزنانە لەلای ئەوان کەمە. ئەمەش مانای ئەوەیە دووڕوویی (النفاق) لەلای ئەوان لاوازە یان دەگمەنە، لەمەشدا لەگەڵ شارنشینەکان لەیەکتر جیاوازن، کەچی لێرەدا رووبەرووی کێشەیەك دەبینەوە. ئەویش ئەوەیە قورئان بە راشکاوی بەدوەکان بە دووڕوو وەسف دەکات" **الأعراب أشد كفرا و نفاقا و أجدر الا يعلموا حدود ما أنزل الله على رسوله...**"[103]. وەك دیارە وشەی (الاعراب) لەزمانی قورئاندا بەدوەکانن، بۆیە تەبەری لە تەفسیرکردنی ئەو ئایەتە دەڵێ: ئەعراب ئەو کەسانەن کە لە بیابان دەژین، سەرسەختترین کەسبوون لەبەرامبەر توحیدی خودا. لەخەڵکی ئاوەدانی، گوند وشارەکان، دووڕووتر بوون. لەبەر زوڵم ودڵڕەقی ئەوان، لەبەر ئەوەی کەمتر چاو لەخەڵکی چاکەخواز دەکەن، بۆیە خودا بەمشێوەیە وەسفی کردوون. ئەوان رەقترین دڵیان هەیە، کەمترین زانیاریان لەبارەی خوداوە هەیە"[104].

وەك دەردەکەوێت ئەو دووڕووییەی (نیفاق) کە قورئان و تەبەری باسی دەکەن، بەو مانایە نییە کە کۆمەڵناسی نوێ تێی دەگات. ئەوەی لێرەدا شایەنی باسە وشەی (نیفاق) زاراوەیەکە لەداهێنانی ئیسلامە بۆ وەسفکردنی کۆمەڵە خەڵکێك ئیسلامبوونیان راگەیاندووە، کوفریان شاردۆتەوە. ئەوانە زۆربەیان دوای هیجرەت

[103] القران، سورة التوبة، الاية : ٩٨
[104] أحمد أمين (فجر الاسلام ص٨٢)

بوون ولەدوای فەتحیش زیاتر بوون. بەمەبەستی هەلپەرستی و تەماعکاری ئیسلامبوونی خۆیان راگەیاندن، پێشبینی ئەوەیان دەکرد پایە ودەستکەوتیان هەبێت. لێرەوە ئیسلام جیاوازی لەنێوان (**المسلم**) و (**المؤمن**) کرد، لەو کاتەشدا ئەو ئایەتە دابەزی کە دەفەرموێ" **قالت الاعراب امنا، قل لم تؤمنوا ولكن قولوا اسلمنا و لما يدخل الايمان في قلوبكم...**"[١٠٥]

بەهەرحاڵ، بەو مانایە بێت کە ئێستا ئاماژەکان بۆ کرد، زۆرترین بەدو لەسەردەمی پێغەمبەر ودوو خەلیفەکەی دوای ئەو، مونافیق بوون. واتە ئەوان بەرواڵەت ئیسلام بوون کەچی لەناخی دڵیانەوە هێشتا جاهیلبوون بۆ بەها کۆمەڵایەتی و مەیلە دەروونییەکانیان.

لەوانەیە یەکێك بڵێ، ئێستاش هەروایە، بەهەکانی بیاباننشینی بەسەریان زاڵە وسەرەرای باوەڕی ئیسلامییان. لەراستیدا جیاوازییەکی زۆر لەنێوان ئەو بارودۆخەی ئێستا وبارودۆخی سەرەتای بانگەوازی ئیسلام هەیە. ئەوان ئەوکات بۆ باوەڕە نوێیەکەیان دڵسۆز نەبوون، تەنها بەرواڵەت ئیسلام بوون. کەچی باوەڕەکە دواتر لەدەروونیان قوڵدەبێتەوە وبەرە بەرە دواجار دەبنە توندترین کەس لەباوەڕهێنان بەئایینەوە. لەگەڵئەوەشدا دەبێت ئیعتراف بەوە بکەین باوەڕیان رێگری نەکردووە لە دەمارگیری وداگیرکاری وتۆڵکردنەوە وهەموو بەهاکانی دیکەی بیاباننشینی. ئەوان دژایەتیەك لەنێوان پابەندبوونی توند بە عەقیدەی ئیسلام و پابەندبوونی توند بەبەهاکانی بەدو نادۆزنەوە، لەوانەشە ئەمە بە رەسەن بزانن[١٠٦].

بەدوەکان ئێستاش هەروەك سەردەمی جاهیلیەت خاوەن راستگۆیی وراشکاون، بەکەمی نەبێت، ئەگینا دووڕوویی ونیفاقیان تێدا نییە. لەو لایەنەوە ئەوان لەشارنشینەکان ئاکاریان بەرزترە. عەباس عەزاوی مێژوونووس لەبارەی بەدوەکانی ئەم سەردەمەمان دەڵێ" هەندێك خەسڵەت هەیە لەلای بەدوەکان هەیە، زۆرجار لەلای شارنشینەکان نایدۆزینەوە. بیاباننشینی پەیوەست بووە بەراستگۆیی، دوور بووە لەفێڵ ودرۆ، کەچی شارنشینەکان لەزۆربەی ئەو

---

١٠٥ القران، سورة الحجرات، الاية ١٤

١٠٦ Jamali( The new Iraq ) p46

وەسفانەوە نزیکن... ئەمەش وایکردووە پیاوی شارنشین لەمامەڵەکردن لەگەڵ بەدو لەخۆی دڵنیا بێت ، لەبەرامبەریشدا بەدو لە خەڵکی شار وفیلبازیان بترسێت.."[107].

هەروەها عەزاوی دەڵێ" هەر چۆنێك بێت بەدو، داگیرکاری وتالان وکوشتار دەکات، بەلام درۆ وتەڵەکە ناکات وناپاکی لەسپاردە ناکات. ویژدانی ئازادە، راشکاوە، داوێن پاکە لەزۆربەی حاڵەتەکاندا ...".

پوختەی قسەکانمان ئەوەیە، پیاوی بەدو لەدرۆ و دووڕوویی و فرتوفێڵ و کوشکێشی[108] سڵ دەکاتەوە، چونکە ئەمانە بە ئاکاری ملکەچی دەزانێت، کە تووشی شارنشینەکان بۆتەوە. بەدو خۆی بەسوارچاك و پیاو دەزانێ. ئاکاری سوارچاکیش پێچەوانەی ئاکاری زەلیل و بێ دەسەلاتانە.

ئیبن خەلدون ئاماژەی بۆ ئەو جیاوازیەکانی نێوان ئاکاری بەدو وشارنیشینەکان کردووە. جیاوازییەکانیشی داوەتەپاڵ دوو هۆکار: حکومەت و خۆشگوزەرانی. شارنشینەکان ملکەچی سەرکوتکاری حکومەت دەبنەوە، بۆیە ناچار دەبن رەفتاری دووڕوویی ودرۆ و کوشکێشی، بۆ ئەوەی ستەم و زوڵم دەسەلاتدارن بشارنەوە. جگەلەمەش ئەوان لەهەندێك رووەوە خۆشگوزەرانن، لەبابەتی رازاندنەوە ماڵ وجلوبەرگ وخواردن وسواربوونیان راهاتوون، بۆیە ناچارن هەڵپەی پەیداکردنی سامان دەکەن وپەنا بۆ هەموو هۆکارێکی رەوا ونارەوا دەبەن، درۆ دەکەن، فرتوفێل دەکەن ....

بەلام بەدو بەشێوەیەکی رێژەیی لەمانە دوورە. ژیانیان لەوپەڕی سەختی وسادەیی دایە. حکومەتیان نییە ستەمیان لێ بکات وباجیان لێ وەربگرێت. بۆیە ئاکاریان زیاتر نزیکترە لە زگماکی. خۆنواندن و خۆهەڵکێشانی تێدانییە، بەراشکاوی و رووبەرووە[109].

**بەجیگەیاندنی بەڵێن:**

---

[107] عباس العزاوي (عشائر العراق) ج١ ص ٣٩٢- ٣٩٤

[108] وشەی کوشکێشیمان لە بری (موجامەلە)ی عەرەبی بەکارهێناوە. وشە کوردییەکە لەنێو کوردەواریدا پێشتر بەکاردەهات. کاتێك یەکێك لەبەر بەرژەندی قسەی خۆشی لەگەڵ یەکێك بکردایە.وەرگێڕ

[109] ابن خلدون (المقدمة) ص ١٢٣ـ ١٢٧

پێشتر باسی سروشتی وەفاداری (بەدو)مان کرد لەبەرامبەر چاکەکاریدا. ئێستا دەمانەوێ باسی سروشتی وەفاداریی بکەین بۆ بەجێگەیاندنی بەڵێن.

بەشێوەیەکی گشتی وەك زانراوە بەدووەکان رێز لەبەجێگەیاندنی بەڵێن دەگرن. ئەو وشانەی بۆ بەڵێنێك لەدەمیان دەردەچێ، پابەند دەبن پێیەوە، وەك قەرزێکی دادەنێن دەبێت وەفادارییان بۆ دانەوەی هەبێت. بۆیە دەبینین لەیەکێك لە پەندەکانیان هاتووە" بەڵێنی مرۆی ئازاد قەرزە". لە زۆر دێری شیعری جاهیلیش ستایشی وەفاداریی و زەمی خیانەت و بێوەفایی کراوە.

لێرەدا لەبەردەم کێشەیەك دەوەستین. شیعری جاهیلی سەرەڕای ئەوەی لەچەندین دێڕ ستایشی وەفاداریی دەکات، کەچی لەهەندێك لەدێڕەکانی ستایشی ناپاکی وبێوەفاییش دەکات. یەکێك لەشاعیرەکانی جاهیلیەت دەڵێ:

**قبح الاله بني كليب انهم   لايغدرون و لا يفون لجار**[110]

(واتە: خوداوەند (بنی کلیب) دزێو بکات، ئەوان نە ستەم دەکەن و وەفاشیان بۆ دراوسێ نییە- وەرگێڕ).

لەو دێڕەدا دەبینین شاعیر زەمی وەفا وغەدەر بەیەکەوە دەکات. ئایا ئەمە دژ بەیەکترە؟ دەتوانین بڵێین ئەو دژ بەیەکترەی لەو دێڕە شیعریە دەبینرێت رووکەشە وراستەقینە نییە. ئەگەرهاتوو لەژێر رۆشنایی خەسڵەتی گشتی رۆشنبیری بیابانشینی تاوتوێی بکەین ئەوا دەزانین چ نهێنییەکی لەپشتەوەیە.

ئەوەی لەو بارەیەوە شایەنی باس بێت ئەوەیە: وەفاداری بەدو جیاوازی لەگەڵ وەفاداریی شارستانیەت هەیە. شارنشینەکان کاتێك وەفادار دەبن، چونکە دەزانن وەفاداری سودی بۆ بازرگانی وپیشەی ئەوان هەیە. ئەو بازرگانەی لەنێو خەڵك خاوەن قسەی خۆی نەبێت ئەوا زوو یان درەنگ لەکارەکەی سەرناکەوێ. پێگەی بازرگانی ئەو بەندە بە بەڵێن وقەرزەکانییەوە. ئەمەش مانای ئەوەیە وەفاداری شارنشین بنەمایەکی بەرژەوەندی ماددی هەیە.

کەچی وەفاداری بەدو بنەمایەکی دیکەی هەیە. زیاتر پەیوەستە بە خەسڵەتی رۆشنبیری بیابانشینەوە. واتە لەسەر بنەمای هێز وخۆسەپاندنە. پیاوی بەدو بۆ

[110] المصدر السابق ، ص ٢٨٥

بەڵێنی خۆی وەفای نییە، تەنها کاتێك نەبێت کە دەزانێ وەك هێمایەکە بۆ هێز ومروەتی خۆی، بەڵام کاتێك زانی ئەو وەفادارییە هێمای لاوازییە ئەوا ئەو کات دەبێتە ناپاك و پشت لەبەڵێنەکەی دەکات، لەمەش شانازی بەخۆیەوە دەکات.

پیاوی بەدو لەخۆیەوە دەچێتە لای ئەو کەسەی بەڵێنی پێداوە، یان راسپاردە وقەرزێکی لایە. ئەو کاتە وادەزانێ مروەتی خۆی نواندوە وسەرکەوتووە نەوەك ژێرکەوتوو. بەڵام ئەگەر پیاوێك هات داوای بەڵێنێکی لێکرد ویانیش پێداگری کرد وتەحەدای کرد. ئەوا پیاوی بەدو لەوکاتەدا وەفاداری بەهەرەشەیەك دەزانێ بۆ سەر کەرامەتی خۆی و بەنیشانەی بێهێزی دەزانێ، بۆیە بەهەموو شێوەیەك بەرەو رووی دەبێتەوە.

یەکێك لەشاعیرەکانی جاهیلیەت ستایشی خۆی و قەومەکەی دەکات و دەڵێ:

**فما يستطيع الناس عقدا نشده    وننقضه منهم و ان كان مبرما** [111]

(واتە: خەڵك ناتوانن خۆیان لەگرێبەستێك لابدەن کە ئێمە ئەنجاممان داوە، دەشتوانین پاشگەزبینەوە، تەنانەت ئەگەر گرێبەستەکە بەسترا بێت. وەرگێڕ)

مەبەستی شاعیر لەو دێرە شیعرە ئەوەیە، گوایە هۆزەکەی زاڵە، دەتوانێ پابەند بێت بەبەڵێن، دەشتوانێ پاشگەزبێتەوە، بەخواستی خۆیان، ئەوان لەهیچ کەس ناترسن و ملکەچ نابن، هەرچەندە کەسەکان بەزەبریش بن.

**دڵسۆزی لە بیابانئشینیدا :**

مەبەست لە ( وەلاء) لێرەدا ئەوەیە مرۆڤ لایەنگری هاوپەیمان، سەرۆك، گروپەکەی بکات لە ناخۆشیدا. لێیان جیا نەبێتەوە ولەپشگیریان سڵ نەکاتەوە، ئەمەش جۆرێکە لە وەفاداریی وهەندێکجاریش بە(دڵسۆزی) ناودەبرێت.

دەمانەوێ بپرسین: ئایا بەدو وەلائی هەیە یان نا؟ حافز وەهبە بە (نەخێر) وەڵامی ئەو پرسیارە دەداتەوە. ئەو دەڵێ" بەدو دڵسۆزی لەدڵ نییە. خەسڵەتەکەی دووڕوویی و ڕیابازییە. میرەکان پشت بە هێز و ژمارەی بەدوەکان نابەستن. زۆر جاریش بەدو خراپەن بەسەر ئەو میرەی لەسەنگەری ئەو دەجەنگن، چونکە خەریك دەبێت لەشکست نزیك دەبێتەوە، دەبینی بەدوەکان سامانەکەی

---

[111] المصدر السابق ص ٢٨٥

تالآن دەکەن بەبیانوی ئەوەی سامانەکە بۆ ئەوان بێت باشترە نەوەک بۆ دوژمنان. هاوشێوەی ئەم دیاردەیە لەسەروبەندی جەنگی یەکەمی جیهان روویدا، ئەمەش ئەفسەرێکی بەریتانی سەرسام کرد، کە ئایا چۆن کەسێك هاورێیەکەی خۆی تالآن دەکات، بەلآم لەبیاباندا شتێك نازانرێ جگە لە تالآنکاری نەبێت ودەستکەوت وغەنیمەش لەپێش هەموو شتێکە..[112].

بەبروای من بەرێز وەهبە لەتێگەیشتنی بۆ سروشتی بیابانشین هەڵەی کردووە، وەك چۆن ئەفسەرەکەی ئینگلیزیش هەڵە تێگەیشتووە. نکۆڵی لەوە ناکەین وەهبە تێکەڵ بە بەدو بووە، هەندێك جار لەنێویان ژیاوە، ئەی چۆن ئەو یەکێك بووە لە وەزیرەکانی شا عەبدولعەزیز بن سعود، بەلآم مەزندەی ئەوە دەکەم ئەو لەدەرەوەی سەیری بیابانشینی بکات، لەوانەشە بەتێروانینی خودی مەلیك عەبدولعەزیز لە بەدوەکان بروانێ.

شایەنی باسە مەلیك عەبدولعەزیز لەسەرەتای فرمانرەواییدا پشتی بەسوپایەك دەبەست لە هۆزەکانی بەدو پێکهاتبوو. زۆرجار مەینەتی بەدەست ناسەقامگیری ونا دڵسۆزی ئەوانەوە هەبوو. ئەوان لەگەڵی دەبوون کاتێك هەستیان بەسەرکەوتنی ئەو دەکرد، بەلآم کاتێك نیشانەی ژێرکەوتن ولاوازیی لێ دەردەکەوت ئەوا بەدوەکان پاشەکشەیان دەکرد. لەوانەش ئەمە وایکردبێ بەرێز وەهبە بە نادڵسۆزی ونەبوونی (وەلا) وەسفی بەدوەکان بکات.

خەریکە باوەری ئەوەم هەبێت، بەدوەکان لەهەموو کەسێك زیاتر دڵسۆزیان هەیە، بەلآم دەبێت ئەم دڵسۆزییە بە پێوانەی بیابانشینی وخەسڵەتی رۆشنبیری کۆمەلآیەتی ئەوان پێوانە بکرێت. هەردەم بەدو وەلائێکی توندی بۆ هۆز وسەرۆك وهاوپەیمانەکانی هەیە. لەوانەشە لەتەنگانە گیانی خۆی فیدا بکات. لە مێژووی بیابانشینیدا نموونە وبەسەرهاتی زۆر هەیە جەخت لەسەر ئەو قسەیەکان دەکاتەوە. لەگەڵئەوەشدا پێشبینی ئەوە ناکەین بەدو دڵسۆزی بۆ هێزێکی بیانی هەبێت، کە لەبەر هەر هۆییەك چۆتە ریزەکانییەوە. دڵسۆزییەکەیان بۆ ئەو هێزە

---

[112] حافظ وهبة (جزيرة العرب في القرن العشرين) ص ١٠، و ص ٢٧٥

بەقەد دڵسۆزیان نییە بۆ هۆز و سەرۆکی خۆیان. لێرەدا ئەوان جیاوازییان هەیە. لەڕۆشنایی بەهاکانی بیاباندا هەر حاڵەتێك حسێبی خۆی بۆ دەکرێت .

بەدوەکان لەوە راهاتوون بچنە ریزی هەر بزووتنەوەیەکی نویێ، کە لەناویان دروست دەبێت، ئەمە کاتێك کە پێشبینی سەرکەوتن ودەستکەوت لەو بزووتنەوەیە دەکەن، بەڵام کاتێك هەندێك نیشانەی ژێرکەوتن ودۆڕان بەدی دەکەن، ئەوا بەپەلە لێی دوور دەکەونەوە. لەوانەشە لەکاتی دۆڕاندا بیانەوێ تاڵانی ئەو سامانانە بکەن کە هی خاوەنی ئەو بزووتنەوەیەیە.

وا مەزندە دەکرێت لەشێوەی ئەو هەڵگەڕانەوەیە، کەم تا زۆر لەسەروبەندی بزووتنەوەکانی وەهابی لەنیوەی سەدەی هەژدەمەوە لەبیابانی عەرەب روویداوە. ئەو بزووتنەوانە جار لەدوای جار لەهەڵکشان وداکشان بوو، جارێك سەر دەکەوت وجارێك ژێر دەکەوت. من وا خەیاڵ دەکەم هێزەکانی بەدو لەکاتی سەرکەوتن دەچوونە پاڵیان و لەکاتی ژێرکەوتنیش پاشکشەیان لێ دەکردن.

بەدوەکان لەهەموو قۆناغەکانی مێژووی خۆیان لەو جۆرە هەڵگەڕانەوانە راهاتوون. ئێمە کاتێك بە رۆشنبیری شارستانی خۆمان سەیری ئەو هەڵگەڕانەوانە دەکەین، ئەوا بەدوەکان بە دووڕوو وریاباز، یانیش بەنادڵسۆز وەسفیان دەکەین، بەڵام لەراستیدا ئەوان وا نین. هەمووان لەسەر هەموو هەڵسوکەوتیان لەسەر پلانێکی نەگۆڕاو دەڕۆن، ئەوان دووڕوو نابن لەگەڵ ئەو پلانە. ئەوان هەردەم بەبایەخەوە سەیری سەرکەوتن وغەنیمە ودەسکەوت دەکەن، لەپێناویشیدا راستەڕێ دەڕۆن ولێی لانادەن وهەڵناگەڕێنەوە. سەبارەت بەو هەڵگەڕانەوەیەی تێبینمان کردووە ئەوا بۆ گۆڕانکاری بارودۆخی دەوروبەریان دەگەڕێتەوە، یان بەواتەیەکی دیکە ئەوان خۆیان هەڵناگەڕێنەوە بەڵکو بارودۆخەکەیان هەڵدەگەڕێتەوە. ئەوان لەسروشتی خۆیان جێگیرن و نازانن رۆژ لەدوای رۆژ بیگۆڕن.

کاتێك سەرۆکێکی شارنشین هاریکاری هۆزەکانی بەدوی دەوێ، ئەوا دەبێت لەو سروشتەیان تێبگات بەر لەوەی لەگەڵیان تێوەبگلێ. جا کاتێکیش دوای پشتگیری، پاشکشەیان کرد ئەوا ئەو سەرۆکە هەقوایە تەنها گلەیی لەخۆی بکات.

بۆچوونی ولفرێد تیسنگەر (Welfred Patrick Thesiger)

تیسینگەری توێژەر لەباری بیابانیشینی توێژینەوەیەکی تێروسەلی هەیە. ئەم توێژەرە جلوبەرگی بەدوی پۆشیبوو و سواری حوشتر بوو، جا لەگەڵ هاوڕییەکانی بەبیابانی عەرەبی دەڕوا. دواتر کتێبێك بلاودەکاتەوە، تێیدا بەوردی باس لەخەسڵەتەکانی بەدو دەکات. ئەو بابەتەی زۆر سەرنجی راکێشاوە وسەرسامی کردووە ئەوەیە زۆر خەسڵەتی دژ بەیەکتری لەبەدوەکان بینیوە. ئەو پێیوایە بەدووەکان توندڕەویی لەهەموو رەفتارەکانیان دەکەن، دەڵێ" ئەوان تاڕادەی زێدەڕۆیی بەخشندە دەبن، یانیش زۆر (بگر) دەبن تا ئاساتێك باوەڕ ناکرێت. زۆر دان بەخۆیان دەگرن، یانیش تا ئاستی هیستریا هەڵدەچن. باوەڕ ناکرێت چەند ئازان، کەچی هەندێکجار بێ هۆکاری دیار زۆر ترسنۆك دەبن"[١١٣].

ئەو توێژەرە وەسفی بەخشندەیی بەدوەکان دەکات وئەوە دەگێڕێتەوە لەبیابانی سوریا لەلایەن کۆمەڵێك بەدو میوانداری کراوە، خوانێکی گەورەی برنجی لەبەردەم دانراوە لەگەڵ بەرخێکی برژاو، کە بۆ ئەو سەر براوە، هێندەش چەوریان بەسەردا کردووە، تا بەسەر لمەکە رژاوە، کاتێك تیسینگەر لەو نارەزایی نیشان داوە، ئەوان وتوویانە" سەد جار بەخێرهاتی" ئەو زێدە بەخشندەییە، هەردەم تیسینگەری نیگەران کردووە، چونکە زانیویەتی بۆ چەند رۆژێك برسی دەبن. لەگەڵئەوەشدا کاتێك بڕیاری رۆیشتنی داوە ئەوان هەوڵیان داوە رازی بکەن بەوەی بمێنێتەوە.

لەلایەکی دیکەوە تیسینگەر کۆمەڵێك بەدوی بینیوە، بەدەنگی بەرز، دەمەقاڵیان بووە دەستیان بۆ ئاسمان راتەکاندووە. کێشەیەکەش کۆن بووە لەسەر چەند دەرهەمێك بووە. تەنانەت وا خەیاڵی کردووە هیچ نەتەوەیەك نییە لەدونیا ئەو خۆشەویستیە بەهێزەی بۆ پارە هەبێت، بەڵام ئەو لەوکاتەدا شتێکی دیکەی بیر دەکەوێتەوە. یەکێك لەو کەسانەی دەمەقاڵیان دەکرد، لەبۆنەیەکدا

---

[١١٣] ولفريد ثيسيغر (رمال العرب) تعريب هاجر وعبدالستار ص ١٧٥

وەك بەخشندەیی تاکە مەندیلەکەی خۆی بە هاوڕییەکەی داوە، کە ئەمەش لەلایەن هیچ مرۆڤێکەوە ناکرێت بەدو نەبێت[114].

لێرەدا دەمانەوێ بۆ ماوەیەکی کورت لەسەر بۆ چوونەکانی تیسینگەر بوەستین. ئەوەی تێبینی دەکرێت ئەو بەدوەکانی خۆشدەویست وسەرسام بوو بەخەسڵەتەکانیان، کەواتە ئەو وەك ئۆلیری و ئەوانی دیکە هێرشیان ناکاتەسەر، بەلام لەگەڵئەوەشدا بە خەسڵەتە دژبەیەکەکان وەسفیان دەکات. وەك دەردەکەوێت سەرەڕای ئەوەی تیسینگەر زۆر هاموشۆی ناو بەدەوەکانی کردووە، کەچی بەشێوەیەکی زانستی قوڵ لەوان نەگەیشتووە، بەڵکو لەتێڕوانینی بۆ ئەوان کاریگەر بووە بە پێوەرەکانی شارنشینی.

ئەوەی بەتایبەتی سەرنجی تیسینگەری ڕاکێشاوە، بابەتی بەخشندەیی وقرچۆکییە. ئەوان خۆشەویسترین شتی خۆیان بۆ میوان دەبەخشن، لەلایەکی دیکەوە لەسەرچەند درهەمێك دەکەونە شەڕ وململانێیەوە. لەڕاستیدا ئەمە دژ بەیەك نییە. ئەوان لەسەر پارەیەکی کەم بەشەڕ دێن کاتێك دەزانرێت لەرێگای ناچارکردن وخۆسەپاندن لێیان وەردەگیرێت. ئەوان حەزناکەن ژیرکەوتوو بن لە هەرشتێکدا هەرچەندە شتەکە بەهاشی کەم بێت. وەك پێشتر باسمان کرد کاتێك میوانیش دێت یان کەسێك هانیان بۆدەهێنێ وداوای لێ دەکات دوو هێندە هاوکاری بکات، ئەوا پێی دەبەخشێ، چونکە بەتێڕوانینی ئەو ئەمە بابەتێکی پێچەوانەیە.

لەیەکێك لە پەندە باوەکانی بەدو هاتووە (**شیم البدوي وخذ عباته**). بەواتەی ئەوەی تۆ دەتوانی تاکە عەباکەی بەدو بەری ئەگەرهاتوو هانات بۆ برد وداوات لێکرد، بەلام ئەگەر ویستت بەهێزەوە عەباکەی لێ وەرگریت ئەوا لێت هەڵدەگەڕێتەوە لێ دەبێتە ئاژەڵێکی درندە، باکی بەوە نییە لە پێناو عەبا شڕەکەی بمرێت.

زەوتکردنی هەرشتێك لەپیاوی بەدو، مانای سوکایەتی وملکەچی دەگەینێ. زەحمەتترین شت بەلای ئەو، ئەوەیە بگەڕێتەوە لای کەسوکاری بزانرێت شتێکی

---

[114] المصدر السابق ص ١٧٤-١٧٥

بێمانای لێ زەوت کراوە. کەسوکارەکەی لەسەر لاوازییەکە وناجوامێرییەکەی سەرکۆنەی دەکەن. تەنانەت ژنەکەشی رقی لێ هەڵدەگرێت و بەشایەنی خۆی نازانێت، لەو حاڵەتشدا مردن باشترە نەوەك سەرشۆڕی.

زانراوە، بەدو کاتێك شتێك دەکڕێت مامەڵەیەکی زۆر دەکات. لە پەندێکی بەدوەکان هاتووە " مامەڵە بکات تا نێوچاوەنت ئارەق دەکاتەوە" هۆکارەکەش ئەوەیە حەزناکەن فرۆشیار یەك فلسیان زیاد لێ وەربگرێت. ئەو زیادەوەرگرتنە بەتێڕوانینی ئەوان جۆرێکە لە زاڵبوون، بەڵام کاتێك ئەو فرۆشیارە دوای ئەو مامەڵە دوور ودرێژە بێتە ماڵیان، چەندین جار زیاتر لەو پارەی مامەڵەیان لەگەڵ کردووە خواردنی پێدەدەن.

شارنشینەکان وا دەزانن ئەو رەفتارانەی بەدو دژ بەیەکترە، بەڵام لەراستیدا خاڵییە لە دژایەتی یەکتر. رەفتاری بەدو ناگۆڕێ ودژ بەیەکتر نییە. لەهەمو حاڵەتەکان ئەو مەیلی بەخۆزاڵکردنە، بۆ هەر کوێیەك بچێت ئەو مەیلەی لەگەڵدایە.

**فێڵکردن لە پیاوی بەخشندە:**

لەپەندێکی بەدوەکان هاتووە" ئەگەر بتەوێ فێڵ لەپیاوی بەخشندە دەکەیت" . وا هەست دەکەم ئەم پەندە لەو پەندە دەچێت کە پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد " رێزی بەدو بگرە، دەتوانی عەباکەی لێ وەربگری". تۆ کارێکت بە پیاوی بەدو بوو، ستایشی مروەتی ئەوت کرد، وا نیشانی بدەی گوایە لە دوورەوە لەبەر ناوبانگی بەخشندەیی و پیاوەتی ئەوهاتووی، ئەوا بەدوەکە دەکەوێتە هەوای خۆیەوە، هەرچییەکت بویێ پێت دەدا. خەڵك لەوە راهاتوون وا قسە لەگەڵ بەدو بکەن بڵێن" یا معود" واتە لە پیاوەتی و چاکە راهاتووە. ئێستاش ئەو وشەیە لەلایەن عێراقییەکانەوە بەکاردێت و تەنها نووسەری ئەو چەند دێرەش بێ مەبەست لەگەڵ ئەوان بەکاری دەهێنێ.

سلێمان فەیزی باس دەگێڕێتەوە، لەساڵی ١٨٩٩ لە ئامادەیی سەربازی، لەئەنجامی شەڕی نێوان قوتابیان فەسڵکراوە. ئەم رووداوەش بۆ ئەو کارەساتێك دەبێت نەجاتبوونی نەدەبوو، ئەگەر فرمانی سوڵتان نەبووایە لەئەستەنبوڵەوە. سلێمان پەنا دەباتە بەر عەبدولعەزیزی کوڕی رەشید کە ئەو کات میری نەجد

دەبێت، لەمیانەی ئەو سەفەرەیدا تووشی زۆر ناخۆشی دەبێت تا بە میر دەگات و داواکەی لێ دەکات، وەك دەزانین پێشتریش میری نەناسیوە، بۆیە میری بەدو پێی دەڵێ" موژدە بێت ئەی سلێمان داواکەت سەرکەوتوو دەبێت" لەدواییدا میر بروسکەیەك بۆ سولتان دەکات وداوای لێبوردن بۆ سلێمان دەکات وسەرەڕای ئەمەش داوای پلەیەکی دامەرزاندنی تایبەتی بۆ دەکات.."[115]

ئەوەی شایەنی باسە هەندێك لە شارنیشنەکانی ئەم رۆژگارەمان ئەم هەوای نەفسی سەرۆك هۆزەکانیان بەهەل زانیوە، بۆ هێنانەدی داواکارییەکانیان، ئەوان مستاوچیەتی بۆ ئەو سەرۆك هۆزانە دەکەن، وا دەزانن ئەوان فێڵ لەسەرۆك هۆز دەکەن، کاتێك لەرێگای ئەو کۆشکێنشییەوە داواکانیان بەجێ دەگەینن.
دەبێت ئەوە بزانین بەدوەکان بەشێوەیەکی گشتی، بەتایبەتیش سەرۆکەکانیان، زیرەکییەکی زگماکی وتوانای پێشبینیکردنیان هەیە، بۆیە فریو ناخۆن، بەڵکو وا خۆیان نیشان دەدەن، جا زۆرێك لە شارنشینەکان لەتێگەیشتنی ئەو خاڵەدا سەرکەوتوو نەبوون.

بەدو بەلایەوە گرنگ نییە کە تۆ بۆ پێداویستیەکی خۆت ماستاوچییەتی دەکەی، ئەو لەپێناو تۆ، چاکە لەگەڵ تۆ ناکات. بەڵکو دەیەوێ ناوبانگی باشی خۆی لەنێو هۆزەکان بلاوبێتەوە. کاتێك بۆ پێویستی خۆت هانات بۆ ئەو بردووە ئەوا ئەمە ستایشی راستەقینەیە بۆ ئەو. جا کاتێك بەزمان ستایشی دەکەی، یان درۆ دەکەی، بەتێروانینی ئەو گرنگ نییە. ئەو بەخشندەیە، بەخشندەش بەسروشتەکەی خۆی فریو دەخوات– وەك لەپەندەکە هاتووە.

**ئایینپەروەری لە بیابانشینیدا:**

ئولیری دەڵێ بەدوەکان زۆر مەیلیان بەلای ئایینەوە نییە[116]. زۆرێکیش لە توێژەر ورۆژهەلاتناسان، لەم بۆچوونەدا بەدوای ئەودا رۆیشتن. بەشێوەیەکی گشتی ئەوان پێیانوایە ئایینپەروەری لەناو بەدوەکان لاوازە. ئەوان وا سەیری ئایینپەروەری

[115] سليمان فضي (في غمرة النضال) ص ١٥ -٢٦
[116] De Lasi oleary (op. cit)p 20

بەدوەکان دەکەن، کەچۆن پێشتر بەتێڕوانینی شارستانییەوانە سەیری خەسڵەتەکانی دیکەی بەدوەکانیان دەکرد.

بەر لەهەموو شتێك دەبێت بزانین، ئایینپەروەری بەمانا کۆمەڵایەتییە گشتییەکە، سێ کۆڵگە لەخۆیەوە دەگرێت: ١- بیروباوەڕ ٢- ڕێورەسمەکان ٣- ئاکار. کاتێك تاوتوێی ئایینپەروەری بەدوەکان دەکەین، دەبینین دوو کۆڵگەی یەکەم بەروونی بوونیان هەیە وهیچیان کەمتر نییە لەشارنشینەکان. کەچی لەڕووی کۆڵگەی سێیەمەوە، کە ئەویش ئاکارە، ئەوا لە هەندێك ڕووەوە جیاوازیان لەگەڵ شارنشینەکان هەیە. بینیمان ئەوان ڕاستگۆ وداوێنپاك وراسپاردەپارێزن، کەواتە لەم لاینەوە ئەوان زیاتر لەئاکاری ئاینی نزیکن نەوەك شارنشینەکان. لەلایەکی دیکەشەوە ئەوان دەمارگیر وداگیرکەر وتۆڵەسێنن، لەم لایەنەشەوە شارنشینەکان لە ئاکاری ئایینەوە نزیکترن نەوەك بەدوەکان.

کەواتە بابەتەکە ڕێژەییە. ئێمە دەتوانین بەدو بە دیندار یان بە نادیندار بزانین، بەپێی ئەو لایەنی کە تێی دەڕوانین. ئیبن خەلدون لەبەشێکی کتێبەکەیدا دەڵێ" بەدو زیاتر لە شارنشین نزیکترە لە خەسڵەتی چاکەخوازی" مەبەستی ئەوەیە ئاماژە بۆ سروشتی ئەوان بکات کە زیاتر ئامادەییان تێدایە، بۆ قبوڵکردنی ئەو ڕێنماییە ئاکارییانەی ئاین هێناویەتی. بۆیە ئەوان نزیکتر لەزگماکی ودوورن لە داهێنراوەکانی شارستانیەت وبەدکارییەکانی[117].

پێشتر ئاماژەمان بۆ سروشتی نیفاق کرد لەلای بەدوەکان لەکاتی ئیسلامبوویان، وتمان دواتر بەرە بەرە نەما، بەتایبەتی ئەو کاتەی بەشداریان لە فەتحکردنی ئیسلامی کرد وسەرکەوتن وغەنیمەیان بەدەستهێنا. ئەبو جەعفەری نەقیب[118] دەڵێ" ئیسلام لەلای عەرەب قبوڵ نەکرا ولەدڵیان جێگیر نەبوو، تەنها دوای مردنی پێغەمبەر نەبێت. ئەو کاتە فەتحکاری ئەنجام درا وغەنیمە وسامان

---

[117] ابن خلدون (المقدمة) ص١٢٣

[118] ئەبو جەعفەر یەکێك بوو لە بیرمەندە گەورەکانی سەدەی شەشەمی کۆچی. بەداخەوە ئەو هیچ کتێبێکی دانەناوە؛ بەڵام ئیبن ئەبی حەدیدی مێژوونووس هەندێك لە بۆچوونەکانی بیستووە تۆماری کردووە، لە کتێبی (شرح نهج البلاغە) بەپەرتوبڵاوی دایناوە. بە بڕوای من ئەبو جەعفەر یەکێك بووە لە بیرمەندە کۆمەڵایەتیەکان بەپلەی یەکەن، ئەگەر ئەو کتێبێکی دابنابوایە ئەوا لەناوبانگ لەسەرووی ئیبن خەلدون دەبوو. عەلی وەردی

ودەسکەوتیان هەبوو، ئەو کاتە تامی ژیانیان کرد ولـەزەتی دونیایـان بینـی.. ئـەو فەتحکردنانـە ودەسـکەوتەکانیان وەك بەڵگـەی دروسـتی بانگەوازەکـە وراسـتی پەیامـەکیان دەزانـی. پێغەمبـەر بـەڵێنی فـەتحکردنی گەنجینـەکانی کیسـرا و قەیسـەری پێـدابوون، کـاتێکیش ئەمـەیان بـۆ هاتـەدی، پێغەمبـەریان بەمـەزن وشکۆمەند زانی. بەمەش گومـان ونیفـاق گاڵتـەکردنیان بـوو بـە ئیمـان ویـەقین و دڵسۆزی، ژیانیان بۆ فەراهـەم بـوو، دەسـتیان بەئایینـەوە گـرت، چـونکە رێگـەی بەدەستهێنانی دونیا بوو، ئایین و پێغەمەبەرەکەیان مـەزن کـرد. دواتـر پێشـینان ئـەما وکەسـانی دیکـە هاتنـە سـەر ئـەو بـاوەڕە حـارزە، بەلاسـایی پێشـینیان وەریانگرت. ئەمانیش رۆیشتن و بەهەمان شێوە کەسانی دیکە هاتن... هتد[١١٩].

**سەرکەوتن و ئاییپەروەری پیاوی بەدو:**

هەنـدێك لـە رۆژهەڵاتناسـان هێرشـیان کردۆتـە سـەر پێغەمبـەر محەمـەد، بـە ( پێغەمبـەری جـەنگ) وەسـفی دەکـەن، نـەوەك ( پێغەمبـەری ئاشـتی). وەك دەردەکەوێت ئـەوان بـە رۆشـنبیری مەسیحی خۆیـان کاریگـەر بـوون، بەشـێوەیەك محەمـەدیان بـەراورد کـردووە بـە مەسـیح، بۆیـە بینیویانـە محەمـەد جـەنگ بـۆ بانگەوازەکەی بەرپا دەکـات، کەچـی مەسیح بانگەوازەکـەی لـەرێگای ئاشـتییەوە دەبێت.

ئەو رۆژهەڵاتناسانە ئەوەیان لەبیرکردووە، محەمـەد لەژینگەیـەکی کۆمەڵایـەتی ئەوتۆ ژیاوە جیاوازە لەدەوروبەرەکەی مەسیح. تـوێنبی مێـژوونووس ئامـاژەی بـۆ ئەمە کردووە و جەختیشی لەسەر کردۆتەوە[١٢٠]. ئەوەی شایەنی باس بێت محەمەد لەوکاتـەی لەمەککـە بـووە بـۆ بانگەوازەکـەی رێگـای ئاشـتیانەی بـەکارهێناوە. ژمارەیەکی کـەمی خـەڵك نـەبێت کەسـی دیکـە پێـوە کاریگـەر نـەبوون، ئـەوانیش خـەڵکی شـارەکان بـوون. کەچـی هۆزەکـانی بـەدو لەبەرامبـەر دەعـوەی ئیسـلام ساردوسڕ بوو، تەماشاکەر بوو وەك ئەوەی بابەتەکە پەیوەندی بەوانـەوە نەبێـت. کاتێك لەدوای هیجرەت شەڕ لەنێوان محەمەد وقورەیش هەڵگیرسا، ئەوا هۆزەکانی

---

[١١٩] مصطفى جواد (أبو جعفر النقيب) ص ٣٧-٣٨

[١٢٠] Arnold Toynbee ( A study of History) vol III p 468-469

بەدو چاودێریان دەکرد بۆ ئەوەی بزانن دواجار کامەیان سەردەکەون. کە محەمەد سەرکەوت وفەتحی مەککەی کرد، ئینجا هۆزەکان دڕکیان بەمە کرد کە بەراستی محەمەد پێغەمبەر و نێردراوی خودایە.

دکتۆر حەسەن ئیبراهیم حەسەن دەڵێ" فەتحکردنی مەککە ودەستگرتن بەسەر کەعبە لەلایەن موسڵمانانەوە گەورەترین هۆکار بوو بۆ سەرکەوتنی بانگەوازی ئیسلام. ئەو هۆزانەی عەرەب کە سەرەتا بانگەوایان رەت دەکردەوە، لەکاتی فەحکردنی مەککە بڕوای ئەوەیان هەبوو موسڵمانان چاودێرییەکی خودایە هەیە کە پێشتر کەسی دیکە نەیبووە. بۆیە بە پەلە و پۆل پۆل هاتنە ناو ئیسلامەوە"[121].

ئەوەی جێگای سەرنجە، ئەو هۆزانەی بەدو هاتنە ریزی ئیسلامەوە، دواتر لێی هەلگەڕانەوە، دواتر گەڕانەوە ناو ئیسلام. هەر هەموو ئەمانە لەماوەیەکی زۆر کورت بوو، کە پێنج ساڵی تێپەڕ نەدەکرد. ئەوان دوای فەتحکردنی مەککە هاتنە ناو ئیسلامەوە، دواتر دوای بیستنی هەواڵی مردنی پێغەمبەر هەلگەڕانەوە. کاتێکیش بینیان مەمالیکەکان فەتح دەکەن ودەسکەوتیان بەسەردا دەبارێ، ئەوا دووبارە هۆزەکان گەڕانەوە ریزەکانی ئیسلام. دەڵێن تەڵحە کە لەسەردەمی هەلگەڕانەوە بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکرد، دواتر هاتووە زۆرترین پەرۆشی بۆ جیهاد هەبوو. تەنانەت زۆرێك لەلایەنگرەکانی ئەوانەی پێغەمبەرانی هەلگەڕانەوە بوون، لەمەدا لاساییان کردەوە، لەناکاو لە هەلگەڕاوەی کافرەوە، بوون بە موسڵمانی موجاهید.

ناکرێت بە چاویلکەی رۆشنبیری شارستانی سەیری ئەو رووداوە سەیرانە بکەین، یانیش ناکرێت بەپێی بەها وپێوەری ئایدیالی ونموونەیی هەڵسەنگاندنیان بۆ بکەین، چونکە ئەمە سروشتی بەدوەکانە لەهەر سەردەم وشوێنێکدا. ئەو مەیلی زاڵبوون وداگیرکارییەی بەدوەکان هەیانە، وا دەکات تێڕوانینیان بۆ ئایین وهەرشتێکی دیکەی ژیان لەتێڕوانینی شارنشینەکان جیاواز بێت. ئەگەر محەمەد لەنێو ئەوان وەك مەسیح بووایە ئەوا دەرفەت بۆ بڵاوبوونەوەی ئایینەکەی نەدەبوو، بەم رۆژە نەدەگەیشت .

---

[121] حسن ابراهیم حسن (تاريخ الاسلام) ج ، ص ۱۳۹

ئەگەر محەمەد وەك مەسیح فرمانی بە پەیڕەوکارانی دەکرد و دەیگوت" ئەوەی لەکوڵمی ڕاستی تۆ بدات، تۆ کوڵمی چەپی بۆ حازر بکە" ئەوا هۆزەکانی بەدو گاڵتەیان پێدەکرد و بەلاوازیان دەزانی و دواتریش لەناویان دەبرد، چونکە کەسی لاواز لە بیابان مانەوەی بۆ نییە. ئەمەش سوننەتی ژیانە لە بیابان هەر لە دێرزەمانەوە !.

**بەراوردێك لە ئایینپەروەری:**

بینیمان چۆن بەدوەکان مەیلیان بەلای ئایینێکی بەهێزەوەیە، بۆ ئەوەی بەرەو سەرکەوتن ودەسکەوتیان ببات. لێرەدا پێویستە لەم لایەنەوە بەراوردی نێوان ئایینداری شارنشین و بەدوەکان بکەین.

وتمان شارنشینەکان بەدەست مەینەتی زۆرداری سەردارەکانیان دەناڵێنن. ئەم بابەتەش بەشێوەیەکی تایبەت لەبارەی خەڵکی شارستانیەتە کۆنەکان دروستە کە ژیانی نوێی دیموکراسیان نەدیبوو. ئەوان سەرەڕای زۆرداریش بەدەست نەخۆشی پەتاکان دەیاننالاند. لەبەر ئەو هۆکارانە خەسڵەتی دڵتەنگی وبەدبەختی وناڵاندن بەسەر زۆربەیانەوە زاڵبوو. کەواتە ئەوان لەو بارودۆخەدا پێویستیان بە ئایینێکە دڵنەواییان بکاتەوە لە مەینەتییەکانیان ومتمانە وگەشبینیان لەلا دروست بکات. بەواتەیەکی دیکە ئەوان پێویستیان بە ئایینێکە جیاواز بێت لەو ئایینەی لە بیابان بینیمان.

ئەو ئایینانەی لە شارستانەتە کۆنەکان دەرکەوتوون هەر هەموویان بەکۆمەڵێك خەسڵەتی تایبەت ناسراونەتەوە. ئێمە لەو خاڵانەی خوارەوە کورتیان دەکەینەوە:

١- زۆری شەفاعەتکار: ئەو دیاردەیە لەزۆری ئەو مەزارگە پیرۆزانە تێبینی دەکرێت، کە خەڵك هانایان بۆ دەبات ونزا وسکاڵای دڵیان لەوێ دەکەن. دەگمەنە شارۆچکەیەك لەولاتانی شارستانی بدۆزینەوە، بەجۆرێك لەجۆرەکان ئەو مەزارگانەی تێدا نەبێت. بەلای شارنشینەکانەوە زەحمەتە ڕاستەوخۆ داواکارییەکانیان لەخودا بکەن، خودا لەدیدی ئەوانەوە سوڵتانێکی مەزنە لەعەرشە زۆر بەرزەکەی خۆی لەئاسمان دانیشتووە، بۆیە پێویستیان بەنێوەندێکە بۆ ئەوەی لەلای خودا شەفاعەتیان بۆ بکات. ئەوان لەژیانی سیاسی خۆیان وا

ڕاهـاتوون بـۆ داواکارییـەکانیان شـەفاعەتکاریان لـەلای سـوڵتان هـەبێت، بۆیـە وا هەست دەکـەن خـوداش وەك ئـەو سـوڵتانەیە داوایـەك قبـوڵ ناکـات شـەفاعەتکار وواسیتەچی نەبێت.

لەراستیدا مەزارگە پیرۆزەکان زۆر هاوکاری شارنشینەکانیان کردووە لەشیفاکردنی نەخۆشی ودڵنەواییان. ئەو هەستە دەروونییەی لـەناو مەزارگـەکان بۆیـان دروست دەبێت، متمانەی دەروونیان بۆ دروست دەکـات. ئەمـەش بابەتێکـە گرنگـی زۆری هەیـە لەچارەسـەرکردنی نەخۆشـییەکان وچارەسـەرکردنی کێشـەکان، وەك زۆر لێکۆڵینەوەی زانستی نوێیش سەلماندوویەتی[١٢٢].

٢- باوەڕ بەفریادڕەسی خودایی: ئەمەش دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی دیکەیە، خەریکـە لەهـەموو شارسـتانیەتەکانی کـۆن دەیدۆزینـەوە. شارنشـینەکان لـەدژی هەستکردن بەو ئازارەی لەدەست فرمانڕەواکانیـان دەکێشن، ئەوا هیـوای ئـەوە دەخوازن خودا فریادەڕسێکیان بۆ بنێرێت تا فریایان بکەوێت ( زەوی پڕ بکات لـە دادپـەروەری، کەپێشـتر پـڕ بـوو لـە ستەمکاری). ئـەم ئومێـدەش بەتێپـەڕبوونی ڕۆژگار دەبێتە باوەڕ و عەقیدە.

ئەو عەقیدەیەش لە رووی شێوە ووردەکاریەوە لەتایفەیەکەوە بۆ تایفەیەکی دیکـە دەگۆڕێـت، لەگەڵئەوەشـدا لەزۆربـەی ئـەو ئـایین ومەزهەبانـەوە هەیـە کـە لـەنێو شارنشـینەکان بلاوبۆتـەوە. ئەمـەش لـەرووی دەروونیـەوە زۆر سـوودیان پـێ دەگەینێ. ئەگەر وا نەبووایە ئەوا ژیان بەلایانەوە بەرتەسك دەبۆیەوە. ئـەوان بـەو باوەڕە خەیاڵ دەکەن کە چۆن لەئاییندەدا تۆڵـە لـەدژومنانیان دەکەنـەوە، دوای ئەمەش دەکەونە ناو خۆشگوزەرانی وناز و نیعمەتی ژیانەوە.

٣- زۆری رێورەسمـە ئایینیـەکان: شارنشـینەکان نـەوە دوای نـەوە ئـەو رێورەسمانە زیاد دەکەن بۆنەوەی لەگەڵ بارودۆخی کۆمەڵایەتی ودەروونی نوێیـان بگونجێت. ئەو رێورەسمـە سـادانە بـۆ ئـەوان بـەس نییـە کـە ئایینەکـە یەکـەمجار هێناویەتی، بۆیە دەبینین بیدعەی (داهێنراو) بەتێپەڕبوونی ڕۆژگـار زیاد دەبێـت و کەڵەکە دەکات. ئەگـەریش چاکسازێك بێـت بیـەوێ خەڵکەکـە بگەڕێنێتـەوە سـەر

[١٢٢] Charles Baudouin ( Suggestion and Autosuggesticon )

سادەیەکەی ئایین، ئەوا جنێوی پێدەدەن وتەکفیری دەکەن. بیدعەکان پێویستی د ـوونی ئەوانی تێرکردووە، ئەوان نایانەوێ لەدەستی بدەن ودواتریش گومڕا بن.

- زۆری ئەولیا وپیاوانی پیرۆز: شارستانیەتە کۆنەکان، بەئێستاشەوە ـریەتی لەو جۆرە پیاوانە. ئەوان ئەرکێکی کۆمەڵایەتی ودەروونی ئەوتۆیان هەیە ناکرێت بەسووک بزانرێت. ئەوان فوو لەسەری نەخۆشەکان دەکەن، دڵنەوایی کۆستکەوتووان دەکەن، دژایەتییەکان ناهێڵن، ڕێنمایی خەڵك دەکەن بۆ دوارۆژ. بەواتەیەکی دیکە ئەوان بۆ خەڵك ئاینێنێکی واقیعی وزیندوو دەنوێنن. ئەگەر یەکێك لەکێشەیەك و دەردێك گلەیی هەبوو، ئەوا پەنا بۆ ئەو جۆرە پیاوانە دەبن و داوای فەتوا و ئامۆژگارییان لێ دەکەن، بێگومان ئەوان هەندێکجار فریویان دەدەن، دوای ئەوەی لەرووی دەروونیەوە سوودیان پێدەگەینن و کەم یان زۆر دڵنەوایی دەخەنە دڵییەوە.

ئەو خەسڵەتانەی سەرەوە کە لە شارستانیەت هەیە، دەگمەن نەبێت ئەگینا هاوشێوەی لەبیابانشینی نییە. لەوانەشە هەندێك لەبەدو لەئەنجامی پەیوەندیان بەشارستانیەتەوە ئەو خەسڵەتانەیان وەرگرتبێت. هەموو ئەمانە وایکردووە شێوەی ئیسلام لەبیابانشینی جیاواز بێت لەگەڵ شارستانیەت، تەنانەت لەشارستانیەتیش لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە بەپێی بارودۆخەکان جیاوازە

بەدوەکان ئەوەیان لە ئیسلام دۆزیوەتەوە، کە بەرەو سەرکەوتن ودەستکەوتیان دەبات، وەك پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد. شارنشینەکانیش ئەوایان لەئیسلام دۆزیوەتەوە کە بەپێی بارودۆخی تایبەتی خۆیان سوودی لێوەردەگرن، هەر جەماعەتێك لەوان ئەوە لە ئایین وەردەگرێت کە بۆی دەگونجێ. لەوانەشە زیادی بکات بۆئەوەی لەگەڵ پێویستیە کۆمەڵایەتی ودەروونییەکانی خۆی نزیك بێت.

جا بەدو پێیوایە ئەو زیاتر لە شارنشینەکان لە روحی ئایینەوە نزیکە، بەپێچەوانەشەوە شارنیشن پێیوایە ئەو زیاتر لە بەدو نزیکترە لە رۆحی ئایین، کەچی لەراستیدا هەر هەموویان ئەو شتانەیان لەئایین وەرگرتووە کە لەگەڵ

بارودۆخی کۆمەڵایەتی ودەروونی دەگونجێ. ئەویتریشیان فەرامۆش کردووە، ئەمەش نەریتی زۆربەی خەڵکە لەهەر سەردەم و شوێنێکدا.

**دیموکراسیەتی لە بیابانشیندا:**

لامانسی رۆژهەڵاتناس دەڵێ: بیابانشینی نموونەی دیموکراسیەتە. ئۆلێریش سەرەرای ئەمە دەڵێ: دیموکراسیەتێکە تا رادەیەکی زۆر زێدەرۆیی تێدا کراوە.[١٢٣].

لێرەدا دەبێت بپرسین ئەو دیموکراسیەتە چییە، کە ئەو دوو پیاوە (بەدو)یان پێ وەسف کردووە؟ ئەگەر ئەو جۆرە بێت کە لەشارستانیەتی نوێ ناسیومانە، ئەوا ئەو دیموکراسیەتە زۆر لە بەهای بەدوەکان دوورە. لەگەڵئەمەشدا نکۆڵی لەوە ناکەین جۆرێك لەدیموکراسی لەناو بەدوەکان هەیە، لەگەڵ خەسڵەتە رۆشنبیریە کۆمەڵایەتییەکەیان دەگونجێ.

وەك پێشتر باسمان کرد، بەدوەکان لەوە راهاتوون، ملکەچی فرمانی هیچ کەسێك نەبن. لەگەڵئەوەشدا رێز لەسەرۆکی هۆز دەگرن، هاوکاری دەکەن، بەڵام کوێرانە ملکەچی نابن وەك ئەوەی شارنشینەکان لەگەڵ دەسەڵاتداری خۆیان لەکۆندا ئەنجامیان دەدا. دەکرێت ئەمەش بەمانایەك بەجۆرێك لەدیموکراسی دابنرێت.

دەبینین بەدوەکان سەرۆکی خۆیان دەبینن، لەگەڵ دادەنیشن وگفتوگۆی لەگەڵ دەکەن، بەشێوەیەکی ئاسایی و بێئەوەی شەرم بکەن. ئەوان وەك نەریتێك بەناوی خۆی یان کونییەکەی بانگی دەکەن (واتە باوکی فلان و کوری فلان). لەرۆژگاری ئێستامان بە وشەکانی (**یا محفوظ، یا طویل العمر**) قسەی لەگەڵ دەکەن، هەندێکجاریش قسەی رەقی لەگەڵ دەکەن و رەخنەی توندی ئاراستە دەکەن.

دکتۆر جۆن فانیس دەگێرێتەوە رۆژێکیان لە رەشماڵی شێخێکی ئال سەعدون بووە، کاتێك پیاوێکی بەدو، لاواز ورەنگ پەریو، بەجلێکی شرەوە، هاتۆتە رەشماڵ و لەگەڵ خەڵکەکە دانیشتووە. کاتێك یەکێك لە بەدوەکانی دیکە قاوەی پێشکەش کردووە، تفێکی لەقاوەکە کردووە ولەسەر شانیەوە فرێی داوە. کاتێك شێخ پرسیاری ئەوەی لێ دەکات بۆچی وا دەکات، ئەو دەڵێ لەشەوی رابردوو

[١٢٣] De Lacy oleary (op. cit) p20

لەلای شێخ نووستووە و لە ئەستۆی ئەو دابووە، کەچی حوشترەکەی لێ دزراوە. دەشڵێ" بەخوا قاوەت ناخۆمەوە" شێخ فرمان دەکات لە سامانەکەی خۆی حوشترێکی بۆ بهێنن، دواتر شێخ جڵەوەکەی لەسەر سەری بەدوەکە دادەنێت وقاوەی پێشکەش دەکات و ئەویش دەیخواتەوە"[124].

ئەمە دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی باوە لەبیاباندا، بەدو پێیوە سەرسام نابێت، چونکە لەسروشتی رەسەنی رۆشنبیرییەکەی هەڵقوڵاوە. ئێمەش بەدیموکراسی ناوی دەبەین، بەڵام جۆرێك نییە لەو دیموکراسییەی کە ئێمە لەشارستانیەتی نوێ بینیومانە.

وەك ئیبن خەلدونیش ئاماژەی بۆ دەکات، شارنشینەکان لەستەمی دەسەڵاتداران راهاتوون، ئەوان ملکەچ و زەلیلن لەژێر دەستیان. شمشێر لەسەریان ئامادەیە بۆئەوەی لەهەر پیاوێك بدرێت بوێر بێت، بێئەدەب بێت، یان ملکەچ نەبێت، بەڵام لەسەرەتای سەدە نوێیەکانەوە، گەلانی شارستانیەت دەستیان کردووە بەشۆرشکردن لەدژی دەسەڵاتدارانیان، دوای خەباتێکی دوور ودرێژ، توانییانە زۆر یا کەم دەسەڵاتداران ملکەچی خۆیان بکەن، لەو پێناوەشدا خەبات بەردەوامە...

مەبەستمان ئەوەیە دیموکراسیەت لە شارستانیەتدا راگوزارەر ونوێیە، رەسەن نیە، وەك ئەوەی لە بیابانشینی هەیە. لەلایەکی دیکەوە دیموکراسیەتی بەدو لەبابەتێکی دیکە جیاوازی لەدیموکراسی شارنشین هەیە، ئەویش بابەتی رەچەڵەکە.

سیستەمی فرمانڕەوایی لەشارستانیەت دا لە سەرەتادا لەسەر بنەمای رەچەڵەك وسیستەمێکی چینایەتی داخراو دامەزراوە. چەند چینێکی دیاریکراو هەیە، مرۆ تێیدا لەدایك دەبێت، زەحمەتە گۆڕانکاری تێدا بکات، هەڵکشێ یان داکشێ. شۆڕشە نوێیەکانی دیموکراسی بۆ دژایەتی ئەو سیستەمەی چینایەتی هاتووە، بۆیە بایەخدان بە گرنگی رەچەڵەك لە شارستانیەتدا بەپێی تێپەڕبوونی رۆژگار لاواز دەبێت. وایلێهاتووە خەڵك لەبەرامبەر یاسادا یەکسان بێت، جیاوازی لەنێوان

[124] جون فاليس ( أقدم اصدقائي العرب) – ترجمة جليل عمسو – ١٠٧-١٠٨

شەرەفەند و ئاست نزم نییە لە ئەرك ومافدا. یان بەلایەنی کەمەوە هەوڵ دەدرێت ئەم جیاوازیانە نەمێنێ...

کەچی لەبیابانتشیندا شانازیکردن بەرەچەڵەك هەر ماوە وەك ئەوەی لەدێرزەمانەوە هەبووە. نکۆڵی لەوە ناکەین سیستەمی چینایەتی داخراو بەو شێوەیەی کە لەشارستانیەتی کۆن هەبووە، لە بیابانشینیدا نییە. بیابانشینی لەسەر بنەمای دەمارگیری هۆز دادەمەزرێت نەوەك دەمارگیری چینایەتی، بۆیە ئەرکی رەچەڵەکناسی جیاکردنەوەی هۆزەکان بووە لەیەکتر نەوەك بۆ جیاکردنەوەی چینەکان بێت. ئەمەش مانای ئەوەیە دیموکراسی بەدو دەمێنێتەوە مادام لە بیابان بێت، بەلام کاتێك بەرەو جیهان دەردەچن، بۆ ئەوەی داگیری بکەن، ئەوا نەتەوە داگیرکراوەکان ملکەچیان دەبن وئەوانیش واز لە دیموکراسیەتی بیابان دەهێنن. لەبەرامبەر نەتەوەکانی دیکە دەبنە ئەرستوکراتیەتی مەزن.

لەو بەدوانەی ئێستا لەبیابان دەژین، بینیومانە سەرەرای بوونی دیموکراسی لەنێوانیاندا، مامەڵەکردنیان لەگەڵ هەندێك تاك وگروپەکانی بیابان خالی نییە لەخۆمەزن کردن وئەرستۆکراتیەت. بۆ نموونە رقێکی گەورەیان لەهۆزی (سەلبە)یە. هەروەها رقیان لە کۆیلەکانیان دەبێتەوە، رقیان لە شوانکارە وکەسانی پیشگەری وەك بەرگدروو وئاسنگەر دەبێتەوە. ئەو بەدوانەی خۆیان بە خاوەن رەچەڵەکی رەسەن دەزانن زەواج لەگەڵ کچانی ئەو جۆرە کەسانە ناکەن و کچیشیان پێ نادەن، چونکە بەچینێکی زۆر نزمیان دەزانن.

ئەوەی شایەنی باسکردن بێت ئەوەیە بەدوەکان ئەو شێوە تێروانینەیان بۆ هەموو خەلکی شارنشین هەیە، خۆشیان بەبەرزترین خەڵقی خودا دەزانن، کەچی شارنشین بە پلەی دووەم دادەنرێت تەنانەت ئەگەر لە رەچەڵەکی شەرفەمەندیش بێت.

رەجەب، کە نەقیبی ئەشرافی شاری بەسرا بوو، لەسەردەمێکی زۆر دوور نییە، زۆر شانازی بە رەچەڵەکی بەدوی خۆی دەکرد. رۆژێك دەچێتە بەغدا بۆئەوەی زەواج لەگەڵ کچێك بکات لە بنەماڵەیەکی شەرەفمەند بێت. ناوی

بنەماڵەی باچەچی و جادرچی و چەندین بنەماڵەی دیکەی بۆ دەهێنن. ئەویش ڕەتی دەکاتەوە و دەڵێ" من لە ئەشرافەکانم دەوێ" گوایە ئەم بنەماڵانە بە ئەشراف نازانێ، چونکە پیشەی شارنشینی دەکەن. ئەوانیش دەڵێن" لەو ماڵانە ئەشرەفتر نییە لەبەغدا، ئەگەر ئەشرافت بەپێی بۆچوونی خۆت دەوێ ئەوا برۆ بیابان...

وەك زانراوە، ژنێکی بەدو ڕەتی دەکاتەوە شوو بە (ابن المشری) بکات کە حاکمی ناوچەی زوبێر بوو لە سەردەمی عوسمانییەکان، گوایە ئەو پیاوە لەنەوەی کۆیلەکانە[125]. پوختەی قسەمان ئەوەیە، بەدوەکان لەنێو خۆیان دیموکراسین. کەچی لەبەرامبەر شارنشین وخاوەن پیشە و ڕەچەڵەکی نزم ئەرستۆکراتین. ئەمەش لەکاتی دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامی بەدەرکەوت، کاتێك بەدوەکان بەر نەتەوەکانی دیکە کەوتن.

**ململانێی چینایەتی لای بەدوەکان:**

بۆئەوەی لەئەرستۆکراتیەتی(بەدو) بگەین لەبەرامبەری کەسانی دیکە، دەبێت تاوتوێی ململانێی چیانیەتی بکەین کە لەلای عەرەبەوە لەگەڵ فراوانبوونی فەتحکاری ودانانی دەوڵەتی ئیسلامی دەردەکەوێت. سەرەتا ئەو ململانێیە لەنێوان خودی عەرەبەکان دابوو، دواتر بەرە بەرە عەرەب لەگەڵ نەتەوە فەتحکراوەکان ئەنجامی دەدا.

ململانێی چینایەتی لە سەردەمی عوسمانی کوڕی عەففانی سێیەم خەلیفە دەرکەوت. ئەو ململانێیەش لەنێوان قورەیش وهۆزەکانی دیکەی عەرەب بوو. وەك دەردەکەوێت ڕەگوڕیشەکەی لە ڕۆژگاری جاهیلیەتەوە بوو. قورەیش لەجاهیلیەت تاکە هۆز بوو بازرگانی لە دوورگەی عەرەبی ئەنجام دەدا، کاری (ریبا)شی دەکرد، بەمەش سامانێکی بێشوماری کۆدەکردەوە. سەرەڕای ئەمانەش سەرداری کەعبە بوون و خۆیان بە ( ئەهلی بەیتی خودا) ناودەبرد، بۆیە هۆزەکانی عەرەب ڕێزیان دەگرت ولەهەمانکاتدا ئیرەییان لەبەرامبەر هەبوو. دوای ڕووداوی فیل پێگەی قورەیش بەرزتر بوو. قورەیش ئەوکاتە بانگەشەی ئەوەی

[125] حافظ وهبة (المصدر السابق) ص ١٣٢ -١٣٣

دەکرد خودا لەسەختی لەگەڵ دەوەستێ و لە دوژمنانی دەپارێزێ. هەر لەبەرئەوەش خودا باڵندەی ناردووە بۆئەوەی ئەو حەبەشیانە لەناوبەرن کە لەیەمەنەوە بۆتێکدانی کەعبە هاتبوون[126].

کاتێك بانگەوازی ئیسلام دەرکەوت، قورەیش دژایەتیەکی توندی کرد، بەڵام بێهودە بوو، بانگەوازەکە سەرکەوت. ئەوکاتە قورەیش هاتە ژێر رکێفییەوە. قورەیشمان بینی لەسەردەمی ئەبوبەکر وعومەر هەستی بە نزمی وملکەچی دەکرد، چونکە ئەو پێگە بەرزەی لەدەستدابوو کە لە رۆژگاری جاهیلیەت هەیبوو. هەندێك ئاماژەی مێژوویی ئاماژە بۆئەوە دەکەن خەلیفە عومەر رقی لەقورەیش بووە مەیلی بەلای ئەعرابەوە بوو، قورەیشیش رقی لەعومەر بوو، تەنانەت هەندێك لەتوێژەران پێیانوایە ئەوان پیلانیان بۆ کوشتنی عومەر داناوە.

کاتێك عوسمان خەلافەتی وەرگرت، قورەیش هەوڵی دا، ئەو هەلە بقۆزێتەوە، پێگەی کۆنی خۆی بگێڕێتەوە. قورەیش عوسمانی زۆر خۆشدەویست، هاوکاریشی کرد بۆ ئەوەی خەلافەت بەدەست بهێنێ، بۆ ئەمەش کۆششێکی زۆری کرد. وەك دەردەکەوێت قورەیش لەسەردەمی عوسماندا بەشێکی گەورەی لەپۆست وویلایەت وەدەستکەوت بەدەستهێناوە، بۆیە جارێکی دیکە ململانێی نێوان قورەیش و هۆزەکانی دیکە دەردەکەوێتەوە.

مێژوونووسان دەگێڕنەوە کە والی کوفە لەو سەردەمەدا، قورەیشی بووە، رۆژێك دەڵێ" خەڵکی عەوام بێستانی قورەیشن" خەڵکی لێی هەڵدەستنەوە ونکۆڵی لەقسەکەی دەکەن. ئەو خەڵکە دەچنە لای معاویە لەشام و لەوێ مشتومڕێکی توند دروست دەبێت. معاویە بەکورتیەکەی پێیان دەڵێ" ئێوە قەومێکن لەعەرەب... پێی راگەیاندووم ئێوە قورەیش بەدوژمن دەزانن، ئەگەر قورەیش نەبووایە ئەوا جارانتان لێ دەهاتووە..." یەکێك وەڵامی دەداتەوە" چەند فرمانڕەوایی قورەیشمان بەسەر هەڵدەکێشێ.. عەرەب بەشمشێری خۆیان دەژین، کەچی قورەیش بازرگانن.."[127].

---

[126] علي الوردي (اسطورة الادب الرفيع) ص ١١٧-١٢٣

[127] ابوبكر بن العربي (العواصم من القواصم) ص ١٢٠

هەرچۆنێك بێت ململانێی نێوان قورەیش وهۆزەكانی دیكە یەكێك لەگرنگترین هۆكارەكانی شۆڕش بوو لەدژی عوسمان. قورەیش توانی هەلی بەكوشتنی عوسمان بقۆزێتەوە، هەروەك چۆن خەلافەتەكەی كردە هەلێك. كراسەكەی كردە دروشمێك، دواجاریش توانی سەركەوتوو بێت كاتێك دەوڵەتی ئەمەوی دامەزرا، ئەم دەوڵەتەش لەسەر دەمارگیری قورەیشی دامەزرابوو، وەك ئیبن خەلدون ئاماژەی بۆ كردووە[128].

قورەیش لەسەردەمی ئەمەوییەكان چەند چینێكی باڵای لەكۆمەڵگای ئیسلامی دروست كرد. لەمەشدا ئەو فەرمودەیە هاوكاریكردن كە دەڵێ" ڕێبەران لە قورەیشن" بۆیە قورەیش خۆی بەشایەنی خەلافەت دەزانی و پێیوابوو نابێت خەلافەت لەدەرەوەی ئەو بێت. وەها بەناو خەڵك بلاوببووە گوایە خوا قورەیشی بەسروشتێكی تایبەت دروست كردووە، هاوشێوەی نییە. جورجی زێدانی مێژوونووس دەڵێ"باوەڕی ئەوەیان هەبوو قورەیش چاكەی بەسەر هەموو خەڵكەوە هەیە، تەنانەت لە ژیان و لەدایكبوونیشدا، وتوویانە ژن لە شەست ساڵی دووگیان نابێت، تەنها قورەیشی نەبێت، لەپەنجا ساڵی دووگیان نابێت، تەنها عەرەبی نەبێت.... قورەیشی نابێتە زندیق، قورەیش نابێت لەزانستە قوڵبێتەوە تەنها لەمەسەلەی زانیاری نەبێت. سەرۆكایەتیش هەر لەناو قورەیش بوو ركابەرییان نەبوو تا سەردەمێكی نزیك نەبێت"[129].

وا خەیاڵ دەكەم بەدوەكان لەسەردەمی ئەمەوییەكان ملكەچی فرمانڕەوایی قورەیش بوون و لێی رازی بوون. لەوانەشە لەمەدا بۆ سەردەمی جاهیلیەت گەڕابنەوە، ریزیان لەقورەیش ناوە وئیرەییان لەبەرامبەر هەبووە. دەتوانین بڵێین بەدوەكان لەو كاتە هەستیان بەمەترسیەكی گەورە كردووە، كە هەڕەشە لەخۆیان ولە قورەیش دەكات، ئەویش مەترسی مەوالییەكانە. ژمارەی مەوالییەكان بەتێپەڕبوونی ڕۆژگار زیاد دەبوو، وا لێهاتبوو زۆرینەی كۆمەڵگەی ئیسلامیيان پێكدەهێنا. بۆیە دەبوو بەدوەكان لەگەڵ قورەیش ڕووبەڕووی ئەو مەترسییە

[128] ابن خلدون (المقدمة) ص ٢١٦
[129] جرجي زيدان (تاريخ التمدن الاسلامي) ج٤، ص ٣٦

بینەوە. بەمەش دەچنەوە سەر ڕێبازە کۆنەکەیان کە دەڵێ" من و براکەم لەبەرامبەر ئامۆزاکەم، من و ئامۆزاکەم لەبەرامبەر کەسی بیانی".

**ململانێی نێوان عەرەب و مەوالییەکان:**

ئەو ململانێیە لەمێژووی ئیسلامی ناسراوە، لە بنەما کۆمەڵایەتییەکەی ململانێیەکی چینایەتییە. بەشێوەیەك لە واقیعدا کاریگەری زیاتر وفراوانتر بوو لەو ململانێیەی لەنێوان قورەیش وهۆزە عەرەبییەکانمان بینی.

توێژەران لەسەر ئەو ململانێیە ناکۆکن، بۆ نموونە ئەحمەد ئەمین جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە عەرەبەکان خراپ مامەڵەیان لەگەڵ مەوالییەکان کردووە ورقیان لەمەوالی بووە[130]. کەچی ئیبراهیم عەدەوی جەخت لەسەر پێچەوانەی ئەمە دەکاتەوە. ئەو دەڵێ عەرەب زۆر شتی پێشکەش بەوان کردووە کە نیشانەی خۆشەویستی و دڵسۆزییە. پشتی بەمەوالییەکان بەستووە لەفرمانڕەواییدا، لەچەندین پۆستی کارگێری وراستی وسەبازی مەوالییەکانی داناوە. سەرەرای ئەمانەش لەگەڵیان بەسەبر بوون وبەرگەی رەخنە ورووبەڕووبوونەوەکانی ئەوانیان دەگرت. کەچی مەوالییەکان لەبەرامبەر هەموو ئەوانە رقی خۆیان بۆ عەرەب دەرخست و بەدوای رێبازی شعوبیەت کەوت بۆ تۆڵەکردنەوە لەعەرەب و زاڵبوون بەسەر دەوڵەتەکەیان[131].

من بروام وایە هەردوو بۆچوونەکەی سەرەوە خاڵی نییە لەزێدەڕۆیی. ئێمە ئەگەرهاتوو لەژێر رۆشنایی رۆشنبیری بیاباننشینی تاوتوێی بابەتەکە بکەین، ئەوا دەبینین هەقیقەتەکە لە نێوان ئەو دوو بۆچوونەیە. هۆزەکانی بەدو خۆیان بەسەر مەوالییەکانەوە فەرز دەکرد وبەخراپی مامەڵەیەیان لەگەڵ دەکردن، ئەمە لەلایەك. کەچی لەلایەکی دیکەوە هەر ئەو هۆزانە دالدەی مەوالییەکانیان دا، چەندین هەلی گونجاویان بۆ رەخساندن. ئەگەرهاتوو مامەڵەی ئەو هۆزانە لەگەڵ مەوالییەکان بە مامەڵەی پێشووی فارس ورۆمەکان بەراورد بکەین، کە پێشتر لەگەڵ ئەوانیان ئەنجام داوە، ئەوا جیاوازییەکی زۆرمان بۆ دەردەکەوێت.

---

[130] احمد أمين (ضحى الاسلام) ج١ ص ١٨-٢٩

[131] ابراهيم احمد العدوي (المجتمع الاسلامي و مناهضة الشعوبية) ص ١٨-٢٠

بینیمان بەدو لەژیانی بیاباندا رقیان لە رەچەڵەکی نزم وپیشەکان دەبێتەوە، بەڵام لەهەمان کاتدا دەیانپارێزن و هێرشیان ناکەنە سەر. جیاوازیش لەنێوان رق وهێرشکردنەسەر هەیە. پیاوی بەدو بەفیز وشانازییە، بەڵام لەهەمانکاتدا شەهامەتی سوارچاکی ومروەتی هەیە. ئەو هێرش دەکاتە سەر کەسێك رووبەرووی بێتەوە و لەبەردەمی بوەستێ، کەچی ئەو کەسە دەپارێزێ کە پەنای بۆدەبات یان داوای فریاکەوتنی لێ دەکات. وەك چەندین جار ئاماژەمان بۆ کرد.

لەراستیدا سەرچاوە مێژووییەکانمان پڕ بووە لەو بەسەرهاتانەی، کە ئاماژە بۆ سوکایەتی کردن بەمەوالییەکان دەکەن، زەحمەتیشە گومان لەدروستی ئەو بەسەرهاتانە بکەین. دکتۆر عەبدولعەزیز دوری بۆچوونێکی بابەتیانەی لەو بارەیەوە هەیە، دەڵێ" ئەو بەسەرهاتانەی لەسەرچاوەکانمان باسکراوە، بۆ ئەوەیە تۆماری ئەو حاڵەتانە بکات سەرنجراکێشن ودەرچوونە لەباو، بۆیە ناکرێت بە دانراویان بزانین. دەبێت لەمەدا ئاگاداری ئەو دیاردەیە بین لەسەرچاوەکانی خۆمانەوە. دەبێت بزانین ئەوانە لەبەر نامۆبوونیان باسکراوە، نابێت ئەوە لەبیر بکەین کە ئەو رووداوانە ریزپەرن"[١٣٢].

دەمەوێ شتێك بۆ ئەم بۆچوونە زیاد بکەم: ئەو بەسەرهاتانەی چەوساندنەوەی مەوالییەکان، کە لە سەرچاوە مێژووییەکانمان هاتووە، زۆربەیان لەسەردەمی عەباسییەکانەوە بووە. ئەو سەردەمەش وەك لێدانی سەردەمی ئەمەوی بووە بۆ ئیدانەکردنی ئەو سەرپێچانەی لەبنەماکانی ئیسلامەوە کراوە. دەبێت ئەوەش لەبیر نەکەین زۆربەی مێژوونووسەکانی سەردەمی عەباسیەکان لە مەوالییەکان بوون. ناشتوانین پێشبینی بێلایەنی لەو مێژوونووسانە بکەین لەگێرانەوەی ئەو بەسەرهاتانەوە.

بەهەرحاڵ، مەزندە دەکرێت مەوالییەکان بەچەندین جۆر لەسەردەستی عەرەب سووکایەتی و چەوسانەوەیان بینیوە، جا زۆر یان کەم. ئەوانیش بەخراپتر وەڵامی خراپەیان داوەتەوە، ئەمەش بەشێوەیەکی گشتی بابەتێکی سروشتییە لەمرۆڤدا.

[١٣٢] عبدالعزيز الدوري (الجذور التاريخية للشعوبية) ص ٢٠-٢١

کاتێك مەوالییەکان دەبینن، عەرەبە بەفیز ولەخۆباییەوە مامەڵەیان لەگەڵ دەکەن، ئەوانیش بەهەمان شێوە وەڵامیان دەدەنەوە، بۆیە سووکایەتی بەدیمەنەکانی شانازی بەدوەکان دەکەن و ەناوی ئایینەوە پوچەڵی دەکەنەوە. دەتوانین بڵێین ئاین بۆتە چەکێك بەدەستی هەردوو لایەنەوە. عەرەب دەڵێ" ئێمە بەهۆی شمشێرەوە هیدایەتمان بۆ مەوالییەکان هێناوە". مەوالییەکانیش دەڵێن" شانازیکردنی عەرەب دژی رێنماییەکانی ئایینە". بەمەش لێرە ولەوێ بەتێپەڕبوونی رۆژگار ململانێیەکە توندتر دەبێتەوە. هەر لایەنێکیش دەمارگیری بۆ خۆی زیاتر بێت، ئەوا بەرامبەرەکەشی دەمارگیری زیاتر دەبێت[123].

**سروشتی مەوالییەکان:**

مەوالی بەم ناوە ناوبران، لەبەر ئەوەبوو لەکاتی ئیسلامبوونیان هەوڵیان دا هاوپەیمانی لەگەڵ هۆزەکانی بەدو بکەن، واتە ویستیان وەلائیان بۆ ئەوان هەبێت ولەژێر پارێزگاری ئەوان بن. بۆ نموونە پیاوێك لە نەتەوە فەتحکراوەکان ئیسلامبوونی خۆی رادەگەیاند، ئەوا دەچووە لای هۆزێکی عەرەبی بۆ ئەوەی وەلائی خۆی بۆ دەربخات، ئەوکاتەش هۆزەکە پارێزگاریکردنی لەو پیاوە رادەگەیاندن. رێگەشی بۆ دەرخساند ناوی هۆزەکە بەکاربهێنێ. بۆ نموونە دەیتوانێ بڵێ کندی، تەمیمی، یان نوخەیعیە، بە وەلائەوە. ئەو وەلائەش دوای چەند نەوەیەك نەدەما، دواجاریش مەوالییەکان دەبوون بە عەرەب.

هۆزە عەرەبیەکان بەلایەنەوە نەنگییە رێگە بەکەسێك بدەن دەستدرێژی بکاتە سەر مەوالییەکانیان، ئەمەش بۆ خۆی بە سوکایەتی دەزانێ، بۆیە بەرگرییەکی زۆری لێ دەکات. ئەمەمان لەعێراق لەسەردەمی عوسمانییەکان بینی، کە زۆرێك لە بێگانە و غەیرە عەرەبەکان دەهاتنە وەلائیان بۆ هێزە عەرەبیەکان دەردەبرێ لەرێگای " الکتبە"وە، بەمەش لەلایەن هۆزەکانەوە پارێزگارییان لێ دەکرا.

وا خەیاڵ دەکەم عەوامی مەوالییەکان لەسەردەمی ئەمەوی ولەسەردەمی عەباسییەکانیشەوە ئەمەیان کردبێت. وەك دەردەکەوێت هەندێك لەمەوالییەکان ئەمەیان بەدڵ نەبووە، ئەوانیش پیاوماقووڵی مەوالییەکان بوون، لەوانە ئەدیب و

[123] علي الوردي (مهزلة العقل البشري) ص ٣٥٤-٣٥٧

زانایان بوون، بۆیە وایان بە باشتر زانیوە لەسەر شانازیکردن بە رەچەڵەك وتوانستی کەسی خۆیان بمێننەوە. بەمەش زۆر یان کەم لەشانازیکردن رکابەری عەرەبیان دەکرد. لەوانەیە شعوبیەت تەنها لەلای ئەوان دەرکەوتبێ، کەچی ئەوانی دیکەش کە زۆرینەی مەوالییەکان بوون بایەخیان بە گوتەگۆت نەداوە و لەژێر پارێزگاری عەرەبەکان دابوون.

کەواتە دەکرێت مەوالییەکان بۆ دوو کۆمەڵە پۆلین بکەین. کۆمەڵە گەورەکە بریتین لە عەوام ئەوانە بایەخ بە رەچەڵەك وشانازیکردن نادەن، هێندەی بایەخ بە پارێزگاریکردن وبژێوی دەدەن، ئەمانە هاوشێوەی عەوامی خەڵكن لەهەموو شوێن وسەردەمێکدا. ئەوان دەیانەوێ بژین، بەلایانەوە گرنگ نییە سووکایەتی دەبینن یان شانازی. کەچی کۆمەڵەی دووەم کەسانی لووتبەرز بوون ئەوانەی شانازی بەرەچەڵەکی سەرفرازی دەکەن. بێگومان ئەمانە کەمینەن، هەر ئەوانەش بارودۆخ و کتێبەکان پڕ دەکەن لە هاوارکردن و بانگەشەکردن.

کەچی عەوام بەشێوەیەکی گشتی حەز لەسەقامگیری وملکەچی دەکەن، مەیلی ئەو شتانە دەکەن کەخوا لەچارەنووسی ئەوانی نووسیوە. کەمینەکەش مەیلی بەلای هاوار وئاژاوە ونارازیبوونە، بەمەش دەتوانن کتێبەکانی مێژوو بەخواستی خۆیان پڕ بکەنەوە.

## پوختە و دەرئەنجام:

توێژینەوەکەمان لەبارەی شرۆڤەکردنی خەسڵەتەکانی بەدو و رۆشنبیری کۆمەڵایەتییان درێژەی کێشا، ئێستا دەبێت ئەو توێژینەوەیە پوخت بکەینەوە بۆ ئەوەی لەچوارچێوەیەکی گشتی دیاری بکەین.

لەسەرەتای توێژینەوەکەمان وتمان، رۆشنبیری کۆمەڵایەتی هەر نەتەوەیەك، خەسڵەتی گشتی وپێکهاتەی خۆی هەیە. هەر پێکهاتەیەك لە خەسڵەتی جیاجیا پێکدێت. بینیمان چۆن لە رۆشنبیری بیابانشینی خەسڵەتی (خۆزاڵکردن) لەسەرووی هەموو خەسڵەتەکانەوەیە. دەکرێت پێکهاتە و سیفەتەکانیشی بەمشێوەیەی خوارەوە کورت بکەینەوە:

١- پێکهاتەی دەمارگیری: ئەمە یەکگرتوویی هۆز، شێخایەتی، تۆڵەکردنەوە، فریاکەوتن، شانازیکردن بە رەچەڵەك و پاراستنی ئافرەت... هتد، لەخۆیەوە دەگرێت.

٢- پێکهاتەی داگیرکردن: بریتیە لەشانازیکردن بە هێز و قارەمانێتی، جەنگ و دەسکەوت، سەربەرزیی و راستگۆیی و لاساری، رقبوونەوە لە پیشەکان.... هتد.

٣- پێکهاتەی مروەت: بریتیە لەشانازیکردن لە میوانداری و بەخشندەیی، پاراستنی پەنابەر، دراوسێ، هاورێ، هاوپەیمان، مەوالییەکان، هەر کەسێکی بێدەسەڵات. هەروەها وەفاداری و دڵسۆزی و پاراستنی راسپاردەیی لەخۆیەوە دەگرێت.

من بانگەشەی ئەوە ناکەم، ئەو توێژینەوەی لەبارەی بیاباننشینی ئەنجام داوە، توێژینەوەیەکی زانستی بێت. وا باشترە ناوی بنێم (هەوڵێکی زانستیە). تکام لە توێژەران هەیە هاوکارم بن، لایەنی دروست و نادروستی دەربخەن. لەراستیدا ئەمە قوڵتر وفراوانترە لەوەی بەتاکە کەسێك ئەنجام بدرێت. بۆیە دەبێت توێژەران تێیدا هاوکار بن هەرکەسە بەپێی توانای خۆی وبابەتی پسپۆری خۆی.

چەند جارێك ئاماژەم بۆ ئەوە کردووە، کۆمەڵگای عەرەبی بەهەموو وڵاتەکانیەوە، ناتوانرێت تێی بگەن، تا نەگەڕێینەوە سەر رۆشنبیری بیاباننشینی ولەتوێژینەوەی قوڵ نەبینەوە، چونکە نیشتیمانی عەرەب گەورەترین شوێنە لەجیهاندا، شارستانیەت و بیاباننشینی تێدا ململانێی کردووە، کاریان لەیەکتر کردووە. بیاباننشینی و شارستانی لەنیشتیمانی لەو کۆمەڵگایەدا وەك دووجەمسەری دژ بەیەکترن. رەوتی مێژووی بەپێی ئەو پەیوەندیەی نێوانیان بەرێوەچووە. وەك چۆن کارەبا لەئەنجامی جەمسەر پۆزەتیف و نیگەتیف دروست دەبێت.

ئەمەش بابەتێکە بەروونی کاریگەرییەکانی دەبینین، کاتێك لەبەشەکانی داهاتوودا توێژینەوەی لەبارەی کۆمەڵگای عێراقەوە دەکەین، ئەمەش کۆمەڵگایەکە ویستوومە بیکەم بە نموونە یان دەروازەیەکی دەستپێك بۆ توێژینەوەی کۆمەڵگای گەورەی عەرەب.

## بەشی پێنجەم

### عێراق لە سەردەمی عوسمانیدا

دوای ئەوەی لەبەشەکانی رابردوودا، بەشێوەیەکی گشتی توێژینەوەمان لەبارەی سروشتی بیابانشی وململانێیەکانمان کرد لەگەڵ شارستانیەت. ئێستا دەچینە سەر توێژینەوەی کۆمەڵگای عێراقی، بۆ ئەوەی بڕی کاریگەری بیابانشینی وجۆری ململانێیەکەی لەگەڵ شارستانیەت دەربخەین.

بەپێی بۆچوونی من، ئێمە ناتوانین لە کۆمەڵگای عێراقی ئێستا بگەین، ئەگەر نەچینەوە سەر تاوتوێکردنی ئەو کۆمەڵگایە لەسەردەمی عوسمانییەکاندا. سەردەمی عوسمانییەکان لەعێراق چوار سەدەی خایاند، کاریگەری ئەو سەردەمە لەعێراق جیانەبۆوە، تەنها سەردەمی جەنگی یەکەمی جیهانەوە نەبێت، واتە نزیکەی نیو سەدەیەکە. ئێمە بەتوێژینەوەمان لەبارەی کۆمەڵگای عێراقی لەسەردەمی عوسمانییەکان، تاوتوێی ئەو بارودۆخە کۆمەڵایەتییە دەکەین کە باوکانمان تێیدا ژیاون. تەنانەت زۆرێك لەبرایانم تێیدا ژیاون کە هێشتا لەژیانمان ماون. ئەمەش مانای ئەوەیە ئەو دابونەریت وبەها وبیرکردنەوانەی لەسەردەمی عوسمانییەکان باو بوو، تا ئێستا بەراستەوخۆ یان ناراستەوخۆ کاریگەریان لەسەر ئێمە ماوە. پێکهاتەی کەسێتیشمان بەرهەمی کارلێکردنی ئەو بارودۆخەی خەڵکە کە لەسەردەمی عوسمانییەکان تێیدا ژیاوە، لەگەڵ بەها ودابونەریتی شارستانیەتی نوێ.

**بیابانشینی لەسەردەمی عوسمانیدا:**

ئەمڕۆ ئەو هۆزە عێراقییەی لە قۆناغی سەرەتایی بیابانشینی دەژین، ژمارەیان زۆر کەمە. ڕێژەکەی لە ٪۲ دانیشتوان تێپەڕناکات، بەڵام ئەگەر ئێمە بۆ دواوە بگەڕێینەوە، بۆ نزیکەی سەد ساڵ لەمەوبەر، دەبینین ئەو جۆرە هۆزانە زۆرن کە

هێشتا لە قۆناغی سەرەتایی بیاباننشینی دەژیان، دەگاتە ٪۳٥ کۆی دانیشتوان. ئەمەش ئاماژەیە بۆ بڕی شۆڕبوونەوەی بیاباننشی لە عێراق لەسەردەمی عوسمانییەکاندا.

وەك دەرکەوێت عێراق لەسەردەمی عوسمانییەکان جێی چاوتێبڕینی ئەو هۆزە بەدوانە بووە کە لەبیانەکانی نزیك لە عێراق ژیاون. ئەوان وەك تەماعکار سەیری عێرقیان دەکرد، هەلیان دەقۆزتەوە بۆ ئەوەی ناوە ناوە بۆ ناو عێراق دزە بکەن. لەمەشدا دوو هۆکار هانی دەدان، یەکەمیان: لاوازبوونی دەسەڵاتی حکومەت بوو لەعێراق، لەگەڵ بڵاوبوونەوەی ئاژاوەو ململانێی هۆزگەرایی. دووەم: بڵاوبوونەوەی پەتا بوو، هەر پەتایەك رووی لەعێراق دەکرد زۆرینەی دانیشتوانی لەناودەبرد، بەتایبەتی خەڵکی شارەکان.

ئەو هۆزە بەدوانەی لە بیابان دەژین، لەژیانێکی سەخت دان، هەردەم لەلێواری برسیەتین، وەك لەبەشی پێشوو ئاماژەمان بۆکرد. ئەمەش مانای ئەوەیە کە لە بیابان لەژێر فشارێکدایە، هانی دەدات بەرەو عێراق دزە بکات. لە لایەکی دیکەوە لە عێراق هۆکاری ئەوتۆی دەبینی کە سەرنجی رابکێشێ. ئەوان لەعێراق خاکی بەپیت و ئاوی زۆریان دەبینی. کەواتە ئەوان ناتوانن لە بیابان لەسەختی ژیاندا سەبر بگرن، عێراقی نزیکیش لەبەردەمیان والاّ بێت. سەرەڕای ئەمەش ئەو وڵاتە خاڵی بێت لە دانیشتوان و ئاژاوە وناسەقامگیری ئەمنی تێدا بێت.

**توێژینەوەیەکی بە پێز:**

دکتۆر محەمەد سەلمان حەسەن لەبارەی ئەم بابەتەوە توێژینەوەیەکی بەپێزی هەیە، بۆ ئێمە زۆر سوودمەند دەبێت. پەیمانگای ئامار لە زانکۆی ئۆکسفۆرد لەیەکێك لە بڵاوکراوەکانی خۆیدا، ئەم توێژینەوەی بڵاوکردۆتەوە[١٣٤]. دکتۆر محەمەد لەو توێژینەوەیدا بە ئەنجامی ئەوە گەیشتووە: ژمارەی دانیشتووانی عێراق لە ساڵی ١٨٦٧ لە ملیۆن و چارەگێك تێپەڕی نەکردووە. رێژەی سێ توێژەکەی دانیشتوانیش بەمشێوەیە بووە:

١- هۆزە بەدوەکان: ٪۳٥ رێژەی دانیشتوان بووە.

---

[١٣٤] Bulletin of the Oxford University Institute of Statistics, vol 20, no 4,1958

٢- هۆزە لادێییەکان: ٪ ٤١ ڕێژەی دانیشتوان بووە.
٣- خەڵکی شار: ٪ ٢ ڕێژەی دانیشتوان بووە[١٣٥].

ئەمەش ئاماژەیەکی روونە بۆئەوەی بزانین کۆمەڵگای عێراق، تاچەند لەژێر تەوژی هەڵکشانی بەدوەکان وداکشانی شارنشینەکان بووە. بیابانشینی لە هۆزە بیابانشینەکان وهۆزەکانی لادێ پێکهاتووە، ئەمەش لە ٪٧٦ ڕێژەی دانیشتوانی پێکهێناوە، واتە سێ چارەگی دانیشتوان، کەچی شارستانیەت لە خەڵکی شار پێکدێت، ئەوانیش چارەگەکەی دیکەی دانیشتوان تەواو دەکەن.

ئەوەی شایەنی باسە، خەڵکی شار نوێنەرایەتی راستەقینەی شارستانیەتیان نەدەکرد. ئەوان بە هۆزەکان دەور درابوون. هەردەم لەژێر هەڕەشە و ڕێگری ئەوان دابوون. لە ئەنجامی ئەمەش ناچاربوون زۆر یان کەم بەهای بەدوەکان وەربگرن، بۆ ئەوەی خۆیان لەمەترسی بەدوەکان بەدوور بگرن. ئەوان وەك پێویست هێزی حکومەتیان دەبینی، بۆئەوەی لەهەڕەشەی هۆزەکان پارێزگاریان لێ بکات، بۆیە ناچار پشتیان بەخۆیان دەبەست. بینیمان ئەوان بە چەك و بەهای بەدوەکان رووبەرووی بەدوەکان دەبوونەوە. لەنێو ئەوانیش نەریتی دەمارگیری و تۆڵەکردنەوە بڵاوبۆیەوە، بۆ پارێزگاریکردن لە گیان وسامانی خۆیان پەنایان بۆ ئەو چەکانە دەبرد. دەشیان گوت" ئاسن تەنها بەئاسن دەتوێتەوە".

**دۆخی شارەکان:**

بەهەرحاڵ، شارەکان لەسەردەمی عوسمانییەکاندا، بەتایبەتی بەر لەناوەڕاستی سەدەی نۆزدەم، لەوپەڕی هەڵوەشانەوە و داڕووخاوی دابوو. لەوانەیە زێدەڕۆیی نەبێت ئەگەر بڵێین (شار) نەبوون بەمانای باوەکەی لەجیهانی شارستانیەتدا، بەڵکو زیاتر لەگوندەکان نزیك بوون.

گەشتیاری ئینگلیزی کیپل کەلەساڵی ١٨٢٤ لە بەسراوە لە ڕێگای دیجلەوە چۆتە بەغدا، بۆمان دەگێڕێتەوە: لەنێوان قرنە وبەغدا تەنها دوو شاری بینیوە، ئەوانیش (کوت) و ( شفلح) بوون. لەبارەی کوتەوە باس لەوە دەکات تەنها

---

[١٣٥] انظر: مجلة الثقافة الجديدة، في عددها الثاني عشر من السنة السابعة، الصادر في تشرين الاول و الثاني عام ١٩٥٩

گوندێکی بچووکی بەدو بووە، هەمووی خانووی قوڕ بووە، شورایەکی قوڕیشی لەدەورە بووە کە شەش پێ بەرز بووە. شێخی قەبیلەکانی (بەنی لام) لەوێ ژیاوە، شێخێکی بەهێز بووە، دەسەڵاتی لە نێوان قرنەوە تا بەغدا هەبووە.[136] لەبارەی شفلحەوە دەڵێ: قەڵایەك بووە لە کەرپوچ دروست کراوە. لەو قەڵایە شێخی هۆزەکانی زوبێد تێیدا دەژیا، گوندەکانی لە لای راستی دیجلەوە لەنێوان زێی غوراف وبەغدا درێژ دەبێتەوە. ئەو قەلای شفلحە دواتر بە (البغیلە) ناودەبرا و دواجاریش بە نعمانییە ناودەبرێت[137].

وەسفێکی دیکەمان بۆ شارەکانی عێراق هەیە، کە لەلایەن گەشتیاری ئەڵمانی نیبۆر کراوە، ئەو لەساڵێ ١٧٦٥ بە عێراق گەڕاوە، ئەو گەشتەکەی لەرێگای فوراتەوە بووە. ناوی ئەو شارانەی هێناوە کەپێیدا تێپەڕیوە، لەوانە سەماوە و لملوم و رماحیە وحیلە. هەروەها چۆتە نەجەف وکەربەلا. پوختەی ئەوەی باسکردووە، ئەوەیە هەموو ئەم شارانە لە قوڕ دروستکراون، خانووەکانی کەمبووە هەندێکیان لە کەرپوچ دروستکرابوون. سەرجەم شارەکانی فوراتی ناوەڕاست لەژێر دەسەڵاتی شێخی خەزعەل دابووە، دەسەڵاتی ئەو وەك حکومەتێکی سەربەخۆ بووە، تەنانەت باجی وەرگرتووە و سەرانەشی لە کاروان و کەشتی و رێبواران وەرگرتووە[138].

**شاری بەغدا :**

بەغداد جاران، بەئێستاشەوە، بەگەورەترین شاری عێراق دادەنرێت. ئەو مەڵبەندی درەوشانەوەی شارستانیەتە لەعێراق. ئەو شارە لەلایەك پایتەختی حکومەتە و لەلایەکی دیکەشەوە زۆرترین بازرگان وخاوەن پیشەکانی تێدا کۆبۆتەوە. بۆ ئەوەی بزانین بری داروخانی شارستانی لەعێراق لە سەردەمی عوسمانییەکان چەند بووە، ئەوا دەبێت سەیری بارودۆخی ئەو شارە گەورەی عێراق بکەین.

---

[136] یعقوب سرکیس (مباحث عراقیة) ج ١، ص ٢٧٤

[137] المصدر السابق، ج١، ص ٢١٦

[138] کارستن نیبور (مشاهدات نیبور)- ترجمة سعاد العمري – ص ٥٥- ٢٠٨

بەهەرحاڵ بەغدا بازاڕی ئاوادانی تێدابووە، هەموو ئەو بازاڕانەش لە ناوچەقی شار بوون. لەنزیك ئەو بازاڕانەش خانووی لەکەرپوچ دروستکراو هەبووە کە بە نەخش ونیگار دەرازایەوە. فەرمانبەرانی گەورە ودەوڵەمەند ومولکدارەکان لەو خانووانە نیشتەجێ دەبوون. زۆر لەو ناوەڕاستە دوور ناکەوینەوە کاتێك دەگەینە دەوروبەری شار، چەندین گەڕەکی خراپ و کۆڵانی تەنگەبەرمان دەبینی، کە دەمارگیری گەڕەکی تێدا بووە.

ئەوەی جێگای سەرنجە، تا ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم، بەغدا هیچ شەقامێکی چەوڕێژکراو نەبوو. یەکەم شەقام لە بەغدا لەسەردەمی مەدحەت پاشا لەساڵی ۱۸۷۰ چەوڕێژ کرا، ئەو والییە مەبەستی چەوڕێژکردنی ئەو کۆڵانە کورتە بوو کە دەگاتە سەر پردەوە لەلای رەسافەوە. ئەو کۆڵانە بە (عقد الصخر)[۱۳۹] ناوبرا، ئەمەش وەك ئاماژەیە بۆ ئەو بەردانەی کە شەقامەکەی پێ چەوڕێژ کراوە.

لەساڵی ۱۹۱۰ نازم پاشای والی هاتە عێراق و لە لایەن عێراقییەکان بە(مەدحەتی دووەم) ناودەبرا. ئەو والییە هەوڵیدا یەکەم شەقام لە بەغدا بکاتەوە، ئەویش (شارع النهر ) بوو، کە دواتر بە (شارع المستنصر) ناسرا. ئەو شەقامە تا ئێستاش وەك خۆی ماوەتەوە، نە فراوانە و نەراستە. بەڵکو لەبەرئەوە بە شەقام ناوبراوە، چونکە لە هەموو شەقامەکان راست وفراوانتر بوو لەکۆڵانەکانی بەغدا. لەکاتی کردنەوەی ئەو شەقامە هاوارێکی زۆر لە لایەن خەڵکەوە دروست بوو، چونکە خانووەکانیان لەپێناو تێکدا، پێشتریش شەقامی وەهایان لە شارەکەیان نەدیبوو.

دەبێت ئەوەش لەبیرنەکەین کۆڵانەکانی بەغدا هیچ رووناکییەکی نەبوو، تەنها رووناکی مانگ نەبێت لەشەوانی مانگەشەودا. لەساڵی ۱۸۷۹ وە حکومەت کۆڵانەکانی بەغدای رووناك دەکردەوە[۱٤۰] و فانۆسی نەوتی لە کۆڵانەکان دادەنرا. بەڵام ئەو فانۆسە رووناکی پێویستیان نەبوو، زۆرجار تەنها دەوروبەری خۆی رووناك دەکردەوە. لەبەر ئەمەش کۆڵانەکان پڕ بوون لە (جنۆکە) بەهەموو

---

[۱۳۹] عبدالكريم العلاف (بغداد القديمة) ص ١٤
[۱٤۰] المصدر السابق، ص ٧٠

جۆرەکانییەوە. زۆرجار تاریکی کۆڵانەکان ترسی دەخستە دڵی ڕێبوارەکانەوە، بەشێوەیەك خەیاڵی تۆقاندن وفێڵەکانی جنۆکەیان لە پەناوپێچی کۆڵانەکانەوە دەکرد، دواجاریش رایان دەکرد. جنۆکەکان تا سەردەمێکی درەنگ لەکۆڵانەکانی بەغدا مابوونەوە. نووسەری ئەم چەند دێڕەش زۆرجار لە جنۆکەکان تۆقیوە.

**مەترسی هۆزەکان لەسەر بەغدا:**

خەڵکی بەغدا بەشەو مەینەتیان بەدەست مەترسی جنۆکە هەبوو، لەرۆژیشدا دەست مەترسی هۆزەکانەوە دەیاننالاند. عەباس عەزاوی مێژوونووس دەگێڕێتەوە: لەساڵی ١٨٥٢ هۆزی بەدوی عەنزە هێرش دەکەنە سەر کاروانێکی حوشتر لەنزیك تارمیەی (الطارمية) باکوری بەغدا. کاروانەکە لەژێر پارێزگاری عوقەیلەکاندابوو. هۆزی عنزە نۆسەد حوشتریان تالانکرد. دوای چەند رۆژێك هەمان هۆز بەسەرۆکایەتی شێخەکەیان ئیبن هوزال، هێرشێکی دیکەیان کردە سەر کاروانێك کە لە شامەوە دەهات. هەموو حوشتر وبارەکانیان تالانکرد کە چەندین درهەمی زێر و زیوی تێدابوو. هەروەها چەندین ماڵتیان لەرێگای حیلەوە تالانکرد[141].

ئەوەی شایەنی باسە عوقەیلەکان هۆز نەبوون[142]، بەڵکو کۆمەڵێك بەدوی نەجد بوون، ئەوان لەبەری کەرخەوە لەبەغدا جێگیربوون، کاری بەرێکردن و پارێزگاریکردنی کاروانیان کرد بووە پیشەی خۆیان.[143] ئەوانیش وەك هۆزەکان سەرۆکیان هەبوو. کرێیەکی دیاریکراویان لە کاروانەکان وەردەگرت، ئەوان وا راهاتبوون سەرانەیان بە هۆزەکان دەدات، بۆئەوەی لە هێرشنەکردنیان دڵنیا بن. هەندێك جاریش ناچاردەبوون بە شمشێر داکۆکی لە کاروانەکان بکەن، جا سەردەکەوتن یان هەندێك جاریش سەرکەوتوو نەدەبوون.

ئەمە کارێکی دەگمەن نییە، کە عوقەیلییەکان لەیەك کاتدا رۆڵی دز وپارێزگار ببینن. ئەوان دڵسۆزن بۆ پاراستنی کاروانەکانی بەغدا، بەڵام ئەگەریش هەل

---

[141] عباس العزاوي (تاريخ العراق بين احتلالين) ج ٧، ص ١٠٦

[142] هەندێك لە سەرچاوە مێژووییەکان، عوقەیلییەکان بەعوز ناو دەبن، گوایە ئێستاش ئەو کەسانەن کە لەبەغدا (عوگەیلی) ناو دەبرێن- وەرگێڕ

[143] هاشم السعدي (جغرافية العراق الحديثة) ص ١١- ١١

رەخساوبێت ئەوا لە تالانکردنی بەغدا دوودڵ نابن. هەر ئەو کۆمەڵەیە لەگەڵ حکومەت هاوپەیمان دەبوو، لەدژی هۆزە یاخیبووەکان دەجەنگان. کەچی هەندێکجاریش لەدژی حکومەت دەبوو، شەڕی سەخت لەنێوانیان بەرپا دەبوو.

فریزەر باسی جەنگێکی سەخت دەکات، لە نزیک بەغدا لەنێوان حکومەت وعوقەیل لەساڵی ١٨٣٤ روویداوە. فریزەر خۆی شاهێدحاڵ بووە. ئەو کات بەغدا بەشێوەیەکی قێزەوەن، ببوو بە گۆڕەپانی تالانکاری و کوشتن و کاولکاریی.

**تێڕوانینێکی گشتی:**

ئەگەر ئەمە دۆخی بەغدای پایتەختی عێراق ومەڵبەندی حکومەت بێت، ئەی دۆخی شارەکانی دیکە چۆن بووە؟! عەبدولرەزاق حوسنی مێژوونووس دەڵێ" دەسەڵاتی هۆزە عێراقییەکان لە سەدەی دوانزەوە، تا سەدەی نۆزدەم سەرتاسەری عێراقی بەڕێوەدەبرد. دەسەڵاتێك بۆ حکومەت نەبوو، تەنها لەمەڵبەندی ویلایەتەکان و شارە گەورەکان، نەبێت. سەبارەت بە ناحیە و گوندەکانیش ئەوا ململانێ لەنێوان حکومەت و هۆزە سەرەکییەکان هەبوو، گرنگترین ئەو هۆزانەش (منتفق) و(خزاعل) و (بەنو لام) بوو. ئەو هۆزانە زەویان پارچە پارچە دەکرد، تخوبی شەرعیان بۆ دادەنا، باج و رسوماتی یاساییان وەردەگرت، هەموو ئەو کارانەیان دەکرد کە کارگێرییەکی خۆجێی ئێستا لە وڵات بەڕێوەی دەبات، وەك ئەوەی دەزگای فەرمی سەربەخۆ بن"[١٤٤]

دەکرێت سەرنجی خۆمان لەبارەی قسەکانی حوسنی بنوسین و بڵێین: دەسەڵاتی حکومەت تەنانەت لە مەڵبەندی ویلایەت و شارە گەورەکانیش بەپێی پێویست بەهێز نەبووە. بێگومان لەو مەڵبەندانە لە شوێنەکانی دیکە بەهێزتر بووە، بەڵام هێندە نەبووە تا بۆ سیمای شارستانیەت پاڵپشت بێت.

وەك دەردەکەوێت لەو سەردەمەدا عێراق یەك حکومەتی نەبووە، بەڵکو چەندین حکومەتی خۆجێی هەبووە. ئەمانەش لەدەوری مەشایخی هۆزە گەورەکان پێکهاتبوو کە دواتر باسیان دەکەین. هەرکاتێکیش دژایەتی و داگیرکاری و کوشتار لەنێوان ئەو حکومەتانە توندتر بووایە، ئەوا حکومەت بەشێوەیەك لەشێوەکان

---

[١٤٤] عبدالرزاق الحسني (العراق قديما و حديثا) ص ١٥٤

دەبووە لایەنێك لەو ململانێیە هۆزگەراییە. ئەوەی جێگەی سەرنجە، ئیبن خەلدون ئاماژەی بۆ دۆخێکی وەهای کۆمەڵایەتی کردووە، کاتێك توێژینەوەی لە بارودۆخی مەغریبی سەردەمی خۆی کردووە. ئەو دەڵێ ئەگەر دەوڵەت لاواز بێت، ئەوا سێبەرەکەی لە وڵات کورت دەبێتەوە، لەشوێنی ئەو دەوڵەتۆکە لەسەر بنەمای دەمارگیری دروست دەبێت.[١٤٥] لەوە دەچێ وڵاتانی عەرەبی لەم لایەنەوە هاوشێوە بن. ئەگەرهاتوو دەسەلاتی حکومەتی مەرکەزی بەهێزبوو، ئەوا دەمارگیری هۆزگەرایی لاواز دەبێت، بەپێچەوانەوە ئەگەر دەسەلاتی حکومەت لاواز بوو ئەوا دەمارگیری بەهێز دەبێت.

زێدەڕۆیی ناکەم ئەگەر بڵێم (حکومەتی عوسمانی) لە عێراقدا، بەتایبەتی لە سەدەی هەژدەمدا، لەنێو حکومەتەکانی عێراق لە هەموویان بچووکتر بوو، بۆیە هەندێکجار هاوپەیمانی لەگەڵ هەندێك لەو حکومەتانە دەکرد بۆ ئەوەی لەدژی هەندێکی دیکە بوەستێتەوە. هەندێك جاریش سەرکەوتوو دەبوو، تالان و ماڵاتی جەنگی دەهێنایەوە، لەبازارەکانی بەغدا بۆ فرۆشتن هەڕاجی دەکرد. هاوشێوەی ئەم کارە هۆزەکانیش ئەنجامیان دەدا کاتێك لەجەنگ بەسەر حکومەت سەردەکەوتن، ئەوانیش دەسکەوتی تفەنگ و کەلوپەل و ئەسپیان دەهێنا بازارەکانەوە بە نرخێکی هەرزان دەیانفرۆشتن.

**دەوڵەتی عوسمانی:**

بۆئەوەی بارودۆخی کۆمەڵایەتی عێراقمان لە سەردەمی عوسمانیدا بۆ روون بێتەوە، ئەوا پێویست دەبێت تێڕوانینێکی گشتی وپوختمان بۆ مێژووی دەوڵەتی عوسمانی هەبێت. لەسەرەتا چۆن دروست بوو، دواتر چۆن هاتە عێراق.

دیارە دەوڵەتی عوسمانی بەر لەوەی بێتە عێراق، تووشی هەندێك نەخۆشی هەمیشەیی ببوو. کاتێکیش هاتە عێراق لەئەنجامی بارودۆخی تایبەتی عێراق، تووشی هەندێك دەردی دیکە بوو. لەبەرئەمەش بێتوانا بوو لە ڕێکخستنی ئاسایش و پاراستنی ماڵ و گیانی خەڵك لە عێراقدا . لەئەنجامی ئەمەش ئاژاوە دروست بوو، ململانێی هۆزگەری بە شێوەیەکی فراوان بڵاوبووە.

---

[١٤٥] ابن خلدون (المقدمة) ص ٣٧٧- ٣٧٨

دەبێت بەر لەهەموو شتێك بزانین، دەوڵەتی عوسمانی لە سەرەتادا دەوڵەت نەبوو، بەڵکو هۆزێکی بەدو بوو لە تورکستانی ڕۆژهەڵاتەوە لە ترسی هێرشەکانی جەنگیزخان رایکردبوو. ئەو هۆزە لە ژێر حوکمی سەلجوقیەکان کە پایتەختەکەیان قونیا بوو، لە ئەنادۆڵ جێگربوو. یەکێك لەسەرۆکەکانی ئەم هۆزە داوای لەسوڵتانی سەلجوقی کرد پارچەیەك زەویان بۆ تەرخان بکات، بۆ ئەوەی لە سەری بژین. ئەویش پارچەیەکی بەسەر دەریای مەرمەرەوە پێدان، کە لە باشووری کوستەنتینەی پایەتەختی دەوڵەتی بیزەنتی بوو.

ئەو سەردەمە دەوڵەتی بیزەنتی لە حاڵەتی توانەوەدا بوو، هۆزی عوسمانییەکانیش ئەمەیان بەهەلزانی، بۆیە بەناوی ئایینەوە هێرشیان دەکردە سەر. ئەمەش وایکرد هێزی هۆزەکە گەشەبکات و پانتای خۆی بەرە بەرە فراوان بکات. زۆرێك خۆبەخش لەمیرنیشینەکانی دەوروبەر دەهاتن بۆ ئەوەی جیهاد لەپێناوی خودا بکەن. هەر کاتێکیش فەتحێکی نوێیان دەکرد لە (وڵاتی کوفر)– ئەو کات وایان ناودەبرد– ئەوا پێگەی ئەو هۆزە لە دیدی موسڵمانان بەرزتر دەبووە، تەوژمی خۆبەخشانیش لەپێناوی بەهێز دەبوو[146].

کەواتە دەتوانین بڵێین دەوڵەتی عوسمانی سەرەتای دەرکەوتنی لەسەر دەمارگیری هۆز وداگیرکرای بووە، لەژێر پەردەی ئاییندا. ئەو پەردەیەش بەدرێژایی ژیانی مایەوە. زیاتر شانازی بەداگیرکردن وغەنیمە دەکرد، نەوەك ئاوادانی ودادپەروەری. والییەکان تێیدا بایەخیان بە دروستکردنی مزگەوت وتەکیە وفراوانکردنی ئەوقاف دەدا، نەوەك گەشەپێدانی دامەزراوە گشتییەکان وهۆکارەکانی بەرهەمهێنان.

### دیالیکتیکی سوپای ئینکیشاری:

دکتۆر ئەسەد ڕۆستەم دەڵێ[147]: دەوڵەتی عوسمانی بەخێرایی گەورە بوو، بەخێراییش پیر بوو. ئەو دەوڵەتە لە ماوەیەکی کورتدا چەندین وڵاتی فەتحکرد، کەچی بەخێرایی دادەرووخا، تواناوە وئاژاوەی لەناو دەردەکەوت. ساتع حەسری

---

[146] ساطع الحصري (البلاد العربية و الدولة العثمانية) ص ١٣-١٦
[147] من محاضرة له ألقاها في جامعة بيروت الامريكية عام ١٩٤٠

سەرجەم هۆکاری ئەو دیاردانە بۆ سروشتی ئەو سوپایە دەگێڕێتەوە کە سوپای عوسمانی لە فەتحکردنەکانی پشتی پێدەبەست. ئەم سوپایەش بە سوپای ئینکیشاری ناسرابوو. یەکەمجار ئەو سوپایە هۆکارێکی کارا بوو بۆ سەرکەوتنی دەوڵەت، دواجاریش هۆکارێك بوو بۆ داڕووخانی دەوڵەت.[١٤٨]

لەراستیدا ئینکیشاری سوپایەکی سەیر بوو، هاوشێوەی لە سوپای کۆن ونوێی جیهان نادۆزینەوە. ئەو سوپایە لەو سەربازانە پێکهاتبوو کە دەوڵەت هەر لەمنداڵییەوە لەکەسوکاری رفاندبوون. دواتریش لەسەر هەموو هونەرەکانی جەنگ و کوشتار مەشقیان کردبوو. زۆرینەیان منداڵی وڵاتانی مەسیحی بوو کە دەوڵەتی عوسمانی فەتحی کردبوو، بەڵام دواتر کە دەوڵەت لە دامەزراوەی تایبەت پەروەردەیان دەکات، ئەوا لە هەموو سەربازێك زیاتر پەرۆشیان بۆ ئیسلام هەیە و دەیانەوێ جیهادی لەپێناو بکەن. ئەوسەربازانە هیچ شتێکیان لەبارەی رەچەڵەکی خۆیان دەزانی. تەنها ئەوەندەیان دەزانی ئەوان سەربازی ئیسلامن. هەر لەبەرئەمەش خۆیان دەخستە جەنگەکانەوە، دڵنیابوون لەوەی (سەرکەوتن و بەهەشت) بەدەستدەهێنن. ئەمەش یەکێك بوو لە هۆکارەکانی سەرکەوتنی عوسمانی لە هەموو ئەو فەتحکارییانەی لە هەرەتی لاوێتی خۆی ئەنجامی دابوو.

ساتع حەسری دەڵێ: تێکچوونی کاروباری دەوڵەتی عوسمانی، بەتێکچوونی سیستەمی ئینکیشاری دەستی پێکرد. ئەو سوپایە بەرە بەرە هەموو سیفەتەکانی خۆی لەدەست دەدا. دواجاریش بووە ئامرازێکی ئاژاوە و بەدکاری. پەیوەندی ئینکیشاری بە سەربازگەکان لاواز دەبوو، زۆربەشیان نەدەچوونە سەربازگەکانیان تەنها لەکاتی ئەو پلانە نەبێت کە بە (علوفات) ناسرابوو. زۆرێکیشیان دوای فرۆشتنی عولفاتەکانیان بە کاری دیکەوە سەرقاڵ دەبوون. هەروەها پشك و قۆچانەکانیان دەفرۆشت. لەگەڵئەوەشدا دوودڵ نەبوون لەوەی بچنە ناو گردبوونەوە و نارەزاییەکان، ئەمەش بەپێی تەفرەدانی کەسانی خاوەن بەرژەوندی تایبەت و پاڵەوانانی ئاژاوە و پیلانگێڕان. کاتێك بۆ جەنگ بانگهێشت دەکران ئەوا سڵیان دەکردەوە یان رایاندەکرد. بۆئەوەی نەنگی راکردن لەخۆیان

---

[١٤٨] ساطع الحصري (المصدر السابق) ص ٤٨

دوور بخەنـــەوە قسەوقســـەڵۆکیان بڵاودەکــردەوە، بــۆ نموونـــە دەیــانگوت سەرکردەکانیان بە نیازبوون بە دوژمنە کافرەکانیان بفرۆشن[١٤٩].

**دەوڵەتی عوسمانی لەعێراقدا:**

دەوڵەتی عوسمانی لە سەردەمی سوڵتان سولەیمانی قانونی دەستی بەسەر عێراق داگرت. ئەمەش لەساڵی ١٥٣٤ بوو، کاتێك دەوڵـەت لەوپـەڕی هێـزی خـۆی دابوو. هێشتا پێگەی لە عێراق جێگیر نەبوو، نیشانەکانی لاوازیی ونەخۆشییەکانی پـیری بـەرە بـەرە لـە قەوارەکـەی دەردەکـەوت. شـایەنی باسـکردنە دەوڵـەتی عوسمـانی ئـەوەی لەچـارەنووس نـەبوو ماوەیـەکی درێـژ بـژیت، دوای ئـەوەی نەخۆشییەکانی پیری لێدەرکەوت. ئەگەر وازیان لێدەهێنا، ئەوا لـەزووەوە دەمرد. بەڵام ئەوەی وایکرد سەرەڕای لاوازیەکەی دەوڵەتی عوسمانی بمێنێتەوە، ئەو شتە بـوو کـە لـە مێـژووی نوێدا بـە ( لێپرسینەوەی رۆژهـەڵات)[١٥٠] ناسـراوە. هەنـدێك دەوڵەتانی گەورە وەك ئینگلترا وفەرەنسا دەیانویست بەرامبەر دەوڵەتی عوسمانی سیاسەتی (نە ژیان نە مردن) پەیڕەو بکەن. ئەو دەوڵەتانـە ترسیان لـەوە هـەبوو دەوڵـەتی عوسمـانی لـە ناکـاو بمرێت بەرلـەوەی رێکـەوتن لەسـەر دابەشـکردنی میراتەکەی ئەنجام بدرێت، بۆیە کۆششیان دەکرد برێکـی کـەم دەرمـانی پێبـدەن ئـەو کاتـەی دەیـانزانی لـە لێـواری مـەرگ نزیـك بۆتـەوە. بەمشێوەیە دەوڵـەتی عوسمانی ماوەیەکی زۆر مایەوە و لە سەرەمەرگ چارەسەر دەکرا.

بەهەرحاڵ، بەشێکی زۆری ئەو لاوازییە گشتیەی دەوڵەتی عوسمانی بەر عێـراق کـەوتبوو، عێـراق بـە دەسـتیەوە دەیناڵانـد. عێـراق وەك مەنفایـەك بـوو بـۆ والی وفەرمانبـەرانی تـورك، هـەر لەبـەر ئەمـەش بـوو بـە (سـیبریای تورکیـا)[١٥١] ناویـان دەبرد. فەرمانبەران رازی نەبوون کار لە عێراق بکەن، وەك چۆن فەرمانبەرانی ئەم رۆژگارەمان رازی نین لە (ئەهوار) و (چبایش) کار بکەن، بۆیە تەنها ئەو کەسانەی رازی دەبوون لە عێراق کار بکەن، کە لـە شـوێنی دیکـە کاریـان دەسـتنەدەکەوت.

---

[١٤٩] المصدر السابق، ص ٤٧-٤٨

[١٥٠] محمد مصطفى صفوت (المسألة الشرقية و مؤتمر باريس) ...

[١٥١] عبدالله الفياض (الثورة العراقية الكبرى) ص ٤٧

یانیش ئەو فەرمانبەرەی دەیزانی ماوەیەکی کورت دەمێنێتەوە، بۆ ئەوەی سامانێکی زۆر بۆ ئایندەی خۆی کۆبکاتەوە.

**ململانێی ئێرانی – عوسمانی:**

ئەوەی قورەکەی خەستتر کردووە، ئەو ململانێیە درێژەیە کە دەوڵەتی ئێرانی ودەوڵەتی عوسمانی لە سەر عێراق هەیانە. قەدەر وایکردووە عێراق لە نێوان ئەو دوو دەوڵەتە رکابەرە بێت، ئەمیان بانگەشە بۆ شیعە دەکات و ئەویتریان بانگەشە بۆ مەزهەبی سوننە دەکات. ئەوەی شایەنی ئاماژەدان بێت ئەوەیە دانیشتوانی عێراق بەسەر ئەو دوو مەزهەبە دابەش دەبن و ململانێی تایفی لەسەرەتای ئیسلامەوە لە نێوانیاندا توندە. دوا جاریش ململانێی عوسمانی وئێرانی دێت بۆئەوەی ئاگرەکە خۆشتر بکات.

دوای دامەزراندنی دەوڵەتی سەفەوی لەسەر دەستی شا ئیسماعیلی سەفەوی، ململانێی نێوان عوسمانی وئێرانییەکان دروست بوو. وەك دەزانرێت بەر لە دەمەزراندنی دەوڵەتی سەفەوی زۆرینەی دانیشتوانی ئێران سوننە مەزهەب بوون، شیعەیان تێدا کەمتر بوو. تەنانەت خودی شا ئیسماعیل سوننی بوو لە بنەماڵەیەکی بەناوبانگی سوننە بوو[152]. لە بەر هۆکارێك کە ئێمە نایزانین، ئەو شیعەبوونی خۆی رادەگەینێ، زۆرێك لە شوێنکەوتووی لە ناوچەی ئازەربیجان لەگەڵ دەبێت و دواجار هەلی سەرکەوتنی بۆ دەرەخسێت، بۆ ئەوەی دەوڵەتێکی بەهێز دامەزرێنێ لەسەرتاسەری ئێران سەرکەوتن دوای سەرکەوتن بەدەست بهێنێ.

دواتر شا ئیسماعیل مەزهەبی شیعە دەکاتە مەزهەبی فەرمی دەوڵەتە نوێیەکەی، خۆشی بە بانگەوازخواز و پارێزگاری ئەو مەزهەبە دەزانێ. بۆیە دەستیکرد بەوەی ئێرانییەکانی ژێردەسەڵاتی خۆی بەچەندین شێوە ناچار بکات، بچنە سەر مەزهەبی شیعەوە. تەنانەت لەو پێناوەدا سڵی نەدەکردەوە پەنا بۆ کوشتن و چەوساندنەوە و ئەشکەنجە ببات. شا ئیسماعیل توانی لەساڵی ١٥٠٨ عێراق داگیر بکات، بۆیە دەستیکرد بەچەوساندنەوەی دانیشتوانی سوننە. هەندێك

[152] ابراهيم فصيح الحيدري (عنوان المجد) ص ١١٦

لەپیاوماقوڵ و فەقیهەکانی سوننەی کوشت، چەندین گۆڕی ئیمامی سوننەکانی تێکدا لەوانە گۆڕی ئەبوحەنیفە و عەبدولقادری گەیلانی بوو[١٥٣].

ئەو کاتە لە دەوڵەتی عوسمانی سوڵتانێکی بەهێز و بە زەبرو زەنگ، حوکمڕانی دەکرد، ئەویش سوڵتان سەلیم بوو. ئەو بەنازناوی (یاوز) ناسرابوو، بەمانای بەزەبرو زەنگ دێت. جا هەر کە سوڵتان سەلیم گوێبیستی ئەو ڕووداوەی عێراق دەبێت ئەوا تورە دەبێت، خۆی بە ڕێبەری سوننە دادەنێت و ئەو فەتوایانە وەردەگرێت کە شیعە بەدەرچوو لەئایینی ئیسلام دادەنێ. بەرەنگاربوونەوە و کوشتیان بە واجب دەزانێ[١٥٤]. لە مانگەکانی سەرەتادا بڕیاری دا شیعە لەهەر کوێیەکی وڵاتەکەی هەبێت سەریان ببڕدرێت[١٥٥]. بۆیە لەئەنجامدا کوشتارگەیەك لە ئەنادۆڵ و دەوروبەری حەلەب ڕوویدا بەهەزاران سەربڕان.

لەدوای مردنی سوڵتان سەلیم، سوڵتانی سولەیمانی کوڕی جێگەی گرتووە، کە بەسوڵتان سولەیمانی قانونی ناودەبرێت. لەڕاستیدا ئەوەیان جیاوازی لەگەڵ باوکی هەبوو، زیاتر لە ئاودانکردنەوە و دادپەروەری نزیك بوو. لەسەردەستی ئەو عێراق فەتحکرایەوە، هەوڵی نەدا وەك باوکی تۆڵە لە شیعەکان بکاتەوە، بەڵکو هەموو مەزارگە پیرۆزەکانی شیعە و سوننەی بەیەکەوە نۆژەن کردەوە.

ئەمە سیاسەتێکی حەکیمانە بوو، بەڵام بە داخەوە زۆری نەخایەند. عێراق کەوتبووە نێوان ئەو دوو دەوڵەتەوە کە تەماعکاریان لەعێراق هەبوو، دەیانویست دەستی بەسەر دابگرن. دەسەڵاتداریکیش لە شێوەی سوڵتان سولەیمانی قانوونی لەو دوو دەوڵەتە دەرنەکەوت. وەك دەردەکەوێت بارودۆخی دەروونی و کۆمەڵایەتی دەوروبەری فرمانڕەواکانی هەردوو دەوڵەت بەشێوەیەك بوو، تا لەسەر سیاسەتی ئەو پەندە بڕۆن " براکەت سەربخە جا زاڵم بێت یان مەزڵوم".

شا عەباسی سەفەوی توانی جارێکی دیکە لەساڵی ١٦٢٣ جارێکی دیکە عێراق داگیر بکاتەوە، دەستی کرد بە چەوساندنەوەی سوننەکان کرد و سەربڕینی لەنێوانیان ئەنجام دا. دواتر جارێکی دیکە سوڵتان موڕادی چوارەم هات بۆ ئەوەی

---

[١٥٣] ستیفن لونکریك (أربعة قرون من تاريخ العراق الحديث) ص١٨-١٩

[١٥٤] ساطع الحصري (المصدر السابق) ص ٤٠

[١٥٥] ستيفن لونكريك ( المصدر السابق) ص ١٩

جارێکی دیکە عێراق فەتح بکاتەوە و وەك شا عەباس تۆڵەی لە شیعەکان کردووە. بابەتەکە بە وەندە نەوەستا، بەڵکو عێراق بۆ ماوەیەکی زۆر جار لەدوای جار لەژێر هەڕەشەی ئێران بوو، بەشێکیان داگیر دەکرد دواتر دەکشانەوە. لەهەر جارێکیشدا بارودۆخی دەروونی و کۆمەڵایەتی عێراقییەکان دەکەوتە تەنگەژە و پڕدەبوو لە رق وکینە. هەر تایفەیەك لە دانیشتوانی عێراق بە رق و دوژمنایەتی سەیری تایفەکەی دیکەی دەکرد.

ئەوەی شایەنی باسە ئەوکات خەڵك وەك خەڵکی ئێستا هەستی نەتەوەیی ونیشتیمانیان نەبوو. بەڵکو لەبری ئەمە مەیلی ئایینی هەیە و کە ئەمەش لە دەمارگیری مەزهەبی بەرجەستەبوو لەنێوان خەڵکدا. بەواتەی ئەوەی خەڵکی عێراق ئێرانی و عوسمانییەکانیان بە بێگانە نەدەزانی کە دەیانەوێ دەست بەسەر وڵاتەکەی بگرن و خێروبەراتی ببەن، بەڵکو هەر لایەنێك وا سەیری هاومەزهەبی خۆی دەکرد، گوایە فریادڕەسە. ئەهلی سوننە بە چاوی پاڵپشتی ودڵسۆزی سەیری دەوڵەتی عوسمانیان دەکرد و شیعەش بەهەمان شێوە سەیری دەوڵەتی ئێرانیان دەکرد. زۆر جار وا رێکدەکەوت هێشتا جەنگ لەنێوان ئەو دوو دەوڵەتە بەرپا نەدەبوو، ئەوا خەڵکی عێراق، هەندێك دەبوون بەلایەنگر وهەندێك نەیار. هەر لایەنێکیش دەستی نزای بۆ سەرکەوتنی دەوڵەتی خۆی بەرز دەکردەوە. ئەو بارودۆخەش خاڵی نەبوو لە جنێودان و تاوانبارکردنی یەکتر. هەر لایەنێکیش وەها سەیری نەیارەکەی دەکرد گوایە ناپاك وکافرە (دەبێت وردوخاش بکرێت).

یەکێك لە پەندە باوەکانی عێراق هاتووە " لەنێو رۆم و عەجەم تووشی بەلا بووین" وەك دەزانین ئەو کات عوسمانییەکان بە عوسمانییەکانیان دەگوت (رۆم) . لەراستیشدا بەهۆی ململانێی نێوان رۆم و عەجەمەوە بەڵایەکی گەورە بەسەر عێراق هاتووە، تەنانەت ئەو بەڵایە هەتا ئەمرۆش بەنهێنی و بەئاشکرا کاریگەری لەسەر دەروونی خەڵکە هەیە.

## ئەنجامێکی گشتی:

لەوەی رابردوو دەگەینە ئەو ئەنجامەی، بارودۆخی سیاسی و کارگێڕی لەعێراق لە سەردەمی عوسمانییەکاندا، لەو پەڕی داڕوخان و ئاژاوە دابوو. لەوانەیە دروست بێت بڵێین توانستی والی لەعێراق بەو چوار بابەتەی خوارەوە دەپێورا:

١-توانستی لەدژایەتی ئێران و بەرپەرچدانەوەی هێرشەکانی ئێران

٢- توانستی لەرووی تەمێ کردنی هۆز و شارە یاخییەکان لەناوەوەی عێراق

٣- توانستی لەرووی کۆکردنەوەی زۆرترین سامان، لەرێگای باج و سزا و دەستبەسەرداگرتن، دواتریش رەوانەکردنی ئەو سامانە بۆ ئیستەنبوڵ

٤- دامەرزاندنی مزگەوت و قوتابخانە ئایینەکان، دەرکەوت بە سیمای ترس وتەقوا. ئەنجامدانی رێورەسمە ئایینییەکان.

جگە لەم چوار خاڵەش، والی ئازاد بوو لەوەی چی دەکات. زۆر کەم نەبێت، ئەگینا کەسێك نەبوو چاودێری بکات ولێپرسینەوەی لەگەڵ بکات. ئەو دەیتوانی بەچەندین شێواز زۆرترین سامان بۆخۆی کۆبکاتەوە، بەخواستی خۆی چێژ لەو سامانە وەربگرێت. ئەو فەرمانبەرانەی لەبەردەستی کاریان دەکرد، ئەوانیش ئازاد بوون لە کارەکانیان لە سنووری دەسەڵاتی خۆیان. فەرمانبەر ئەرکێکی نەبوو تەنها رازیکردنی سەرۆکەکەی نەبێت، جگە لەمە نەبێت فەرمانبەر دەیتوانی بەخواستی خۆی خەڵك بچەوسێنێتەوە، خەڵك بگوشێ. تەنانەت هەندێك لە فەرمانبەران لەوە راهاتبوون بە نهێنی لەگەڵ دز وڕێگر رێك بکەون بۆ ئەوەی شتە دزراو وتالآنکراوەکانیان لەگەڵ دابەش بکەن.

کاتێك گەشتیاری ئەڵمانی نیبۆر لەسەرەتای گەشتەکەی لەساڵی ١٧٦٥، بەبەسرا تێدەپەرێت، وێنەیەکی روونمان پێ دەدات لەبارەی بەدرەفتاری حکومەتی عوسمانی لەو رۆژگارەدا. نیبۆر باس لەوە دەکات دەوڵەمەندەکانی بەسرا خۆشگوزەرانی خۆیان دەشارنەوە، بۆئەوەی لە تەماعکاری فرمانڕەواکان دوور بن و پارەیان لێ وەرنەگرن. دەوڵەمەندەکان موکڕ بوون لەوەی بەئاشکرا پێنج نوێژەکەیان بکەن، بۆ ئەوەی رووبەرووی تۆمەتی دەسەڵاتداران نەبنەوە تا بەناوی کەمتەرخەمی لە ئاین بە پارەیەکی زۆر سزا بدرێن. کەچی فرمانڕەواکان

بایەخیان بەوە نەدەدا هەژارەکان نوێژ دەکەن یان نا، بەڵام نوێژی دەوڵەمەند بە تێڕوانینی ئەوان زۆر گرنگ بوو.[١٥٦]

کەتنێکی ساد لەلایەن دەوڵەمەندێکەوە ئەنجام بدرایە، زۆر لە تاوانێکی گەورە کە هەژارێك ئەنجامی دەدا، گەورەتر دەکرا. ئەگەر دەوڵەمەند ئەو کەتنەی دەکرد، ئەوا پاشا فرمانی خنکاندنی دەدا وبەشێك لە سامانەکەی داگیر دەکرد. کاتێکیش پارە دەچووە خەزێنەی پاشاوە، ئەوا گێڕانەوەی زۆر ئەستەم دەبوو. ئەستەمەیەکەی وەك ئەوە بوو کەسە خنکاوەکە جارێکی دیکە ژیانی بە بەردابێتەوە[١٥٧].

سوپای ئینکشاری ڕۆڵێکی گەورەی لەو بەدرەفتارییە هەبووە. ئەوان هەر هەلێکیان بۆ دەرەخسا هێرشیان دەکردە سەر ماڵی مەسیحی و جولەکەکان، لە ڕۆژی رووناك تالانیان دەکردن. تەنانەت موسڵمانیش لە خراپەی ئەوان بەدوور نەبوون، تەنها ئەو کاتە نەبێت کە دەچوونە ریزی ئەوانەوە یانیش سەرانەیان دەدا.

ئینکشارییەکان لە هەموو شارەکان و لە بەسڕاش ئیمتیازی گەورەیان هەبوو. یەکێك لەو ئیمتیازانە ئەوەبوو نەدەکرا کەس بیانوەستێنێ. یان سزایان بدات، تەنها سەرۆکەکەیان نەبێت. بۆیە زیانیان لە هەر کەسێك دەدا کە سەرانەی نەدەدا و ناویشی لە دەفتەرەکانی ئەوان تۆمارکرابوو.

نیبۆر دەڵێ: نازناوی (ئینکشاری) لە بەسڕا لە گەورەترین کەسەوە تا بچووکترین کەس دەنرا. ئەوان ئینکشاری بوون بە نازناو. باجی ئەوەشیان دەدا. بۆ ئەوەی پارێزگاری لە گیان و سامانیان بکەن[١٥٨].

**دوای هەوڵی نوێکردنەوە:**

سوڵتان مەحمودی دووەم، لەساڵی ١٨٢٦ وە دەستیکرد بە نوێکردنەوەی دەزگای سوپا ودەوڵەت. لە ئەستەنبوڵ بەسەر ئینکیشارییەکان زاڵبوو، فرمانیشی دا لە هەموو ولاتی سەر بەدەوڵەتی عوسمانی سوپای ئینکیشاری

---

[١٥٦] کارستن نیبور (المصدر السابق) ص٢٢
[١٥٧] المصدر السابق، ص ١٩
[١٥٨] المصدر السابق، ص ١٧-١٩

هەڵبوەشێتەوە. لەبری ئەمە دەستیکرد بەکردنەوەی قوتابخانەی نویێ بۆ دەرچوواندنی ئەفسەر وفەرمانبەران بۆ کارگێری دەزگا نوێییەکەی.

بەمەش عێراق جۆرێك لە نوێبوونەوە، یان چاکسازی رووکەشی لە حکومەتەکەی بینی. ئەمە لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمەوە بوو. جا (ئەفەندییەکان) ئەوانەی دەرچووی قوتابخانە نوێییەکان بوون، شوێنی ئینکیشاری ومەمالیکەکانیان دەگرتەوە. نکۆڵی لەوە ناکەین ئەو ئەفندیانە خراپە وبەدرەفتارییان، لەوانەی پێشووتر کەمتر بوو، لەگەڵئەوەشدا نەیانتوانی بەپێی پێوەرەکانی شارستانیەتی نوێ فرمانڕەوای چاکخواز بن. هۆکارەکەش ئەوە بوو ئەو نەخۆشیانەی قەوارەی دەوڵەتی تەنیبوو بە ئاسانی بەکردنەوەی چەند قوتابخانەیەك ودەرچوواندنی کەسانێك کە زاراوەی زانستە نوێیەکان کاوێژ بکەن و خۆیان لە خەڵك بە گەورەتر بزانن، چارەسەر ناکرێت.

مەدام دیولافوا، کە لەگەڵ هاوسەرەکەی لەساڵی ١٨٨١ بەعێراق گەڕاون. باس ئاستی بەدرەفتاری ئەفسەر وفەرمانبەرانی دەوڵەتی عوسمانیمان بۆ دەگێڕێتەوە. باس لەوە دەکات یەکێك لە بەڕێوەبەری فەرمانگەکانی بەغدا بەڵێنی دروستکردنی باڵەخانەیەکی داوە، دوو جار دروستی کردووە. جاری یەکەم هێشتا بەتەواوی بناغەی دروست نەکردبوو، بەئەنقەست سوتاندی، لە ئەنجامی ئەمەش برە پارەیەکی گەورەی وەرگرت. مەدام دیولافوا دەڵێ سەرکردەکانی سوپا شانازی بە گەشتە جەنگی نا راستەقینەکانیان دەکەن کە لە بەرامبەردا پارەیان وەردەگرت. جارێك وا رێکەوت بزانرێت هەندێك لە گەورە ئەفسەرانی سوپا بوونیان نییە. کەچی دوای ماوەیەکی کەم بە( الباب العالي)یان راگەیاند هەموو تاکەکانی سوپا ئامادەن. ئەمەشیان بۆ پەردەپۆشکردنی ئابڕۆچوونیان بوو لە فرۆشتنی چەك و خراپ مامەڵەکردن بە پلەی سەربازیدا. زۆرجاریش وا روودەدات سەرکردەکانی سوپای لەگەڵ شێخی عەشایر رێکدەکەون بۆ ئەوەی لە چەند شوێنێکی دیاریکراو سوپا تالآن بکەن و دواتریش لەگەڵ ئەو شێخانە تالآنەکە دابەش بکەن[١٥٩].

---

[١٥٩] مدام دیولافوا (رحلة مدام دیولافوا ) – ترجمة علي البصري- ٨٣-٨٤

لەوانەیە ئەو چیرۆکانە کەم یا زۆر دروستکرا بێت، یان زێدەڕۆیی لە بەشێکی کرابێت، بەڵام لەگەڵئەوەشدا ناتوانین نکوڵی لەوە بکەین بەشێکی یان زۆر راستی تێدایە. زۆرێك لە پاشماوەی ئەو فەرمانبەرانەمان ناسیوە، یانیش گوێبیستی بەساڵاچووەکانمان بووین لەو بارەیەوە، بۆیە ئەو چیرۆکانە بەدوور نازانین کە لە بارەی ئەو فەرمانبەرانەوە کراوە.

دەگوترێت پۆست و ئەرکە باڵاکان لە ئیستەمبوڵ لەشێوەی موزایەدە بوو، بۆ ئەو کەسە بوو کە بەرتیلی گەورەی دەدا[١٦٠]. ئەو پیاوەی کە بەرتیلێکی گەورەش دەدا، چاودەبڕێتە ئەوەی پارەکەی خۆی بگێڕێتەوە، لەگەڵ زێدەیەکی گونجاو، ئەمەش لە گیرفانی خەڵکی داماو دەبێت.

ئێمە نکوڵی لەوە ناکەین لە نێو فەرمانبەرانی ئەوکاتەی دەوڵەت پیاوی چاك و لەخواترس هەبووە، بەڵام ئەمانە ژمارەیان زۆر کەم بووە، تەنانەت لەوانەیە لەنێو هاوڕێیانیان بەنەشاز زانرابن. وەك دەردەکەوێت زۆر ئەستەم بووە فەرمانبەر دەستپاك بێت، چونکە ناتوانێ بە مووچەی خۆی بژێوی دابین بکات، کە زۆر کەم و نارێك بوو، زۆرجاریش چەند مانگێك دوادەکەوت[١٦١].

موحسێن ئەمین بۆمان دەگێڕێتەوە، لە ساڵی ١٩٠١ لە عێراقەوە سەفەری شامی کردووە، بە رومادی تێپەڕیوە، لەوێ مەئموری نفوس رێگەیان پێدەگرێت و رێگەی رۆشتنیان نادات، تەنها دوای پێدانی بەرتیل نەبێت. دواتر ئەو مەئمورە دەچێتە لایان و داوای لێبوردن دەکات و دەڵێ" لێم مەگرن، دەوڵەتی ئێمە مەئمور دەنێرێ و دەڵێ بەرتیل وەربگرە، پارەی خەڵك ببە و چی دەتەوێ ئەنجامی بدە... مووچەی یەك مانگم پێنج مەجیدیە (دراوی عوسمانی) ئایا بەشی توتنەکەم دەکات. ئەگەر تووشی ئێوە نەبم، چی بکەم؟ پێیان گوت: لێت ناگرین"[١٦٢].

هەر موحسین ئەمین باس لەوە دەکات لە کاتی گەڕانی بەبەغدا، بانکی شاهانەی بەریتانی بینیوە. لەبەر دەرگاکەی تابلۆی بانکی بینیوە، دوو پیاوی هیندیش

---

[١٦٠] مذكرات مدحت باشا- ترجمة يوسف حنانة- ص ٢٣٤ (نقلا عن: ابراهيم الوائلي- الشعر السياسي العراقي في القرن التاسع عشر) ص ٢٤ ـ ٢٥

[١٦١] ساطع الحصري (المصدر السابق) ص ١٠٣

[١٦٢] محسن الامين (أعيان الشيعة) ج ٤٠ ص ٧٠-٧١

لەبەر دەرگا بووە. کاتێکی دیکە بە بەردەم بانکەکە تێپەڕیوە تابلۆکەی نەبینیوە. وەك دەردەکەوێت ئەوان بەڕۆژ تابلۆیان داناوە، بەشەو هەڵیانگرتووە، نەوەك دز بانکەکە ببڕێت. موحسین ئەمین دەڵێ" بەلامەوە سەیر بوو ئەمە لە شارێك رووبدات، والی و موشیری لێ بێت و پایتەختی ولاتیش بێت"[١٦٣].

## مەدحەت پاشا:

بۆئەوەی درك بەو بەدرەفتارییە بکەین، کە حکومەتی عوسمانی لە عێراق بەدەستیەوە دەینالاند، دەبێت سەیری سەرگوزەشتەی مەدحەت پاشا بکەین، کە دەوڵەت وەك والی عێراق لەساڵی ١٨٦٩ دەیمەزراند و نزیکەی دوو ساڵ لەم پۆستەدا مایەوە.

ئەم والییە دەستپاك بوو، موکڕ بوو لەسەر کارکردن، حەزی بەچاکسازی بوو. سەرەڕای ئەمانەش پڕبوو لە رۆشنبیری ئەوروپی. هەوڵیشی دا هەندێك داهێنانی شارستانی لە عێراق ئەنجام بدات. لەوانە یەکەم قوتابخانەی نوێی دامەزراندن، لەگەڵ قوتابخانەی پیشەسازی، کارگەی رستن وچنین، باخچەی گشتی، نەخۆشخانەی بیانیان، چاپخانە و رۆژنامەیەکی فەرمی دامەرزاند. هاوکاربوو لەدانانی شاری ناسرِیە و رومادی، هەوڵیدا شاری کەربەلا فراوان بکات، سیستەمی بۆ شارەوانی بەغدا دانا. نۆژەنکردنەوەی قشڵەی تەواوکرد، هێشتا بەفەرمانگەکانی دەوڵەتەوە ئاودانە. کۆمپانییەکی ئەهلی (ترام)ی لە نێوان بەغدا و کازمییە دامەزران، هەروەها هەوڵی چاکسازی دا لە زەوییە کشتوکاڵییەکان ومافی بەکارهێنانیان. چەندین کاری دیکەی ئەنجام دا، لێرەدا دەرفەتی باسکردنیان نییە.

مەدحەت پاشا وەك ئەوانەی پێش خۆی نەبوو، زۆر بایەخی بە نۆژەنکردنەوەی مزگەوت و فراوانکردنی ئەوقاف نەدا. ئەو لەبری ئەوە بایەخی بە ئاودانی ولات دەدا، کارەکانیشی بەسەرەتای شارستانیەتی نوێ دادەنرێت لە عێراقدا، خەڵك بەو کارانەوە سەرسام بوون، هەندێکیش دژی وەستانەوە، لەوانە لە فوراتی ناوەڕاستدا نزیکەی سەرجەم هۆزەکان بڕیاری یاخیبوونیان دا، بە شێوەیەك

---
[١٦٣] المصدر السابق ، ص ٤٧

مەدحەت پاشا نەیتوانی ملکەچیان بکات، دوای کۆششێکی زۆر نەبێت. لە بەغداش گەڕەکی (باب شێخ) و گەڕەکی (قەنبەر عەلی) و چەندین گەڕەکی دیکە لێی یاخیبوون. ئەمەش لە دژی سەربازیکردنی ئیجباری بوو کە مەدحەت پاشا فەرزی کردبوو. ئەو خەڵکە چەکیان هەڵگرت و هەرا وهۆسەیان دەکرد وەك ئامادەکارییەك بۆ جەنگ، تەنانەت لە ناو ڕێگاکان هاتوچۆیان دەکرد وهەندێك کاری تالآنکاریشیان ئەنجام دا. ئەو خەڵکە خۆیان بۆ هێرشکردنە سەر گەڕەکەکانی مەسیحی و جولەکەکان ئامادەکردبوو.. بەڵام مەدحەت پاشا هەر زوو بەسەر ئاژاوەکە زاڵ بوو[١٦٤]. لە راستیدا ئەو وەك چۆن چاکساز بوو، بەهەمان شێوە پیاوێکی سیاسی ژیر بوو.

سەیر ئەوە بوو، پیاوانی دەوڵەت لە ئیستەنبول، ئەو کارە چاکسازییانەیان لەبەرچاو نەگرت کە ئەو پیاوە لە عێراقدا ئەنجامی دابوو. وەك ئەوەی زۆر و کەم بایەخی بەلای ئەوانەوە نەبێت. بەڵکو ئەوان سەیری ئەو برە پارانەیان دەکرد کە لە عێراقەوە بۆیان رەوان دەکرا، لەوانەشە هەر هیچی بۆ رەوانە نەکردبن، داهاتەکەی هەر لەعێراق خەرج کردۆتەوە. ئەمەش کارێك بوو جێی رەزامەندی ئەوان نەبوو، بۆیە یەکسەر فرمانی گواستنەوەیان دا.

عەباس عەزاوی مێژوونووس لەوبارەیەوە دەڵێ" پیاوانی دەوڵەت لە ئیستەنبوڵ بینیان ئەو پرۆژانەی مەدحەت پاشا دەوڵەت لەو داهاتە زۆرە بێبەش دەکات، کە ساڵآنە لە عێراقەوە بۆیان دەچوو. دەوڵەتی عوسمانی لەمەدا وەك ئەو کەسانە بوو کە ئەوقاف بۆ مەرامی خۆیان بەکاردەهێنن، ئەوان دەیانەوێ لە نزیکترین کاتدا کرێ وەربگرن، بایەخ بەداروخان و لەناوچوون نادات..."[١٦٥].

لە پرۆژەکانی ئاودان کردنەوە، مەدحەت پاشا پشتی بە بەخششی خەڵکەوە دەبەست، ئەمەش هیچ بارقورسی بۆ خەزێنەی دەوڵەت نەبوو. کێشەکە لەڕوانگەی دەوڵەتەوە لەوە دابوو ئەو برە پارەیەی نەناردبوو کە دەوڵەت هەموو ساڵێك لە عێراقی وەردەگرت، ئەمەش گەورەترین نەنگییەکانی والی بوو لەو سەردەمدا.

---

[١٦٤] عباس العزاوي (المصدر السابق) ج ٧، ص ٢٠١-٢١٢

[١٦٥] المصدر السابق ج ٧ ، ص٢٧٠

ئەوەی جێگای سەرنجە کاتێك مەدحەت پاشا هاتە عێراق، وتارێکی درێژی بۆ خەڵك خوێندەوە، تێیدا باسی لە شکۆمەندی سوڵتان و دەوڵەتی عوسمانی کرد. وەسفی دەوڵەتی عوسمانی کرد گوایە خۆشگوزەرانی ودادپەروەری کامەرانی و رەحمەتی بۆ هەموو خەڵك دەوێ بێ جیاوازیی... دواتر وتی" ئەو کاوڵکارییەی هەیە، بێ چالاکی، هەموو لە کەموکوڕی خەڵکەوەیە. ئەوان ئەو رێگەیان نەگرتۆتەبەر کە نەتەوەکان پێیدا رۆیشتوون. بەڵکو هەرکەسە خەریکی کاروباری خۆیەتی. بۆیە ئوممەت نەگەیشتۆتە ئاستی نەتەوەکانەوە. دەربازبوونیش لەو تەنگەژەیە نییە، تەنها ئەوە نەبێت بەدوای سوڵتانی مەزن بڕۆین. هەموو خاوەن پۆستەکانیش دەبێت گوێڕایەڵی ویستی ئەو بن، سوڵتان پارێزگاری لەمافی تەواوی خەڵك کردووە، چاودێری ئاسوودەییان دەکات، دادپەروەری لەنێویان بەرقەرار دەکات. والییەکانیشی بۆ ئەو مەبەستە ناردووە، زیاد لەگوێڕایەڵ بوون بۆیان و جێبەجێکردنی فەرمانەکانیان داوا ناکات، بۆ ئەوەی بتوانین کۆشش بکەن و بە ئامانجەکە ..."[166].

وا خەیاڵ دەکەم، مەدحەت پاشا درکی بە هەڵەی بۆچوونەکەی کردووە، کاتێك دەوڵەتی فرمانی گواستنەوەی دا لە عێراق، لەوانەشە روونتر لەهەڵەکەی گەیشت بێت، کە دواجار سوڵتان دووری خستەوە و فرمانی ژەهرخواردنی دا، کە دواجار لەمەنفا کوژرا[167].

پوختەی قسەکانمان ئەوەیە، مەدحەت پاشا چاکترین والی عوسمانییەکان بوو کە لە عێراق جڵەوی دەسەڵاتیان بەدەستەوە گرتبوو. زۆرێك لەوالییەکانی دوای ئەو ویستیان لەهەندێك شت لاسایی بکەنەوە، بەڵام لەقوڵایی ناخییانەوە دەیانزانی لەلایەك دەوڵەت چاکسازی ناوێت، لەلایەکی دیکەش خەڵکی عێراق لە چاکسازی ناگەن. لەوانەشە هەندێك لە والییەکان خۆیان چاکسازییان ناوێ و لەچاکسازی نەدەگەیشتن.

[166] المصدر السابق، ج٧ ، ص ١٦٢- ٢٢٨

[167] صديق الدملوجي (مدحت باشا) ص ٢٢١-٢٢٨

کاتێك دکتۆر جۆن فانیس لەساڵی ۱۹۰۳ هاتە عێراق، زانی کۆمەڵگای عێراقی پێویستی زۆری بە قوتابخانەی نوێ هەیە، خوێندن بەزمانی عەرەبی بێت نەوەك زمانی تورکی، کە لەقوتابخانەکانی ئەو سەردەمدا باوبووە. کاتێکیش ئەو بابەتە لەگەڵ والی دەکاتەوە، والی بەگاڵتەوە وەڵامی دەداتەوە و دەڵێ" بۆ تۆ کاتی خۆت لەفێرکردنی گوێدرێژ بەفیرۆ دەدەیت"[168].

**دوای راگەیاندنی ( مەشروتیە ):**

مەبەست لە (مەشروتیە) ئەو بزووتنەوەیە بوو، لە تورکیا وئێران دەرکەوت. داوای دەستوور وسیستەمی نوێنەرایەتی دەکرد لە حوکمڕانیدا. ئەوانەی لە ئەستەنبول بانگەشەیان بۆ ئەو بزووتنەوەیە دەکرد، لەساڵی ۱۹۰۸ و ۱۹۰۹ سەرکەوتن و سوڵتان عەبدولحەمیدیان کەنارگیر کرد. هەوڵیشیان دا لە وڵاتانی ژێر دەسەڵاتی عوسمانی هەڵبژاردن ئەنجام بدەن، دروشمی بزووتنەوەکەش بریتی بوو لە (ئازادی و دادپەروەریی و یەکسانی).

نکۆڵی لەوە ناکەین لە ئەنجامی بزووتنەوەی مەشروتیە، حکومەتی عێراق هەندێك رووخساری چاکسازی بەخۆوە بینی. چەندین رۆژنامە لە بەغدا دەردەچوو، ئەو رۆژنامانە رەخنەیان لە فەرمانبەران دەگرت وداوای ئەنجامدانی چاکسازییان دەکرد لە دەزگای کارێگری عێراقدا. بەشێوەیەکی تایبەت ئەمەمان لە رۆژنامەی (الرقیب) تێبینی کردووە. ئەم رۆژنامەیە رەخنەی توندی لەم و لەو دەگرت، دواتر ستایشی والی دەکرد بۆ هاندانی لەلادانی فەرمانبەرانی گەندەڵ. بەهەرحاڵ ئەو رۆژنامەیە نەیدەتوانی بەراشکاوی بڵێ لەوانەیە والی خۆی سەری گەندەڵییەکان بێت.

کێشەی زۆربەی عێراقییەکان، بەتایبەتی عەوامی خەڵك ئەوەبوو، وا لە مەشروتیە دەگەیشتن گوایە ئازادی رەهایە مرۆڤ دەتوانێ بەئارەزووی خۆی هەرشتێك بکات. دەگوترێت دزێك چووە سەرماڵێك و خاوەن ماڵەکەی کوشت. دواتر لەدادگا بڕیاری لە سێدارەدانی بۆ دەرچوو. بەو مانایە وتبووی" ئەی ئەو ئازادییە لەکوێیە کە بانگەشەی بۆ دەکەن؟! دزەکە وا تێگەیشتووە ئازادی رێگە

---

[168] جون فانیس (أقدم أصدقائي العرب) – ترجمة جليل عسو - ٣٣٩

بە مرۆڤ دەدات بەویستی خۆی داگیرکاری بکات و بکوژێ و دزی بکات. زۆرێکیش لە پیاوانی ئایینی مەشروتیەیان بە حەرام و کوفر زانی. وەك دەردەکەوێت ئەوان دەیانویست لەسەر باروۆخی ئەو حکومەتە بەدرەفتار و کاولکاری گشتی بمێننەوە. لێرەشدا دروستی فەرمودەکەی پێغەمبەری مەزن دەردەکەوێت کە دەفەرموێ" ئێوە چۆنن وەها حوکمڕانی دەکرێن".

**نازم پاشا:**

ئەم پیاوە لەساڵی ۱۹۱۰ وەك والی عێراق دامەزرا. واتە لەسەردەمی مەشروتییە بوو. بە (مەدحەتی دووەم) ناودەبرا، ئەمەش لەبەر چالاکی و هەوڵەکانی بۆ چاکسازی. نزیکەی ساڵێك لە عێراق مایەوە، کارە باشەکانی لەو چەند خاڵەی خوارەوە کورت دەکەینەوە.

١- یەکەم شەقامی لە بەغدا کردەوە. وەك پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد ئەویش شەقامی رووبار (شارع النهر) بوو.

٢- کۆکردنەوەی سەگی بەرەڵا. والی فرمانی دەرکرد هەموو ئەو سەگانە بە پەت ببەسترێتەوە لە شوێنێکی تایبەت دابنرێت کە لەنزیك گۆرستانی جولەکەکان بوو. دەگوترێت لەسەردەمی نازم پاشا کاتێك سەگ گوێبیستی وشەی (حبل: پەت) دەبوو، رایدەکرد. بۆیە منداڵە بەدوای سەگ دەکەوتن و هاواریان دەکرد (حەبل، حەبل) ئەویش بەترسەوە رایدەکرد.

٣- پاککردنەوەی کوچە وکۆڵانەکانی بەغدا. والی فرمانی ئامادەکردنی زبڵدانی کرد، بۆ کۆکردنەوەی پیسی. رێگەشی نەدەدا ماڵەکان زبڵ بخەنە کۆڵانەکانەوە. بەڵکو دەبێت لەکاتی بیستنی زەنگی تایبەت بە عەرەبانچییەکانی بدەن.

٤- سەربازەکان پێشتر بەرێکوپێکی مووچەیان وەرنەدەگرت، بۆیە بەر لەهاتنی جەژن هێرشیان دەکردە سەر بازاڕەکان و تالآنیان دەکرد. ئەمە بەزاراوەی بەغدابیەکان بە (فەرهود) ناودەبرا. کاتێك نازم پاشا هات دیاردەی فەرهودی قەدەغەکرد و فرمانی دا مووچە دواکەوتووەکانی سەربازەکان بدرێ.

٥- والی بەنداوێکی درێژی لەلایەنی رۆژهەڵاتی بەغداوە دروستکرد، بۆ ئەوەی بەغدا لە لافاو بپارێزێت. ئەو بەنداوە تا ئێستاش ماوە بە بەنداوی نازم پاشا دەناسرێت. چەندین جار بەغدای لە نقوم بوون رزگارکردووە.

٦- والی رێزێکی مەزنی بۆ مانگی رەمەزان دانابوو، پۆلیس لە کۆڵان و بازارەکان دەخولانەوە، هەرکەسێك خواردنی بخواردایە دەستگیر دەکرا. دەستگیرکراوەکەش دە دار جەڵدەی لێ دەدرا و دواتریش مانگێك زیندانی دەکرا[١٦٩].

٧- ئەو چاڵ و خەندەقانەی پڕ کردەوە کە لەچەند لایەکەوە لە دەوری بەغداوە هەڵکەندرا بوو، ئەو چاڵانە لەمێژ بوو بەدوای شورای بەغداوە هەڵکەندرابوو، بۆ پاراستنی شارەکە لە هێرشکردن. دواجاریش ببوە شوێنی پیسی و بۆگەن، تاوانکاری.

٨- ژووری بازرگانی بەغدای دامەزراند، فرمانی دا کۆمپانیاکان ناویان تۆمار بکەن و مۆڵەت لە ژووری بازرگانی وەربگرن. یەکەم سەرۆکی ژووری بازرگانی مەرکوریان بوو کە بەرێوەبەری بانکی عوسمانی بوو، سەرۆکی دووەمیش شائول حەسقیل بوو.

٩- والی بە شێوەیەکی رێژەیی توانای ئاسایش بەرقەرار بکات، داوای لەپیاوانی ئایینی و فەقیهەکان کرد فەتوای حەرامکردن داگیرکاری نێوان هۆزەکان بدەن. ئەمەش داوتر باسی دەکەین.

لەوانەیە ئەو کارانەی نازم پاشا لە بەغدا ئەنجامی داوە، لە تێروانینی هەندێك کەسەوە هیچ بێت. ئەگەرهاتوو بە تێروانینی شارستانیەتی پێشکەوتوو سەیر بکەین ئەوا لە زۆر وڵاتان هەیە. ئێمە بۆیە باسمان کردووە بۆ ئەوەی خوێنەر بزانێ ئەوکاتە شارستانیەت لەعێراق بەر لەجەنگی یەکەمی جیهان لە چ بارودۆخێکی سەیر بووە. نازم پاشاش لە عێراق بە کۆششەکانی بۆ چاکسازی ناسراوە. ئەمەش لە ئەنجامی ئەو کارانەی کە بە هیچ دەزانرێت. خۆزگە دەمانزانی حاڵی والییەکانی دیکە چی بووە کە بەچاکسازی نەناسراون، یانیش بە گەندەڵی بەناوبانگ بوو.

---

[١٦٩] عبدالكريم العلاف (المصدر السابق) ص ١٧٧-١٨٠

## نوکتەی کۆتایی:

کاتێك نازم پاشا لە بەغدا گوێزرایەوە، دەوڵەت جەمال پاشای وەك والی لە شوێنی ئەو دانا. ئەم والییە نوێیە تارادەیەکی زۆر بە والییەکەی پێشووی دەچوو لەڕووی ڕۆشنبیری نوێ و کۆششی بۆ چاکسازی. کەچی خەڵك ڕقی لەو والییە بوو چونکە تێکەڵی کەسانی ئەوروپی دەبوو لە بەغدا، لە ئاهەنگ و سەمایان بەشدار دەبوو. ئەو لە کۆشکێکی سەر رووباری دیجلە نیشتەجێ بوو لە نزیك باب شەرگییەوە. ئەمەش ئەو کۆشکە بوو کە تا سەردەمێکی نزیك وەزارەتی کاروباری کۆمەڵایەتی لێ بوو. دراوسێی جەمال پاشا بەڕێوەبەری بانکی عوسمانی بوو کە پیاوێکی ئینگلیز بوو. هەندێك جار جەمال پاشا لەگەڵ هاوسەری ئەو پیاوە سەمای دەکرد. ئەمەش وایکردبوو والی جێگای رق و ناحەزکردنی خەڵك بێت. یەکێك لە نووسەرەکانی ئەو سەردەمە لەسەری نووسیوە و دەڵێ" بە ئابڕووچوون بەناوبانگ بوو، سەمای دانسی لەگەڵ مەدامی بەڕێوەبەری بانقی عوسمانی کردووە..."[170]. دیارە خەڵك دەیویست ئەم والییەش وەك پیاوانی پێشووی عوسمانی بێت: ریشی درێژ بکات و نزای شاراوە بکات، نوێژ لە مزگەوت بکات. هەڵسوکەوت لەگەڵ پیاوانی ئایینی بکات. گرنگیش نییە دوای ئەمانە چی لەوان و ولاتەکەیان دەکات.

ئەمە حاڵی خەڵك بوو لەسەردەمی عوسمانییەکان؛ بە سەردار و ژێردەستەوە. تا ئەو کاتژمێرەش ئاسەواری ئەو بارودۆخە کۆمەڵایەتییە لە دەروونی زۆرێك خەڵك بەشاراوەیی ماوەتەوە.

[170] (المصدر السابق)

## بەشی شەشەم

### ململانێی رۆشنبیری لە عێراقدا

وەك لەبەشی پێشوو بینیمان، عێراق لە سەردەمی عوسمانیدا بەدەست داڕوخانێکی توندی شارستانیەتەوە دەینالآند. سەرەڕای ئەمەش بەڕووی بیابان کراوەتەوە، بەشێوەیەك هۆزەکانی (بەدو) ناوە ناوە دزەیان دەکردە عێراق وتێیدا جێگیر دەبوون. لەئەنجامی ئەمەشدا عێراق بووە بۆتەیەکی کۆمەڵایەتی گەورە تێیدا ئەو هۆزانەی لە بیابانەوە هاتبوون لەگەڵ دانیشتوانی عێراق کە پاشماوەی نەتەوە کۆنەکان بوون، کاریان لەیەکتر دەکرد.

هۆزەکان دەهاتە عێراق، لەگەڵ خۆیان بەهای بیبانشینیان هەڵگرتبوو. لەگەڵ ئەو دانیشتوانە کاریان لەیەکتر دەکرد کە بەهای تایبەتی خۆیان هەبوو. بۆیە دەبێت هۆزە نوێیەکان کاریگەر بن بە دانیشتوانە کۆنەکان و لەبەرامبەریش دەبێت دانیشتوانەکان کاریگەر بن بەهۆزەکانەوە. ئەو ئالوگۆڕییەی کارلێکردن کۆمەڵگای عێراقی کردۆتە خاوەن خەسڵەتێکی تایبەت، ئەو دیاردەیەش بەرهەم هێناوە کە لەکۆمەڵناسی بە ململانێی رۆشنبیری دەناسرێت (Clash of Cultures).

زانای کۆمەڵناسی نورنوالد ئامارەی بۆ دەرکەوتنی ئەو جۆرە ململانێیەی رۆشنبیری کردووە، لە هەموو ئەو ناوچانەی جیهان کە تێیدا بەدوەکان بەر جووتیاران دەکەون[171]. بە بڕوای من ئەو ململانێیە لەعێراق زۆر روونە، چەندین رووخساری هەیە. بەشێوەیەك ئێمە ناتوانین لە سروشتی کۆمەڵگای عێراق بگەین، ئەگەر لەو ململانێیە قوڵ نەبینەوە.

ئەوەی شایەنی ئاماژە بۆ کردنە، ئەو ململانێیەی رۆشنبیری لە سەرتاسەری عێراق لەسەر یەك رێچکە نییە، بەڵکو لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە دەگۆڕێت، بەپێ

[171] Encyclopedia of Social Sciences, Vol . VII art Nomads

بارودۆخ و شێوازی بژێوی ناوچەکە. دەتوانین لەو لایەنەوە عێراق بۆ چەند ناوچەیەك دابەش بکەین، کە ئەمەی خوارەوە پوختەکەیەتی:

١- ناوچە شاخاوییەکان: ئەمە دەکەوێتە گۆشەی باکووری رۆژهەڵاتی عێراق، زۆرینەی کورد تێیدا دەژێت. لەگەڵ کەمینەیەکی تورکمان لە شار و گوندەکان کە بەنزیکەیی لەسەر یەك هێلی راستن. هەر ئەو هێلەش ناوچەکە لە شوێنەکانی دیکەی عێراق جیا دەکاتەوە. هەر لەو ناوچانەش کەمینەی ئایینی هەیە وەك ئیزدی و تایفەکانی مەسیحی.

ئەم ناوچەیە ناچێتە چوارچێوەی توێژینەوەکەی ئێمەوە، بەڵکو شایەنی توێژینەوەیەکی تایبەتە. جارێکیش هەوڵی توێژینەوەم داوە بەلام کەمێك نەبێت، ئەگینا سەرکەوتوو نەبووم. ئەمەش لەبەر نە شارەزاییم بوو لەو زمانانەی لەناوچەکە باون. بەهەرحاڵ ئێمە پێمانوایە ئەو هۆزانەی لەبیابانەوە هاتوون نەیانتوانیوە لەو ناوچانە شۆڕ ببنەوە. کاریگەریەکی ئەوتۆیان بەسەر ئەو ناوچەیە نەبووە. ئەو ناوچەیە زیاتر کەوتۆتە ژێر کاریگەری هۆزە کۆچەرییەکانی ناوچە شاخاوییەکانەوە، نەوەك هۆزەکانی بیابان. بۆیە باوەڕم وایە لە زۆر لایەنەوە ئەو ململانێیە رۆشنبیریەی لەو ناوچەیە هەیە جیاوازی لەگەڵ ناوچەکانی دیکەی عێراق هەیە.

٢-ناوچەی دیالی: ئەم ناوچەیەش دەکەوێتە باشووری ناوچەی شاخاوییەوە، لە رۆژهەڵاتی بەغداوە. سەرەڕای بچووکییەکەی، ئەم ناوچەیە گرنگیەکی کۆمەڵایەتی و ئابووری گەورەی هەیە. زۆرینەی ئەو ناوچەیە بێستانە. لەزۆر رووەوە لە غۆتەی شام و دەلتای میسر دەچێت. ئەوەی لەمەشدا هاوکاری کردووە رووبارە. ئەو رووبارەی ناوچەکە ناوی خۆی لەو وەرگرتووە، لە ناوچەی شاخاوییەوە دێت، واتە ئاستەکەی بەرزە، دواتر بەرە بەرە ئاستەکەی نزم دەبێتەوە، بۆیە سوودێکی دووسەرەی بۆ ناوچەکە هەیە. کاتێك لە کەناڵە بەرزاکانەوە دەردەچێت ئەوا بەدەم رۆیشتنەوە بێستانەکان ئاو دەدات، لەلایەکی دیکەوە کاتێك ئاوەکەی زیاد دەبێت ئەوا (دەراو)ی بۆ دروست دەکرێت ئاوەکەی دەڕژێتە ناو بێستانەکانەوە.

ئەو دانیشتوانەی لەو ناوچەیە کاری کشتوکاڵی دەکەن، ژمارەیان زۆرە، لەگەڵ هۆزەکانی دەوروبەریان جیاوازی زۆریان هەیە. ئەوان نزیکترن لەشارستانیەت نەوەك هۆزەکان. بۆ نموونە ئەوان سڵ لەچاندنی سەوزە ناکەنەوە. بەڵکو لەدێرزەمانەوە لەچاندنی راهاتوون. ئەمەش ئاماژەیەکی گرنگی کۆمەڵایەتی هەیە، چونکە چاندنی سەوزە لەلای هۆزەکانی (بەدو) بە پیشەیەکی نزم دەزانرێت. لەلای ئەو کەسانەی هێشتا لە بەدوەکانیش نزیك هەر وایە. جیاوازییەکی دیکەی کۆمەڵایەتی هەیە لەو دەرفەتەدا قورسە بچینە نێو وردەکاریەکانەوە.

٣- ناوچەی جەزیرە: ئەو ناوچەیە دەکەوێتە نێوان دیجلە وفوراتەوە، لەباکوری بەغدا. نیمچە بیابانە. لەرووی جوگرافییەوە بە درێژبوونەوەی بیابانی شام دادەنرێت تەنها فورات جیایان دەکاتەوە. بڕوای ئەوە هەیە زۆربەی هۆزەکانی بەدو، کاتێك لە بیابانەوە دێن یەکەمجار دێنە ئەو ناوچەیە. دواتر بەرە بەرە بەرەوباشوور دەکشێن. هیچ بەربەستێکی سروشتی لە بەردەم هاتنی ئەو هۆزانە نییە تەنها فورات نەبێت. ئەو رووبارەش لە هەندێك شوێنی نزمی خۆی دا هەندێك خاڵی پەڕینەوەی ئاسانی هەیە[١٧٢].

دەتوانین بەشێوەیەکی گشتی بڵێین، ئەو هۆزانەی لە ناوچەی جەزیرە نیشتەجێن، زیاتر لە هۆزەکانی باشوور پەیوەستن بە بەهاکانی بیابانئشینەوە. ئەو پەیوەندی بە بیابانەوە هەیە، بەڵگەی ئەمەش شێوەزاریانیە کە زۆر لە شێوەزاری بەدوەکان نزیکە. سەرەڕای ئەمەش لەسەر مەزهەبی سونین، کە مەزهەبی زۆرینەیە لەبیابانی عەرەبدا. کەچی هۆزەکانی باشوور زۆربەیان شیعە مەزهەبن. لەراستییدا ئەمەش یەکێکە لە بەڵگەکان لەسەر کۆنی جێگیربوونی شیعەگەرایی لەعێراقدا. ئەو مەزهەبە هەر لە سەدەی یەکەمی ئیسلامەوە لە عێراق دەرکەوتووە. لە بیابانەکانی دەوروبەر نەیتوانیوە بڵاوبێتەوە، ئەمەش لەبەر چەند هۆکارێك کە لەبەشی داهاتوودا دێینەوە سەری.

١٧٢ التقرير الرسمي المرفوع الى عصبة الامم عن أحوال الادارة العراقية في سنة ١٩٢٦- تعريب عطا نعوم- ص٥٥

٤- ناوچەی بیابان: ئەمەش ناوچەیەکی پان وفراوانە، دەکەوێتە رۆژئاوا وباشووری رۆژاوای عێراق. ئەو ناوچەیە لەکۆندا بەبەشێك لەعێراق نەدەزانرا، وەك دەرکەوێت لەسەردەمی عوسمانییەکانەوە، بە بەشێك لە عێراق زانراوە، ئەمەش ئەو کاتە بووە کە سنووری نێوان عێراق و سوریا و نەجد، بۆ چەند مەبەستێکی کارگێری دانراوە.

ئەم ناوچەیە هێشتا خاوەن خەسلەتێکی گشتی بەدوە. ململانێی رۆشنبیری تێدا نییە، کەمێك نەبێت. ئێستا چەند هۆزێکی بەدوی تێدا نیشتەجێیە، بەناوبانگترین عنزە و زەفیرە. عێراق زۆر بەدەست هێرشەکانی ئەو هێزانە نالأندوویەتی، هێرشەکانیشیان نەوەستاوە، تەنها بەم درەنگانە نەبێت، ئەمەش دوای ئەوە حکومەت توانای راوەدوییان بێت یان دەستەمۆیان بکات.

٥- ناوچە نیشتەنییەکان ( **المنطقة الرسوبية**): ئەمەش دەکەوێتە ناوەراستی عێراق و باشوورییەوە. لەبەرئەوەش بەمە ناوی دەبەین، چونکە لیتەیەکی زۆری رووبارەکانی تێدا نیشتووە. لەراستیدا ئەم ناوچەیە زۆرترین گرنگی لەرووی کۆمەڵایەتی ومێژووییەوە هەیە. ئەوەی شایەنی باسە، جوگرافیناسەکانی کۆن کاتێك باسی عێراقیان کردبێت، بایەخیان بەو ناوچەیە داوە، هەندێکجاریش هەندێك ناوچەی دیکەیە دەگەڵ ئەو ناوچەیە داوە. ئەوان وا راهاتبوون کە ناوچەی جەزیرە لەعێراق جیابکەنەوە بەوڵاتێکی سەربەخۆی دابنێن[١٧٣].

بە بڕوای من ناوچە نیشتەنییەکان ئەو خەسڵەتە کۆمەڵایەتییەی بەعێراق داوە کە لە دێرزەمانەوە پێیوە ناسراوە، بۆیە من ئەو ناوچەیە بە بۆتەی سەرەکی کۆمەڵایەتی عێراق دەزانم، تێیدا کەسێتی تاکی عێراقی بەشێوەیەکی گشتی تێیدا پێگەیشتووە.

دەبێت ئەوەش لەبیرنەکەین هەر ئەو ناوچەیە زێدی ئەو شارستانیەتەیە کە شان بەشانی شارستانیەتی میسر بەکۆنترین شارستانیەتەکانی دونیا دادەنرێن. لەتەورات ناوی بە (شنعار) هاتووە. کاتێکیش عەرەب لە فەتحی ئیسلامی هاتن

١٧٣ ثابت اسماعيل الراوي ( العراق في العصر الاموي) ص ١٩-٢١

بەناوی (السواد) ناویان برد، ئەمەش لەبەر چڕی كشتوكاڵ و زۆری دانیشتوان. لەسەردەمەكانی كۆنتر بە (عەمباری داهاتی جیهان) ناسراوە[١٧٤].

یەكێك لە خەسڵەتە جوگرافییەكانی ئەم ناوچەیە ئەوەیە، لەسەردەمە مێژووییە جیاوازەكاندا ڕێڕەوی ڕووبارەكانی تێدا گۆڕاوە[١٧٥]. ئەو ناوچەیە لەهەموو ناوچەكانی دیكەی عێراق زیاتر ڕێڕەوی ڕووبارەكانی تێدا دەگۆڕێت. ئەمەش لەلایەك بۆتە هۆی تێكچوونی شارەكان، لەلایەكی دیكەشەوە بۆتە هۆی دروستبوونی هۆرەكان (الأهوار). ئەگەر ڕێڕەوەكە بۆ ناوچەیەكی دیكە بگۆڕێت، ئەوا شاری سەر ڕێڕەوە كۆنەكە لەناودەچێت و لە ڕێڕەوە نوێیەكەش هۆرەكان دروست دەبن.

سەرەڕای ئەمەش ئەم ناوچەیە سوێری تێدا كەڵەكە دەبێت، ئاستی زەوییەكانی لە ئاستی ڕووبارەكەوە نزمتر دەبێت، بەتایبەتی لەوەرزی لافاودا. بۆیە كاتێك لەنێو ئەو خاكە هاتوچۆ دەكەین دەبینین پانتاییەكی زۆر فراوانی بەكەڵكی كشتوكاڵ نایەت و بریتین لە خاكی سوێری. ئەمەش لەلایەن شارەزایانەوە بە گەورەترین كێشەی كشتوكاڵی ناوچەكە دادەنرێت[١٧٦].

هەموو ئەمانەی سەرەوە مانای ئەوەیە، ناوچە نیشتەنییەكان پێویستی بەبایەخدانێكی بەردەوام و زۆر هەیە، بۆ چاكردنی ڕووبارەكان و ڕێكخستنی ئاودێری و بەپیتكردنی زەوییەكان، بۆ ئەوەی شارستانییەت تێیدا گەشە بكات. ئەگەریش كەمتەرخەمی لەمەدا كرا، ئەوا بیاباننشینی شوێنی شارستانیەت دەگرێتەوە. ئەمەش ئەوە دەگەیێنێ كە ململانێی ڕۆشنبیری لەو ناوچەیە لەهەموو ناوچەكانی دیكەی عێراق زیاتر ڕوونە.

٦- ناوچەی بەسرا: ئەم ناوچەیە لەلای باشوورەوە ئەوپەڕی ناوچەكانی عێراقە. دەكەوێتە هەردوو لایەنی بەنداوی عەرەبەوە كە تێیدا هەردوو ڕووباری دیجلە وفورات بەیەكتر دەگەیێنێ. ئەم ناوچەیە بە مەزنترین بێستانی دارخورمار

---

[١٧٤] متي عقراوي (العراق الحديث) تعريب المؤلف و مجيد خدوري -ص٣

[١٧٥] طه الهاشمي ( جغرافية العراق) ص ٤٧-٥٣

[١٧٦] متي عقراوي (المصدر السابق) ص ١١٢-١١٣

دادەنرێت لەجیهاندا[١٧٧]. لەمەشدا هەڵکشان و داکشانی کەنداوی عەرەب هاوکاری بووە. هەڵکشانەکەی بێستانەکانی دارخورمای بۆ ئاوداوە. داکشانەکەشی وەك دەراوێك بووە زۆر و کەم سوێرییەکەی پاککردۆتەوە.

ئەوەی جێگەی سەرنجە ئەو ناوچەیە زیاتر لەدانیشتوانی دیکەی عێراق هەستی هۆزگەرایيان لاوازە و کەمتر پابەندن بە بەهاکانی بیاباننشینی. توێژەری بەناوبانگی ئەنسرۆپۆلۆژیا هنری فیلد ئەو ناوچەیە بە (ناوچەیەکی نا هۆزگەری) ناودەبات[١٧٨]. وەك دەردەکەوێت سروشتی بێستانەکانی زیاتر کاریگەری بەسەر خەڵکەکەوە هەبووە، لەوەی لەناوچەی دیالەمان بینی.

**نموونەی چەند هۆزێکی نوێ:**

ئێستا لەعێراق سێ هۆز هەیە کە درەنگ لە بیابانەوە بۆی هاتوون. هاتنیشیان یەك بەدوای یەکەوە بووە. ئەو هۆزانەش تەمیم و شەمەر و عەنزەیە. کاتێك سەیری مێژووی ئەو هۆزانە دەکەین، لەرووی کاریگەربوونیان بەژینگەی کە بۆی هاتوون. بۆمان روون دەبێتەوە، چۆن هۆزەکانی دیکەی پێشتر هاتوون بەو ژینگەیەوە کاریگەر بوون.

کۆنترین هۆز لەوانە کە زووتر هاتبێتە عێراق هۆزی تەمیمە. ئەمەش بەر لەناوەڕاستی سەدەی هەژدەم بووە، پێشتر ئەوان لە بیابانەکانی نزیك عێراق بەدوای لەوەڕگا دەگەڕان، دواتر هاتنە باکوری عێراق لەناوچەی (عقرقوف) نیشتەجێ بوون، ئەمەش هەر لەساڵی ١١٥٠ کۆچییەوە[١٧٩]. دوای ماوەیەکی زۆر لەو مێژووەوە، واتە لە سەرەتای سەدەی نۆزدەم، هۆزی شەمەڕ هاتن لەناوچەی جەزیرە لەباکووری (عقرقوفەوە) نیشتەجێ بوون[١٨٠].

وەك دەزانرێت هۆزی شەمەر کە لە بیابانی شامەوە جێگیر بوو، لە رۆژئاوای فوراتەوە، لەفورات پەڕییەوە بۆ ناوچەی جەزیرە، کاتێك هۆزی عەنزە لەبەری نەجدەوە فشاری بۆ دەهێنا. عەنزە کە شەمەڕ لە بیابانی شامەوە وەدەردەنێ

[١٧٧] طه الهاشمي ( المصدر السابق) ص ٥٥

[١٧٨] Henry Field ( The anthropology of Iraq )part I, NO 2 P253

[١٧٩] JAMALI (New Iraq)p 121

[١٨٠] دائرة الاستخبارات البريطانية (تقير سرى عن العشائر و السياسة) ترجمة عبدالجليل الطاهر – ص ١٥٣

بەدوای دێت بۆ ناوچەی جەزیرە، چەندین جەنگی لەنێوان ئەو دوو هۆزە بەرپا دەبێت کە تا ئێستاش نموونەی لەیادەوەری ماوەتەوە[١٨١].

لە کۆتاییدا شەمەڕ توانی لەجەنگەکان سەرکەوێت، لەرێگای فوراتەوە عەنزەی وەدەرنا، بەمشێوەیە فورات بەربەستی نێوانیان بوو، عەنزە لە بیابانی شام نیشتەجێ بوو، جەزیرەشی بۆ شەمەڕی نەیاری جێهێشت. ئەوەی تێبینی دەکرێت عەنزە پارێزگاری لەزۆرێك لە بەها بەدوەکانی خۆی کرد. لەزۆر حاڵەتەکەدا هێشتا بەدوای لەوەرگای بیابان دەگەرێت، حکومەتی عێراق تا درەنگ سەرانەی بەو هۆزە دەدا، بۆ پارێزگاریکردن لە کاروان و ئەو ئۆتۆمبیلانەی بە ناوچەی ژێر دەستی ئەو هۆزە تێدەپەرین[١٨٢].

کەچی شەمەڕ بارودۆخەکەی زۆر لە عەنزە جیاوازە. حکومەتی عوسمانی لەسەردەمی مەدحەت پاشاوە ویستویەتی دەستەمۆی بکات و هانی بدات بۆ ئەوەی پیشەی کشتوکاڵ بکات. شێخ فەرحان شێخی شەمەڕ بۆ ئەستنبول چوو لەوێی خوێند، دواتر کە گەرایەوە حکومەت هەندێك زەوی کشتوکاڵی پێدا. مووچەیەکی بەبری ٢٠ هەزار قورش پێدا کە لە بەروبوومی کشتوکاڵی وەری دەگرت. لقەکانی هۆزەکەی لەدەوری کۆبوونەوە کاری کشتوکاڵیان دەکرد و وازیان لەشەڕ وتاڵان هێنا.کەچی دواتر حکومەت ئەو مووچەی بەزۆر زانی ، مووچەکەی بڕی. بەمەش هۆزەکە گەرایەوە سەر خوەکەی پێشووی[١٨٣].

دوای دامەزراندنی دەوڵەتی عێراق، لەدوای جەنگی یەکەمی جیهانەوە شەمەڕ، جارێکی دیکە گەرایەوە سەر کشتوکاڵ. ئێستا تێبینی ئەوە دەکەین هەندێك لەسەرۆك هۆزەکانی خاوەن زەوی کشتوکاڵین وحەزیان لەژیانی سەقامیگری و خۆشگوزەرانییە. تەنانەت نەوەیەکی نوێ لەنێویاندا پێگەیشتووە دەچنە قوتابخانەی نوێ، لەشارەکان دەژین. لە جلوبەرگ و ئۆتۆمبیل و خواردن کەشخە و خۆشگوزەرانن.

---

[١٨١] هاشم السعدی (جغرافیة العراق الحدیثة) ص ٩٨-٩٩

[١٨٢] متی عقراوی ( المصدر السابق) ص ٢٥٥

[١٨٣] عباس العزاوي (تاریخ العراق بین احتلالین ) ج ٧ ن ص ٢٣٦

کاتێک دەگەڕێتەوە سەر تەمیم دەبینین، هەنگاوێکی دوورتر ڕۆیشتوون. سەرۆکەکانی ئەو هۆزە لە ئاستێکی بەرزی کەشخەیی و خۆشگوزەرانی دان، تەنانەت هەندێکیان سەرەڕای کشتوکاڵ، کاری بازرگانی دەکەن. منداڵەکانیشیان لەکۆشکی گەورە دەژین و جلی فەرەنجی ( ئەورووپی) دەپۆشن و هاموشۆی یانە و مەلهاکان دەکەن.

هاوڕێیەکی ئاگادار باسی ئەوەی بۆ کردم، لەسەرەتای سەدەی بیستەم تەمیمیەکان نەیاندەزانی کشتوکاڵ چییە، بۆ بژێوی خۆیان پشتیان بەمەڕداری دەبەست. هەندێك لەسەرۆکەکانیان ژمارەیەکی دیاریکراویان حوشتر بۆ شانازیکردن هەبوو. کەچی شەمەر پشتیان بەحوشترەوانی دەبەست، بۆیە سوکایەتی بەتەمیم دەکرد و بە (شاویە) ناوی دەبردن و لە پێگەی کۆمەڵایەتی ئەوانی کەم دەکردەوە.

تەمیم کاری کشتوکاڵی نەدەکرد، تا ماوەیەك بەر لەجەنگی یەکەمی جیهان، دواتر بە کشتوکاڵی دانەوێڵە دەستی پێکرد و لەدوای ئەمەش دەستیکردووە بە کشتوکاڵی سەوزە، وا مەزندە دەکەم تەمیم و دواتریش عەنزە لەدوای تەمیمەوە هەمان ڕێگەیان گرتبێت.

وا خەیاڵ دەکەم، ئەو هۆزانەی بەر لەتەمیمیش هاتوون بەو قۆناغانەی گەشەکردن تێپەڕیون کە تەمیم پێیدا تێپەڕیوە. سەرەتا لە بەدو بووە حوشترەوان بووە، دواتر بۆماوەیەکی درێژ یان کورت (شاویە) بووە واتە مەڕدار بووە. دواتر دەستیکردووە بەچاندنی دانەوێڵە، لەدوای ئەمەش کشتوکاڵی سەوزەی کردووە، لەدواین جاریش دا گامێشەوان و هەندێك پیشەی دیکەی شارستانی کردووە. ئەمە زنجیرەی چەند ئەڵقەیەکە، بەدوای یەکترەوە دێن. هەرچەندیش ئەو هۆزە هەنگاوی دوورتری لەو زنجیرەیە نابێت، ئەوا بەبەرچاوی ئەو هۆزەی دوای ئەو دێتە عێراق پێگەی کۆمەڵایەتی دابەزیوە.

هۆزەکانی بەدو لەبیابان، رقیان لەهەموو رووخسارەکانی شارستانیەتە، بۆیە لە یەکێك لەپەندەکانیان هاتووە:" ئەگەر بەدو شارستان بێت بەدرەفتار دەبێت" هۆزی بەدو، بەپێی توانا دەیەوێ لە کشتوکاڵ خۆی بەدوور بگرێت. لەوانەشە وا

بزانێت کە کشتوکاڵەکە سەری داوەکەیە، ئەگەر تووشبوو ئەوا تووشی تەوژمەکە دەبێت و تادوایی لەگەڵ دەبێت.

جا تێبینی دەکرێت تەمیم قۆناغی بیابانشینیەوە بۆ قۆناغی شارستانی، بەماوەیەکی کورت بڕیوە. هۆکارەکەش ئەوەیە تەمیم کاتێکی درەنگ هاتە عێراق. ئەمەش ئەو سەردەمە بوو تازە سەرەتاکانی شارستانیەتی نوێ لەعێراق بەرەبەرە بەدی دەکرا. کەچی ئەو هۆزانەی پێش تەمیم هاتبوونە عێراق حکومەتێك لاواز و شارستانیەتێکی نزمیان بینیبوو. بۆیە زۆر بەسستی بەرەو شارستانی دەڕۆیشتن.

**بەرمیلی تورشیات:**

پێشتر ئاماژەمان بۆ ئەوە کرد، ناوچەی جەزیرە، وەك دەروازەیەکی عێراقە بۆ ئەو هۆزانەی لە بیابانەوە دێن، بۆیە هۆزەکانی ئەم ناوچانە زیاتر پابەند بە بەها بەدوەکانی خۆیانەوە، کەمتر لە هۆزەکانی ناوچەی نیشتەنیەکان تێکەڵ دانیشتوانە کۆنەکان دەبن. لە باکوری جەزیرەوە ئەو هۆزانە دەژین کە تازە لە بایابنەوە هاتوون، هێشتا پارێزگاری لە شوانکارەیی و کۆچکردن دەکەن. ئەوان لە خێوەتی دروستکراو لەتووکی حوشتر دەژین، هەروەك بەدوەکانی بیابان. هەر چەندیش بەرەو باشوور شۆڕبینەوە، ئەو دەبینین هۆزەکان شوانکاریی و رەشماڵنشینی جێدەهێڵن و دانەوێڵە دەچینن و لە خانوچکەی لەقوڕ دروستکراو دەژین.

کاتێك دەگەینە لێواری هۆرەکانەوە، دەبینین خانوچکەی لە قامیش دروستکراو شوێنی خانوچکەی قوڕ دەگرێتەوە. لەوێش لەگەڵ چاندنی گەنم و جۆ، برنج دەچێنرێت. وەك دەزانرێت برنج بەهایەکی ئابووری بەرزی هەیە، هۆزەکانیش بۆ فرۆشتن لەبازارەکان دەیچێنن. ئەمەش وا دەکات ئابووری نەختینەیی لەنێو هۆزەکان بڵاوبێتەوە، کە دواجار لە بەهای بیابانشینی دووری دەخاتەوە.

کاتێکیش دەگەینە ئەوپەڕی باشوور، کە بەسرای خاوەن بێستانەکانی خورمایە. ئەوا دەبینین پابەندبوون بەهۆز و بەهاکانی بیابانشینی دەگاتە ئەوپەڕی لاوازی، چونکە ناوچەی هۆزگەرایی نییە وەك هنری فیلد ئاماژەی بۆ کردووە. لێرەدا دەکرێت عێراق بە دەفری ترشاندن( بەرمیلی تورشیات ناوی دەبەین) بشوبهێنین،

لەسەری باکوورەوە ئەو هۆزە تەڕ وتازانەی تێدایە کە تازە لەبیابانەوە هاتوون. هەرچەندیش بەرەو قوڵایی برۆین ئەوا دەبین هۆزە تازەکان تێکەڵ بە هۆزە کۆنەکان دەبن، وەك یەکتر دەبن لەرووی دوورکەوتنەوە لە بەهاکانی بیبانشینەوە.

**رەچەڵەکی هۆزەکانی باشوور:**

کاتێك بەنێو هۆزەکانی ناوچە نیشتەنییەکان دەگەڕێین، دەبینین زۆربەیان رەچەڵەکی خۆیان بۆ رەگوریشتەی بەدوی کۆن دەگێرنەوە. هەر هۆزێکیش دەیەوێ رەچەڵەکی خۆی بداتەپاڵ کەسایەتی و هۆزێکی ناسراو. بۆ نموونە خەزعەلییەکان خۆیان دەگێڕنەوە سەر سولیمانی خوزاعی، خەفاجی بۆ ئەبوعوبەیدە بن جەراح، ئال ئیبراهیم بۆ ئیراهیمی بن مالکی ئەشتەڕ، ئال فتلە بۆ ئەنەسی کوڕی مالیك، بنوحەکیم بۆ عەممار کوڕی یاسر، ئال شبل بۆ شەمەڕ، غزالات بۆ عەنزە، زوبەید بۆ حمیر، ئەلبو محمەد بۆ عزە[١٨٤].

مایەی شانازی هۆز دەبێت، شێخەکەی بۆ خەڵك باس لەرەچەڵە عەرەبییەکەی هۆزەکەی بکات. جارێك لەگەڵ کۆمەڵێك قوتابی چووینە لای شێخێك لەنزیك قەزای (عفك) ئەو باسی ناوی باب و باپیرانی کرد، زیاتر لە دە دانەی ژمارد، زۆر بەوردی ئەزبەری کردبوو. باسی لەوە کرد کەی هۆزەکەیان هاتۆتە عێراق و دواتریش باسی سەروەرییەکانی هۆزەکەی کرد. وەك دەردەکەوێت ئەمە نەریتی زۆرینەی شێخی عەشیرەتەکانی عێراقە، بەتایبەتی لە ناوچە نیشتەنییەکان.

لەوانەیە یەکێك لێرەدا بپرسێت: تا چەند دەتوانین متمانەی بەراستی رەچەڵەکی هۆزەکان بکەین؟ ئەگەرهاتوو دروست بێت، ئەی کەواتە پاشماوەی نەتەوە کۆنەکان لەکوێن؟

ئێمە دەزانین دانیشتوانی عێراق، لەکاتی فەتحکردنی دا لەلایەن ئیسلامەوە، چەند ملیۆنێك بووە. هەندێك لەمێژوونووسان زێدەڕۆیی لەو ژمارەیە دەکەن ودەڵێن نزیکەی سی ملیۆن بووە. ئەو دانیشتووانەش پاشماوەی سومەری، ئەکەدی، عاموری، کلدانی، کاشی و فارس و نەتەوەکانی دیکە بووە، ئەوانە بە نەبەتییەکان

---

[١٨٤] عبدالجبار فارس (عامان في العراق الاوسط) ص ٧٧-٨٧

ناوەبران (النبط) ئایا ئەوانە بۆ کوێ چوون؟ ئەی رەچەڵەکی کۆنیان چی بەسەرهات؟

من وا خەیاڵ دەکەم، ئەوانە لەو هۆزە عەرەبیانە تواونەتەوە کە لەبیابانەوە هاتوون. لەرێگای هاوپەیمانی ووەلائەوە چوونەتە ریزی ئەو هۆزانەوە. دواتریش بەتێپەربوونی رۆژگار رەچەڵەکی کۆنیان لەیاد دەکەن، بەپێی هەر هۆزێك رەچەڵەکی عەرەبی وەردەگرن. ئەمەش مانای ئەوەیە ئەو رەچەڵەکە عەرەبیانەی کە شێخەکان باسی دەکەن، لەسنوورێکی دیاریکراو دروستە. سەبارەت بەشێخ وچەند کەسێکی دەوروبەری دروستە، بەڵام سەبارەت بەتەواوی هۆزەکە ئەوا لەوانەیە زۆرێك لەوان سەر بەرەچەڵەکی دیکە بن.

روونترین نموونە کە دەکرێت لەوبارەیەوە ئاماژە بۆ بکەین، هۆزی ئەلبو محەمەد، ئەو هۆزە لەدەوروبەری عمارە نیشتەجێن. ئەو هۆزە ئەمرۆ بریتیە لە یەکێتیەکی گەورە لەچەندین پشت وعەشیرەتی دیکە پێکهاتووە. هەموویان رەچەڵەکی خۆیان دەبنەوە سەر پیاوێك ناوی محەمەد بن حەسەنە، ئەو پیاوە لە هۆزی عزە بووە کە لە باکوری بەغدا لە لای رۆژهەڵاتی دیجلەوە بووە. لە بەر ناکۆکییەك هۆزەکەی جێدەهێڵێ وبەرەو عمارە دەچێت، لەوێ خوشکی یەکێك لە شێخەکانی فریجات دەهێنێ، ئەو پیاوە زۆرزان و پاڵەوان بووە، لە ئەنجام دەبێتە تۆی هۆزێکی گەورە وبەهێز کە ئەمرۆ بەهۆزی ئەلبو محەمەد دەناسرێت. ئاسان نییە ئێستا وێنای ئەوە بکەین هەموو پیاوانی ئەلبو محەمەد لە رەچەڵەکی ئەو محەمەدەن کە باسمان کرد، بۆچوونی دروست ئەوەیە زۆرێك لەوان پاشماوەی نەتەوە کۆنەکان بن، لەرێگای هاوپەیمانی و وەلائەوە چوونە ریزەکانی ئەلبومحەمەدەوە. بۆئەوەی پارێزگاری لەخۆیان بکەن.

بەسەرهاتێکی خۆش لەو بارەیەوە هەیە، نووسەری ناسراو ئیبراهیم ساڵح شوکر ماوەیەك لەساڵی ١٩٣٤ ، قایمقامی قەزای (قەلعەی ساڵح) بووە، کە سەر بەشاری عمارەیە. ئەو نووسەرە گومانی لەعەرەبێتی هۆزی ئەلبو محەمەد دەکرد، پێیوابوو

لەرەچەڵەك هیندی یان تورکمانی بن، بەڵگەشی ئەوەبوو سیمای کەسانی ئەو هۆزە لەسیمای عەرەبەکان ناچێ"[185].

**دانیشتووانی هۆڕەکان:**

وتمان ناوچەی نیشتەنیی لەعێراق، هۆڕەکانی تێدا زۆرە، ئەمەش دەبێت هۆی گۆڕینی ڕێڕەوەی رووبارەکان. جوگرافیناسی عەرەب بە (بەتائیح) ناوی دەبەن ئەمەش لەزمانی کۆندا بەمانای وشەی هۆڕ دێت کە ئێستا لەشێوەزاری عێراقییەکان بەکاردێت.

وەك دەردەکەوێت هۆڕەکان ئەو ناوچانەن کە زۆرینەی پاشماوەی نەتەوە کۆنەکان پەنایان بۆ بردووە. تیسیگەر دەڵێ" هۆڕەکان هەر لەسەردەمە کۆنەکانی مێژووەوە پەناگەی نەتەوە ژێرکەوتووەکان بووە. ئەنجامدانی کردە سەربازی لەو ناوچانە سەختە. ڕوودواوەکانی جەنگی یەکەمی جیهانیش ئەمەی سەلماند کاتێك بەریتانیا ویستی مەعیدییەکان(معدان) دەستگیر بکات، کە هیلاکیان بۆ بەریتانیا دروست دەکرد[186]... ئەمرۆ هەندێك لقی گەورە و بچووکی هۆزی ئەلبو محەمەد لە هۆڕەکان دەژین وەك شدە و ئەلبونەسرولَلا، هەروەها هۆزەکانی بەنی ئەسەد و بەنی خەیقان و زۆرینەی عەشیرەتی فەرتوسیش لە هۆڕەکان نیشتەجێ هەموو ئەمانە مەعدانن و هەر یەکێکیش خۆی دەگێڕێتەوە سەر رەچەڵەکێکی عەرەبی وەك هۆزەکەی بانگەشەی بۆ دەکات. هەرچەندە لەراستیدا لەوانیە سەر بەرەچەڵێکی دیکە بن، لەبەر ئەوەی هۆزە گەورەکانی عەرەب لەهەر شوێنێکدا هۆزە لاوازەکان هەڵدەمژن لەپێناو پاراستنیان. بۆیە حیکمەت لەوەدانییە کە ئەو قسانەی مەعدان قبوڵ بکەین کە لەبارەی رەچەڵەکی خۆیانەوە دەیکەن. عەشیرەتی (الشغبانیه) و هەندێك لە تاکەکانی فریجات ئیعتراف بەوە دەکەن کە رەچەڵەکیان دەچێتەوە سەر سابئییەکان"[187].

---

[185] المصدر السابق ، ص ٢١-٦٢

[186] مەعیدی بە کەسێکی دانیشتوانی هۆڕەکان دەگوترێت کۆی وشەکە دەبێتە(معدان) لەزمانی عەرەبیدا. لەچەندین سەرچاوەی گرنگی مێژوویی باسی دانیشتووانی هۆڕەکان کراوە. بە گامێشەوانی بەناوبانگن. وەرگێر

[187] ولفرد ثیسیغر (المعدان او سكان الاهوار ) - ترجمة باقر الدجيلي -ص ١٥-١٦

تیسیگەر باس لە ڕووداوێکی هاوشێوەی ئەمە دەکات کە لەعوممان ڕوویداوە. لەوێ کۆمەڵێك لە بلوشەکان هەیە، دواتر چوونەتەپاڵ هۆزی وەهیبەی عەرەبی. دوای تێپەڕبوونی ڕۆژگار ئەوان بانگەشەی ئەوە دەکەن کە ڕەچەڵەکیان هەمان ڕەچەڵەکی هۆزی وەهیبە. چوونەوە سەر ڕەچەڵەکێکی بەناوبانگی عەرەب، لەرۆژهەلاتی ناوەڕاست گرنگی خۆی هەیە وەك ڕەچەڵەکی نۆرماندییە لە بەریتانیا[188].

هەندێك لەتوێژەرانی ئەنسرۆپۆلۆژی لەوانە هینری فیلد و سیتن لوید پاڵپشتی بۆچوونەکەی تیسگەر دەکەن. بۆ نموونە سیتن لوید تێبینی هەندێك لێکچوون دەکەن لەنێوان دانیشتووانی هۆرەکان و نەتەوە کۆنەکان، لەرووی پێوانەی سەر و کەلوپەلە کشتوکاڵییەکان. ئەو لەبارەی دانیشتوانی هۆرەکانەوە دەڵێ" ژیان و بارودۆخیان تا ڕادەیەکی زۆر لە ژیانی هۆزەکانی کۆن دەچێت. دیوەخانە بارنەیی و جوانەکانی شێخەکانیان کە بە کەنیسەکان دەچێت، هەمووی لەقامیش و قوڕ دروست کراوە، تاڕادەیەکی زۆر بە پەرستگاکانی سۆمەڕ دەچێت لە هەزارەی چوارەمی پێش زایینەوە"[189].

**کردەی تۆمارکردن ( الكتبة):**

مەبەست لە (الكتبة– نووسین) کە ئێستا لە گوندەکانی عێراق بەکاردێت، نزیکە لە مانای هاوپەیمانی و وەلا کە لەزمانی عەرەبی کۆن هەیە. دکتۆر شاکر مستەفا سەلیم توێژینەوەی بابەتی کیتبەی لە هۆرەکانی چبایش (الجبایش) کردووە. لەو هۆرانەدا دەسەلاتی بەنی ئەسەد زاڵە. ئەو هۆزە بەهێزە هەر لەسەردەمێکی دوورەوە بۆتە کرۆکی یەکگرتنێکی هۆزگەری گرنگ، بۆیەش هۆزە لاوازەکان لە ڕێگەی کیبتەوە ڕەچەڵەکیان وەردەگرت. دکتۆر شاکر دەڵێ" وشەی کیتبە لە زمانی عەرەبی لە وشەی (الكتابە – نووسین ) وەرگیراوە. وەك زاراوەیەك بۆ ئەوە بەکاردێت، خێزانێك یان بنەماڵەیەك ڕەچەڵەك لە هۆزێك وەربگرێت، ئەم کردارەش بە نووسین تۆمار دەکرێت. ئەم شێوازی تەبەنی کردنەش هەندێك

[188] المصدر السابق ، ص ١٦
[189] شاكر مصطفى سليم (الجبايش) ج١، ص ٢٦

ئیمتیاز بە خێزان یان بنەماڵەکە دەدات، لەبەرامبەریش هەندێك ئەرکی دەخاتە ئەستۆ. بەمەش هۆزە تەبەنی کراوەکە لەگەڵ هۆزە سەرەکییەکە یەکسان دەبێت. کۆمەڵێك هۆکاریش لەدوای ئەو دیاردەوە هەیە کە تا رابردوویەکی نزیك بەشێوەیەکی فراوان ئەنجام دەدرات. بەشێوەیەك هەموو لقەکانی ئێستا بەلقەکانی بەنی ئەسەدیشەوە، لە بنەڕەتدا بۆ هۆزی دیکە دەگەڕێتەوە".

"کاتێك جەنگەکانی هۆز لە رابردوودا درێژخایەن بووە، ئەوا لایەنە لاوازەکانی عەشایەری پەنایان بردۆتە بەر بەنی ئەسەدی بەهێز، بۆ ئەوەی لەژێر چاودێری ئەوان بژین و لەرێگای تەبەنییەوە لەگەڵ ئەوان تێکەڵدەبوون. لەگەڵئەوەی ئەو تێکەڵبوونە لەسەردەمێکی دوورەوە روویداوە، لەبەرئەوەی بەرەچەڵەکبوون بۆ بنەڕەتێکی غەریب کاریگەری بۆ پێگەی کۆمەلأیەتی بنەماڵە یان پشەکە دەبێت، ئەوا ئاسان نییە جیاوازی بکەین لەوەی کامە بنەماڵە بنەڕەتە یان کەمەیان هاتۆتە ناو هۆزەکەوە. لەگەڵئەوەشدا بینیمان زۆر پشت و سك لەناو هۆزەکان غەریبن"[190]

پرۆسەی تۆمارکردنی رەچەڵەك تەنها لە ناوچەی چبایش نییە، بەڵکو لەسەرتاسەری گوندەکانی عێراق بڵاوە. لەراستیشدا ئەمە پرۆسەیەکی سادە نییە، وەك لە رووخسارە دەرەکییەکەی دیارە، بەڵکو کاریگەرییەکی کۆمەلأیەتی گەورە هەیە. تەنانەت بروای ئەوەم هەیە، یەکێکە لە هۆکارەکانی بڵاوبوونەوەی بەهای بیاباننشینی لەنێو دانیشتوانی عێراقدا.

ئەو هۆزە لاوازە کە دەیەوێ لە رێگای کیتبەوە بچێتە ریزی هۆزێکی بەهێزەوە، خۆی بەناچاری لەوە دەدۆزێتەوە هەندێك بەهای ئەو هۆزە قبوڵ بکات، ئەو هۆزەی دەیەوێ رەچەڵەکی هۆزێکی دیکە وەربگرێت ئەوا دەبێت لە بەها کۆمەلأیەتییەکانی لاسایی بکاتەوە، بۆ ئەوەی بچێتە ریزی ئەوانەوە لەسەر ئەوان هەژمار بکرێت. لەوانەیە لەوەدا سەرکەوتوو بێت یان ژێرکەوتووبێ، بەلأم بەهەر شێوەیەك هەوڵ دەدات لاسایی بکاتەوە.

[190] المصدر السابق ج ١ ١٣٧ـ ١٣٨

**یەکێتی هۆزەکان:**

ناوچـەی نیشـتەنیی لەسـەردەمی عوسمانییەکانـدا بەدەرکـەوتنی کۆمـەڵێك یەکێتی بەهێزی هۆزەکان بەناوبانگ بوو. ئەو یەکێتیانە وەك پێشتریش ئامازەمان بۆ کرد لە شێوەی حکومەتی بچووك دەردەکەوتن. ئـەو یەکێتیانـە زەوییـەکانیان دابەش دەکرد، تخوبییان دەکێشا. سەرانە وباجیان وەردەگرت. تەنانـەت زۆربـەی کارەکـانی حکومـەتیان دەکـرد وەك ئـەوەی دامـەزراوەی سـەربەخۆی حکومـەت بن[191]. هەر ئەو یەکێتیانـەش ململانێیـان لـەنێوان خۆیـان دەکـرد و لەگـەڵ یـەکتر دەجەنگان، هەر یەکێکیش لەوان دەیویست لەسەر حسێبی دراوسـێیەکەی فـراوان بێت. حکومەتی عوسمانیش بایەخی بەو کێشانە نـەدەدا مـادامێکی بـاجی خۆیـان دەدەن. لەوانەشە هەر حکومەت هەندێك جار هانی ململانێ و کوشـتاری نێوانیـانی دابێت. ئەمەش بـەپێی وتەیـەی دەڵـێ" پـەرت بکـە و زاڵ بـە". سـەرۆکی بـاڵای یەکێتیەکەی هۆز بەپێدانی بڕێك پارەی سـاڵانە خاکەکـەی ژێـر دەسـەڵاتی زامـن دەکرد، دوای ئەمەش سەرپشك بوو لـەوەی چی لـەهۆزەکانی ژێـر دەسـتی خـۆی دەکـات. زۆرجـاریش بـەزیادکردنی سـەرانە سـتەمی لـێ دەکـردن. پاسـەوانە تایبەتەکانیشی فرمانەکانیان جبەجێ دەکرد.

هەندێك جار لەسەر ئەو برە پارەیەی ساڵانە، ناکۆکی دەکەوتـە نێـوان حکومـەت وسەرۆك. تەنانەت شەڕیان لـەنێوان بـەرپادەبوو. کاتێـك حکومـەت هەسـتی بـەوە دەکرد لەبەرامبەر سـەرۆك لاوازە، ئـەوا بەهـەرحاڵ بەکـەم رازی دەبـوو[192]، کەچـی ئەگـەر حکومـەت دەیزانـی بـەهێزترە ئـەوا لێـی دەدات و شـەڕی لەگـەڵ دەکـرد، تەنانەت سەرۆکایەتیشی بۆ شێخێکی دیکە دەگواستەوە.

بەناوبانگترین یەکێتیش کە لەسەدەی هـەژدەم لەناوچـەکە زاڵبـوو، ئـەوا یـەکێتی خەزعەلییەکان و مونتەفەق بوو لە دیوی فوراتەوە، بەنولام و زوبەید بوو لە بەرەی دیجلەوە. لە سەدەی نۆزدەهەمیش یـەکێتی ئـەلبو محەمـەد لەدەوروبـەری عمـارە

---

[191] عبدالرزاق الحسني (العراق قديما و حديثا) ص ١٥٤
[192] عباس العزاوي (المصدر السابق) ج٧ ص ٢٤٩

دەرکەوت، دەسەڵاتێکی گەورەی پەیداکرد، بەشێوەیەك توانای تۆپهاوێژی هەبێت و لە جەنگەکانی بەکاریان بهێنێ"[١٩٣].

ئەوەی هاوکاری دروستبوون وزاڵبوونی ئەو یەکێتیانەی لە ناوچەکە کرد، زۆری هۆزەکان بوو. کاتێك حکومەت بۆ تەمێکردنیان دەهات ئەوا ئەوان بەرەو هۆزەکان پاشکشەیان دەکرد، لەوێش ناسەقامگیریان دروست دەکرد و رێگریان دەکرد. عەباس عەزاوی مێژوونووس لەو بارەیەوە دەڵێ" کاتێك والی عومەر پاشای سەردار لەساڵی ١٨٥٧ هاتە عێراق پێیوابوو دەتوانێ بەسوپاکەی بەسەر ئەو ناوچەیە زاڵ بێت، کەچی دواجار دەرکەوت هەڵەبوو. گەورەترین رێگریش لەوەدا بوونی هۆزەکان بوو کە کۆسپ بوون لەبەردەم سوپا"[١٩٤].

**ئاستەکانی شەرەف:**

شایەنی ئاماژە پێدانە هۆزەکانی بەدو ئەوانەی لەسەر شوانکارەیی و کۆچکردن دەژیان، ژمارەیان لەناوچەکانی نیشتەنی زۆر بوو، بەڵام لەناوەراستی سەدەی نۆزدەمەوە ژمارەیان کەم دەبۆیەوە. تەنانەت ئێستا بوونیان لەو ناوچەیە دەگمەنە. ئەوان ژیانی بیابانشینیان جێهێشت و کشتوکاڵیان کرد بە پیشەی خۆیان، لەگەڵئەوەشدا هێشتا پابەند بە زۆرێك لەبەها کۆنەکانی بیابانشینەوە. ئەوان بەفیز و خۆ بەزلزانینەوە سەیری هۆزەکانی دیکە دەکەن. بۆ ئەوەی خۆیان لە هۆزەکانی دیکە جیاواز بکەنەوە، ئەوا خۆیان لەکاری گامێشەوانی و کشتوکالکردنی سەوزە و راوەماسی بەدوور دەگرن. ئەو پیشانە بە تێروانینی ئەوان زۆر نەنگییەکە، چونکە وا لە خاوەنەکانیان دەکات وەك دێوەرە بن کەلوپەلەکانیان لە گوندان بگێرن.[١٩٥]

لە شێخی یەکێك لە هۆزە رەسەنەکانی فوراتی ناوەراستم پرسی: بۆچی رقتان لە بەقاڵە؟ لە وەلام وتی: بەپاڵ لەسەر تەرازوو دەژی ئەمەش عەیبە. دەردەکەوێ شێخ مەبەستی بوو بڵێ: بەقاڵ لەبری چەك، تەرازوو هەڵدەگرێت. ئەمەش پێچەوانەی پیاوەتی و پاڵەوانێتیە.

---

[١٩٣] Jamali (new iraq) p 128

[١٩٤] عباس العزاوي ( المصدر السابق) ج ٧، ص ١٢٤

[١٩٥] شاكر مصطفى سليم (المصدر السابق) ج٢ ص ٥٦٢-٥٦٥

کەسێك ئەگەر لە هۆزە رەسەنەکان بێت، ئەو لە کەناری رووبارەوە دەوەستێت و (فالەکە)[196]ی بەدەستەوە دەگرێت، بۆئەوەی ماسییەك یان چەند ماسییەك راو بکات، نایەوێ ماسی بە تۆڕ راوبکات، چونکە تۆڕ ماسییەکی زۆر دەگرێت، ئەو کاتە ناچار دەبێت ماسییەکان لە بازاڕ بفرۆشێتەوە، کەچی فالە تەنها ژمارەیەکی کەمی ماسی پێ راو دەکرێت، تەنها بەشی خۆراکی خۆی و خێزانەکەی دەکات. ئەوەی شایەنی باسە فالە لە گوندە عێراقییەکان وەك چەکێك بووە. وەك حەربەییەکە سێ دەمی تیژی هەیە، زۆرجار لەکوشتارەکان بەکارهاتووە، بەڵام تۆڕەکان هی بەقاڵە بێهێزەکانە.

لە گوندەکاندا چوار توێژی بێزراو هەیە. لەهەموویان بێزراوتر (بەرگدروەکانن) دوای ئەوان، ئەو جووتیارانەن کە سەوزە دەچێنن، لەزمانی عێراقییەکان بە (حساوییەکان) ناودەبرێن، دواتر ماسیگرەکان دێن کە(بەربەرەکان) ناودەبرێن و دواجاریش مەعدان دێن، ئەمانەش ئەو کەسانەن گامێشەوانن.

**رقبوونەوە لەوانەی رستن و چنین دەکەن:**

ئەوەی جێگای سەرنجە جیاوازییەکی زۆر لە پێگەی کۆمەڵایەتی ئەو کەسانە هەیە، کە حەسیری قامیش دەچنن، لەگەڵ ئەو کەسانەی رستن و چنین دەکەن یان کاری دیکەی دوورمان دەکەن. حەسیرچنەکان پێگەیان لەو کەسانە کەمتر نییە کە دانەوێڵە دەچێنن، کەچی ئەوانەی رستن وچنین دەکەن هیچ کەسێك لە قێزەوەن بوون پێیان ناگات. ئەوانەی خۆیان بە رۆڵەی هۆزە رەسەنەکان دەزانن کچ بەوان نادەن وکچیشیان لێ ناخوازن. تەنانەت ئەگەر شەڕوکوشتار دروست بوو، پێویست ناکات بەرگدروو وئەو جۆرە پیاوانە بەشدار بن، ئەوان لەگەڵ ژنان دادەنیشن و لەجەنگدا داوای هیچ هاوکارییەکیان لێ ناکرێت، هەرچەند هاوکارییەکەیان کەمیش بێت.

دکتۆر شاکر سلیم لەبارەی رقبوونەوە لەبەرگدرووەکان پرسیار لەشارەزاییەکی نەریتە عەشایرییەکان دەکات، ئەویش وەڵامی دەداتەوە و دەڵێ: بەرگدرووەکان

---

[196] فالە ئامێرێکی وەك (شنە)ی کوردەوارییە، چەند سەرێکی هەیە، پێشتر لە باشووری عێراق بۆ راوە ماسی بەکارهاتووە. شەڕیشی پێکراوە. – وەرگێڕ

لەرووی رەچەڵەکەوە عەیبدارن، درۆ زۆر دەکەن، ئەوان ئەستۆپاک نین، ئەوان خشڵەکانی حوسێنیان دزی. شاهێدحاڵیان لەسەر مەریم کرد کاتێك منداڵی بوو. زۆر کاری بێزراویان کردووە، لەمێژوودا تۆمارکراوە[197].

وەك دەردەکەوێت ئەو بیانوانە دروستکراون، هۆزەکان بۆ رقی خۆیان لە بەرگدرووەکان دەیکەنە پاساو. لەراستیدا رقبوونەوە لەبەرگدروو و ئەوکەسانەی چنین دەکەن، نەریتێکی کۆنی بەدووەکانە، بەدو لە دێر زەمانەوە ئەگەر جنێوی دەدا دەیگوت (بەرگدرووی کوڕی بەرگدروو). سەرچاوەی ئەو رقبوونەوەیە ئەوەیە پیاوی بەرگدروو کارێك دەکات کە لە بنەڕەتەوە هی ژنانە، جگە لەمەش لەبری ئەوەی بە شمشێر و بازوو بژیت، بەدەستی خۆی دەژی. ئەوان پەندێکیان هەیە دەڵێ" بەرگدروو لەژیانی خۆی مشکێکی نەکوشتووە".

سەبارەت بەجیاکردنەوەی حەسیرچن، و ئەوکەسانەی رستن و چنین دەکەن، ئەوا بە بڕوای من بۆئەوە دەگەڕێتەوە حەسیرچن، وەك ئەو کەسەیە کە دانەوێڵە دەچێنێ، هێشتا پەیوەستە بە بەهاکانی بیابانشینەوە. ئەو لەگەڵ ژنان دادانیشێ و تەرازوو بەکارناهێنێ. ئەو حەسیرێکی زۆر بەرهەم دەهێنێ، دواتر کۆی دەکاتەوە بەیەکجار بە بازرگانی دەفرۆشێ. ئەو بە دانە لە بازاڕەکانی نافرۆشێ، مامەڵەی کڕین و فرۆشتن لەسەر حەسیر ناکات، بۆیە وەك ئەو کەسەیە کە لە وەرزی دروێنەدا دانەوێڵەکەی دەفرۆشێ.

**هۆزەکانی فوراتی ناوەڕاست:**

پێشتر عێراقمان لەرووی تێکەڵبوونی رەچەڵەکی هۆزەکان بە (بەرمیلی تورشیات) چوواند. ناوچەی نیشتەنییمان بە بنی بەرمیلەکەوە وەسف کرد. لێرەوە دەبێت هۆزەکانی فوراتی ناوەڕاست لەوە جیابکەینەوە. ئەو هۆزانە جیاوازییەکی زۆریان هەیە لەگەڵ هۆزەکانی کەناری دیجلەوە لەرووی رۆژهەلات و هۆزەکانی هۆرەکانەوە، لەرووی بێگەردی رەچەڵەك و توندی پابەندبوونیان بە بەهاکانی بەدووەوە.

[197] المصدر السابق ج٢ ص ٤٦٣

فوراتی ناوەڕاست دەکەوێتە لێواری بیابانەوە، بۆیە دەکرێت لەدوای ناوچەی جەزیرەوە بە دەروازەی دووەم دابنرێت، بۆ ئەو هۆزانەی لە بیابانەوە بۆ عێراق دێن. لەراستیدا زۆرێك لە هۆزەکانی فوراتی ناوەڕاست ماوەیەکی زۆر نییە هاتونەتە عێراق. ئەوان بەر لە هۆزەکانی جەزیرە هاتونەتە عێراق، بەڵام دوای هۆزەکانی دیجلە و هۆزی هۆڕەکانەوە هاتوون.

شێخ فەریق مەزهەر فیرعەون ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە و هۆزەکانی عێراقی بۆ دوو جۆر پۆلێن کردووە: جۆری یەکەمیان لە هۆزەکانی فورات و هۆزەکانی جەزیرە پێکهاتووە. بە تێڕوانینی ئەو ئەو هۆزانە هێشتا رەسەنایەتی عەرەبیان پاراستووە. کەچی جۆری دووەم هۆزەکانی دیجلەن، ئەو هۆزانە زۆرێك لە نەریت و خەسڵەتە باش و کۆنەکانی خۆیان لەدەست داوە، لەئەنجامی پەیوەندیان بەحکومەت و هامۆشکردنی شار و تێکەڵبوونیان بە خەڵکەوە[198].

وەك دەردەکەوێت دکتۆر شاکر سەلیم پاڵپشتی ئەو پۆلێنکردنە دەکات و دەڵێ: زۆرێك لەو هۆزانەی لە دوورگەی عەرەبییەوە بەرەو عێراق هاتوون، هۆڕەکانیان کردۆتە پەناگەی خۆیان، بەخێوکردنی گامێشیان کردۆتە سەرچاوەی بژێوی خۆیان. لەئەنجامی ئەمەشدا بۆ سەدان ساڵ دەچێت، پەیوەندیان لەگەڵ ژیانی بیابان پچڕاوە. سەرەڕای ئەمەش دەکرێت بەروونی تێبینی سیفەتەکانی بیابانشینی سروشتی و شارستانی بکرێت لە دانیشتوانی هۆڕەکانی ناوچەی فوراتدا. ئەمەش لە ئەنجامی پەیوەندی بە دوورگەی عەرەبییەوە لە رێگای کۆچکردن و زەواجەوە. ئەگەر بە شێوەیەکی ناڕۆشنیش بێت ئەمە وایکردووە دانیشتوانی هۆڕەکان بۆ دوو جۆر دابەش ببن، جۆری یەکەم دانیشتوانی رۆژهەڵاتن کە لە هۆڕەکانی دیجلەن، جۆری دووەمیش لە رۆژئاوان، لەهۆڕەکانی فوراتن[199].

هنری فیلد بۆ هەمان بۆچوون دەچێت. ئەو بڕوای وایە هۆزەکانی نیشتەجێی باشووری کوت لە بیابانشینی دابڕاون، یەکێك لەوان بەدو نییە، تەنها هۆزی بەنی

---

[198] فريق مزهر الفرعون (الحقائق الناصعة) ج ، ص ٢٢

[199] شاكر مصطفى سليم (المصدر السابق) ج١ ص ٢٠

لام نەبێت کە نیمچە بەدوە. ئەگینا ئەوانی دیکە مەیلیان بەلای فەرامۆشکردنی پەیوەندییەکانی هۆز هەیە، سەرقاڵی کشتوکاڵ و بەخێوکردنی گامێش و کاری دیکەن[٢٠٠].

دەبێت ئاماژە بەوە بدەین هۆزەکانی فوراتی ناوەڕاست، بەچاوی رقبوونەوە سەیری هۆزەکانی رۆژهەڵاتی دیجلەوە دەکەن، بە (شروگییەکان) ناودەبرێن، ئەمەش لەزمانی عەرەبی لە وشەی( الشروق) یان (الشرق) هاتووە. بەمدواییە شروگییەکان گرنگییەکی کۆمەڵایەتی گەورەیان هەیە، چونکە زۆرینەی ئەو کەسانە پێك دەهێنن کە لە لادێ روودەکەن شارەکان. وەك دەردەکەوێت، لاوازبوونی پەیوەندییەکانی هۆزگەرایی لە لای هۆزەکانی دیجلەوە هۆکارێکی یاریدەدەر بووە لە کۆچکردن.

هۆزەکانی فورات هەردەم شانازی بەوە دەکەن کە زیاتر لە هۆزەکانی دیجلە هیمەتیان هەیە وهەستی شۆڕشیان بەهێزترە. کاتێك شۆڕش لەساڵی ١٩٢٠ لە فوراتی ناوەڕاست پەرەی دەسەند، هۆزەکانی دیجلە هێمن و لایەنگری حکومەتن. لە ساڵانی ١٩٣٥– ١٩٣٦ یش هەمان هەڵوێستیان هەبوو. ئەوکات گوێبیستی یەکێك لە شێخەکانی دیجلە بووم، بە سەرسوڕمانەوە دەیپرسی: ئەو خەڵکە لەو شۆڕشە یەك لەدوای یەکانە چییان دەستدەکەوێت؟ مەبەستی هۆزەکانی فورات بوو، نەشیدەزانی هۆکارێکیان بەهێزی کولتوری بیاباننشینە لەلای ئەوان.

هەر هۆزەکانی فوراتی ناوەڕاست هاوشێوەی شروگییەکان، رقیان لە مەعدانیش دەبێتەوە. ئەوان خۆیان لە ژنخوازی مەعیدییەکان بەدوور دەگرن و رقیان لە ئاکاری ئەوان دەبێتەوە. مامۆستا جەعفەر خەلیلی ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە، باسی هەندێك جیاوازی نێوان مەعیدیەکان وئاکاری هۆزەکانی فوراتی ناوەڕاست کردووە. ئەو بۆچوونێکی سەیری شێخ عەبادی حوسێن ئال فتلەمان، لەبارەی مەعدانەوە بۆ دەگوازێتەوە کە وتویەتی: وشیار بە لەوە رازی بن مەعیدی پەنج بخاتە ناو کونی دیوار ماڵەکانتانەوە، چونکە ئەو پەنجەی لەکونی دیوارەکە داناوە، بەدەستەکەی دیکە ئاماژە بۆ جەماعەتەکەی دەکات وهاوار دەکات، زوو

---

[٢٠٠] Henry field (op.cit) p. 260

وەرن فریا بکەون بۆ ئەوەی لەو کونە دەرگایەك دروست بکەین و تێیدا بچینە ناو خانووەکەوە"[201].

لەوانەیە هۆزەکانی فوراتی ناوەڕاست لە رقبوونەوەیان لەمەعدان هەندێك لەسەرهەق بن، چونکە مەعدان ناتوانن وەك پێویست پارێزگاری لە بەهاکانی بیابانشین بکەن، لەوبارەیەوە تیسیگەر دەڵێ: نەریتەکانیان لە نەریتە یەکلاکەرەوەکانی بەدو جیاوازە، ئەوان لە میواندۆستی وەك ئەوان بن، ئەوان بێ ئۆقرەترن، نەریتی تۆڵەکردنەوە وەك ئەوەیە لەناویان نەبێت. ناوبانگێکی فراوانیان لە دزیکردن هەیە"[202].

**دانیشتوانی شارەکان:**

سەرجەم قسەکانمان لەو بەشەدا، لەبارەی هۆزە جیاجیاکانی عێراقەوە بوو، کە چۆن رەچەڵەکیان تێکەڵ بە پاشماوەی نەتەوە کۆنەکان بووە. ئێستا پێویستە قسە لەسەر دانیشتوانی شارەکان بکەین. بەر لەهەموو شتێك دەبێت بزانین زۆربەی شارەکانی ناوچەی نیشتەنییەکان، لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم دانراون لەوانە: قەلعەی سالح، عمارە، مەجری گەورە، عەلی غەرەبی، کومەیت، شیخ سعد، کوت، نعمانیە، صویرە، عەزیزیە، شەترە، رفاعی، قەلعەی سوکەر، حمزە، شامیە، ئەبو صخیر، هیندیە، مەحمودیە. تەنها سێ شار لە سەدەی هەژدەم دانراون، ئەوانیش دیوانیە و سوق شیوخ و زوبێرە. تەنها یەك شار لەسەرەتای سەدە نۆزدەم دروست بووە ئەویش (حەی) یە. لەسەدەی بیستەمیش شاری هاشمیە و فەیسەڵیە دروستبووە.

ئەو دیاردە کۆمەڵایەتیە لەناوچەی نیشتەنییەکان جێگای سەرنجدانە. وەك پێشتر ئاماژەمان بۆکرد، لە گرنگترین هۆکارەکانی ئەو دیاردەیە، گۆڕینی رێڕەوی رووبارەکانە لەناوچەکەدا. شارەکان هەردەم دەکەونە کەناری رووبارەکانەوە،

---

[201] أ، س، ح (ال فئلة كما عرفتهم) ص ١١٣ " مامۆستا جەعفەر خەلیلی پێیوتم ئەو کتێبە لەنووسینی خۆیەتی. لەراستیدا ئەو کتێبە زۆر زانیاری کۆمەڵایەتی سوودبەخش لەخۆیەوە دەگرێت" – عەلی وەردی

[202] ولفرد تيسيغر (المصدر السابق) ص ١٤

کاتێك ڕێڕەوی ڕووبارەکە دەگۆڕێت، ئەوا شارەکەش بەرەو لەناوچوون دەچێت. ئەم دیاردە کۆمەڵایەتییە کاریگەرییەکی زۆری لەسەر سروشتی ئەو شارانە هەبووە کە تازە دروستکراون. دانیشتوانی ئەو شارانە زۆرەیان لەهۆزەکانی دەوروبەرن، بە زاراوەی هۆزگەرایی بە (لەملوم) ، ئەوان لە هۆزی جیاجیاوە دێنە شار، لەگەڵئەوەشدا کەسانی دیکە بۆ کاسبی و بازرگانی دینە شارەکەوە. لەگەڵئەوەشدا هەموو ئەو دانیشتوانە ناچارن پابەند بن بە بەها و نەریتی هۆزەکانی دەوربەرەوە. زۆرجار شەڕ لەنێوانیان دروست دەبێت، تۆڵەکردنەوە و رقبوونەوە پەرە دەستێنێ، لەبەشی داهاتوودا باسی دەکەین.

کەچی کاتێك دێینە ناوچەی جەزیرە، یان ناوچەی دیالەوە، ئەوا دەبینین بەپێی تێپەڕبوونی رۆژگاریش ڕووبارەکان ڕێڕەویان جێگیرن. ئەمەش وایکردووە شارەکان لەکۆنەوە لەشوێنی خۆیان بمێنێتەوە، گۆڕانکاری لەناو وشوێنەکەی نەکراوە، ناویان لەکتێبی جوگرافیناسە کۆنەکان هەر بەمشێوەی ئێستا هاتووە. باوەڕی ئەوەش هەیە زۆربەی دانیشتوانی ئەمجۆرە شارانە پاشماوەی نەتەوە کۆنەکان بن. ئەوان تووشی بەعەرەبکردن بوونەتەوە لەئەنجامی بەرکەوتنیان لەگەڵ هۆزەکانی دەوربەریان. ئەوان دواجار جیاوازییەکیان لەگەڵ ئەو هۆزانە نییە، تەنها هەندێك جیاوازی سادە نەبێت لە زمان و رەنگی پێست و قژ و چاویان نەبێت.

**بۆتەی کۆمەڵایەتی:**

لەهەندێ شاری عێراقدا، کەسانی بیانی دەژین، کە لە وڵاتانی ئیسلامی، وەك ئێران وئەفغانستان و ئازەربیجان و هیندەوە هاتوون. ئەو بیانیانە لە شارە شیعییەکان زیاترن، بەتایبەتی لە کەربەلا و کازمییە، زۆربەشیان ئێرانین. ئەوەی تێبینی دەکرێت ئەو بیانییە، لەسەرەتای جێگیربوونی لەیەکێك لەشارەکانی عێراق هەست بەغەریبی دەکات، هەست بە بەهاکانی دەوروبەری ناکات، بەڵام بەتێپەڕبوونی رۆژگار لەناو بۆتەکە کۆمەڵایەتییەکە دەتوێتەوە. ئەگەر خۆشی توانای تێکەڵبوونی نەبێت، ئەوا منداڵ و نەوەکانی دەبێت بە شێوەیەك لە

شێوەکان تێکەڵ بن، بۆیە دواجار دەبینین لەبیرکردنەوە و دابونەریتیان جیاوازیان لەگەڵ کەسانی ئەو گەڕەکە نییە کە تێیدا دەژین.

ئیبن خەلدون دەڵێ: مرۆڤ کوڕی نەریت و شتە باوەکانە، نەوەک کوڕی سروشت و میزاجی خۆی بێت. کە لەبارودۆخێك رادێت، ئەوا دەبێت ئاکار و بەهرە و نەریتی، شوێنی سروشتەکەی دەگرێتەوە. ئەمەش لە زۆر ئادەمیزادەکان بەدی دەکرێت، خوا بەویستی خۆی شتەکان خەلق دەکات[٢٠٣].

ئەم وتەیەی کە ئیبن خەلدون، نزیکەی شەشسەد ساڵ بەر لەئێستا ئاماژەی بۆ کردووە، زۆر لەوتەی کۆمەڵناسانی ئێستا دەچێت. مرۆڤ بەرهەمی بارودۆخی کۆمەڵایەتیە، زیاتر لەوەی بەرهەمی رەچەڵەك و بۆماوەیی سروشتی خۆی بێت. ئەگەر مرۆڤێك لە ژینگەیەك نەشونما بکات، ئەوا فشاری کۆمەڵایەتی یان ناچاربوونی کۆمەڵایەتی( قسر اجتماعی) بەپێی گوتەی دورکایم[٢٠٤] کاریگەری بەسەرەوە دەبێت، دواجار کاریگەری خۆی لەسەر بیرکردنەوە و نەریتەکانی دادەنێت، جا هەست بکات یان نا. مرۆڤیش هەرچەندە هەوڵبدات ئەوا ناتوانێ لەوفشارە کۆمەڵایەتیە نەجاتی بێت.

تێبینی ئەوە لەو ئێرانیانە دەکەین کە بۆ شارە پیرۆزەکان دێن، ئەوان بۆ پیرۆزیی یان بۆ وەرگرتنی زانستەکانی ئاین دێن، ئەوان لە سەرەتاوە لە گیانی هۆزگەرایی و بەها زاڵبووەکانی گەڕەك و دەوروبەریان ناگەن، نایانەوێ لەو شەڕانە بەشدار بن، کە ناوە ناوە روودەدات. کەچی منداڵەکانیان کە لەو ژینگە نوێیە گەورە دەبن، پێیوە کاریگەر دەبن. ئەوان لەگەڵ منداڵی هاوشانی خۆیان لەگەڕەك یاری دەکەن. ئەوا فێری دەمارگیری و بەهاکانی گەرەك دەبن و بەناخی دەروونیان شۆڕ دەبێتەوە. کاتێکیش گەورە دەبن ئەوا کۆمەڵگای هانیان دەدات لەملکەچبوون بۆ بەهاکان بەردەوام بن و رێزیان لێ بگرن. تاکەکە دەبینی کەسانی دەوربەری دەمارگیرن و شەڕدەکەن، شانازی بەخۆیان دەکەن و جنێو دەدەن، هەر کەسە بەپێی بەهاکانی خۆی. ئەگەر ئەویش لاساییان نەکاتەوە ئەوا بەترسنۆك و

[٢٠٣] ابن خلدون (المقدمة) ص ١٢٥
[٢٠٤] Harry Barnes (History of Sociology) p 506

لووسكەی دەزانن. لەوانەشە بەلاوازی بزانن و سوكایەتی پێ بكەن، بۆیە ناچارە وەك ئەوان بێت لەبیركردنەوە و رەفتاردا بۆ ئەوەی پێگەیەكی بەرێزی لەلای ئەوان هەبێت.

مرۆڤ تەنها بەعەقڵی خۆی بیرناكاتەوە، بەڵكو بەعەقڵی كۆمەڵگاكەشی بیر دەكاتەوە. ئەو بەپێی كۆمەڵگاكەی سەیری شتەكان دەكات و جوان و ناحەز لەیەكتر جیادەكاتەوە. بیركردنەوەی بەپێ ئەو قاڵب و هێلكاریانە دەبێت كە كۆمەڵگای بۆی داناوە. جا كاتێك یەكێك دێت بۆ بیركردنەوەیەكی دیكە رێنمایی بكات، ئەوا دەزانێ دەیەوێ رێگای هەڵەی نیشان دەدات و گومرای دەكات.

نكۆڵی لەوە ناكەین كەسانێك هەبوون، لە بەها وچوارچێوەی بیركردنەوەی كۆمەڵگاكەیان دەرچوون. ئەمەش بابەتێكە لە كۆمەڵگا كراوەكان روودەدات كە ململانێی بیركردنەوەی تێدابێت و هەموو ئاراستەكانی پێ بگات. كەچی لەكۆمەڵگای داخراو كە لە گۆشەگیرییەكی رێژەیی دەچێت، ئەوا رۆشنبیریەكی كۆمەڵایەتی یەكگرتوو زاڵ دەبێت، بۆیە لەلای مرۆڤی ئەو كۆمەڵگایەش ئاستەم دەبێت بەپێچەوانەی ئەوەی لێی راهاتووە بیربكاتەوە و رێگا بگرێت.

بەشێوەیەكی كردەیی لەعێراقدا، ئەمە لەسەردەمی عوسمانییەكان روویدا، ئەوكات عێراق تا رادەیەكی زۆر داخراو و گۆشەگیر بوو. هەر بیانیەك دەهاتە عێراق لە بۆتەكەی دەتوایەوە. هاوشێوەی توانەوەی پاشماوەی نەتەوە كۆنەكان و دانیشتوانی شارەكان. بۆتە پێویستی بە ئاگرێكی بەگڕ هەیە، بەبڕوای من ئەو ئاگرە لەسەردەمی عوسمانییەكان لەعێراق هەبوو، مەبەستیشم ئاگری جەنگ و شەڕی هەمیشەیی بوو، ئەمەش بەوردی لەبەشی داهاتوودا تاوتوێ دەكەین

## بەشی حەوتەم

## جەنگی هەمیشەیی لە عێراق

لەبەشی رابردوودا گوتمان یەکێك لە دیارترین سیماکانی رۆشنبیری بیابانشینی بریتیە لە (جەنگی هەمیشەیی). جەنگ لەژیانی بیاباندا رەسەن و بنەڕەتە، ئاشتی دیاردەیەکی راگوزەر و لاوەکییە. کاتێك توێژینەوەی لەبارەی کۆمەڵگای عێراق دەکەین لە سەردەمی عوسمانییەکاندا، دەبینین ئەو دیاردەیە بوونی هەیە بەشێوەیەك لە بنەما کۆمەڵایەتیەکەی جیاوازییەکی لەوەی بیابان نییە. زۆر دەگمەنە ماوەیەك لە عێراق تێپەڕێت بێئەوەی بەشێوەیەك لە شێوەکان جەنگی تێنەکەوێت. ئێستا یەك بەدوای یەك بەپێی گرنگی و فراوانییەکەی، باس لەشێوە جیاوازەکانی ئەو جەنگانە دەکەین.

١- جەنگی نێوان هۆزەکان
٢- جەنگی هۆزەکان و حکومەت
٣- شەڕی نێوان گەڕەکەکان لە یەك شاردا
٤- شەڕی نێوان هۆزەکان و شارەکان
٥- شەڕی شارەکان لەگەڵ یەکتر
٦- شەڕی شارەکان و حکومەت

بۆئەوەی خوێنەر وێنەیەکی روونی لەبارەی سروشتی کۆمەڵگای عێراقەوە هەبێت، وا باشترە برێك بەوردی باسی ئەو شێوانەی جەنگ بکەین.

جەنگی نێوان هۆزەکان:

ئەمە گشتیترین شێوەی جەنگ بوو لەسەردەمی عوسمانییەکاندا، لەرووی کۆمەڵایەتیشەوە لەهەموویان گرنگتر بوو. کەچی هۆکارەکانی جۆراوجۆر بوون، گرنگترینیان: ململانێ لەسەر زەوی وزار و ئاودێریی، ململانێی بەهۆی قینەی کۆن و تۆڵەکردنەوە، ململانێ بەهۆی هاوپەیمانی وپەنابردن و فریاکەوتن و ئەو جۆرە

بەهایانە. لەوانەیە دەمەقەڵێ لەسەر شتێکی زۆر هیچ لەنێوان دووکەس روویدابێت، ئەوا دواتر فراوان بووە تا هەردوو هۆزەکە تێیدا بەشداربوون و لە ئەنجامیشدا هەردوولا جەنگیان راگەیاندووە. لەشێوەی جەنگی بەسوس.

کاتێك نازم پاشا لەساڵی ١٩١٠ بوو بە والی بەغدا، بینی گەورەترین کێشەی کە کۆمەڵگای عێراقی بەدەستییەوە دەناڵێنێ، ئەوا جەنگی نێوان هۆزەکان، وەك ئەو بە( الغزو) ناوی برد، بۆیە پەنای بردە بەر ریگایەك پێیوابوو، دەتوانێ رێگر بێت لەو دیاردەیە، ئەویش پەنابردنەبەر بەدەستهێنانی فەتوای پیاوانی ئایینی شیعە وسوننە بوو، کە لە فەتواکە هاتووە: غەزوکردن یەکێکە لە نەریتەکانی جاهیلیەت ئیسلام حەرامی کردووە...، هۆزەکانیش دەبێت وازی لەو دیاردەیە بهێنن وەك گوێرایەڵی بۆ فرمانی خودا وپێغەمبەرەکەی. هەر لەبەردەرکردنی ئەو فەتوایەش شێخی هۆزەکان لەبەغدا کۆکرانەوە و فەتواکەیان بۆ خوێندرایەوە. والی هەرەشەی کرد کە نابێت سەرپێچی ئەو فتوایە بکەن، دیاریشی پێ بەخشین، ئەمەش رۆژێکی مێژوویی بوو لە بەغدا.

نازم پاشا بەو ئەنجامە دڵخۆش بوو، موژدەی بە خەڵکەکە دا. وا خەیاڵی بۆ خەڵك کرد کە عێراق کەوتۆتە قۆناغێکی نوێیەوە. ئەوەی شایەنی باسە نازم پاشا تەنها ماوەیەکی کورت لە عێراقدا مایەوە، لەساڵێك زێتر نەبوو. ئەو ماوەیە خاڵی بوو لە جەنگی نێوان هۆزەکان، بەڵام دواتر نازم پاشا لەعێراق گوێزاریەوە، لەدوای ئەو جەمال پاشا هات، هەوڵی دا لە رێگای والی نازم پاشا بڕوات، بۆیە بەیاننامەیەکی درێژی دەرکرد، هۆزەکانی لە جەنگ ئاگادار کردووە. ئەو فەتوایەشی بەبیرهێنانەوە کە پێشتر دەرچووبوو[٢٠٥].

ئەو بەیاننامەیە هیچ سوودێکی نەبوو، هۆزەکان گەڕانەوە سەر شێوازی پێشوویان، بۆیە جەنگ لەنێوانیان بەرپابوو. هەندێك خەڵك بڕوایان وایە هۆزەکان لە ترسی نازم پاشا وازیان لە جەنگ هێنابوو؛ بەڵام کاتێك رۆیشت ئەوا رێزیان لەدوای ئەونەگرت گەڕانەوە سەر نەریتی کۆنیان، ئەم بۆچوونەش خاڵی نییە، لە سادەیی و کورتبینی.

---

[٢٠٥] عباس العزاوي (تاريخ العراق بين احتلالين ) ج ٨، ص ٢٦١-٢١٨

هۆزەکان لە دێرزەمانەوە لە جەنگ و غەزاکردن راهاتوون، ئەوە دوای ئەوە لەسەری رۆیشتوون، ماقوڵ نییە لە ترسی نازم پاشا و غەیرە نازم واز لە جەنگ بهێنن. ساڵێکیش وازهێنان لەجەنگ بەڵگەی شتێك نییە، ئەمە ماوەیەکی کورتە وەك ئاگربەستێکی کاتییە، زۆرجار پێشتر ئەمە لەعێراق روویداوە. جا هۆکاری یان بێ هۆ بێت، تەنانەت لە بیابانیش ئەو ئاگربەستانە روویداوە . من بڕوام وایە هۆزەکان هەر لەسەردەمی نازم پاشا دەگەڕانەوە سەر جەنگ وکوشتار، ئەگەر ئەو ماوەیەکی زۆرتر لەعێراق بەردەوام بووایە.

هۆزەکانی عێراق وازیان لە جەنگ نەهێنا، تەنها بەم درەنگانە نەبێت. ئەمەش کاتێك بوو کە حکومەتی عێراقی بەسوپا و چەکە نوێیەکانی توانی بەسەر ناوچە لادێییەکان زاڵ بێت. لەگەڵئەوەشدا هۆزەکان هێشتا وازیان لەو دیاردەیە نەهێناوە، زۆرجار دەبیین هەندێك رووداوی کوشتار لە نێوانیان روو دەدات، بەڵام بەهەرحاڵ دەبیین ئەو دیاردەیە رۆژ لەدوای رۆژ بەرەو لاوازبوون دەچێت.

**چەند نموونەیەکی نوێ:**

لەوانەیە سوودبەخش بێت، ئاماژە بۆ چەند جەنگێکی هۆزەکان بکەین، کە لە سەردەمێکی نزیك ئەنجامدراون. لەوانە:

١- لەساڵی ١٩٣٢ جەنگ لەنێوان عەفالیجە و عەممارییەکان لە دەوروبەری دیوانییە بەرپابوو، پۆلیس پەلەی کرد بۆ ئەوەی جەنگەکە فراوان نەبێت و خوێن نەڕژێت. کە عەفالیجە حەوت کەسیان کوژرا و عەمارییەکانیش چوار کەس. پۆلیسێکیش کوژرا و سێیانیش بریندار بوو، دەستبەسەر ٢٦ تفەنگ داگیرا[٢٠٦].

٢- لەساڵی ١٩٣٧ ململانێ لەسەر زەوی لەناحیەکانی عمارە، لەنێوان ئەزیرج و بەزون دروست بوو. کۆمەڵێك لەپیاوانی بەزون، ژمارەیان بەپێنج سەد پیاوی چەکدار مەزندەدەکرا، هێرشیان کردە سەر ئەزیرج و نزیکەی نۆ کەسیان لەوان کوشت. و حەوت کەسیشیان بریندارکرد، ئەوانی دیکەش رایان کرد. کاتێك ئەزیرج بەمەیان زانی خۆیان بۆ تۆڵەکردنەوە ئامادەکرد، رۆژی دواتر سوپایەکی گەورەی ئەزیرج کە نزیکەی ١٢ هەزار کەسی چەکدارکراو بەتفەنگ. هێرشیان کردە

[٢٠٦] عبدالرزاق الحسني (تاريخ الوزارات العراقية) ج٣، ص ١٦٨

سەر بەزون، نزیکەی ١٨٠ کەس لەهەردوولا کوژرا و ٤٠ کەسیش بریندار بوو. سوپای ئەزیرج توانیانماڵی بەزونییەکان بوستێنن و هەندێك کەلوپەلی نێومالّ و شتی دیکەشیان لە دوکانی عەتارەکان تالانکرد.

دواجار بەهۆی ئەنجومەنێکی عەشایەری ململانێیەکە یەکلاکرایەوە. ئەنجومەنەکە توانی زەوییەکان بەپێی نەریتی عەشایری بەسەر هەردوولا دابەش بکات. خوێنی کوژراو و بریندارەکان بەخوێن حسێب کرا. ئەمەش لە زمانی عەشایرەکان پێدەگوترێت (دمدوم) مەبەست لەو زاراوەیە ئەوەیە هەر کوژراوی هۆزێك لەبەرامبەر کوژراوێکی هۆزەکەی دیکە حیساب بکرێت. وەك دەرکەوت هۆزی بەزون بەو چارەیە رازی نەبوو. بۆیە لەساڵی ١٩٤٦ سەر لەنوێ کێشەکە دەرکەوتەوە، خەریك بوو دەبووە کوشتارێکی گەورە، بەلام حکومەت رێکاری گرتەبەر بۆ سەرکەوتکردنی ئاژاوە[٢٠٧].

٣- لەساڵی ١٩٤١ ململانێییەك لەنێوان هۆزی ئەلبومحەمەد و ئەلبو عەلی دروست بوو لەسەر دزینی چەند گامێشێك و کوشتنی چەند گامێشێکی دیکە و سەگەکێك. محەمەد خەلیفە شێخی ئەلبو محەمەد سور بوو لەسەرلێدانی هۆزی ئەلبو عەلی، بۆیە تاکەکانی هۆزەکەی خۆی کۆکردەوە و ئاگادارکردنەوەی دا بەشێخی ئەلبو عەلی. دواتر ئاگادارکردنەوەکەی جێبەجێکرد و هێرشێکی توندی کردە سەرهۆزەکە، چەندین کەسیان کوشت و ماڵەکانیان سوتاند و مەروماڵات و سامانیان تالان کرد، تا گەیشتنە ماڵی شێخی ئەلبوعەلی و ئابلۆقەیان دا، وازیان لە شەڕ نەهێنا، تا پۆلیس گەیشت. ئەنجامی شەڕەکە ٥٦ کوژراو و ٨١ بریندار بوو. ١٥٠ خانووش سوتێنران و ٢٥٠ ماڵیش تالان کرا[٢٠٨].

٤- لەساڵی ١٩٤٥ ململانێیەك لەبەر زەوی لەنێوان هۆزی بەنی ئەسەد و ئال حەسەن لە چبایش روویا، کە دواتر بووە هۆی جەنگێك هەموو مێرمندالّ و پیرێك بەشداری تێدا کرد. حکومەت هەڵمەتی کرد و توانی ئەو کێشەیە سەرکوت بکات، دۆخەکەی گەڕاندەوە باری خۆی و هەردوولایەنی بەتوندی سزا دا[٢٠٩].

---

[٢٠٧] محمد باقر الجلالي (موجز تاريخ عشائر العمارة) ص ٥٠-٥١
[٢٠٨] المصدر السابق ص ٥١-٥٢
[٢٠٩] شاكر مصطفى سليم (الجبايش) ج ١ ، ص ١٣٤-١٣٥

٥- لەساڵی ١٩٤٦ لەناوچەی موسڵ شەڕێك لەنێوان شەمەرو ئەلبو مەتیوت و جەحیش روویدا. کوژراوێکی زۆر لەهەردوولا کەوتەوە. بۆچوونی جیاواز لەبارەی هۆکاری سەرهەڵدانی ئەو شەڕە هەیە.[٢١٠]

٦- لەساڵی ١٩٥٢ شەڕێك لەنێوان هۆزی عوبەید وهۆزی عزە لەخاڵس بەرپابوو، هۆکارەکەشی زەوی بوو. هۆزی عوبەید شەوی جەژنی رەمەزانی کردە هەلێك، چونکە فەرمانگەکانی حکومەت فەرمانبەری تێدا نابێت. ئەو کاتە هێرشی کردە سەر عزە، شەڕی بەدرێژایی شەو بەردەوام بوو. ١٨ کوژراو لەهەردوو لا هەبوو، کوڕی شێخی عوبەید و کوڕی شێخی عزەش لەنێو کوژراوەکان بوون. حکومەت نەیتوانی شەڕەکە دابمرکێنێتەوە، دوای زەحمەتییەکی زۆر نەبێت. دوای ئەو رووداوە چەندین بەریەکەوتن و شەڕلە هەر شوێنێك رووی دەدا کە کەسانی ئەو هۆزەی تێیدا بەیەکتر دەگەیشتن. تەنانەت هەندێك کەس کاری تاڵانکارییان لە زەوییەکانی هۆزەکەی دیکە دەکدر بۆ ئەوەی حکومەت ناچار بکەن لەو زەوییانە رێکاری بگرێتەبەر[٢١١].

٧- لەساڵی ١٩٦٤ شەڕێکی خوێناوی لەنێوان دوو لقی هۆزی حەمیدات، لە فوراتی ناوەڕاست روویدا. ٧ کەسی تێدا کوژراو چل کەسیش بریندار بوون. یەکێك لە ئاگاداربووان ئەو رووداوەی بۆ گێڕاومەتەوە.

ئەو رووداوانەمان تەنها بەنموونە هێنایەوە، ئەگەر بمانەوێ بچینە وردەکارییەکانەوە ئەوا لێرەدا دەرفەتمان نابێت و تەنانەت ناتوانین باسی هەموویان بکەین. ئەوەی شایانی ئاماژەپێدانە هۆزەکانی عێراق وەك سەردەمی عوسمانییەکان، هێشتا شانازی بەچەك هەڵگرتن دەکەن. هەر مێرمنداڵێك بەر لە هەموو شتێك خەمی ئەوەی هەیە ببێتە خاوەن تفەنگێکی تایبەت بەخۆی، بۆیە کڕینی تفەنگ لە کڕینی هەر پێداویستیەکی دیکەی خۆی و خێزانەکەی بەپێویستتر دەزانێ، تەنانەت بەنیشانەی پیاوەتی وقارەمانێتی خۆی دادەنێت. هێشتا دەبینین شێخی هۆزەکان شانازی بە ژمارەی چەکدارانی هۆزەکانیان دەکەن، کە

---

[٢١٠] عباس العزاوي (عشائر العراق) ج ٣، ص ٢٧١
[٢١١] عارف رشيد العطار (الاجرام في الخالص)

ئەوان بە (تفاگە) ناوی دەبەن. مەبەستیان لە (تفاگە) هەرکەسێکە کە تفەنگ هەڵبگرێت. جا خەڵك ئەگەر بیەوێ باسی هێزی شێخێك بکەن، ئەوا باسی ژمارەی تفەنگ بەدەستەکانی دەکەن. شێخ کاتێك بیەوێ لەبەر هەر هۆکارێك جەنگ هەڵبگیرسێنێت ئەوا ئاڵا بەرز دەکاتەوە و هۆسە لێدەدات، بۆ ئەوەی تفەنگ بەدەستەکانی لایەنگر و هاوپەیمانی پەلە بکەن و بگەنە فریای. لەوانەیە شەڕ هەڵگیرسێت و کوژراو بریندارێش هەبێت کەچی دواتر حکومەت پێی دەزانێ یان دایدەمرکێنێتەوە.

وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا، حکومەتی عێراقی ئێستا توانای دامرکاندنەوەی شەڕی نێوان هۆزەکانی هەیە. لەگەڵئەوەشدا هەندێك جار لەتوانای حکومەت دەردەچێت. ئەمەش لەبەر فراوانی هۆزەکان و خراپی رێگاوبان و گەیاندن لەهەندێك لادێدا. بۆیە حکومەت لەو جۆرە حاڵەتانە ناچار دەبێت پەنابەرێتەبەر شارەزایانی نەریتە عەشایەرییەکان، لەوان ئەنجومەنێکی عەشایەری دروست دەکات بۆ یەکلاکردنەوەی ناکۆکی و کێشەی نێوان هۆزەکان. ئەو وا بەچاکتر دەزانێ، نەوەك تەنها بەکارهێنانی هێز، ئەمەش بابەتێکە خاڵی نییە لەدانایی ودووربینی، چونکە زۆرجار تەنها بەکارهێنانی هێز لەیەکلاکردنەوەی قینە و تۆڵەکردنەوەی نێوان هۆزەکان سەرکەوتوو نابێت.

بەزمێکی سەیر هەیە لەو بارەیەوە دەیگێڕینەوە، جارێکیان بەر لەسی ساڵ لەمەوبەر، ململانێیەکی توند کەوتە نێوان هۆزی شەمەڕ و هۆزی عوبەید. حکومەت بە مەبەستی ئەنجامدانی سوڵح لەنێوانیان شێخ حەمەد باسلی لەمیسرەوە هێنا. دیارە حکومەت لەو هەوڵەی سەرکەوت. ئەو پیاوە لەشێخی هۆزەکانی صعیدی میسر بوو، لێرەشەوە لێکچوون هەیە لەنێوان نەریتی عەشایەری هۆزەکانی عێراق و هۆزەکانی صەعید. هەردوو لا نەریتی خۆیان لە بەهاکانی بیابانشینی کۆنەوە وەردەگرن. سەرەڕای ئەمەش شێخ حەمەد خاوەن کەسایەتیەکی بەرێز بوو، بۆچوونەکانی بایەخێکی گەورەی لە لای هۆزەکانی عێراقەوە هەبوو.

## جەنگی نێوان هۆزەکان وحکومەت:

لەسەردەمی عوسمانی دەگمەن بوو والییەك بێتە عێراق، لە ماوەی حوکمڕانی خۆی جەنگێك لەگەڵ هۆزێك یان چەند هۆزێك نەکات. لەوانەشە والییەکە بەدرێژایی فرمانڕەوایی خۆی بەجەنگی هۆزەکانەوە سەرقاڵ بوو بێت، هێشتا لە جەنگی یەکێك لەهۆزەکان نەبۆتەوە، تووشی هۆزێکی دیکە بووە. بۆیە لەسەردەمی عوسمانییەکاندا بینیمان، شاعیرەکان شیعریان لەستایشی ئەو سەرکەوتنانە دەنووسی کە والییەکان لەشەڕکردن لەگەڵ هۆزەکان بەدەستیان دەهێنا[٢١٢].

لەو بارەیەوە بەزمێکی سەیر هەیە، باسی دەکەین، شێخ فەریق فیرعەون، هۆکاری ئەو شەڕە هەمیشەییەی نێوان حکومەت و هۆزەکان بۆ ئەوە دەگێڕێتەوە گوایە هۆزەکان حەزیان لە ئازادی بووە و مەیلیان بەلای بەدەستهێنانی سەربەستی بووە. شێخ فەریق دەڵێ: لەمیانەی ئەو شەڕانەوە عێراقییەکان داوای سەربەخۆیی عێراقیان لەتەواوی سنوورەکەی خۆی، لەدەسەڵاتی عوسمانی دەکرد، بەڵام ئەوان نەیاندەزانی گوزارشت لەوە بکەن چی لەدڵیان و لە مێشکیان هەیە، نەیدەزانی کە گیانیان بۆ ئازادی بەپرۆشە، بۆیە دەتبینی، هەر چەند ساڵ جارێك جووڵانەوەیەکیان لە دژی دەسەڵاتی عوسمانی ئەنجام دەدا. ناڕەزایی خۆیان لەدژی دەردەبری، بەڵام گوزارشتیان نەبوو جگە لە ( ئەم حکومەتەمان ناوێ) وشەی (نامانەوێ) چاکترین گوزارشت بوو بۆ هەستی خۆیان لەبەرامبەر ئازادبوون لە کۆتی ئیستعمار و دەسەڵاتی داگیرکەران. زمانحاڵی راستەقینەی ئەوان دەیگوت : حکومەتێکمان لەخۆمان دەوێ، بۆ ئەوەی حوکمڕانی خۆمان بکەین[٢١٣].

وەك دەردەکەوێت شێخ فەریق دەیەوێ ستایشی هۆزەکانی عێراق بکات، کە خۆی یەکێکە لەشێخەکانی. بۆیە مەیلی ئازادی وسەربەخۆییان دەداتەپاڵ. لەراستیشدا هۆزەکانی عێراق بە شێوەیەکی تایبەت و عێراقییەکان بەشێوەیەکی گشتی ئەو مەیلەیان نەبووە و درکیان بەماناکەشی نەکردووە. ئەمە رەوتێکی

---

[٢١٢] ابراهيم الوائلي (الشعر السياسي العراقي في القرن التاسع عشر) ص ٢٢١- ٢٥٨

[٢١٣] فريق مزهر الفرعون (الحقائق الناصعة) ج ١، ص ٢٧

نوێیە زۆر درەنگ گەیشتە عێراق، ئەمیش لە ئەنجامی پەیوەندیکردنی عێراق بەشارستانیەتی نویّ و وەرگرتنی هەندێك چەمك و زاراوە لەو شارستانییەتەوە.

بەرێز فوراتی ئەو بۆچوونەی فەریق فیرعەون پوچەڵ دەکاتەوە کاتێك دەڵێ: راستییەکە ئەوەیە هۆزەکانی عێراق لەگەڵ حکومەتی عوسمانی بەریەك دەکەوت، بەهۆی باجدانەوە، یان بەهۆی ئەوەی دەوڵەتی عوسمانی بەمەبەستی سیاسی پاڵپشتی هۆزێکی دەکرد و پشتی لەهۆزێکی دیکە دەکرد، یانیش موڵکایەتی زەوییەکی لەهۆزێك دەسەندەوەو بەهۆزێکی دیکەی دەدا. سەرەڕای ئەمانەش هەندێك جار حکومەت هەڵمەتی سزادانی دەستپێدەکرد لە ئەنجامی رووداني کوشتار و دوژمنایەتی و تاڵانەوە. یان رێرەوی ئاویان هەڵدەکەن، لەگەڵ چەندین هۆکاری دیکە کە هەموو دەیزانین، بەڵام ئەگەر بڵێین هۆکارەکەی شۆرش و جووڵانەوەی سەربەخۆخوازی یان مەبەستی ئازادی هەبووە، وەك مەبەستەکانی شۆرشە گەورەکەی عێراق، یان بانگەشە بووە بۆ یەککگرتن لەپێناو گۆرینی دەسەلاٚت و بەدەستهێنانی سەربەخۆیی. ئەمە سەرەڕای ئەوەی بەرەهایی کەسێك لەعەشیرەتەکان بیری لێ نەکردۆتەوە. بێگومان ئەمە لە ئاستی هۆزەکان کەم ناکاتەوە، کاتێك تا ئەو رۆژگار بیرۆکی یەکێتی و مانای سەربەخۆیان نەزانیوە. هەروەها لە ئاستی ئێمەش کەم نابێتەوە ئەگەر بڵێین ئەوکات نەمانزانی پێکهاتەی دەوڵەت چییە. یان هێشتا خواردنی بەتام و پۆشاکی تایبەتمان نەناسی بوو[٢١٤].

من مەزندەی ئەوە دەکەم، تەنانەت شۆرشی عێراقیش کە لەساڵی ١٩٢٠، کە فوراتی ئاماژەی بۆ کردووە، لەراستیدا درێژبوونەوەی ئەو جەنگانە بوو، کە هۆزەکان دژی دەسەلاٚتی عوسمانی ئەنجامیان دەدا. لەوانەیە هۆکارەکانی ئەو رووداوە لەهەندێك لایەنەوە جیاوازی لەگەڵ جەنگەکانی پێشوو نەبێت. سەبارەت بەوەی رەوتی ئازادی وسەربەخۆیی لەگەڵ شۆرشی ١٩٢٠ دەرکەوتووە، ئەمە تەنها رواڵەتێکی دەرەوی بووە، تەنها کەسانێکی کەم لە خوێندەوار وپیاوانی ئاینی وهەندێك لە شێخەکان درکیان بە ماناکەی کردووە. زۆرینەی پیاوانی

[٢١٤] فراتي (على هامش الثورة العراقية الكبرى) ص ٣٩-٤٠

هۆزەکانیش ئەوانەی بەشداریان لە شۆڕشەکە کردبوو، بەهەمان گیانی پێشووتری جەنگەکان دەجەنگان.

هۆزە عێراقییەکان وا سەیری حکومەتیان کردووە، کە میکرۆبێکی سروشتی بێت بۆیان. ئەم تێڕوانینەشیان لە بیاباننشینەوە بۆماوەتەوە. ڕۆشنبیری بیاباننشینی وەك لەبەشی پێشوو ئاماژەمان بۆکرد، سێ پێکهاتەی هەیە، ئەوانیش: دەمارگیری، داگیرکاری، مروەتە. شاراوە نییە، هەر ئەو سێ پێکهاتەیەش دژی حکومەتە. لەتوانای حکومەتیش نییە ئەرکەکانی خۆی لەناو کەسانێك ئەنجام بدات دەمارگیری هۆزیان هەبێت، هێرش بکەنەسەر یەکتر، بەدوای بەهاکانی فریاکەوتن و هاوسێیەتی و خۆدەخیلکردن بن.

لەواقیعدا دوژمنایەتی نێوان هۆز و حکومەت رەگوریشەیەکی قوڵی لەسەردەمی عوسمانییەکان هەبوو. حکومەت رق و کینەی خۆی لەبەرامبەر هۆزەکان دەشاردەوە[٢١٥]، هەروەها بەهەمان شێوە هۆزەکانیش رقوکینەی خۆیان لەبەرامبەر حکومەت حەشار دەدا.

دکتۆر جون فانیس باس لەوە دەکات جارێکیان لە هۆزەکان بووە، چۆتە لای یەکێك لە هۆزەکان و گوایە هانای بۆ بردوون و خۆی دەخیل کردوون، بەڵام شێخی هۆزە کاتی سەیری ریشی سوور وچاوە کاڵەکەی دەکات، گومانی لێدەکات و دەڵێ" ئەتۆ تورکی، تورکیش دوژمنی ئێمەن، تۆ هاتووی سیخوڕی لەسەر ئێمە بکەیت، بەڵام ژیانت بەدەست ئێمەیە" دکتۆر فانیس بەشێخەکە دەڵێ من تورك نیم، من پزیشکم چارەسەری خەڵك دەکەن. شێخ دەڵێ" بە راستی تۆ پزیشکی، من تاقیکردنەوەت پێ دەکەم، نەخۆشێك دەهێنم، ئەگەر چارەسەرت کرد، ئەوا میوانێکی بەرێز دەبێت لەلای ئێمە، ئەگەریش وا نەبێت ئەوا ( بخبخ)" شێخ دەست لەسەر گەردەنی خۆی دادەنێ، بۆ ئاماژەی سەربڕین.

وا رێکەوت دکتۆر فانیس لەچارەسەرکردنی نەخۆشەکە سەردەکەوێ، بەمەش لەکوشتن نەجاتی دەبێت. شەو لەنزیك شێخ دەمێنێتەوە، لەلای گۆمەتی کەلوپەلی

---

[٢١٥] جون فانیس (أقدم أصدقائي العرب)- ترجمة جليل عصو ــص ٣٣٩

تـاڵانکراو، کـە شـێخ بەشـانازییان پێوەدەکـات، گوایـە پیاوەکـانی لـە هـۆزە دوورەکانەوە بەتاڵان هێناویانە[٢١٦].

ئـەو بەسـەرهاتە بـری ئـەو رقمـان بـۆ دەردەخـات، کـە هۆزەکـان لەبەرامبـەر عوسمانییـەکانیان هـەبووە. ئـەوان ئارەزووی کوشـتنی فەرمانبـەرانی حکومـەت وسەربازان دەکەن، تەنانەت ئەگەر خۆشیان دەخیلی هۆزەکان بکـەن. ڕووداوێکی دیکەش لەوبارەیـەوە دەگێڕینـەوە.والی عومـەر سـەردار شـێخ مەنسور سـەعدونی شـێخی مونتەفـەق، دەکاتـە قایمقـامی (سـوق الشـیوخ) نازنـاوی (بـەگ) و پلـەی سـەبازی (میرئـاخور)ی پێـدەدات[٢١٧]. هۆزەکـەی لـەم ڕووداوە تـورە دەبـن و شاعیرێکی هۆزەکە دوو دێرە شیعری گاڵتەجاری لەبارەی ئەو ڕووداوە نـەخوازراوە دەنووسـێ. ئـەو لـە شـیعرەکەی بـاس لـەوە دەکـات، هۆزەکـەی لـەوە راهـاتووە سەربازی دەوڵەت سەرببڕێت، کەچی شێخەکەی بێباکانە دەبێت بەڕێوەبـەر لـەو دەوڵەتە، قەدەر لەمە زیاتر چ شتی دیکەی ناکۆکی حەشار داوە[٢١٨].

دەتـوانین بڵـێین کوشـتار لـەنێوان هۆزەکـان و حکومـەت نەوەسـتا، تـەنها دوای جوڵانەوەیەکی فراوان نەبێت، کە چەندین هۆز لەدژی حکومـەت لەسـاڵانی ١٩٣٥-١٩٣٦ پێی هەڵسان. ئەو هۆزانە دەیانویست شۆڕشێکی هاوشێوەی شۆڕشـەکەی بیست ئـەنجام بدەن. هەنـدێك لـەپیاوانی ئـایینی لەنەجـەف و هەنـدێك لـەپیاوانی سیاسـی لەبەغـدا پاڵپشـتی ئـەو جوڵانـەوەیان دەکـرد[٢١٩]. حکومـەت سـوپایەکی بەهێزی بەسەرکردایەتی پیاوێکی توند وخوێنرێژ نارد ئەویش بەکر سدقی بوو، ئەو پیاوە توانی زەبری کوشندە لەهۆزەکان بدات.

دواجار هۆزەکان هەستیان بەوەکرد، بارودۆخەکـە گـۆڕاوە و حکومـەت لـە توانـای هەیە بەسـەر هـەر هۆزێك زاڵ بێت ئەگـەر لێی یاخی بێت. لەوکاتـەوە دەبیـنین هۆزەکـانی عێـراق بـەرەو نـەرمی نوانـدن و ملکەچـی دەچـن. شـێخەکانیش هـەوڵ

---

[٢١٦] المصدر السابق ، ص ١٤٩-١٥٠

[٢١٧] بەپێی چەندین سەرچاوەی مێژووی لە دەوڵەتی عوسمانی، ئەو کەسەی سەرپەرشتیی یەکەیەکی سەربازی ئەسپسواری کردووە، پێی گوتراوە (میرئاخور) ئەمە سەیری ئەو سەرچاوەیە بکە: (**الرتب والمناصب والألقاب في العهد العثماني** جريدە الزمان : ٢٦ اكتوبر ٢٠١٣) - وەرگێر

[٢١٨] يعقوب سركيس (مباحث عراقية) ج ١، ص ٧٤-٧٥

[٢١٩] Stephen longrigg (Iraq 1900 to 1950) p 247

دەدەن لەحکومەت نزیك ببنـەوە. لـەبری ئـەوەی جـەنگی لـەدژ بـەریا بکـەن ئـەوا هەوڵی بەدەستهێنانی رەزامەندی دەدەن.

مەلیك فەیسەڵ بەر لەمردنی لە ساڵی ١٩٣٣ راپۆرتێکی نهێنی پێدراوە کە تێیدا هاتووە: هۆزەکان بەهێزترن لەحکومەت، ئەوان ١٠٠ هەزار تفەنگیان هەیە، کەچی حکومەت ١٥ هەزار تفەنگی هەیە. مەلیکیش سەرنجی خۆی لەوبارەیەوە نووسیوە و دەڵێ: لەهیچ وڵاتێکی خودا نییە، حاڵی حکومەت و گەل بەمشێوەیە بێت. ئـەو کەموکورییەش وام لێدەکات بیربکەمـەوە و وردببمـەوە. دواش لـەپیاوانی دەوڵـەت وبەرپرسانی وڵات دەکەن؛ عەقل بەکاربهێنن و سەرکێشی نەکەن[٢٢٠].

لەواقیعدا ئـەو حاڵەتـەی مـەلیك ئامـاژەی بـۆکردووە، دوای مردنـی زۆر گـۆڕاوە. ئێستا سوپای عێراق ژمارەی زۆرە و چەکی بـەهێزە. هۆزەکـان لەبەرامبـەر سـوپا لاوازن و هیچ شتێك نین. ئەم بابەتـەش ئـەنجامی سیاسـی و کۆمەڵایـەتی گرنگـی هەبوو، لەبەشی داهاتوو باسی دەکەین.

**پەیوەندی هۆزەکان بەحکومەتەوە:**

سەرەڕای ئەوەی هۆزەکان مەیلیان بەلای ملکەچی و گوێڕەبـەڵبوونی حکومـەت هەیە، کەچی هێشتا پاشماوەی قین و دوژمنایەتیان بۆ حکومەت مـاوە. هۆزەکـان هێشتا لەوە رانەهاتوون حکومەت بە رەمزی سەربەخۆیی وبەرژوەندی وڵات بـزانن، بـەڵکو حکومـەت بـەرەمزی بـاج و قامچـی و زینـدان وسـتەم و بێگـاریی دەزانـن. ئەمەش پاشماوەی کولتورێکی کۆنە رەگوڕیشـەی بـۆ سـەدان سـاڵ دەگەڕێتـەوە، ئاسان نییە بەیەکجار لە دەروونیان بسڕێتەوە.

ئەوەی شایەنی باسکردن بێت، زۆرێك لەخـەڵکی هۆزەکـان، تـا ئـەم سـاتە خـۆ لەوە بەدوور دەگرن سکاڵا لەلای حکومەت بکەن، لەبارەی ئەو کوشـتن وهـەتکردن ودەستدرێژییەی کە لەنێوانیان روودەدات. ئەوان ئەم کـارە بـە پێچـەوانەی بـەهای پیـاوەتی و دەمـارگیری خۆیـان دەزانـن. پیـاو لـەنێو ئـەوان دەیـەوێ خـۆی تۆڵـە لەنەیارەکەی بکاتەوە. بۆیە بـەتێڕوانینی ئـەو ئەوانـەی بـۆ تۆڵەکردنـەوە پـەنا بـۆ

---

[٢٢٠] عبدالرزاق الحسني (المصدر السابق) ج ٣ ، ص ٢٨٨

حکومەت دەبەن ئەوا کەسی بێدەسەلات و زەلیلن. پیاوی بەهێز ئەوکەسەیە بەدەستی خۆی تۆڵەبکاتەوە نەوەك بەدەستی کەسانی دیکە.

کاتێك ڕووداوی کوشتن لەناو هۆزێك دەبێت، پۆلیس بۆ لێکۆڵینەوە دێت، بەڵام کەسێك نادۆزێتەوە لەهۆزەکەدا هاوکاری بکات. تاکەکانی هۆزەکە دەزانن کێ بکوژە، بەڵام زانیاری بەپۆلیس نادەن، چونکە مەبەستیانە بەدەستی خۆیان بیکوژن. ئەگەریش پۆلیس دەستگیری بکات و رادەستی دادگای بکات، ئەوا لەبەردەم دادگا چاوەڕوانی دەکەن، کە دەبینین لە هەموو لایەك بکوژەکە بەپۆلیس دەوردراوە و دواتر دەبرێتە زیندان، ئەوا ماوەی زیندانی کردن ئەوان چاوەڕوانی دەکەن، خۆیان مەڵاس دەدەن، تا لە زیندان دەردەچێت و جا هەوڵی کوشتنی دەدەن.

ڕۆژێکیان جەماعەتێك لادێیم بینی، عەسا وخەنجەریان بەدەستەوە بوو، بەدوای کوڕێك دەگەڕان گوایە لەکچێکی ئەوانی داوە. بەتوڕەیی دەیانپرسی" خۆ کچە بێکەس نییە؟!" مەبەستیان ئەوەبوو بڵێن کچە کەسی هەیە( الأهل) واتە عەشیرەتێکی هەیە تۆڵەی بکات، جا چۆن دەکرێت کوڕێك دەستدرێژی بکاتەسەری. من تەواوی چیرۆکەکەم نەدی، بەڵام تەسەوڕ دەکەم جەنگێکی توند لەنێوان هۆزی کچەکە و هۆزی کوڕەکە، لەئەنجامی ئەم ڕووداوە هەڵگیرسابێت.

جا لەگوندەکان زاراوەی کەس(الأهل) شوێنی حکومەت دەگرێتەوە. ئەگەر کەسێك بکوژرێت کەسێك نەبێت داوای تۆڵەکردنەوە بکات، ئەوا بۆی دڵگران دەبنو دەڵێن" بەستەزمانەی بێکەس بوو" کەچی حکومەتیان بەخەیاڵ نایەت. ئەوەی جێگای سەرنجە تەنانەت پۆلیس وسەربازەکانیش لەگەڵ یەکتر دەمارگیری دەنوێنن و بەدوای تۆڵە دەگەڕێن، چونکە پۆلیس وسەربازەکانیش زۆرینەیان ڕۆڵەی هۆزەکانن. هەرچەندە مەشقیان بۆ حکومڕانی و پاراستنی ئاسایش پێکراوە، کەشی ناتوانن دەمارگیری خۆیان لەیاد بکەن. تەنانەت دەمارگیری خۆیان پێشدەخەن بۆ ئەوەی لەگەڵ بارودۆخی نوێ بگونجێت. هەندێکجار شەڕ لەنێوان پۆلیس و سەرباز دروست دەبێت، یان لەنێوان سەرباز و کۆمەڵێك خەڵك

دروست دەبێت، جا هەرکەسە دەمارگیری بۆ هۆزەکەی خۆی دەردەبڕێت، لەوانەشە لەئەنجامی ئەمە جەنگی خوێناوی دروست بێت.

لەساڵی ١٩٣٩ لەگەڵ کۆمەڵێك لە هاوڕێیانم سەفەری بابلمان کرد، لەناو شەمەندەفەر یەکێك لەهاوڕێیانم لەگەڵ سەربازێك بەشەڕهات و زلەیەکی لێدا. لەبەدبەختی ئێمە شەمەندەفەرەکە پڕبوو لەسەرباز. هەواڵەکە بەنێویاندا بڵاوبوویەوە، هەموویان کۆبوونەوە بۆ ئەوەی تۆڵەی هاوڕێیان بکەنەوە، بێ جیاوازیکردن. هەر سەربازێك بەدوای قوتابییەك دەگەڕا بۆ ئەوەی لێی بدات. قەدەر دواسات هاوکارمان بوو بۆ ئەوەی خۆمان دەرباز بکەین و بقوچێنین و وەك با رابکەین. سەربازەکان لە هۆزی جیاجیا بوون، بەڵام ئەوکاتە دەمارگیری سەربازی بەسەریان زاڵبوو، هەموویان بوون بە هۆزێك لەبەرامبەری هۆزی دوژمن، کەئێمەی قوتابی بەستەزمان بووین!

**لەساڵی ١٩٣٦ لەبەغدا شەڕێکی گەورە لەنێوان سەربازان و خەڵك روویدا، ئەوەی خوارەوە دەقی بەیاننامەی حکومەتە لەبارەی رووداوەکەوە:**

( لەرۆژی سێیەمی جەژنی رەمەزان، سوارێك بەناو خەڵکی گۆڕەپانی شێخ مەعروف تێدەپەڕێت. لەکاتی تێپەڕبوونی خەڵکەکە بێزاردەکات ولەنێو خەڵکەکەشدا سەربازێك دەبێت کەسوارەکە بەسەر پێی دەکەوێت، خەڵکەکە و بە سەربازەکەشەوە لەو هەڵسوکەوتە پەست دەبن و بۆیە لە سوارەکە دەدەن. لە ئەنجامدا هەندێك لە خەڵکەکە لە هۆزی سوارەکە دەبن و هەندێکیش لەگەڵ سەربازەکە دەبن، بۆیە شەڕ دەکەوێتە نێوانیان و پۆلیس دەچێتە ناو رووداوەکەوە. هەندێك لەسەرباز وخەڵکەکە بریندار دەبن، دووان زامەکەیان مەترسیدارە، ئەوانی دیکە سووکە. بەپەلە سەربازی ئینزیبات و بەرپرسان دەگەنە شوێنەکە و ئاسایش دوای ماوەیەکی کورت سەقامگیر دەبێتەوە. لێکۆڵینەوە لەلایەن پۆلیس و سوپا بەردەوامە بۆ بەسزاگەیاندنی ئەوانەی دەستدرێژیان کردووە، بەو شێوەیەی کەشایستەیانە)[٢٢١].

[٢٢١] عبدالرزاق الحسني (المصدر السابق) ج ٤، ص ١٨٩

لەسەردەمی خۆی وا بلاوبوویەوە کە رووداوەکە زۆر لەوە گەورەتر بووە کە بەیاننامە فەرمییەکە باسی کردووە. شەڕەکە زۆرتر لە نێوان سەرباز وپۆلیسەکان دابوو، تەنانەت کوژراویشیان لەنێودا هەبوو. هەر یەکە لە پۆلیس وسەربازەکان ئەو چەکەیان بەکارهێنابوو کە هی حکومەت بوو، بۆ پاراستنی ئاسایش وەریانگرتبوو، کەچی ئەوان ئاسایشیان تێکدا لەبری پاراستنی.

**شەڕی نێوان گەڕەکەکان:**

لەسەردەمی عوسمانییەکان زۆرجار لەنێوان گەڕەکەکانی شارێکدا شەڕدروست بەرپادەبوو. دانیشتوانی هەر گەڕەکێك هەستیان دەمارگیرییەکی تایبەت دەکرد گوایە جیاوازن لەگەڵ گەڕەکەکانی دیکە. دەتوانرێت بگوترێت، ئەو دەمارگیرییەی لەگەڕەکەکانی شاردا هەیە، لەزۆر لایەنەوە هاوشێوەی ئەو دەمارگیرییەیە کە لە گوندەکان هەیە. بۆیە چەمکی ( کوڕی گەڕەکەمەم) لەشاردا، نزیکە لە (کوڕی هۆزەکەم) لەلادێدا. لەهەر گەڕەکێکیش شێخ و پاڵەوان و بەسەرهاتی خۆی هەیە وەك ئەوەی لەهۆزی گوندێك هەیە.

هەرشارێکی عێراق لەسەردەمی عوسمانییەکان، خاڵی نەبوو لەشەڕەگەڕەك. ئەو شەڕەش لاوازی و بەهێزییەکەی بەپێی بارودۆخی شارەکە بوو. بۆ نموونە لەبەغدا شەڕەگەڕەك لاوازتر بوو، ئەمەش لەلایەك لەبەر دەسەڵاتی حکومەت بوو، لەلایەکی دیکەوە بوونی زۆرێك لە بێگانە وبازرگان بوو. کەچی نەجەف لەوبارەیەوە بەپێچەوانەی بەغدابوو، ململانێی گەڕەك گەیشتە ئەوپەڕی توندی. ئەمەش لەبەر ئەو هۆکارانەی خوارەوە:

یەکەم: نەجەف لەبەغدا وئەو شارانەی دیکە دوورە کە دەسەڵاتی حکومەتی تێدا گردبۆتەوە. دەتوانین ناوی(دوورەدەستی) لەم شارە بنێین، کە ئیبن خەلدون زاراوەی (قاصیة)ی بۆ بەکاردەهێنێت. ئیبن خەلدون دەڵێ" ئەگەر دەسەڵاتی دەوڵەت دابەزێ، ئەوا سێبەرەکەی لەشوێنە دوورەدەستەکان کەم دەبێتەوە بۆیە خەڵکی شارەکان دەبێت لەسەر بنەمای دەمارگیری خۆیان رێك بخەنەوە"[222].
ئەمەش بە کردە لەسەردەمی عوسمانییەکان لە نەجەف روویدا.

---

[222] ابن خلدون (المقدمة) ص ٣٧٧

دووەم: نەجەف دەکەوێتە لێواری بیابان. یان دەکرێت بڵێین دەکەوێتە خودی بیابانەوە بۆیە دەبێت سەرچاوەی کۆمەك کردنی هەندێك لەو هۆزانەی بەدو کە لە بیابانەکانی نزیك نەجەف هاتوچۆ دەکەن. زۆرجاریش گرژی و ململانێ لەنێوان هۆزەکان و خەڵکی شارەکە بەرپادەبوو[٢٢٣]. ئەمەش وا لە خەڵکی دەکات هەست بەپێویستبوونی دەمارگیرییەکی بەهێز بکەن بۆ ئەوەی هاوکاریان بەکات لەرووبەرووبوونەوەی هۆزەکانی بەدو. ئەم پێویستیە زیادبوو لە کۆتایی سەدەی هەژدەمدا، چونکە ئەوکاتە هۆزە وەهابییەکان هێرشیان دەکردە سەر شارە عێراقییەکانی لێواری بیابان. خەڵکی نەجەفیش داکۆکیان لە شارەکەی خۆیان دەکرد و لەمەش زۆر سەرکەوتوو بوون[٢٢٤].

سێیەم: نزیکی نەجەف لە ناوچەی فوراتی ناوەڕاست، ئەم ناوچەیەش وەك لەبەشی پێشوو باسمان کرد، دوای ناوچەی جەزیرە بەدەروازەی دووەم دادەنرێت، بۆ هاتنی هۆزەکانی بیابان. هۆزەکانی ئەم ناوچەیەش لەدێر زەمانەوە بەوە ناسراوە کە زۆرترین یاخیبوونیان لەحکومەت هەیە و هاندەرن بۆ شۆڕش لەدژی حکومەتدا. یەکێك لەبەرپرسانی دەوڵەتی عوسمانی نازناوی ( دڵە بەگورەکەی عێراق)[٢٢٥] ناوی دەبات. بۆیە دەبێت خەڵکی نەجەف کاریگەر بن، بە گیانی هۆزگەری زاڵبوو بەسەر ئەو ناوچەیە.

چوارەم: نەجەف شارێکی زۆر پیرۆزە. لەلایەك مەزاری ئیمامی ئەعزەم: عەلی کوڕی ئەبوتاڵبی تێدایە. لەلایەکی دیکەشەوە مەڵبەندی شیعەگەرییە لەهەموو جیهانەوە، بەشێوەیەك هەموو قوتابی وگەشتیاران لەهەموو لایەکی جیهانەوە رووی تێدەکەن. زۆرجاریش مەرجەعی باڵای شیعە تێیدا دەژی. لەبەر ئەم هۆکارانە دەوڵەتی عوسمانی تێڕوانینێکی تایبەتی بۆ نەجەف هەبوو. فرمانی دامەزراندنی قایمقام راستەوخۆ لە ئەستەنبوڵەوە دەهات. حکومەتی بەغداش لەبەرامبەر خەڵکی نەجەف هەست بە بێ توانایی خۆی دەکرد، دەستی لەکارەکانی نەجەف وەرنەدەدا تەنها لەچوارچێوەیەکی زۆر تەسك نەبێت. هەندێك

[٢٢٣] مجيد الموسوي (الحاج عطية ابو كلل) ص ٥٤-٦٦
[٢٢٤] محمد سعيد محبوبة (ماضي النجف و حاضرها) ج ١، ص ٣٢٦- ٣٣١
[٢٢٥] وداى العطية (تاريخ الديوانية) ص ٩٩

جار خەڵکی نەجەف لەحکومەتی بەغدا یاخی دەبوون، حکومەتیش نەیدەتوانی سزایەکی توندیان بدات، لەترسی ئەوەی رای گشتی لەدژی هەڵسێتەوە. حکومەت تەنها گوێڕایەڵبوونی رەمزی ئەوانی قبوڵ بوو، جگە لەمەش سەرپشکی کردبوون بۆ ئەوەی بەپێی نەریتی خۆجێی خۆیان کاروباری خۆیان بەڕێوەببەن، وەك ئەوەی لەسەرویەندی جەنگی یەکەمی جیهان روویدا[٢٢٦].

**چەند نموونەیەکی واقیعی:**

نەجەف لەسەردەمی عوسمانیدا بەسەر دوو دەمارگیری دژ بەیەکتر دابەشببوو، ئەوانیش زەقروت وشمرت بوو. لەبارەی سەرچاوەی ئەو دوو زاراوەیە پرسیارێکی زۆرم لەخەڵکی نەجەف کردووە، لە لێکدانەوەیدا ناکۆك بوون. هەرچۆنێك بێت ململانێی نێوان ئەو زەقروت وشەمرت لەو کاتەوە دەستی پێکرد کە نەجەف لەکۆتایی سەدەمی هەژدەم بوو بەمەڵبەندی شیعەگەرایی جیهان جەنگی توندیش لەنێوان ئەو دوو دەمارگیریە بەردەوام هەبووە، تەنها ماوەیەکی نزیك نەبێت.

مامۆستا سەعید محەمەد مەحبوبە دەگێڕێتەوە، لەساڵی ١٣٢٣ی کۆچی، یەکێك لەو جەنگانەی بەچاوی خۆی بینیوە. پاڵەوانی جەنگەکە پیاوێك بووە بەناوی عەزیز باقر شام، لەپیاوانی شەمرت بووە. دوای ئەوەی چەند پیاوێکی بەناوبانگ بە ئازایی وفریادڕەسی لە زەقروت دەکوژێت، خۆی و دووکوڕی دەکوژرێن. بەمەش زەقروت سەردەکەوێ و ئاژاوەکە دادەمرکێتەوە. مامۆستا مەحبوبە ناوماڵ و مافوری گرانبەهای بینیوە، کە زەقروت لەدوژمنانیان تاڵان کردووە[٢٢٧].

موحسین ئەمین جەنگێکی دیکەمان لەو شێوەیە بۆ دەگێڕێتەوە. هۆکارەکەی ئەوەبووە شەمرت ویستویانە بەشەو لەوادی سەلام مردوویەك بنێژن، زەقروتیش رێگریان لێدەکەن... رۆژی دواتر شەمرت هێرش دەکەنە سەر بازاڕ و خەڵك بە پەلە دوکانەکانیان دادەخەن، هەر دوولا سەنگەر لەیەکتر دەگرن، کلیداریش دەرگای مەزارگەی پیرۆز دادەخات، بۆ ئەوەی یەکێك لە لایەنەکان نەچنە سەر منارەکان و لەوێوە تەقە بکەن. منارەکان بەرزترین شوێنی شارن هەر لایەنێك

[٢٢٦] عبدالله الفياض (الثورة العراقية الكبرى) ص ١٦
[٢٢٧] محمد سعيد محبوبة (المصدر السابق) ج١، ص٣٣٩

بگاتە ئەوێ ئەوا لایەنی زاڵبوو دەبێت. کەچی حکومەت کاری ئەوە بوو دەرگای سەرای دابخات و سەربازەکان بچنە قشڵەوە و دەرگاکانیان دابخەن. هەروەها موحسین ئەمین دەڵێ: ( هەندێك شەو وا خەوتووین گوللە بەسەرمان تێپەڕیوە. وەرزی هاوین بوو، سەرەتا لەسەربان بووین دواتر کە گوێمان لەویزەی گوللەکان دەبوو، هاتینە حەوشیماڵەوە، دواتر هەر لەبەر دەنگی گوللەکان چووینە هەیوان....)[228].

ئەمە نموونەیەکە بۆ زاڵبوونی دەمارگیری ناوخۆیی لە نەجەف، لەوانەیە لە زۆربەی شارەکانی عێراق، هاوشێوەی بدۆزینەوە، ئەگەر بەشێوەیەکی کەمتریش بێت. بۆ نموونە لە کەربەلا لەدێر زەمانەوە ململانێ لەنێوان گەڕەکەکانی هەیە. ئەو ململانێیە روونتر بوو کاتێك عوسمانییەکان لەسەروبەندی جەنگی یەکەمی جیهان لە کەربەلا کشانەوە. ئەو کات خەڵکی کەربەلا بوون بەدوو تایفەی دژی یەکتر. یەکێکیان ئال کمونە و ئەویتریان ئال عەواد بوو. سەرەتا وەردەشەڕ بوو لەیەکێك لەبازاڕەکان لەنێوان ئال عەواد و حومەبرییەکان، کە ئەمانەی دووەم هاوپەیمانی ئال کمونە بوون. شێخ فەخری کمونە ئاگادارکردنەوەیەکی توندی بۆ ئال عەواد رەوانەکرد، داوای لە ئال عەواد کرد ئێوارە هەمان رۆژ لەکەربەلا بچنە دەرەوە، ئەگینا خانوویان دەروخێنێ و لەشارەکە بەناچاری دەریان دەکات. ئال عەواد هانایان بۆ هاوپەیمانان برد لەهۆزەکانی لادێ. ترس لەشار بڵاوبۆوە. هەردوو لا لە سەر ماڵ وبازارەکان سەنگەریان لەیەکتر گرت، هاتوچۆ قەدەغەکرا، پاڵەوانی گەڕەکەکان لەسەر رێگاکان وەستابوون، خەریك بوو کارەساتەکە رووی دەدا !

پیاوانی ئایینی هەوڵیان دا هەردوو لایەن لەیەکتر نزیك بکەنەوە و سوڵحیان لەنێوان ئەنجام بدەن. لەمەدا بەشێوەیەکی کاتی سەرکەوتن. کاتێك ئینگلیز بە بابەتەکەی زانی، ئەوکات بەغدایان داگیرکردبوو، بۆیە یەکێك لە ئەفسەرەکانی

[228] محسن الامين (أعيان الشيعة) ج ٤٠ ، ص ٥٨-٥٩

خۆی نارد بۆئەوەی بەسەر کەربەلا زاڵ بێت[229]. ئەوکاتیش خەلکی هەناسەی ئاسوودەیی هەڵمژی.

نموونەیەکی دیکەی ئەو ململانێییە لە سەماوە دەدۆزینەوە.عەزیز قەساب ئەو رووداوە دەگێڕێتەوە، ئەو لەلایەن حکومەتی عوسمانی، لەساڵی ١٩٠٩ وەك قائیمقامی سەماوە، دانرابوو. قەساب باس لەوە دەكات كاتێك گەیشتۆتە سەماوە بینیویەتی بازاڕی گەورە داخراوە، خەڵك لەترس دەژیت. وردەكاری بەسەرهاتەكە ئەوەیە سەماوە لەسێ گەڕەگ پێك دێت، ئەوانیش :

١-گەڕەكی قشڵە: ئەم گەڕەكە دەكەوێتە كەناری چەپی رووباری فوراتەوە. لەبەرئەوەی قشڵە تێدایە بەوناوە ناونراوە. سەرباز وئەفسەر و هەندێك لەمەدەنی و بازرگان لەو گەڕەكە نیشتەجێن، فەرمانگەكانی حكومەتیش لەو گەڕەكەیە، قایمقام بەسەری زاڵە.

٢- گەڕەكی رۆژئاوا: دەكەوێتە بەرەی راستی رووباری فوراتەوە، لەباكووری بازاڕی گەورەوە، سەركار ربات سەلمان دەسەلاتی بەسەر هەبووە، لەبەر زۆری كەسوكار و كاربەدەستانی لەو گەڕەكە.

٣- ئەوەش هەر دەكەوێتە بەری راستی رووبارەكەوە، لە باشووری بازاڕی گەورەوە سەید تەفاڕ دەسەلاتی بەسەر ئەو گەڕەكە هەیە. لەجێگای ئەو عەبدوللا شاهیر و سەباڕ حوسێن جێبەجێكار بوون، ئەم دوو پاڵەوانی بوێربوون كە لە (رموەشاندن) شارەزابوون.

قەساب دەڵێ ململانێ لەنێوان گەڕەكی رۆژهەڵات و گەڕەكی رۆژئاوا بەردەوامبوو، زۆرجار كوشتارەكان لەسەر هیچترین هۆكاربوو. قەساب هۆكارەكانی بەرپابوونی ئەو شەڕانە بۆ ئەمانەی خوارەوە دەگێڕێتەوە:

١-لاوازی كارگێڕی

٢- سوودوەرگرتنی جێبەجێكارەكان لە خوێنی كوژراوەكانیان، چونكە نیوەی خوێنەكە بۆ سەرۆكەكەیان دەگەڕایەوە.

[229] عبدالرزاق الوهاب (كربلاء في التاريخ) ج ٣ ، ص ١٥-١٨

٣- بەدرەفتاری فەرمانبەران و سوودبینیان لە ناکۆکیان، ملکەچبوونیان بۆ جێبەجێکارەکان.

لەراستیدا لێرەدا دەرفەت نابێت بۆ ئەوەی نموونە جیاجیاکانی دەمارگیر گەڕەکەکان لەشارەکانی عێراق بهێنینەوە. جارێك ویستم لەو نموونانە وردبیمەوە، ئەمەش بە بەکارهێنانی سەرچاوەی جۆراوجۆر و راپۆرتی قوتابیان، ژمارەیەکی زۆر نموونەم کۆبۆوە. لەوانیە لە کتێبی داهاتووم دەرفەتی ئەوەم بۆ برەخسێ بەو وردی باس لەو نموونانە بکەم.

بەهەرحاڵ دەتوانین وێنەی توندی ئەو دەمارگیرییەی گەڕەك بکەین لەشارەکانی عێراقدا، ئەگەرهاتوو توێژینەوە لەبارەی دەمارگیریەکانی بەغدا بکەین. ئەو شارە تا ئێستاش لەهەموو شارەکانی دیکە عێراق شارستانیترە. شەڕەگەڕەکی تێدا لەهەموو شارەکانی دیکە کەمتر بووە. وەك پێشتریش ئاماژەمان بۆ کرد. کەچی جارجارە شەڕەگەڕەکی توندی تێدا بەرپابووە.

هەر لەو بارەیەوە بەسەرهاتێکی خۆش هەیە، رۆژهەلاتناسی فەرەنسی لویس ماسنیۆن لەساڵی ١٩١٢ لەبەغدا بووە. ئەو شەڕێکی توند لەنێوان گەڕەکی باب شێخ و گەڕەکی حەیدەرخانە دەبینێ. هۆکاری شەڕەکە دەرچوونی کەژاوەکان دەبێت لەگەڕەکەکانەوە.ئەو کاتە هەواڵی هێرشکردنی ئیتالیا بۆ سەر تەرابلوس و هەلگیرسانی جەنگ لەنێوان ئیتالیا و دەوڵەتی عوسمان دەگاتە بەغدا و خەڵك بۆ پشتگیری دەوڵەتی عوسمانی و کۆکردنەوەی کۆمەك دێتەدەرەوە، لە باب موعەزەم کەژاوەی باب شێخ بەکەژاوەی حەیدەرخانە دەگات و بەریەکەوتن و شەڕ لەنێوانیان دروست دەبێت، سەرکەوتنیش بۆ گەڕەکی باب شێخ دەبێت[٢٣٠].

عەلی بەرزگان باس لەوە دەکات، لەگەنجێتی بەچاوی خۆی شەڕی توندی لەنێوان گەڕەکەکانی حەیدرخانە و مەیدان و عەممار و ئەلبوشبل بینیوە. گەنج و مێرمنداڵ بەشداریان لەشەڕەکان کردووە و ژنانیش شەرکەرانیان هانداوە. شەڕکەران دارعەسا و بەردی گەورەیان بەکارهێناوە. شەڕەکانیش لەبەر هۆکاری زۆر هیچ و

[٢٣٠] لویس ماسنیون (لهجة بغداد العربية) ترجمة اکرم فاضل ص ٥

پووچ ئەنجام دراون. هەرهەمووشیان بە بەر چاو و گوێچکەی حکومەت روویدەدا کەچی ئەو رێگری لێ نەدەکرد.[٢٣١]

دکتۆر مستەفا جەواد باس لەوە دەکات لەشەڕێکی بەغدا ئامادە بووە لەساڵی ١٩٢٠ لەنێوان گەڕەکی بەنی سەعید و گەڕەکی کورد و باب شێخ روویداوە، پۆلیس هاتۆتە نێوانیان و پەروازەی پێکردوون، کۆمەڵێک گەنجیش دەستگیر دەکات و بەتۆمەتی جیاواز سزایان دەدات[٢٣٢].

**شەڕ لەنێوان شارەکان و هۆزەکان:**

گەڕەکەکانی نەیار لەیەک شاردا، کینە و دەمارگیری تایبەتیان لەبیر دەکەن، ئەگەر مەترسییەکی گشتی لەسەر شارەکەیان بێت. ئەوکاتە هەموویان لەدژی دوژمنە هاوبەشەکەیان یەک دەگرن، ئەمەش بەپێی ئەو پەندەی بەدو کە دەڵێ(( من و براکەم لەبەرامبەر ئامۆزا، من و ئامۆزام لەبەرامبەر بێگانە)).

ئەو مەترسیە گشتیە کە هەڕەشە لەشار دەکات لەسێ ئاراستەوە دێت: لە هۆزێکی نزیکەوە دێت، لەشارێکی دیکەوە دێت جا دوورە یان نزیک، هەندێک جاریش لەلایەن حکومەتەوە دێت. جا کاتێک مەترسی لەهەر لایەکی ئەم سێ ئاراستەیەوە بێت، ئەوا ئەواوی خەڵکی شارەکە لەژێر سەرکردایەتی پیاوێکی گەورە کۆدەبنەوە، هەروەها هانا بۆ هاوپەیمانانیان دەبەن لەهۆز و شارەکانی دیکە، جا رێگای بەرگری یان هێرشکردن دەگرنەبەر وەک ئەوەی نەوەی یەک گەڕەک یان یەک هۆز بن.

ئەوەی شایەنی ئاماژەیە، هۆزەکان وا سەیری شارەکانیان دەکرد، وەک ئەوەی هۆزێك بن، شاریش بەهەمان تێڕوانین سەیری خۆی دەکرد.هەندێک جاریش لەنێوان هۆز وشارەکان هاوپەیمانی و رێکەوتنی عەشایەری ئەنجام دەدرا، وەک ئەوەی هۆزەکان لەگەڵ یەکتر ئەنجامی دەدەن. شەڕیش لەنێوان هۆز و شار روویدەدا، تۆڵەکردنەوە و کینەشیان لەنێوان هەبووە، وەک ئەوەی لەنێوان دوو هۆز هەبێت.

---

[٢٣١] علي آل بازركان ( الوقائع الحقيقية في الثورة العراقية ) ص ٥٧

[٢٣٢] مصطفى جواد (مقدمة كتاب الفتوة لابن المعمار البغدادي ) ص ٩٩

نیبۆری گەشتیار رووداوێك دەگێڕێتەوە، لەساڵی ١٧٦٥ لە ناوچەیەکی فوراتی ناوەڕاست روویداوە. رووداوەکەش ئەوەیە کەشتیەك بەرووبار تێپەڕیوە، پڕبووە لە کەلوپەل و خەڵك. دواتر لەرووبارەکەوە گیردەبێت، هەندێك لەبەدوەکان دەیانەوێ کەلوپەلەکان دابەزێنن، کەچی لەوکاتەدا کەشتیەکە بەلایەك دەکەوێ و هەندێك لەبەدوەکان دەمرن. نیبۆر سەرسام دەبێ کاتێك دەزانێ بەدوەکان داوای خوێنی کوژراوەکان لە شاری سەماوە وقرنە دەکەن، بیانویان ئەوەبووە زۆربەی سەرنشینەکانی کەشتیەکە خەڵکی ئەو دوو شارەبوون [٢٢٣]. بۆیە دەبوو خەڵکی ئەم دوو شارە خوێنی کوژراوەکان بەهۆزەکان بدەن، ئەگەر ئەمەیان نەکردبوایە ئەوا لەئەنجامدا دوژمنکاری وکوشتار لەنێوان شارەکان و هۆزەکە دروست دەبوو.

ئەگەر مێژووی هەر شارێکی عێراق بخوێنینەوە، ئەوا دەبینین خاڵی نییە لەو شەڕانەی لەنێوان شارەکەو هۆزەکانی نزیکیان روویداوە. لەوانە نموونەی ئەوەی لەنێوان شاری نەجەف و هۆزی بەنی حەسەن روویدا، لەنێوان شاری بەلەد و هۆزی شەمەڕ روویدا، لەنێوان شاری کوبەیسە و هۆزی عەنزە، لەنێوان شاری دیوانیەوە هۆزی خەزاعل روویداوە...

حاجی ودای عەتیە باسی شەڕێکمان بۆ دەگێڕێتەوە، لەنێوان شاری دیوانیە و هۆزی خەزاعل لەسەروبەندی جەنگی یەکەمی جیهان روویداوە. هۆکارەکەش ئەوەبوو خەڵکی دیوانییە دەستیان بەسەر ئەو چەك وکەلوپەلە جەنگیانە داگرتووە کە عوسمانییەکان دوای پاشکشەیان لەشارەکە جێیانهێشتووە. ئەوان لەنێوان خۆیان دابەشی دەکەن، کەچی دواتر هۆزی خەزاعل دێن داوی بەشێك لەو کەلوپەلانە دەکەن. ئەوانیش نکۆڵیان لێ دەکەن و فەرامۆشیان دەکەن. لەئەنجامدا هۆزەکە دوژمنایەتیەك هەڵدەگرن. رۆژێك دێت هەندێك لەخەڵکی دیوانییە دەچنە نەجەف، تەرمی مردوویەك هەڵدەگرن بۆ ئەوەی لەنەجەف بینێژن، ئەوان چەکدار دەبن و ژمارەیان هەشتا پیاو دەبێت، هۆزەکە رێگەیان پێ دەگرێت. لەئەنجام دا سێ کەس لەپیاوانی دیوانییە دەکوژرێن [٢٢٤].

---

[٢٢٣] کاوستن نیبور (مشاهدات نیبور) ترجمة سعاد العمري ص٧٠ - ٧١

[٢٢٤] ودای العطیة (المصدر السابق) ص ١٤١- ١٤٢

نکۆڵی لەوە ناکەین جەنگی نێوان هۆزەکان وشارەکان ئێستا نەماوە. ئەمەش دوای ئەوە بووە حکومەت توانای سەقامگیرکردنی ئاسایش و بەرپەرچدانەوەی هێرشبەرانی هەیە. لەگەڵئەوەشدا جەنگێك لەنێوان شاری حەی و هۆزی مەیاح لەساڵی ١٩٥٤ بەرپابوو. وەك ئەوەی رووداوێکی ریزپەڕبوو، دەنگدانەوەیەکی گەورەی لەسەرتاسەری عێراق هەبوو: هۆکارەکە ئەوەبوو ئال یاسین کە شێخەکانی مەیاحن، زەویوزاریان لەدەوربەری شاری حەی هەیە. ئەوان خەندەقیان بۆ تەسککردنەوە لێدابوو، بۆ ئەوەی شارەکە لەسنوورە کۆنەکەی فراوانتر نەبێت. فەرمانبەرانی کارگێریش بوێریان نەبوو بۆ فراوانکردنی شارەکە و شکاندنی ئابلۆقەکە. سەعید قەزاز کە وەزیری پێشووی ناوخۆ بوو، لەبەردەم دادگای باڵای سەربازی تایبەت، رایگەیاند لەمشتومڕێکی بەردەوام دابووە لەگەڵ شێخ عەبدوڵلا ئال یاسین بۆ تەرخانکردنی زەوییەکی گۆڕستان بۆ خەڵکی شاری حەی...[235]

رۆژێك دەمەقاڵێ لەنێوان جەماعەتێکی ئال یاسین و یەکێك لە فرۆشیارەکانی خەڵکی حەی دروست دەبێت. بەریەکەوتن لەنێوان هەردوولا روودەدات. دوای پێنج رۆژ نزیکەی سەد کەس لە هۆزی مەیاح بەیانیەك هێرش دەکەنەسەر سەراج و زێرنگرەکانی بازاڕی حەی، هەندێك لە خەڵکی حەی هانای بۆ براکانیان دەبەن، شەڕێکی گەورە لە نێوانیان دروست دەبێت دوو کەس لەهۆزەکە وپانزە کەس لە خەڵکی حەی بریندار دەبن و یەکێکیان دواتر دەمرێت.

محەمەد حەبیب شێخی ربیعە بەپەلە دەکەوێتە ناوبژیوانیان، دواجار دەتوانێ سوڵحێك لەنێوانیان ئەنجام بدات، بەڵام ئەم سوڵحە بەرواڵەت بوو، خێرا بووە کارەساتێك لەساڵی ١٩٥٦ ئەمەش ئەو کاتەبوو کە خۆپیشاندانی خەڵکی حەی لەدژی هێرشە سێ قۆڵییەکەی سەر میسر ئەنجام درا[236].

---

[235] عبدالرزاق الحسني (المصدر السابق) ج ١٠، ص ١٠٨

[236] المصدر السابق ج ٩ ص ٨٦-٨٧

## شەڕی نێوان شارەکان و حکومەت:

لەواقیعدا شەڕی نێوان شارەکان وحکومەت لەسەردەمی عوسمانییەکاندا بەدەگمەن روویداوە. ئەمەش بەپێچەوانەی جەنگی بەردەوامی نێوان هۆزەکان وحکومەتە. وەك دەردەکەوێت خەڵکی شار هەست بەبێ توانایی خۆیان دەکەن لە بەرامبەر سوپا و تۆپخانەی حکومەت، بۆیە دەترسن لەوەی خانوو وبازاڕەکانیان بە تۆپی حکومەت بروخێت و لەلایەنی سەربازەکانیشەوە تالآن بکرێن. کەچی هۆزەکان بایەخێکی گەورەیان بەمە نەداوە، ئەوان نە خانووی جێگیریان هەیە و نە بازاڕی ئاوادانیان هەیە تا لێی بترسن. دەشتوانن لە هێز و تۆپی حکومەت رابکەن و بەرەو هۆرەکان بچن یان بەرەو قوڵایی بیابان بچن.

جەنگ لەنێوان شارەکان و حکومەت لەسەردەمی عوسمانییەکان روویندەداوە ژمارەیەکی زۆر کەم نەبێت. بەناوبانگترین جەنگ ئەوە بوو لەسەردەمی نەجیب پاشای والی لەساڵی ١٨٤٢ لە کەربەلا روویداوە. پوختەکەی ئەوەیە کەسێك بەناوی ئیراهیم زەعفەرانی کۆمەڵەیەکی لەخەڵکی شارەکە پێکهێناوە بەناوی یەرمازییەکان[٢٣٧] . ئەو کۆمەڵەیە بەهێز دەبێت و بەتێپەڕبوونی رۆژگار ژمارەی کەسەکانی زیاد دەبێت، بەشێوەیەك هەرکەسێك لە سەرتاسەری عێراق لە حکومەت یاساغ دەبوو، پەنای بۆ ئەو کۆمەڵەیە دەبرد. ئەو جەماعەتە لەسەردەمی داود پاشا دەستیان بەسەر شارەکە داگرت. کاتێك عەلی رەزا پاشا بووە والی سوپایەکی ناردە سەر کەربەلا وئابلۆقەی دا. پیاوانی ئایینی وپیاوماقوڵان هاتنە ناو بابەتەکەوە حەفتا هەزار قرانیان دا، والیش رازی بوو وازی لە کەربەلا هێنا، بەڵام کاتێك نەجیب پاشا بوو بەوالی ، لەسەر تەمێکردنی کەربەلا و گێڕانەوەی بۆ ژێردەسەڵاتی حکومەت موکڕ بوو. هۆشیاری ملکەچی ودانانی چەك دا و مانگێك مۆڵەتی دا، کەچی کەربەلا کاردانەوەی بۆ هۆشیاریەکەی ئەو نەبوو، بۆیە سوپایەکی بەهێزی بەتۆپخانەوە ناردە سەرشارەکە و ٢٣ رۆژ ئابلۆقەی دا. خەڵکی شارەکە خۆیان بە شورا قایمەکەی شار پاراست بوو. کەچی

---

[٢٣٧] یەرماز لەزمانی تورکی بەکەسێك دەگوترێت کە کەڵکی هیچی نەبێت، مەبەستیش شەڕانگێزەکانی چینەکانی کۆمەڵگایە- عەلی وەردی سەیری ئەمە بکە : رحلة فريزر ترجمة جعفر الخياط ص ١٧٨

تۆپـەکان کـەلێنیان لـەو شـورایە دروسـت کـرد لـەلای بـاب خانـەوە. هەنـدێك لـە خەڵکەکە پەنایان بردە بەر هۆزەکانی دەوربەر، وەك هۆزی ئال فتلە و ئـال یەسـار و ئال زوغبە. شەڕەکە توندتر دەبوو ژمارەی کوژراوەکان گەیشتە هەزار کەس[٢٣٨]. دواجار سوپای عوسمانی سەرکەوت چووە حەزرەتی عەباسـەوە و ئەوکەسانەشـی کوشت کە هانایان بۆ ئەو شوێنە برد بوو، بۆ ماوەی چوار سـەعات هـەموی تـاڵان کرا و دواتریش بانگەوازیان بۆ ئاشتەوایی کرد..[٢٣٩]

لەسەروبەندی جەنگی یەکەمی جیهاندا، سێ شار لە حکومەتی عوسمانی یـاخی بـوون، ئـەوانیش کەربـەلا و نەجـەف و حیلـە بـوو. حکومـەت سـوپایەکی بەسەرکردایەتی عاکف بەك بۆ حلە نـارد، بـۆ ئـەوەی بـۆ ئـەوانی دیکـە بیکـات بـە پەنـدێك. ئـەویش شـارەکەی داگیرکـرد و حـەفتا پیـاوی لەسـێدارەدا. یـەکێك لەگەڕەکانی رووخاند و هەندێك لەژنەکانی رفاند. ئەمە رووداوێکی قێزەوەن بوو بـە رووداوی عاکف ناسراوە. عـاکف ویستی بـەرەو کەربـەلا بچێت، بۆئـەوەی وانـەی حیلـە دووبـارە بکاتـەوە. لـەدوای ئـەویش بـەرەو نەجـەف بچێت. بـەڵام ئەمـەی نـەکرد..[٢٤٠]. مەزنـدە دەکرێـت حکومـەتی عوسـمانی لەهەڵچـوونی رای گشـتی ترسـابێت، لەسـەروبەندی جەنگدا، ئەمـە کاتێـك ئەگـەر هاوشـێوەی حیلـە تۆڵـە لەنەجەف و کەربەلا بکاتەوە. بەهەرحاڵ نەجەف ماوەی دووساڵ سەربەخۆ مایەوە لەلایـەن سـەرۆکی گەڕەکەکانـەوە بـەڕێوەدەبرا، لەوانەیـە کەربـەلاش وەك ئـەو بووبێـت. ئەوانـەی لەسـەربازی فیراریـان دەکـرد روویـان لەنەجـەف دەکـرد لـەوێ سەلامەتی و پارێزگاریان دەدۆزییەوە، یەکێك لەو فیرارانەش باوکی نووسـەری ئـەو دێڕانەبوو.

هەلی ئەوەم بۆ رەخسا لەگەڵ خێزانەکەم بەدوای باوکم بچین، ئـەوکات منـداڵێکی بچـووك بـووم، ئێسـتاش لـەیادم مـاوە ئـەو کـات نەجـەف لـە چ بـارودۆخێکی کۆمەڵایەتی سەیر دابوو. هەر گەڕەکێك لەچوار گەڕەکەکە سەرۆکی تایبەتی خـۆی هەبوو، بەپێی نـەریتی عەشایری گەڕەکـەکەی بـەڕێوەدەبرد. کەسـانی چـەکداری

[٢٣٨] سلمان هادي الطعمة (تراث كربلاء) ص ٢٧٢
[٢٣٩] عباس العزاوي (المصدر السابق) ج ٧ ، ص ٦٦
[٢٤٠] مجيد الموسوي (الحاج عطية ابو كلل) ص ١٠٣

لەگەڵ بوو فرمانەکانیان جێبەجێ دەکرد. زۆرجار شەڕوپێکدادان لە نێوان زەقرووت و شەمروت رووی دەدا، دوکانەکان دادەخران و خەڵك بەرەو ماڵ رایاندەکرد و تەقەی تفەنگ لەهەموو لایەکەوە دەبیسترا.

**شەڕی نێوان شارەکان:**

شەڕی نێوان شارەکان لەسەردەمی عوسمانییەکان کەم رووی نەدەدا. کاتێك دوو شار دراوسێی یەکتر دەبوون و نێوانیان دوور نەبوو، ئەوا دژایەتی لەنێوانیان لەسەرچەند بابەتێك دروست دەبوو. هەندێك جاریش دژایەتیەکە دەگەیشتە ئاستی کوشتاری یان درێژەی دەکێشا. وەك ئەوەی لەنێوان شارۆچکەی راوە و عانە روویدا. یان ئەوەی لەنێوان بەلەد و دوجیل هەبوو. هەندێك جارییش دژایەتی لەنێوان دوو شاری دوور لەیەکتر روویداوە، ئەمەش لە کاتی بۆنە و رێورەسمە گشتییەکان بووە کە دوو شار تێیدا بەشداری کردووە، وەك ئەوەی لە (چلە) لە نێوان کازمیە و نەجەف روویدا.

نوکتەیەك لەعێراق دەگێڕنەوە، ئەو نوکتەیە ئاماژەیە بۆ توندی نێوان خەڵکی شارۆچکەکانی عانە و راوە. پوختەکەی ئەوەیە پیاوێك لە خەڵکی عانە کتێبێکی کۆن بەزمانی عەرەبی دەخوێنێتەوە، هەر زوو لێرە و لەوەی ئەمەی بەرچاو دەکەوێت " قال الراوی" وادەزانێ لەگەڵ خەڵکی راوەی دایە، زۆر تورە دەبێت و قەڵەم بەدەستەوە دەگرێت هەموو( راوی) یەکان دەسڕێتەوە لەشوێنی ئەوان (العانی) دەنوسێ بۆیە کتێبەکە پڕ دەبێت لە رستەی (قال العانی).

زۆر نوکتە و چیرۆکی دیکە هەیە لەبارەی بابەتی دوژمنایەتی شارەکانی عێراق. لەوانەیە لێرەدا بەسوود بێت تەنها بەکورتی باسی دوژمنایەتی نێوان خەڵکی کازمیە و خەڵکی نەجەف بکەین. ئەو چیرۆکە ماوەیەکی لەمێژە ناوبانگی هەیە، بەم چیرۆکە دەتوانین تەسەوری سروشتی بارودۆخی کۆمەڵایەتی عێراق بکەین لەسەردەمی عوسمانییەکاندا.

**دوژمنایەتی نێوان کازمییە و نەجەف:**

ئەم دوژمنایەتیە لەساڵانی یەکەمی سەدەی بیستەم دەستی پێکرد. هۆکارەکەش ئەوە بوو پیاوێکی کازمییە کاری گواستنەوەی تەرمی مردووانی

دەکرد لە کازمییەوە بۆ نەجەف. ئەو پیاوە بوێر وئازا بووە تفەنگی هەڵگرتووە بۆ ئەوەی بتوانێ لەرێگای نەجەف پارێزگاری لە تەرمەکان بکات. رۆژێك تووشی جەماعەتێکی خەڵکی نەجەف دەبێت، پێکدادان لەنێوانیان روودەدا، پیاوەکەی کازمیە دەتوانێ دوو کەس لەوان بکوژێ، دواتریش بە سەلامەتی بۆ کازمییە دەگەڕێتەوە. دواتر خەڵکی نەجەف ئامادەکاری بۆ تۆڵەکردنەوە دەکەن، پیاوێکی کازمییەیان دەستدەکەوێت دەیکوژن، هەواڵەکە دەگاتەوە کازمییە وسەرۆکی گەڕەکەکان کۆبوونەوە دەکەن بۆ ئەوەی مشتومڕی بابەتەکە بکەن داوا چارەسەر یان تۆڵەکردنەوە بکەن. بەپێی نەریتە عەشایرییە باوەکان.

سەرۆکەکان بەوە گەیشتن لە کازمیە هاوشێوەی نەجەف و زۆربەی شارەکانی دیکە هاوپەیمانیەتی عەشایەر دروست بکەن. وەك دەردەکەوێت کازمیە پێشتر هاوپەیمانی لەو جۆرەی نەبووە، ئەمەش لەبەر نزیکی لەبەغدا و بوونی بارەگای والی و پۆلیس و دەسەڵاتی حکومی. دوای مشتومڕێکی توند لەبارەی ئەوەی کێ دەبێتە شێخی هاوپەیمانێتی سەرۆکی شارەوانی کە جەعفەر عەتیفە بوو دەیویست ببێتە سەرۆك، کەچی سەرۆکەکان بەتوندی بەرپەرچیان دایەوە، بەبڕوای ئەوان جەعفەر دەوڵەمەند وسامانی زۆرە، بەڵام لە هۆزێك و بنەماڵەیەك نییە، تا پاڵپشتی بکات. ئەویش لەمە تورە دەبێت و بەنهێنی دەچێتە لای والی، پێی رادەگەینێ کازمییە بەنیازی یاخیبوونە لە حکومەت، والی دوای ئەوە بەرتیلێکی گەورەی لێ وەردەگرێت باوەڕی پێدەکات، بەمەش والی فرمانی دوورخستنەوەی سەرۆکەکانی کازمەییە دەدات، بۆ ئەنادۆڵ.

هەرچۆنێك بێت ئەو دوژمنایەتییە مایەوە و تۆڵەکردنەوە لەنێوانیان بەردەوام بوو. لەساڵی ١٩٢٩ شەڕێکی سەخت لەنێوان خەڵکی کازمییەو نەجەف لە چلە روویدا لە شاری کەربەلا. پیاوێکی نەجەفی کوژرا بەناوی دەعبول. خەڵکی کازمییە هێرشیان کردە سەر خێوەتی نەجەفییەکان وگوریسی خێوەتەکانیان پچڕاند وقاوەکانیان رژاند، دواتریش روویان لەمەزارگەی عەباس کرد و هوتافی سەرکەوتیان دەکێشا.

من لە کەربەلا بووم کاتێك رووداوەکە روویدا، بینیم رۆژی دواتر خەڵکی کازمییە لە کەژاوەیەکی گشتی دەرکەوتن و هەموو گەڕەکەکان بەیەکەوە بوون، ئەمەش

پێشتر ڕووینەدابوو، چونکە هەر گەڕەکە وکەشاوەی خۆی هەبوو. لەو ڕۆژەدا سنگی خۆیان نەدەکوتا وەك لەنەریتەکە هەیە، بەڵکو دەستیان رادەوەشاند وەك ئەوەی ئاماژە بۆ زاڵبوون و ڕووبەڕووبوونەوە بکەن. هوتافی سەرکەوتنیان دەکێشا و ستایشی خەڵکی کازمییەیان دەکرد[٢٤١]. وەك ئەوە شوبهاندم هۆزێك بن، بەسەر هۆزێکی دیکە زاڵبووبن، بۆیە گۆرانی سەرکەوتن دەڵێن.

لەساڵی ١٩٤٥ هەندێك لەپیاوماقوڵانی کازمییە ویستیان کۆتایی بەدوژمنایەتیە بهێنن کە لەنێوان کازمییە و نەجەف هەیە. شەوێکیان لەماڵی یەکێکیان کۆدەبنەوە، باسی چۆنیەتی ئەنجامدانی سوڵحەکە دەکەن، ناکۆکی لەسەر ئەم بابەتە دروست دەبێت: ئایا دەبێت خەڵکی کازمییە بچێتە نەجەف، یان خەڵکی نەجەف بێتە لەلای کازمییەکان؟ هەموویان لەسەر ئەوە کۆك بوون یەکێك لە شارەزایانی نەریتە عەشایەرییەکان بهێنن بۆ ئەوەی کێشەکە یەکلابکاتەوە.

شێخ حەسەن سوهەیلیان لەخەو بە ئاگاهێنا و بۆ شوێنی کۆبوونەوەکەیان هێنا. شێخ حەسەن شێخی بەنی تەمیم بوو. بڕوای شێخ ئەوە بوو کە ئەو لایەنەی قاوەی ڕشتووە، بچێتەوە لای نەیارەکەی و داوای سوڵحی لێ بکات. سەرۆکەکانی کازمییە بەمە ڕازی نەبوو، بەڵکو وتیان دەبێت سوڵحەکە لە کەربەلا بێت، بۆ ئەوەی خەڵکی کازمییە و نەجەف هەردوو لا بۆ ئەوەی بچن. بەهەرحاڵ کۆبوونەوەکە سەرکەوتوو نەبوو، بێهوودە کۆتایی هات، بابەتی تۆڵەکردنەوەی دەعبولیش هەتا ئێستا وەك خۆی ماوەتەوە– زۆر بەداخەوە!

ئەوەی بچێتە ناو وردەکاری ئەو مەسەلەیەوە، دەزانێ کاریگەری بەهای بیابانشینی لەسەر کۆمەڵگای عێراق چەندە. ئەگەریش لەناوەڕاستی سەدەی بیستەم بەهاکانی بەدو بەمشێوەیە کاریگەری هەبووبێ. ئایا دەبێت سەدەی رابردوو یان پێشتر چۆن بووبێت؟ ئەگەر بارودۆخەکە لەنێو خەڵکی شارەکان بەمشێوەیە بووبێت، ئایا لەنێو خەڵکی هۆزەکان چۆن بووە؟

---

[٢٤١] دکتۆر عەلی وەردی ئاماژەی بەیەکێك لە هوتافەکان کردووە، کە ئەمەیانە ( حي روايا الكواظم حي اهاليها) – وەرگێڕ

## بەشی هەشتەم

## پێکهاتەی کەسێتی لە لادێدا

کەسێتی بەمانا زانستییەکەی بریتییە بە پێکهاتەیەکی دەروونی لەچەند سیفەتێکی جیاوازەوە پێکدێت. ئەو پێکهاتەیە مەیلی بەلای گونجاو تەبابوون هەیە لەگەڵ ئەو رۆشنبیرییە کۆمەڵایەتیەی لەکۆمەڵگاکە باوە. هەر مرۆڤێك کەسێتی تایبەتی خۆی هەیە و بەو کەسێتیە لەخەڵکی دیکە جیادەکرێتەوە. خەڵکیش لەکەسێتی جیاواز دەبن، بەپێی جیاوازی توانای کاردانەوەیە لەگەڵ رۆشنبیرییە کۆمەڵایەتییەکە. جا هەندێك سەردەکەون و هەندێکیش سەرناکەون. لەراستیشدا زۆرینەی خەڵك لەیەك کات سەرکەوتوو وسەرنەکەوتووە. جیاوازییشیان لە رێژەی ئەو سەرکەوتن و سەرنەکەوتنە دایە کە لەپێکهاتەی کەسێتیان هەیە.

ئەو هۆکارە کۆمەڵایەتی و دەروونیانەی هەر لەمنداڵییەوە کاریگەریان لەسەر مرۆڤەکەوە هەیە، وا دەکەن کەسێتیەکەی بەمشێوەیە بێت کە لە گەورەیی بۆمان دەردەکەوت، بۆیە کاتێك مرۆڤێك بەچەند سیفەتێکی خراپەوە دەبینین، ناکرێت گلەیی لەخۆی بکەین، بەڵکو ئەمە ئەنجامی بارودۆخ و هۆکارە دەروونی و کۆمەڵایەتییەکانە. ئەگەر ئێمەش لە بارودۆخی ئەو بووایِن ئەوا ئەگەری زۆری هەبوو ئێمەش ئەو سیفەتانەمان هەبووایە.

بیرمەندانی کۆن پێیانوابوو، مرۆڤ بەپێی پێگەیشتنی عەقڵ ودروستی بیرکردنەوەی سیفەتەکانی باش و خراپ دەبێت. بەڵام دواجار ئەم بۆچوونە لەژێر رۆشنایی توێژینەوە نوێیەکانی زانست هەڵەکەی دەرکەوت. تەنانەت خودی بیرکردنەوەش ملکەچی بارودۆخی کۆمەڵایەتی و دەروونی دەبێت. جا جۆری بیرکردنەوە، بەگوزارشتێکی دیکە بریتیە لە سیفەتێکی کەسێتی. هەروەك خودی

کەسێتیش بەرهەمی بارودۆخی دەوروبەریەتی. پێشتر ئاماژەمان بۆ ئەوەکرد کاتێك مرۆڤ بیردەکاتەوە، بیرکردنەوەی بەو جۆرە دەبێت کە کۆمەڵگاکەی ئاماژەی بۆ دەکات. ئەگەریش بینیمان لە بیرکردنەوەکانی لەکۆمەڵگاکەی لادەدات، ئەوا بۆ کاریگەری هەندێك هۆکار دەگەڕێتەوە لەکۆمەڵگایەکی دیکە هاتووە، جا سەفەر بێت یان خوێندنەوە وبیستن وهۆکاری دیکە بێت، بەڵام ئەو مرۆڤەی کە لە چوارچێوە تەسکەکەی کۆمەڵگای خۆیەتی، ئەوا زێتر لەخۆی کەسی دیکە ناناسێ، بە دەگمەن نەبێت ئەو کەسە لە بیرکردنەوە لەکۆمەڵگاکەی خۆی لانادات[٢٤٢].

**بۆچوونێك و رەخنەیەك:**

عەباسی عەزاوی مێژوونووس، تێبینی ئەوەی کردووە زۆرێك لە هۆزەکانی بەدو ئەوانەی لە بیابانەوە هاتوونەتە عێراق، هەندێك لەسیفەتە پەسەندەکانیان لەدەست داوە، وەك راستگۆیی و راشکاوی و پاراستنی راسپاردەیی، وەك دەزانرێت لەبەرامبەر ئەمە پابەندن بەنەریتەکانی کۆنی بیابانشین وەك داگیرکاری و دەمارگیری و تۆڵەکردنەوە. جا عەزاوی بروای وایە دەکرێت رێنمایی بەو هۆزانە بدرێت و ئاراستە بکرێن، لەرێگای خوێندن وپێگوتنەوە، تا واز لە سیفەتە ناپەسەندەکانیان بهێنن و پارێزگاری لە سیفەتە پەسەندەکانیان بکەن[٢٤٣].

لەراستیدا ئەو بۆچوونەی عەزاوی لەرووی تیۆرییەوە جوانە، بەڵام لەرووی کردارییەوە، جێبەجێکردنی سەختە، یان رەنگە مەحاڵ بێت. خوێندن و پێگوتن زهنی مرۆڤ پڕدەکات لەبیرۆکەی بەرز، بەڵام ناتوانێ کاریگەری کردەیی لەسەر کەسێتی مرۆڤەوە هەبێت. کەسێتی بەرهەمی بارودۆخی واقیعیانەیە، وەك پێشتر ئاماژەمان بۆکرد، ئەگەرهاتوو مێشکی مرۆڤێکمان پڕکرد لەبیرۆکەی بەرز، کەچی هەوڵی گۆڕینی بارودۆخی واقیعی کەسەکەمان نەدا، ئەمەش دەبێتە هۆی دەرکەوتنی هەندێك سیمای دووفاقی لەکەسێتی ئەودا. جا کەسەکە لەو

---

[٢٤٢] ئەمە بابەتێکی گرنگ بوو لەبابەکەکانی کۆمەڵناسی نوێ، لە مەنهەجی پۆلی چواری بەشی کۆمەڵناسی زانکۆی بەغدا دەخوێندرا، زیاتر لەدە ساڵ لەسەر یەك ئەو وانەیەم دەگوتەوە، کەچی دواجار لابرا – زۆر بەداخەوە – عەلی وەردی

[٢٤٣] عباس العزاوي (عشائر العراق) ج ٣، ص ١٩-٢٣

بارودۆخەدابە گوفتار ئەو قسە بریقەدارانە دەکات کە فێرمان کردووە، لەژیانی کرداریشدا بەپێی بارودۆخی خۆی پێچەوانەی ئەو قسانە کاردەکات"[٢٤٤]. بۆیە ئەو کەسە راستی کردووە کە گوتویەتی " بارودۆخی مرۆڤێك بگۆڕە، ئاکارەکەی دەگۆڕێت".

**بارودۆخی لادێی عێراق:**

ئامانجی باڵای هەر تاکێکی هۆزەکانی عێراق ئەوەیە سەراپای بەهاکانی بیابانشینی پەیرەو بکات. هەموو ئەو بەهایانەش لە لادێدا پەیوەندیان بەشانازیکردن و داشۆرینەوە هەیە. ئەمەش مانای ئەوەیە ئەو بەهایانە مەیلێکی بەهێز بەو تاکانە دەدەن، بۆ نزیك بوونەوە لە سیفەتەکانی شانازیکردن و دوورکەوتنەوە لەسیفەتەکانی داشۆرین. بەڵام کێشەکە ئەوەیە بارودۆخی لادێ لەعێراق بەشێوەیەکە تاك زۆر یان کەم ناچار دەبێت لەبەهاکانی بیابانشین لابدات.

بەشێوەیەکی رێژەیی ئەو بارودۆخەی لە لادێی عێراق هەیە، لە بیابان بوونی نییە. ئەگەر بزانین ئەو بەهایانەی بەدو کە لە بیابان پەیدابووە ولەگەڵ ژیانی ئەوێ گونجاوە، ئەو درك بەکێشەی ئەو بەهایانە دەکەین کاتێك بۆ لادێی عێراق دەگوازرێنەوە.

دەکرێت بارودۆخی لادێ بەمشێوەیەی خوارەوە پوخت بکەینەوە:

١- بوونی دەسەڵاتی حکومەت. هەر چەندە ئەو دەسەڵاتە لەسەردەمی عوسمانییەکان لاواز بووە، بەڵام بەهەرحاڵێك بێت بوونی هەبووە و کاریگەرییەکی تەواوی لەسەر کۆمەڵگای لادێی هەبووە.

٢- بوونی ئەو بازاڕانەی بەرهەمە کشتوکاڵییەکانی تێدا دەفرۆشرێت. لادێیەکان لەو بازاڕانە پێداویستی خۆیان دەکڕی، ئەوانەی سوو (ربا)یان دەدا، کاریگەری زۆریان لەسەر ئەو بازاڕانە هەبوو.

---

[٢٤٤] لەبەشی داهاتوودا بابەتی دووفاقی کەسێتی عێراقی بەکورتی باس دەکەین، بەڵام لەکتێبی داهاتوودا بە وردی باسی دەکەین بەناونیشانی ( دووفاقی کەسێتی لەعێراق لەسەردەمی کۆن و نوێدا)، عەلی وەردی

٣- دەرکەوتنی سەرەتاکانی دەربەگایەتی لە لادێ، بەشێوەیەك هەندێك لەسەرۆك هۆزەکان و سەرۆکی یەکێتیانی هۆز ستەمیان لەلایەنگرانیان دەکرد و مەیلیان بۆ خۆشگوزەرانی هەبوو.

٤- دەرکەوتنی پاڵنەری قازانج و خۆشەویستی سامان لەلای هەندێك لەلادێییەکان، بەتایبەتی ئەوانە پەیوەندیان بەبازاڕ وشارەکانەوە هەبوو، ئەوان دواتر دەبوون بە بەقاڵ یان (سوو)بەخش، یانیش لەهەندێك وەرز دەبوون بەکرێکار.

٥- بڵاوبوونەوەی هەندێك نەخۆشی لە لادێ، لەوانە مەلاریا و بیجل و مێزی خوێناوی و سکچوونی خوێناوی و سیل و نەخۆشی کرمە جیاجیاکان.

٦- چەوسانەوەی ژنانی لادێ، ناردنیان بۆ بازاڕەکان بۆ کڕین وفرۆشتن، دواجاریش ئەو ژنانە کاریگەردەبوون بە رەفتاری شارستانەکانەوە، هەندێکجاریش بەرەو بەدڕەوشتی دەڕۆیشتن.

**میوانداری لەلادێ"**

شێخی لادێی هەوڵ دەدات لە هەموو بەها وئاکارەکانی لەشێخی بەدو بچێت. ئەو دەیەوێ ئازا و بەخشندە بێت و دراوسێ و لێقەوماو پەنابەر و لاواز بپارێزێت، لە دیوەخانەکەی دادەنیشێ بۆ ئەوەی کێشەی هۆزەکەی چارەسەر بکات. ئەو لەجەنگدا سەرکردایەتی هۆزەکەی دەکات و لە دانوستاندنەکانیش نوێنەرایەتی دەکات، بەڵام شێخی لادێ تا چەند دەتوانێ لاسایی شێخی بەدو بکاتەوە؟

یەکەم رووخساری لەیەکچوونی نێوان شێخی لادێ و شێخی بەدو لەبەهای میوانداری دایە. لەگەڵئەوەشدا دیوەخانی شێخی لادێ رەشماڵێکی گەورە نییە وەك ئەوەی لە بیابان هەیە، بەڵکو وەك ئەوەی ستین لوید وەسفی کردووە، زیاتر لە هەیکەلە کۆنەکانی سۆمەر دەچێت. دیوەخانەکە بەقامیش و قوڕ دروست دەکرێت، ژمارەی چەمانەوەی سەری دیوەخانەکە بەپێی پێگەی شێخ و نەریتی بنەماڵەکەی دەبێت. ناکرێت شێخی لادێ کرێکاری پیشەگەر بۆ دروستکردنی دیوەخانەکەی بگرێت، بەڵکو داوا لەرۆڵەکانی هۆزەکەی دەکات هاریکاری یەکتر بکەن لەدروستکردنی، شێخیش تەنها لەسەریەتی خواردنیان پێ بدات.

سەرەڕای ئەمەش دیوەخانی لادێ لەرووی نەریت و بەها کۆمەڵایەتییەکانەوە هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ دیوەخانی بەدو نییە. لەدیوەخانی لادێیش بەپێی نەریتەکان قاوە پێشکەش دەکرێت، خواردن بەهەموو میوانێك دەدرێت، هەر کێیەك بێت. هەرچەندە میوانەکە پێگەی کۆمەڵایەتی بەرزتر بێت ئەوا ژمارەی کوشتییەکان بۆ ئەو زیاتر دەبێت. کاتێك خەڵکی گوندەکە گوێیان لە دەنگی ئاونی قاوەچی دەبێت، ئەوا دەزانن میوانێك هاتۆتە لای شێخەکەیان. جا بۆ بەخێرهێنانی دەچنە دیوەخان و چاوڕێش دەکەن وەك رێزلێنانێك لەمیوانەکە بەشداری خوانەکەی بکەن.

خەڵکی گوند هیوای ئەوە دەخوازن میوانەکەیان پایەی بەرزبێت بۆ ئەوەی خواردنەکە زۆرتر بێت. لەوکاتەشدا ئەوان گۆشت و برنج و چەندین جۆری دیکەی خواردنی چەوریان بەردەکەوێت، کە دەگمەن نەبێت ئەگینا لە ماڵەکەی خۆیان نایخۆن. شێخی لادێ هەرچەندە خواردنەکەی لە دیوەخان زۆرتر وچەورتر بێت، ئەوا ناوبانگی بەرزتر دەبێت وەهەواڵی دیوەخانەکەی بەربلاوتر دەبێت. بۆ نموونە دەگوترێت مەشتەتی خەلیفە، کە شێخی ئەلبو محەمەد بووە، سی ساڵ دوای مردنی خاکی دیوەخانەکەی گژوگیای لێ نەڕواوە لەبەر زۆری ئەو روون و چەورییەی لەپێشکەشکردنی خواردن بۆ میوانان رژاوە[٢٤٥]. بنەماڵەیەك لە ئال فتلە هەیە بەناوی (ئالبو هدلە) ناسراون چونکە وشەی (یهدل) بەواتای دەرژێت و شۆڕدەبێتەوە. ئەمەش لەبەرئەوەی خواردن لەسەر قاپەکان رژاوە لەدیوەخانەکەیاندا[٢٤٦].

نزیکەی بیست ساڵێك لەمەوبەر، چەند پیاوماقوڵێکی ئێران سەردانی یەکێك لەهۆزەکانی فوراتی ناوەڕاستیان کرد، لەلای شێخەکەی میوان بوون. شێخی برێکی زۆر خورادنی پێشکەشکردن بەشی سەدان کەسی دەکرد. ئێرانییەکان سەریان لەمە سوڕمابوو، نەیادەزانی هۆکارەکە چییە. لەڕاستیدا شێخ ئەو خواردنە زۆرەی وەك رێزێك پێشکەشکردوون ، بەپێی نەریتی لادێی عێراقی

٢٤٥ محمد باقر الجلالي (موجز تاريخ عشائر العمارة) ص ١٥
٢٤٦ أ ، س، ح ( آل فتلة كما عرفتهم) ص ٥٥

بەئەرکی خۆی هەڵساوە. ئەو خواردنە بەخەسار ناچێت، خەڵکی لادێکە لێی دەخۆن و سکە بەتاڵەکانیان لەو خواردنە پڕدەکەن. کەواتە میوانداری لە لادێ وەك بیابانشینی ڕۆڵێکی گرنگی کۆمەڵایەتی هەیە. شێخ بەو میوانداریە ناوبانگ پەیدا دەکات و پیاوەکانیشی خواردنی بەتام دەخۆن.

ئەحمەد فەهمی دەڵێ: زۆرینەی خەڵکی لادێی لەعێراق لەحاڵەتی نەداری و بێبەشی دەژین، تامی گۆشت ناکەن تەنها ئەوکاتە نەبێت شێخی میوانێکی بەرێزی دێت. ئەوکاتەش هەموو دەوری میوانەکە دەدەن، بێئەوەی کەس بانگیان بکات. کاتێکیش بۆ خواردن بانگ دەکرێن، ئەوا بەرەو خواردنەکە ناچن، تەنها دوای ئەوەی چەند جارێك دەگوترێت " دەی، دەی، هەڵسە فلان". ئەوان وانیشان نایانەوێ، سەنگینی دەنوێنن، ئەمەش دیاردەیەکە جێگای سەرنجە[٢٤٧].

ئەوان بە مەبەستی خواردن هاتوونەتە دیوەخان، بەڵام نەریتی بەدوییان هانیان دەدات ئەو مەبەستەی خۆیان بشارنەوە. ئەوان وای دەردەخەن، بۆ بەخێرهاتنی میوان هاتوون، کەچی سکیان ئارەزووی خواردن دەکات، لەپێناوی خواردندا قۆڕەی سکیانە.

لەم لایەنەوە پیاوی لادێ لە ململانێیەکی دەروونی دەبێت، بەدەست چەندین جۆری دیکەشەوە دەناڵێنێ، کە دواتر باسی دەکەین. ئەو لەبیابانشینی لەسەر نەفس بەرزی و لوتبەرزی ڕاهاتووە، کەشی بارودۆخی خراپی بژێوییەکەی لە هەندێك حاڵەت وادەکات چاوبرسی و ملکەچ بێت.

**خۆدەخیلکردن لە لادێدا:**

شێخی لادێی دەیەوێ بەپاراستنی دراوسێ وکەسی دەخیل و داڵدەدراو بەناوبانگ بێت، وەك چۆن دەیەویست بە بەخشندەیی و میواندۆستی ناوبانگی هەبێت. زۆرێك بەسەرهات لەبارەی (خۆدەخیلکردن)[٢٤٨] دەگێڕدرێتەوە لەلادێدا هەروەك ئەوەیە کە لەبیابانشینیدا هەیە.

---

[٢٤٧] أحمد فهمي (تقرير حول العراق) ص ٢٤

[٢٤٨] بۆ وشەی (الدخالە) ئێمە وشەی (خۆ دەخیلکردن) مان بەکارهێناوە، ئەم وشە هەرچەندە لە عەرەبییەکە وەرگیراوە. بەڵام بەکارهێنانی لەناو کوردواری و تەنانەت بەکارهێنانی لەچەند تێکیستێکی بەناوبانگی شیعری کوردیدا وایکرد ئێمەش لێرەدا بەکاری بهێنین – وەرگێڕ

دەگێڕنەوە پیاوی هۆزێکی لادێی، خۆی دەخیلی شێخی هۆزێکی دیکە دەکات، وا ڕێکدەکەوێت کوڕی شێخ بکوژی کوڕی ئەو پیاوەیە کەخۆی دەخیلی شێخ کردووە. پیاوەکە ئازار دەچێژێ و دەیەوێ ئەو هۆزە جێبهێڵێت کە کوڕەکەی کوشتووە. بەڵام کاتێك شێخ بەمەدەزانێ زۆر تورە دەبێت وهەست بەو نەنگییە دەکات کە لە ئەنجامی ڕۆیشتنی کابرا تووشی دەبێت، بۆیە بەپەلە کوڕەکەی دەکوژێ. داواش لەپیاوەکە دەکات لە دەخیلبوون بمێنێتەوە مادامەکی تۆڵەی کوڕەکەی کردۆتەوە[٢٤٩]. شێخ کوڕەکەی لەدەستدا، بەڵام لەنێو هۆزەکاندا شانازی پێبرا. ئەگەر ئەو ملکەچی سۆزی باوکایەتی دەبوو وپارێزگاری لەژیانی کوڕەکەی دەکرد ئەوا ناوبانگی دەزڕا وبێزراو دەبوو.

لێرەدا دەوەستین بۆ ئەوەی بپرسین: ئایا شێخی لادێ لە هەموو حاڵەتەکان وەك شێخی بەدو دەتوانێ داڵدەی ئەو کەسانە بدات کە خۆی دەخیل دەکەن؟ لەراستیدا شێخی لادێ لەمەدا بەپێی توانا هەوڵ دەدات وەك شێخی بەدو بێت، بەڵام هەندێك جار کەم توانا دەبێت بەهۆی بوونی حکومەتەوە. ئەگەرهاتوو کەسێك لە حکومەت رابکات و خۆی دەخیلی یەکێك لە شێخەکان بکات، ئەوا حکومەت هەڕەشە لەشێخ دەکات و داوای رادەستکردنەوەی پیاوەکە دەکات. شێخ لەو کاتەدا چی دەکات؟ دەکەوێتە نێوان دوو ئاگرەوە. ئەگەر پیاوەکە رادەستی حکومەت بکاتەوە ئەوا تووشی شەرمەزاری دەبێت، ئەگەریش موکڕبێت لەسەر حەشاردانی پیاوەکە ئەوا حکومەت تۆڕە دەبێت. شێخەکانیش لە هەڵبژاردنی ئەو دوو هەڵوێستە جیاوازیان هەیە. هەندێك شەرمەزاربوون لە تورەیی حکومەت بەگرنگتر دەزانن، هەندێکی دیکەش بەپێچەوانەوە.

حاجی ودای عەتیە دەگێڕێتەوە. حکومەت بەسەر یاخیبوونەکەی موتلەگ کرێدی شێخی خەزاعل زاڵ دەبێت و لەهەر شوێنێك راویدەنێ. بۆیە موتلەگ خۆی دەخیلی نوسەیف بن دەرویشی شێخی رەبیعە دەکات. کەچی شێخ نوسەیف پشتی تێدەکات و رادەستی حکومەتی دەکات. پاساوی ئەوەش دەهێنێتەوە گوایە حکومەت ناچاری کردووە. کەچی خەڵك ئەو پاساوە قبوڵناکەن. بەمەش

---

[٢٤٩] احمد فهمي (المصدر السابق ) ص ٢٦-٢٧

خۆی و هۆزەکەی رووڕەش وشەرمەزار دەبن. دواجار هۆزی خەزاعل توانی تۆڵە لە رەبیعە دەکەنەوە و هێرشی دەکەنە سەر و پیاوانی دەکوژن و تاڵانی دەکەن. دوژمنایەتیەکە بە ناوبژیوانی هەندێك لەسەرۆکەکانی زوبەید کۆتایی هات، رەبیعە خوێنی خەزاعلی دا[٢٥٠]..

بەسەرهاتێکی دیکە هەیە تەواو پێچەوانەی بەسەرهاتەکەی سەرەوەیە. لەساڵی ١٩٢٧ عەبد عباس مەزهەر لە هۆزی ئال فتلە براکەی خۆی کوشت، خۆی دەخیلی یەکێك لە شێخەکانی بەنی روکاب کرد، شێخ ئەو پیاوەی لە پۆلیس پاراست، تەنانەت ناچار بوو ئەو پیاوە لەگەڵ خێزان و ژنەکان حەشار بدات[٢٥١].

**دەرکەوتنی ستەمکاری لەنێو شێخەکاندا:**

کاتێك بەراوردی نێوان شێخایەتی بەدو، شێخایەتی لادێییەکان دەکەین، تێبینی دەرکەوتنی هەندێك جیاوازی لەنێوانیان دەکەین، بەتایبەتی دوای توندبوونی دەسەڵاتی حکومەت لە لادێکانی عێراق، لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەمەوە. یەکێك لەو جیاوازیانە ئەوەیە شێخی لادێی زۆر یا کەم مەیلی بەلای ستەم وزۆرداریییەوە هەیە. ئەمەش بەپێچەوانەی شێخی بەدوە. شێخی بەدو ناتوانێ ستەمکار و چەوسێنەری رۆڵەکانی هۆزەکەی بێت، یان لەمامەڵەکردنیان دڵرەق بێت. ئەگەر وا بکات ئەوا ئەندامانی هۆزەکەی پاشکشەی لێ دەکەن و لەدەوری براکەی یان ئامۆزەکەی کۆدەبنەوە، لەشوێنی ئەو دەیکەن بە شێخ. بۆیە شێخی بەدو وەك ئیبن خەلدون وەسفی دەکات، پێشڕەوی دەکات و ستەمکار نییە. ئەو ماقوڵی و سەرۆکایەتی خۆی لەوە وەردەگرێت هۆزەکەی بەدەوریییەوە بن، رێزی بگرن. ئەو هێزی نییە، پاسەوانی تایبەتی نییە، تا بەهۆی ئەوانەوە فرمانی خۆی بەسەر هۆزەکە بسەپێنێ.

کەچی لە لادێی عێراق، حاڵەتەکە لەلای هەندێك شێخ گۆڕاوە، بەتایبەتی لەلای ئەوانەی سەرۆکایەتی هۆزەکان و یەکێتی هۆزە گەورەکان دەکەن. ئەو جۆرە شێخانە بەڵێنیان بەحکومەت داوە پابەندی وەرگرتنی باج بن، لە هۆز و عەشیرەت

---

[٢٥٠] وداي العطية (تاريخ الديوانية) ص ٤٩-٥٠.
[٢٥١] عبدالجبار فارس ( عامان في الفرات الاوسط ) ص ١٠٢-١٠٣

و بنەماڵەکان. لەبەر ئەمەش ژمارەیەك پاسەوانی تایبەتی بۆ دروست دەبێت، ژمارەیەکی زۆر کۆیلەی دەبێت، بۆ ئەوەی هاوکاری بکان لە کۆکردنەوەی باج و وەرگرتنی سزا لەو کەسوکاری هۆزەکان.

تەنانەت هەندێك لەشێخە گەورەکان زیندان و ئامێری ئەشکەنجە وسزادانیان هەیە. ئەوان تاوەر بۆ ئامانجی جەنگ دروست دەکەن و بە (مەفاتیل) ناوی دەبەن. فەیسەڵ خەلیفە کە شێخی ئەلبو محەمەد بوو توانای شارەزایان بهێنێ بۆ ئەوەی تۆهاوێژی بۆ دروست بکەن. شێخی محەمە عورەبی ژمارەی پاسەوانە چەکدارەکانی دەگەیشتە ٥٥٠ پیاو، بە (حوشیە) ناودەبران. ئەو پیاوانە هیچ کارێکیان نەبوو تەنها جێبەجێکردنی فرمانەکانی شێخ و کۆکردنەوەی سامان نەبێت[٢٥٢].

هەندێك لەشێخەکان دوودڵ نەبوون لەوەی سزای توندی ئەوکەسانە بدەن، سەرپێچی فرمانەکانیان دەکەن و کەمتەرخەم دەبن لەپێدانی سەرانە. بە نموونە وادی شەفلەح زوبەید هەبوو، حکومەتی عوسمانی لەساڵی ١٨٣٣ وەك سەرۆکی گشتی هۆزەکانی فوراتی ناوەڕاست دەیمەزراندبوو. مەلا جاسمی هیندی وەك نووسەر لەلای دامەزرابوو. شێخ وادی بەخشندەیی حاتەمی تەی هەبوو. بۆیە سەرنجی هۆزەکانی راکیشابوو. بەڵام زۆر دڵڕەق بوو لەکۆکردنەوەی سەرانە. تەنانەت ستەمی ئەو گەیشتە ئەو حاڵەتی لەناوچەکەی درکی خەڕنووکی کۆکردبووە، ئەو شێخانەی دەهێنا کە سەرانە و باجیان دواخستبوو، جا فرمانی دەکرد وەك کەر وبارگیر ببەسترێنەوە ئینجا خەڕنوکەکانی پێ گێرە دەکردن. ئەمەش وەك ئەشکەنجدانێك و سوکایەتی پێکردن[٢٥٣].

وەك دەردەکەوێت شێخە گەورەکان بەپاڵپشتی حکومەتەوە، بەو ئاستەی ستەمکاری گەیشتبوون. حکومەتی عوسمانی لەناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەوە، لەزۆرکاتدا توانای دانان و لادانی شێخەکان هەبوو. هەندێك جار شێخ پێویستی بە فەرمانی سوڵتانی هەبوو، بۆئەوەی ببێت بە شێخ. حکومەتیش باکی بەوە نەبوو

[٢٥٢] محمد باقر الجلالي (المصدر السابق) ص ١٥٤
[٢٥٣] وداي العطية ( المصدر السابق) ٤٠ ـ٤٢

کیّ لە ناوچەکەی ژێر دەسەلأتی خۆی بکات بە شێخ، تەنها ئەوەبوو کەمێك یان زۆر باج و سەرانەکانی بۆ کۆبکاتەوە، رێز و گوێڕایەڵیشی بۆ فەرمانبەرانی دەوڵەت هەبێت.

لە رۆژنامەی رەقیبی رێکەوتی ٢٥ی شوباتی ١٩٠٩ هاتووە: حکومەت بەشێك لە زەوییەکانی هۆزی جوحەیشی بە شێخی ئەلبوسوڵتان داوە. ئەو کارەش جوحەیشی هانداوە ئامادەکاریی بکەن بۆ شەڕکردن لەگەڵ ئەلبو سوڵتان، حکومەت بایەخ بەمە نادات و قایمقامی ناوچەکە وتویەتی (**باسهم بينهم**) واتە ئەوەی لە نێوانیان بێت خراپترە. لە ئەنجامی ئەمەش شەڕ لەنێوان دوو هۆزەکە روویداوە هەزار یان زیاتر کوژراو و بریندار هەیە[٢٥٤].

دەتوانین بڵێین شێخی لادێ لە بارودۆخێکی وەها هەندێك لە سیمای دووفاقی کەسێتی هەبووە، بەهاکانی بیابانتشین لەلایەکەوە هانی دەدەن بەرەو شەهامەت و مروەت بڕوات، لە لایەکیش دەسەلأتی حکومەت بەرەو ستەم و زۆرداری دەبات. وەك دەردەکەوێت شێخەکانیش جیاوازیان لە پلەی ئەم دووفاقییە هەبووە، هەندێك زیاتر مەیلی بەلای مروەتەوە هەبووە، هەندێکیش مەیلی بۆ ستەمکاری زیاتر بووە.

**ئاکاری شێخەکان:**

هەرچۆنێك بێت بەشێوەیەکی گشتی شێخی لادێ مەیلی بەلای رابواردن وکوشکێشی کردن بوو بۆ حکومەت. بەرە بەرە ئاکاری سەربەرزیی و راشکاوی کە لەلای پێشینانی هەبوو، فەرامۆشی دەکردن، لەبەرامبەردا ماستاوچێتی لەنێوان شێخەکان بڵاودەبۆیەوە. تەنانەت قسەی هێمادار، ماناشاروە، لەنێویان بڵاودەبۆیەوە کە لە لای ئەوان بە( حەسچە) دەناسرا. لەو بارەیەوە جەعفەر خەلیلی دەڵێ: ئەو جۆرە قسەکردنە وەك نەریتێك تایبەتە بەشێخەکان، هەندێکیان هونەرکاریی تێدا دەکەن، خوازە و پەندی تێکەڵ دەکەن، بەشێوەیەکی ناراستەوخۆ ئامانجەکانیان دەپێکن. تەنانەت ئەگەر بیانەوێ وەسفی یەکێك بە قسەزان و زیرەك و نوکتەچی وەسف بکەن دەڵێن" کەسێکی حەسچاوییە". ئەوان

[٢٥٤] عبدالله الفياض (الثورة العراقية الكبرى) ص ٢٤

مانای راستەقینە لە قسەی حەسچە دەدۆزینەوە، ئەگەر کەسێکیش لەو جۆرە قسەیە نەگات، ئەوا بە دەبەنگی وەسف دەکەن[٢٥٥].

زۆرێك لەشێخەکان تێکەڵی ژیانی رابوردن و لەزەت بوون، جا رەوا یان نەرەوا بێت. خانووی مەزن لەتەك دیوەخانە قامیشیەکەیان دروست دەکرد، لەوانە هەندێکیان خانووی گەورەیان لە شارەکان هەبوو. هەندێکیان کچی جوانیان بۆ خۆیان دەستنیشان دەکرد، جا خۆیان و کەسوکاریان رازی بن یان نا. لەوانەش هەندێك لە ئەنجامی کۆکردنەوەی پارەیەکی زۆر لە رێگای سەرانەوە بەرەو ئەو رێگایەی بردن.

بۆ نموونە دەگوترێت شێخ مبدر فرعون لە ئال فتلە، خەریکی رابوردن بووە پارەیەکی زۆریشی لەو پێناوە سەرف کردووە، عەلی بازرگان لەو بارەیەوە دەڵێ هەموو شەوێك ٥٠ لیرەی زێری لە سەماکەر و لەشفرۆشەکان خەرج کردووە[٢٥٦]. لەوە دەچێ ئەو زانیاریە زێدەرۆیی تێدا کرابێت، لەگەڵئەوەشدا خاڵی نییە لەهەقیقەت. من لە بارەی هەندێك شێخم بیستووە کە زۆر پەرۆشی سەماکەری قەرەج بوون، تەنانەت شەوێکیان لەکاتی سەماکردن کە رووناکی دەکوژێتەوە، ئەو پارەی کاغەز دەسوتێنێ بۆ ئەوەی رووناکی هەبێت.

نکۆڵی لەوە ناکەم ئەو بابەتە لە نێو شێخەکانی سەردەمی عوسمانی کەم روویداوە، بەلام سەرەرای کەمییەکەی ئاماژەی دەرکەوتنی گۆرانکارییە لە سروشتی شێخەکانی لادێ. ئەو گۆرانکارییەش زیاتر بوو دوای دانانی ئەو یاسایەی ١٩٣٢ کە بەیاسای (التسویە) ناسراوە. حکومەتی عێراق لەو کاتەوە دەستیکرد بە پێوانەکردن و دیارکردنی زەوییەکان و بەناوی شێخەکانیشی تۆماردەکرد. لەمەوە شێخە مەیلی جێهێشتنی لادێی، دانیشتنی پایتەخی هەبوو، بۆیە دەستیان کرد بە تێکەڵبوون لەگەڵ ئەفەندییەکان، بەرەبەرە لە ژیانی خۆشگوزەرانی لاسایی ئەوانیان دەکردەوە. ئەمەش بابەتێکە لە کتێبی داهاتوو بەوردی دەچینەوە سەری.

---

[٢٥٥] أ.س. ح. ( المصدر السابق) ص ١١٠

[٢٥٦] علي آل بزركان (الوقائع الحقيقية في الثورة العراقية) ص ٣٤

**ئاکاری جووتیاری عێراق:**

کاتێک ئاکاری شێخەکانی لادێ دەگۆڕێت، ئەوا دەبێت ئەوانەی بەدوای کەوتوون کاریگەربن پێی و لاسایی بکەنەوە. لەوانەیە زێدەڕۆیی نەکەن ئەگەر بڵێم ڕۆڵەی هۆزەکان زۆرتر لە شێخەکان ئاکاریان گۆڕا و ئاکاری پێشوویان هەڵوەشایەوە. جووتیاریش کەوتبووە ژێر فشارێکی توند کە وایلێکردن ئاکاری کۆنی بیابانشینی فەرامۆش بکات. ئەو فشارەش لەچەندین لایەنەوە هات بەمشێوەیەی خوارەوە پوختی دەکەینەوە:

١- فشاری فەرمانبەران و ئەو کەسانەی سەرانەیان کۆدەکردەوە: یەکێك لە گرنگترین ئەو بابەتانەی جووتیاری عێراقی لە ژیانی لێی دەترسا، ئەوە بوو فەرمانبەران و ئەو کەسانە بێت سەرژمێری ماڵاتەکەی بکەن و مەزندەی بەروبوومە کشوکاڵییەکەی بکەن بۆ ئەوەی سەرانەی لەسەر دابنێنن. بۆیە جووتیارەکە هەوڵ دەدا لە دەستیان رابکات یان درۆیان لەگەڵ بکات بۆ ئەوەی هێندەی بتوانێ باجەکە نەدات. ئەو سوێندی بەپیرۆزترین شت دەخوارد بۆ ئەوەی لەو بارەیەوە باوەڕشی پێ بکەن، وا راهاتبوو لەبەرامبەریان زەلیل و ملکەچ بێت و گێچەڵ و سووکایەتیان قبول بکات، نارەزایی دەرنەبرێت یان بیانو نەگرێت.

جووتیاری عێراقی لەبەرامبەر هاوشانی خۆی لەهۆزەکەیدا نەفس بەرز و لوتبەرزە، بەڵام هەرکە فەرمانبەرێك حکومەتی لێ دەرکەوێت ئەوا کەسێتییەکی دیکە وەردەگرێت، چونکە ناتوانێ لەگەڵ حکومەت لوتبەرز بێت چونکە تووشی توندترین بەڵا دەبێت.

کێشەی ئەم جووتیارە ئەوەیە تەنها لەفەرمانبەرانی حکومەت ناترسێ، بەڵکو لەپیاوانی شێخە گەورەکانیش دەترسێت هەموو ئەوانە لە توانای خۆی، زێتر داوای لێ دەکەن، کەواتە دەبێت سیفەتی درۆ و ماستاوچیەتی و سوێندی بەدرۆی هەبێت، یانیش خۆی هەژار دەربخات، بۆ ئەوەی خۆی لە هەندێك کارەسات لابدات. کارەساتیش لەساڵی ١٩٣٥ وە بەسەر ئەو جووتیارانەوە زیاتر بوو کاتێك حکومەت سەربازی ئیجباری فەرز کرد، بەمەش کەوتنە نێوان فشارێکی

سێگۆشـەیی، هەرلایـەك لەوانـە پـاڵی دەنـا بـۆ هەڵوەشـاندنەوەی ئاکارەکـانی پێشووی.

٢- فشارێکی دیکە هەیە لە ئەنجامی هەژارییەکی کوشندە دەکەوێتـە سـەر جووتیارەوە. جووتیاری خۆی زەوییەکی مولکی نییە. بـەڵکو لـە پارچـە زەوییـەك کار دەکات کە شێخ بۆی تەرخان دەکات، جا بـەروبومی کشتوکاڵی دەبێـت سـێ بەش: بەشێك بۆ شێخ دەچێ، بەشی دووەم بـۆ حکومـەت، بەشـی سـێیەم تـەنها ئەوەیان بەشی جووتیارەکەیە[٢٥٧]. ئەمەش بەشێکی زۆر کەمە، بەشی بژێوی خـۆی و خێزانەکەی ناکات، بۆیە ناچار دەبێت لـە بەشـەکانی حکومـەت و شـێخ بـدزێت، زۆرجاریش ئەمەی دەکرد.

ئەمجۆرە دزییە وەك نەریتێکی لێ هاتبوو لە ئاکاری جووتیارەوە ریشـەی داکوتـا بوو، نەیدەتوانی خۆی لێ بپارێزێت. ئەمە بۆ ئەو پێویست بوو، بۆنـەوەی خـۆی و خێزانەکەی لەژیان بمێننەوە. ئێمە بە خەیانەتی دەزانین کەچی ئـەو بەپێویسـتی بژێوی دەزانێ.

بەسـەرهاتێکی خـۆش هەیـە لەوبارەیـەوە، دەگێڕنـەوە کـە سـەیدێکی عەمامـە بەسەر لە نـەوەی پێغەمبـەر پارچـە زەوییـەکی هـەبوو، داوای لـە جووتیـاران کـرد کاری لەگەڵ بکەن. جووتیارەکانیش وەك نەریتەکەی خۆیان، چۆن لە شێخ دزیـان دەکرد، ئەوهاش دزی وخیانەت لـە سـەید دەکـەن. سـەید بـە خیانەتەکـەی ئـەوان دەزانـێ و نـزا دەکـات خـودا سـزاییەکی توندیان بـدات. وا رێکـەوت رۆژی دواتـر گەورەی ئەو جووتیارانە مرد، بۆیە هەموو جووتیارەکان لە زەوی سەید رادەکـەن، چونکە خـودا بـە پەلـە دوعاکـانی قبـوڵ دەکـات. ئـەو هەواڵـە لـە نێـو هۆزەکـان بڵاودەبێتەوە، دواتر کەسێك ناوێرێ لە زەوییەکەی سـەید کـار بکـات، بۆیـە سـەید ناچار دەبێت واز لەکشتوکاڵ بهێنێ و کارێکی دیکە بکات. ئـەو درك بـەوە دەکـات دەتوانێ لە نێو هۆزەکان ببێتە پیاوێکی پیرۆز، خەڵك داوای نزای لێ بکەن و نەزری بۆ بکەن، بەڵام ناتوانێ خاوەنی زەوی بێت و لەگەڵیان کشتوکاڵ بکات.

---

[٢٥٧] أحمد فهمي (المصدر السابق) ص ١١٠-١١١

دەبێت ئەوەمان بەبیربێت ئەو جۆرە خیانەتی جووتیاری عێراقی لێی راهاتووە، بوونی لە بیابانشینی دەگمەنە، بەدو دەیەوێ رووبەروو لە رێگای هێز و زاڵبوون و ئازاییەتی تالاّن بکات، ئەو قبوڵ ناکات لە رێگای خیانەت و فێڵبازییەوە دزی بکات، چونکە ئەمە لە تێروانینی ئەو سیفەتی بێدەسەلاّت وزەلیلەکانە.

٣- فشاری سێیەمیش هەیە، جووتیاری عێراقی دەکەوێتە ژێر بارییەوە، ئەویش فشاری ریباچی و دوکاندارەکانی گوند و شارە نزیکەکانە. لەو شار وگوندانە کەسانێك هەن بەچەوساندنەوەی جووتیاران دەژین و سامان کۆ دەکەنەوە. ئەوان پارە و کەلوپەلی پێویست بەر لە وەرزی دروێنە دەدەن بە جووتیارەکان، سوویەکی زۆر دەخەنە سەر پارەکە، ئەمەش بە بەڵگە تۆمار دەکەن. جووتیارەکە باکی بەوە نییە چەند لەدەفتەر و سەندەکە دەنووسرێت، مادەمەکی ئەو پێویستیە خێراکەی دابین دەکات.

جووتیار ئەو سیفەتەی لە پێشنە بەدوییەکەی وەرگرتووە، تەنها بیر لە ئەمڕۆی دەکات وحسێبی بەیانی ناکات، وەك ئەو پەندەی دەڵێ " ئەمڕۆ ئەوەی دەستت خەرج بکە، ئەوەی بەیانیت بۆ دێت" . بۆیە جووتیار هیواخوازە، لەوەرزی دروێنەدا هەموو قەرزەکانی بداتەوە، لەوەش دڵنیایە لە حاڵەتێکدا بێت، خودا و وەلییەکانی لەمەدا هاوکاری دەکەن.

لەپەندە باوەکانی لادێی عێراقی هاتووە " قەرز زیادەیە" لەبەر ئەمەش دەبینی لە زۆر حاڵەتدا قەرز لەسەر جووتیارەکە کەڵەکە دەبێت، جا کاتی دانەوەی قەرز دێت، ئەوا ناتوانێ بیداتەوە. ئەوکاتەش ناچار دەبێت دووبارە قەرزەکەی تۆمار بکاتەوە لەگەڵ زیادکردنی سوورەکەی، ئەو قەرز لەکەسێکی دیکە وەردەگرێت بۆ ئەوەی قەرزە کۆنەکەی دباتەوە ئەمەش لەگوندەکان بەوتەی " کلاّو لەسەر کلاّو لەسەردەنێ" گوزراشتی لێ دەکرێت[258] .

جووتیار لە سەرەتادا پەنا نابەتەبەر فرۆشتنی کەلوپەلەکانی بۆ دانەوەی قەرزە کەڵەکەبووەکەی، بەلاّم کاتێك خاوەن قەرز بێزاری دەکات، یان بەهۆکاری جۆراوجۆری بەدوای دەکەوێت، ئەوا جووتیارەکە بەشێك لە مانگاکانی،

---

[258] شاكر مصطفى سليم (الجبايش ) ج ٢ ، ٤٤٢

بەلەمەکەی، تفەنگەکەی، یان هەرشتێکی دیکە دەفرۆشێ و هەندێك یان هەموو قەرزەکانی دەداتەوە[٢٥٩].

عەبدولجەبار فارس دەگێڕێتەوە، بەچاوەکانی خۆی بینیویەتی، جووتیارێك لە گوندی (بەدیر) سێ مریشکی قەرزکردوە بۆ ئەوەی خواردنی میوانێك ئامادە بکات. جار لەدوای جار قەرزەکەی زیاد دەبێت تا دواجار ناچار دەبێت گایەکەی بۆ دانەوەی قەرزی سێ مریشکەکە بفرۆشێت[٢٦٠]. لەراستیدا ئەوە کەسانەی سوویان بە جووتیار دەدا، بەهەمان شێوە زۆرجار شێخ و سەرکارەکانیشیان دەچەوسانەوە. جەعفەر خەلیلی دەڵێ بەچاوی خۆی سکالایەکی بینیوە، یەکێك لە بازرگانەکان لەسەر کارێکی کردووە بۆ وەرگرتنەوەی قەرز. قەرزە راستەقینەکە پێنج لیرەی زێر بووە بەڵام سەرکار سووی بە بازرگانەکە داوە تاگەیشتۆتە چل وپێنج لیرە لەماوەی ١٠ساڵ، کەچی قەرزەکە هەروەك خۆی ماوەتەوە[٢٦١]. جارێکیان سەرکارێك پێڵاوێك بەقەرز دەکرێت، کە نرخەکەی یەك دینار بووە، بەڵام دوای ماوەیەك ناچار دەبێت بۆ دانەوەی قەرزەکە (تەغارێك برنج ) بدات، کە نرخەکەی پانزە دیناربووە[٢٦٢].

جەعفەر خەلیلی دەڵێ بازرگانەکان بەمشێوەیە شێخی عەشیرەتەکان دەچەوسێننەوە و خۆشیان سامانێکی بێشومار پێك دەهێنن. شێخەکان نە حسێبی خۆیان رادەگرن و نە خەرجییەکانی خۆیان رێك دەخەن، ئەو قازانجەی کە بازرگان لەشێخی دەکات لە هەندێك جاردا نیوەی بەرهەمە کشتوکاڵییەکەیە ئەگەر زیاتر نەبێت" پیاوێکم دەناسی،پێشتر لە مهناویە دێوەرە بوو( بەقاڵی گەڕۆك) بەڵام ئێستا بۆتە بازرگان و خاوەن موڵك وسامانێك گاڵتەی پێناکرێت. ئەمەش بەهۆی ئەو جۆرە مامەڵە بازرگانیانەوە"[٢٦٣].

رەنگە پێویست بەوە نەکات بڵێین ئەوە دیاردە کۆمەڵایەتیە پیاوی لادێی ناچار دەکات رێگای دواخستن و درێژکردنەوە و فێڵ و درۆ بگرێتەبەر. لەوانەشە

٢٥٩ المصدر السابق، ج ، ٤٤٦
٢٦٠ عبدالجبار فارس (المصدر السابق) ص ٦١
٢٦١ أ، س، ح (المصدر السابق) ص ٦٥
٢٦٢ عبدالجبار فارس (المصدر السابق) ص٦١
٢٦٣ أ. س. ح (المصدر السابق) ص ٦٥

ناچاربێت نکۆڵی لە قەرزەکە بکات یان لەدەستی رابکات. قسەم لەگەڵ هەندێك لەو بازرگانانە کردووە کە مامەڵە لەگەڵ بەدو و لادێییەکان دەکەن. ئەوان هەموویان لەسەر ئەوە کۆکن، پیاوی بەدو زۆر دەستپاکترە، بۆیە بە (هەقانی) وەسفی دەکەن. ئەو ئەگەر قەرز بکات و بگەڕێتەوە بیابان، ئەوا دەبێت لە نزیکترین دەرفەت دەگەڕێتەوە بۆ دانەوەی قەرزەکەی، کەچی پیاوی لادێی لە زۆر حاڵەت لەمەدا پێچەوانەی بەدوە.

**پاڵنەری قازانج:**

دکتور مەتی عەقراوی ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە ئەو گیانی بەدەستهێنان و تەماعکارییەی بەپاڵنەری قازانج لەلایەن رۆژئاوییەکان هەیە. ئێستا لەلای ئەو هۆزانەی لە عێراق بەرەو شارنشینی دەڕۆن رۆڵێکی دیاردەگێڕن.

لێرەدا دەمەوێ کەمێك بوەستم، بۆ ئەوەی سەرنجی خوێنەر بۆ سروشتی ئەو ململانێیە دەروونیە رابکێشم، کە پیاوی لادێی لەعێراق لە ئەنجامی دوو پاڵنەری پێچەوانەوە، بەدەستیەوە دەناڵێنێ. ئەو دوو پاڵنەرەش یەکەمیان پاڵنەری قازانج و پارە بەدەستهێنانە، لەلایەکی دیکە پاڵنەری دووەم دێت کە پاراستنی نەریتەکانی بیابانشین و پێگەی کۆمەڵایەتییە. پیاوی بەدو زۆر کەم ئەو ململانێیەی هەیە، چونکە ئەو بەپاڵەوانێتی و هێزی شمشێرەکەی سامان و پێگەی کۆمەڵایەتی لە یەك کاتدا بە دەست دەهێنێ. ئەو داگیرکاری ئەو لە ژیانی بیابان لەسەری راهاتووە دوو بابەت لەخۆیەوە دەگرێت: نواندنی پاڵەوانێتی و بەدەستهێنانی غەنیمە.

ئەو هۆزانەی بەدو، لەسەردەمی عوسمانییەکاندا هاتنە عێراق، لەسەر داگیرکاری بەردەوام بوون، بەڵام دواتر بەرە بەرە لە ئەنجامی زیادبوونی دەسەڵاتی حکومەت و گەشەکردنی شارستانیەت، وازیان لەو کارەیان دەهێنا. زۆرێکیش لە خەڵکی لادێکان بەتایبەتی دوای جەنگی جیهانی یەکەم، مەیلیان بەلای پیشەی شارستانی هەبوو، وەك دوکانداری، کرێکاری، ریبا وبازرگانی. ئەوانەش بەتێڕوانینی هۆزەکانیان پێگەی کۆمەڵایەتیان لەدەست دەدا.

یەکێك لەو کێشانەی کۆمەڵگای لادێی بەدەستیەوە دەناڵێنێ ئەوەیە پێگەی کۆمەلایەتیش پێوستی بەسامانە. بۆ نموونە دیوەخان، یەکێکە لە گرنگترین رووەکانی پێگەی کۆمەلایەتی لە لادێکان، دەبێت هەردەم خۆراك و رایەخێ تێدا بێت بۆ هەر میوانێك. هەرچەندە میوانیش زیاد بێت ئەوا پێگەی خاوەن دیوەخان لەلای هۆزەکەی زیاتر دەبێت، بەلأم لەکوێ ئەو پارەیە دەهێنێ؛ تا لەمیوانەکانی خەرج بکات؟ هەندێك جار بەروبومی کشتوکاڵی بەشی ئەوە ناکات، جا خاوەنی دیوەخان یان دەبێت دیوەخانەکەی فەرامۆش بکات، یان رێگایەکی ناشیاو بۆ بەدەستهێنانی پارە بگرێتەبەر، هەردوو بابەتیش لە کۆمەڵگای لادێی قبولکردنی قورسە.

ئێستا لە لادێکانی عێراق دوو رەوتی پێچەوانەی یەکترمان هەیە: یەکێکیان بریتیە لە پیاوانی خانەدان و خاوەن رەچەڵەك، ئەوانە تووشی کەمدەرامەتی هاتوون بۆیە دیوەخانەکانیان فەرامۆش کردووە و دایانخستووە، بەمەش پێگەی کۆمەلایەتیان لەدەستداوە. رەوتەکەی دیکە، ئەو کەسانەن کە رەچەڵەکی نزمیان هەیە یان پیشەی بێزراو دەکەن، بەلأم سامانیان کۆکردۆتەوە، دیوەخانی تایبەت بەخۆیان هەیە، لەئەنجامدا کەم یان زۆر پێگەی کۆمەلایەتیان هەیە.

ئەمە لەسەردەمی عوسمانییەکان دەگمەن روویدەدا، پەندێکی پێشنیان هەیە لەلادێکان باس دەکرێت بۆ زەمکردنی پیاوێکی نزم کە هەوڵ بدات لە رێگای سامانەوە خانەدان دەربکەوێت. ئەوان دەڵێن " وەك دێوەرەکەی زوبێدە". سەرچاوەی ئەو پەندە ئەوەیە بەقاڵێکی گەرۆك لەلای هۆز زوبێد دەمێنێتەوە و دەوڵەمەند دەبێت، دواتر واز لەکارەکەی دەهێنێ و دیوەخانێك دەکاتەوە. خەڵکی هۆزەکەش بۆ پەنایان بۆدەبرد و سکالآکانیان لەلای ئەو یەکلادەکردەوە. تورەدەبوو بەلێدان کەسێکی دەترسان ئەگەر سەرپێچی فرمانەکەی دەکرد، هەلوەس عەلوان شێخی هۆزەکە کاتێك بەمە دەزانێ ئەوا لەنێو هۆزەکەی دەریدەکات[٢٦٤].

---

[٢٦٤] عبدالجبار فارس (المصدر السابق) ص ٦٩ ـ ٧٠

وەك دەردەكەوێت ئێستا نموونەی ئەو بەقاڵە لە لادێكانی عێراق زۆرە، بێنەوەی دەربكرێن یان پەندیان لێ دروست بكرێت. دكتۆر شاكر مستەفا سەلیم باس لەوە دەكات كە زۆرێك خەڵك لە چبایش هەبووە سەروەت وسامانی خۆیان بۆ بەرزكردنەوەی پێگەی كۆمەلایەتی خۆیان بەكارهێناوە. ئەو نموونەیەكی دیار دەهێنێتەوە، ئەویش عەبودە سەلمانە. ئەو پیاوە لەسەرەتادا فەراشێك دەبێت لەفەرمانگەیەكی حكومەت لەچبایش، دواتر یەكێك لە بەڕێوەبەری ناحیەكان وەك پێناوێك بۆ بەرتیل وەرگرت بەكاریدەهێنێ. لەجەنگی دووەمی جیهان دەبێت بایەعی شەكەر، بەمەش دەبێتە پیاوێكی دەوڵەمەند و ناسراو. دیوەخانێك دەكاتەوە پیاوماقولانی بەنی ئەسەد لەلای ئەو كۆدەبنەوە و قاوەی ئەو دەخۆنەوە. تەنانەت ئەو پیاوە هاوكاری نەدارانی عەشیرەتەكەی دەكات و دواجاریش ناوبانگێكی چاكی بەدەست هێناوە"[٢٦٥].

ئەو پیاوە توانیویەتی بەسامانەكەی پێگەیەكی كۆمەلایەتی بەرز بەدەست بهێنێ، لەبەر ئەوەی هەوڵی داوە لەگەڵ نەریتەكانی هۆزگەرایی بڕوات، ئەو هاوكاری نەداران دەكات، خواردن بەخەڵك دەدات. لێرەوە پرسیارێك رووبەڕوومان دەبێتەوە، ئایا ئەمە لەتوانای هەموو ئەوكەسانە هەیە كە دەوڵەمەندن و پێشتر خاوەن پێگەی نزم بوون؟

وەك دەردەكەوێت كاتێك پاڵنەری قازانج بەسەر پیاوی لادێی زاڵ دەبێت، وادەكات لە زۆربەی حاڵەتەكان نەریتەكانی هۆز فەرامۆش بكات، قرچۆك بێت، هەڵپەی كۆكردنەوەی سامان بكات، تەنانەت تاكێتی خۆی بەسەری زاڵ دەبێت، وا دەكات ریبا بدات، ساختە بكات، خۆپەرستێكی دڵڕەق بێت. شاكر مستەفا سەلیم چەند نموونەی واقیعی دەهێنێتەوە لەبارەی پیاوانی خانەدان لە چبایش، ئەوانەی بەدوكانداری وكاری بازرگانی خەریكن، دیوەخان و نەریتی هۆزیان فەرامۆشكردووە، بەشێوەیەك لە كارەكانیان لەگەڵ رووت ورەجاڵ و كۆیلەكان لەسەر پارەیەكی كەم دەمەقاڵێ دەكەن، ئەمەش پاڵپشتی ئەو بۆچوونەی خەڵك

[٢٦٥] شاكر مصطفى سليم (المصدر السابق) ج ٢، ٤٦٠

دەکات کە پێیانوایە کەسایەت لەگەڵ ژیانی هۆزگەرایی ناگونجێت، ئەوان دوو دژی یەکترن بەیەکەوە کۆناکرێنەوە[٢٦٦].

داریل فۆرد نموونەی ئەمەی لە نێجیریا تێبینی کردووە، دەڵێ: ئەو کاریگەریەی لە ئەنجامی شێوازی شارستانیەتی نوێ پەیدا دەبێت، لەزۆرحاڵەتدا دەبێتە هۆی دەرکەوتی تاکێتی (النزعە الفردیە). ئەمەش یەکانگیری کۆمەڵگای کۆن هەڵدەوەشێنێتەوە و بەریەکەوتن لەنێوان بەرژەوەندی تاکەکان دروست دەکات[٢٦٧].

## پێگەی ژنی لادێی:

ژن بەپێی بەهای بیابانشینی پێگەی لە پیاو نزمترە، ئەو ناتوانێ وەك پیاو داگیرکاری وکوشتار ئەنجام بدات، بۆیە ئەو خۆی تەرخان دەکات بۆ کۆمەڵێك کار کە پیاو خۆی لە قەرەیان نادات، وەك بەڕێوەبردنی ماڵ وهەڵدانی خێوەت، دروومان و چەندین کاری دیکە. هەرچەندە پیاوی بەدو بەمرووەت وسوارچاکی ناسراوە، بەڵام بەخراپ مامەڵە لەگەڵ ئافرەت ناکات، زۆرجار ڕێزی دەگرێت، لێی نادات، لە زەواج کەمتەرخەم نابێت، بەڵکو ڕەزامەندی بەدەست دەهێنێ. دەست بەسەر مارەیی ژنەکەی ناگرێت. ئافرەتی بەدو ئازادە لە داواکردنی تەڵاق ئەگەرهاتوو پیاوەکەی جێی ڕەزامەندی ئەو نەبوو. عەبدولجەبار ڕاوی دەڵێ ( تەڵاقی بەدو دوو گرێیە، یەکیان بەدەستی پیاوە و ئەویتریان بەدەست ژنە)[٢٦٨].

ژنی بەدو کاتێك لەگەڵ هۆزەکەی بەرەو عێراق هاتن، ئەوا پارێزگاری لە پێگە وتایبەتمەندییەکانی خۆی دەکرد، مادامەکی هۆزەکەی هەر لە قۆناغی کۆچکردن و بەدو ماوەتەوە. هەرکە هۆز دەستی کرد بە پیشەی کشتوکاڵی ئەوا پێگەی ژنان گۆڕا، پێگەی کۆمەڵایەتیشی زۆر دابەزی و هەموو ئەو ئیمتیازانەشی لەدەست دا کە پێشتر هەیبوو. هەرچەندیش هۆزەکە بەرەو شارنیشنی دەرۆیشت و پیشەی گامێشەوانی و کشتوکاڵی سەوزە و بەقاڵی دەکرد، ئەوا پێگەی ژن زیاتر دادەبەزی.

---

[٢٦٦] المصدر السابق ج٢ ، ص ٤٧٠-٤٧١

[٢٦٧] المصدر السابق ، ج ٢، ص ٤٦٩

[٢٦٨] عبدالجبار الراوي (البادية) ص ٢٦٨

بەهەرحاڵ دەتوانین بڵێین ژن لە زۆرینەی لادێکانی عێراقدا ، بەتایبەتیش لە هۆزەکان وەك ئاژەڵ وکۆیلەی لێهاتووە. لەرووی ئابوورییەوە دەچەوسێتەوە، بەناوی زەواجەوە کڕین وفرۆشتنی پێدەکرێت. سەبیحە شێخ داود دەڵێ: ئەو تێڕوانینە ئابوورییەی کە پیاو لە لادێ بۆ ژنی هەیە، وایکردووە زۆرجار زیاتر لەتوانای خۆی ماندوو بێت. ئەو بەردەوام کار دەکات لە باروۆخێکی سەختەدا کە زۆرجار پیاوان بەرگەی ناگرن. پیاو سەخترین کاروبار دەداتە ئافرەتان، بەشێوەیەك هەردەم لەچەمانەوەیە، بژاری کێڵگە دەکات، زەوی تەخت دەکات و بەرهەم کۆدەکاتەوە. گوێم لە پیاوێك بوو، گومانم لەقسەکانی نییە، ئەو پیاوە زۆرینەی ژیانی لە لادێکانی عێراق بەسەربردووە، ئەو پیاوە دەیگوت جارێك ژنێکی جووتیاری بینیوە، لەگەڵ کەرێکدا گاسنی ڕاکێشاوە و لەزەوییەکی ڕەقدا کە کەرەکە بەتەنیا نەیتوانیوە رایبکێشێ، کەچی پیاوەکەی دەسکی گاسنەکەی گرتووە و لێی خوڕیوە"[٢٦٩].

پیاو بەوەندە واز ناهێنێ، بەڵکو بەشێوەیەکی دیکە ئافرەت دەچەوسێنێتەوە، کاتێك ڕەوانەی بازاڕەکانی دەکات و بەرهەمە شیری و کشتوکاڵییەکانی لەوێ بەژنەکەی دەفرۆشێت، خۆشی تا درەنگی ڕۆژ چاوەڕێی گەڕانەوەی دەکات بۆ ئەوەی پارە یان ئەو شتانە بهێنێتەوە کە ڕایسپاردووە. لەوانەشە لێی بدات ئەگەر پێشبینی شتێکی لێکردبێت وئەو ئەنجامی نەدابێت.

ئەمە بەشێوەیەکی تایبەت، زۆر بەڕوونی لەلای مەعدانەوە بەدیدەکرێت، ئەوان لە دەوروبەری هەندێك شار دەژین، زۆربەی ڕۆژەکانیان لە قاوەخانە بەسەردەبەن، یان لە نوێژی جەماعەت ئامادە دەبێت و گوێی لە واعیزەکان دەگرێت، کەچی ژنەکانیان زەحمەت دەکێشن لە سپێدەوە کاردەکەن و داهاتێکی باشی بۆ کۆدەکەنەوە. سامانی پیاو لەلای مەعدان بەژماری ژن و گامێشەکانی پێوانە دەکرێت، گامێش ماست و قەیماغی دەبێت، ژنەکەش لە بازاڕ دەیفرۆشێ.

---

[٢٦٩] صبیحة شیخ داود (أول الطریق) ص ٢٢٥

دەتوانین هەمان ئەو قسانەی سەرەوە لە بارەی لادێیەکانیش بکەین، ئەوانەی کشتوکاڵی سەوزە دەکەن، پیاو نایەوێ خۆی لە بازاڕەکان سەوزە بفرۆشێ، چونکە حەز ناکات ببێتە بەقاڵ، بۆیە لەجیاتی خۆی ژنەکەی رەوانە دەکات.

**بارودۆخی هاوسەرگیری:**

بۆ ئەوەی بزانین بری چەوسانەوەی ژن لە لادێکانی عێراق چەندە، دەبێت تاوتوێی ئەو بارودۆخە بکەین کە هاوسەرگیری تێدا دەکرێت. ئەوە تەنها لەرواڵەتدا زەواجە، بەڵام لەراستیدا خاڵی نییە لەمانای فرۆشتن وشت گۆڕینەوە، یان شتێکی هاوشێوەی ئەوانە. لەخوارەوە بەکورتی باس لەبارودۆخی هاوسەرگیری دەکەین لە لادێکانی عێراقدا:

یەکەم: مافی یەکەم زەواجی ژنی لادێی بۆ ئامۆزاکەیەتی، ئەو بێ مارەیی یان بەمارەیەکی رەمزی دەیخوازێ، ئەگەر کەسێکی بێگانە بیەوێ زەواجی لەگەڵ بکات ئەوە دەبێت ئامۆزەکەی بە بڕێك پارە رازی بکات، وەك ئەوەی قەرەبووی زیانەکەی بکاتەوە.

دووەم: باوکی هەژار پێی باشترە کچەکەی بدرێتە کەسێکی بێگانە، بۆ ئەوەی سوود لە پارەکە وەربگرێت. وەك نەریتێك باوکەکە دەست بەسەر دوو لەسێی یان تەواوی مارەییەکە دەگرێت. تەنانەت مامەڵەش لە سەر زیادی مارەیی دەکات، دواتر کچی خۆی بەو کەسە دەدات کە پارەیەکی زۆرتری پێدەدات. وا هەستیش دەکات بەشوودانی کچەکەی زیانێکی ماددی دەکات؛ چونکە پێشتر بۆ باوکی کاری کردووە، لەمەشەدا باوکی بەمارەییەکە دەیەوێ قەرەبووی بەشێك یان تەواوی زیانەکەی بکاتەوە. وەك دەگوترێت هەندێك لە باوکان لە ئەنجامی بەشوودانی کچەکانیان دەوڵەمەند بوون.

سێیەم: زۆرجاریش زەواج لەسەر بنەمای شت گۆڕینەوەیەکی راشکاوانە دەبێت، ئەمەش لەلای ئەوان بە ژن بەژنی (بە عەرەبیەکەی گصە بگصە) دەناسرێت. دوو پیاو رێك دەکەون خوشکی یەکتر مارە بکەن بێ مارەیی. هەندێك بەسەرهات هەیە لەبارەی ئەو پیاوانە دەگێردرێتەوە کە کچی جوانیان هەیە، بۆیە کچەکەی خۆی بەشوودا دەدات لەبەرامبەر کچێکی بچووك بۆ خۆی.

چوارەم: ژنی لادێی هەندێك جار وەك بەشێك لە قەرەبووکردنەوە دەبێت لە سوڵحە کۆمەلایەتیەکان، یان بۆ چاکردنی کێشەی ناموس. دوو هۆزی دژ بەیەکتر رێك دەکەون، بۆ سوڵحکردن بە پێشکەشکردنی چەند ژنێك یان چەند ئاژەڵێك، برێك پارە، ئەمەش بۆ قەرەبووکردنەوەی بەشێك لە زیانە گیانی و مادییەکانی هۆزێکیان. مەعروف رەسافی دەگێڕێتەوە لەشارۆچکەی عەلی غەربی لەساڵی ۱۹۲۸ کێشەیەکی عەشایەری بینیوە، پوختەکەی ئەوەیە پیاوێك دەستدرێژی کردۆتە سەر ژنێك و دواتر لەخۆی مارەکردووە، بۆیە داوای لێکراوە خوشکەکەی خۆی وەك مارەیی بدات[270].

پێنج: ئەو باوکەی کچی زۆری هەیە و کوڕی نییە هاوکاری بکات، بەدوای کوڕێکی هەژار دەگەڕێت بۆ ئەوەی زەواج لەگەڵ یەکێك لە کچەکانی بکات، بێ مارەیی، بەو مەرجەی کوڕەکە لەگەڵ ماڵی باوکی کچەکە بژیت. ئەمە لەلادێکانی عێراق بە (قعیدی) ناودەبرێت. ئەگەر ئەو گەنجە ویستی لەگەڵ هاوسەرەکەی لەماڵی باوکی جیا بێتەوە، ئەوا دەبێت ئەو مارەییە بدات کەپێشتر لەسەری رێکەوتوون، ئەگەریش ژنەکەی تەلاق دا، ئەوا هیچ شتێك نادات[271].

شەشەم: هەندێك جار وا روودەدات، باوکێك یەکێك لە کچەکانی هەر لە منداڵییەوە دەکات نەزر بۆ یەکێك لەسەیدەکان لەڕەچەڵەکی پێغەمبەر، یان بۆ مەزارگەیەك لە مەزارگە پیرۆزەکان، کاتێك کچەکە گەورە دەبێت، ئەوا باوکەکە کچەکەی پێشکەشی سەیدەکە دەکات، یان پێشکەشی مجێوری مەزارگەکە دەکات، ئەو کەسەش دەتوانێ لەو مافەی خۆی خۆش بێت لە بەرامبەر برێك پارە وەربگرێت کە لە سەری رێکدەکەون.

حەوتەم: هەندێك جاریش ژن دەکرێتە دیاری و پێشکەشدەکرێت، وەك ئاژەڵێك یان وەك هەر شتێکی دیکە، کە بەهای ئابووری هەبێت. دکتۆر جون فانیس باس لەوە دەکات جارێکیان چۆتە لای هۆزێکی مەعدان، بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشەکانیان، شێخی هۆزەکە خۆشی دەوێ وداوای لێدەکات لەلای هۆزەکە

---

[270] معروف الرصافي (أراء الرصافي) ص ۱۳
[271] شاکر جواد سليم (المصدر السابق) ج ۱، ص ۱۰۸-۱۰۹

بمێنێتەوە بۆ ئەوەی چارەسەری نەخۆشەکانیان بکات، شێخ دەڵێ" بۆ ئەوەی وات لێبکەم لەلای ئێمە بمێنیتەوە ئەوا کچەبراکەی خۆمت بۆ دەکەم بە بووک، چونکە هاتنی دکتۆرێکی شارەزای وەك تۆ بۆ ئەو ناوچەیە زۆر دەگمەنە"[٢٧٢].

هەشتەم: ئەگەر پیاوێك ژنێکی خواست و مارەییەکەی دا، دواتر بۆی دەرکەوت کەموکورییەکی جەستەیی یان دەروونی هەیە، ئەوا دەتوانێ بیگرێتەوە بۆ لای کەسوکاری و داوای مارەییەکە بکاتەوە. ئەگەریش ئافرەتەکە کێشەی رەوشتی هەبوو، گومان لەرەفتاری کرا، ئەوا پیاوەکە دەتوانێ بیکوژێت، لەمەشدا کەسوکاری ژنەکە هاوکاری دەکەن لە پاککردنەوەی شەرەف یان ئەوەی بە (غسل العار) دەناسرێت.

نۆیەم: ئەگەر ژنێکی لادێی شووی کرد و ماوەیەکی زۆر مێردەکەی دیار نەبوو، ئەوا بەخێوەکەرەکەی هەوڵ دەدات بەشووی بداتەوە ئەمەش وەك تەماعکاری بۆ مارەییەکەی. سەبیحە شێخ داود باس لەوە دەکات لەماوەی کارکردنی لە دادگا، رۆژێك کچێکی لادێی بینیوە تەمەنی لەچواردە ساڵ تێپەڕی نەکردووە، لەبەردەم دادگا وەستاوە بەتۆمەتی ئەوەی بێ تەڵاقدان سێ جار شووی کردووە، چونکە دایکی جار لەدوای جار بۆ مارەیی بەشووی داوە[٢٧٣].

مەعروف رەسافی دەگێڕێتەوە، لەساڵی ١٩٣٢ لە عمارە ژنێکی لادێی بنیوە لەگەڵ برا ومێردەکەی هاتۆتە لای موتەسەڕف، مێردەکەی سکاڵای ئەوەی هەبووە، کاتێك لە بەسرا بووە، تا گەڕاوەتەوە برای ژنەکە، هاوسەرەکەی بەشوو داوەتەوە بۆ وەرگرتنی مارەیی[٢٧٤].

چەند مانگێگ لەمەوبەر رووداوێك لە دەوروبەری کەربەلا روویدا، جێگا سەرنجە، پیاوێکی لادێی خوشکێکی جوانی هەبووە، لەرێگای بەشوودانەوە بە کاری هێناوە، چەند جارێك بەشووی داوە، بۆ چەندین پیاو، بێ ئەوەی تەڵاق بدرێت، هەر جارێکیش مارەیی وەرگرتووە... دواتر ئاشکرا دەبێت ودەستگیر دەکرێت و دادگایی دەکرێت، ئەو بابەتە لە تەلەفزیۆنەکانی بەغدا پەخش کرا.

---

[٢٧٢] جون فاتیس (أقدم أصدقائي العرب) ص ١٥٠

[٢٧٣] صبیحة الشیخ داود(المصدر السابق) ص ٢٣٢

[٢٧٤] معروف الرصافي ( المصدر السابق) ص ١٤

پاککردنەوەی شەرەف:

لە لادێکانی عێراق نەریتێکی زۆر باو هەیە، ئەویش کوشتنی ئافرەتە کاتێک گومان لە رەفتاری دەکرێت. ئەمەش بە (غسل العار) ناودەبرێت. ئەو دیاردەیە لە زۆربەی وڵاتانی عەرەبی هەیە، بەڵام من بڕوای ئەوەم هەیە، لە لادێکانی عێراق زۆرتر بڵاوە و لە هەموو ناوچەکانی دیکەی عەرەبی توندرە، هۆکارەکەش بە بڕوای من بۆ دیاردەی(نەگونجانی کۆمەڵایەتی) دەگەڕێتەوە.

( نەگونجانی کۆمەڵایەتی) زاراوەیەکە کاتێک پەنای بۆ دەبەم، کە دەمەوێ ئەو دژبەیەکێ و بەرکەوتنانە روون بکەمەوە کە لە لادێکانی عێراق لە نێوان بەهای بیابانیشی و بارودۆخی نوێی هۆزەکان روودەدات. ئەمەش بابەتێکە لە بەشی رابردوو باسمان کرد، بەڵام زیاتر لە بابەتی پاککردنەوەی شەرەف تێبینی دەکرێت.

وا لە بەدوەکان زانراوە، لە دێرزەمانەوە لەوە راهاتووە ژن بکوژن کاتێک گومان لە رەفتاری دەکەن، لەو بارەیەوە دکتۆر فازڵ جەمالی دەڵێ: ئەگەر کچێك شووی نەکردبێت و دووگیان بێت، ئەوا کەسانی نزیکی دەیبەنە دووری رەشماڵەکان، دەیکوژن ودەینێژن، بێئەوەی کەسێك پرسیار لە هۆکارەکەی بکات. ئەگەر یەکێك لە بەدو قسەوقەلۆك لەبارەی رەفتاری ژنێك بکات، ئەوا داوای بەڵگەی لێ دەکرێت، ئەگەر بەڵگەی هەبوو، ژنەکە دەکوژرێت، ئەگیان بەدوەکە سزادەدرێت چونکە هەوڵی بەدکردنی شەرەفی ژنەکەی داوە[٢٧٥].

لێرەدا پێویستە بگوترێت زۆر دەگمەن ژن لە بیابان لەبەر بەدرەفتاری دەکوژرێت. بارودۆخی ژیان لە بیابان هاوکاری ژن دەبێت بۆئەوەی پارێزگاری لە پاکیزەیی و ئابڕووی خۆی بکات. پیاوی بەدو لەزۆربەی کات داوێن پاکە، دەگمەن نەبێت هەوڵ نادات فریوی ژن بدات و تەحروشی پێ بکات. لەلایەکی دیکەوە ژن لەگەڵ کورانی هۆزەکەی دەژیت و زۆر کەم تێکەڵی کەسانی دیکە دەبێت، ئەگەر بارودۆخ ناچاری کود بەرەو شوێنێکی دیکە بڕوات، ئەوا بۆ هەر کوێ بچێ کەسێکی لەگەڵ دەبێت پارێزگاری لێ بکات.

---

[٢٧٥] Jamali (new Iraq)p, 37

دکتۆر پۆڵس هاریسن دەڵێ: لەگەڵ قافلەیەك بووم لە مێرگی هەفهوفەوە بەرەو کەناری کەنداوی عەرەب دەڕۆیشت. کاروانەکە لەچەند قۆناغێك بوو، کچێکی بەدو لەسەر حوشترەکەی بوو، لەدووری نیو میل لە قافلەکە دەڕۆیشت، کاتێك قافلەکە دەوەستا، ئەویش حوشترەکەی دەوەستاند لەهەمان دووری لەقافلەکە، یەکێك لەپیاوانی قافلەکە نانی ئێوارەیان بۆ دەبرد، بێئەوەی کەسێك هەقی بەسەرەوە بێت، یان بەخراپە مامەڵەی لەگەڵ بکەن[٢٧٦].

ئەمەش مانای ئەوەیە ئافرەت لە بیابان کەم تووشی فریو ولادان دەبێت، لەبەر ئەمەشە دەگمەنە بەدوەکان نەریتی پاککردنەوەی شەرەف لەگەڵ ئافرەتەکانیان بەکاربهێنن. کێشەکە ئەو کاتە دەردەکەوێت کە بەدوەکان بەرەو لادێکانی عێراق دەچن و لەوێشەوە وەك فرۆشیار رەوانەی بازارەکان دەکرێن، ئەوکاتە ژن لە بازاڕ تووشی فریودان دەبێت ورێگاکە دەگرێتە بەر. ئێمە نکوڵی لەوە ناکەین هێشتا ژن لە بەرامبەر بارودۆخە نوێیەکە پارێزگاری لەپاکی و ئابرووی خۆی دەکات، بەڵام لەهەر حاڵەتێکدا بێت توانی سنووردارتر دەبێت، ئەویش مرۆڤە، خۆ لە ئاسن دروست نەکراوە.

لەراستیدا رێژەی لادان لە نێوان ژنانی لادێ زۆر کەمە، لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی دیکەش دەگۆڕێت، بەڵام لە هەموو حاڵەتەکاندا، لادانی ژنانی لادێ زۆر بەرزترە لەژنانی بیابان، دەکرێت بگوترێت ئەو رێژەیە لە ناو هۆزێك بەپێی زیاتر چەوسانەوەی ژنان و ناردنیان بۆ بازاڕ زیاد دەکات.

هۆزەکانی لادێیش لەرووی پابەندبوون بەپاککردنەوەی شەرەف جیاوازیان لەگەڵ یەکتر هەیە، هەندێکیان نەرمی دەنوێنن، هەندێکی دیکەش تارادەیەکی سەیر پابەند دەبن بەو نەریتەوە. هەندێك جار ئەو نەریتە بۆ هەندێك خەڵکی شاریش دەگوزرێتەوە، بەتایبەتی ئەوانەی رەچەڵەکیان لادێییە وپەیوەندی بتەویان بەخەڵکی لادێیەوە هەیە.

بەر لەچەند ساڵێك یەکێك لەرۆژنامەکانی بەغدا باسی پیاوێکی کردبوو لە گوندی سەلمان پاك خوشکەکەی کوشتبوو، لەبەرئەوەی بەر لە گواستنەوە پەیوەندی

---

[٢٧٦] جون فاتیس (المصدر السابق) ص ١١٠

بەمێردەکەی کردبوو. لەیەکێك لەگەڕەکانی کازمیەش ڕووداوێکی پاککردنەوە شەرەف ڕوویدا و خەڵکی گەڕەك لەکوشتنی ژنەکە بەشداربوون ، برا بچووکەکیان هاندابوو بۆ کوشتنی و پارەیان پێدابوو. تەنانەت لەچوونە زیندانیش هاوکاریان دەکرد، تا دواتر ئازاد کرا، خەڵکی گەڕەك وەك پیاوێکی بەشەرەفی ناسراو سەیریان دەکرد.

بەسەرهاتی پاککردنەوەی شەرەف لەعێراق هێندە زۆرە، ناژمێردرێ. یەکێك لە قوتابیەکانم راپۆرتێکی کرد بوو؛ چیرۆکی وەهای لەخۆوە گرتبوو جێگای سەرسوڕمان بوون. هاورێییەکم کە پێشتر پزیشکی داد بووە، لەو بارەیەوە زۆر چیرۆکی سەیری بۆ گێڕاومەتەوە. ئەو زۆرێك لەو لاشەی ژنانی پشکنی بوو کە بە تۆمەتی شەرەفەوە کوژرا بوون، لە پشکنین دەرکەوتبوو زۆرێکیان هێشتا پەردەی کچێنیانیان پاراستبوو، بەڵام کەسوکاریان تەنها بەگومان یان بەقسەوقسەلۆك پەلەیان لەکوشتنی کردبوو.

وەك زانراوە لە هەندێك ناوچەی لادێی عێراق، پیاو یەکسەر ژنەکە دەکوژێ، تەنها لەبەر گومانێك، جا راست یان درۆ، ئەو وەك پیاوی بەدو نییە، حەزی لە لێکۆڵینەوە و بەدواداچوون بێت. لەوانەیە وا بزانێ ئافرەت شایەنی ئەوە نییە، بۆیە دەیکوژێ و بەخوێنەکەی شەرەفی خۆی و هۆزەکەی خاوێن دەکاتەوە. لەوانەشە دوای کوشتنی دەستێکی ببڕێت بۆ ئەوەی بەردەم ماڵی خۆی یان دیوەخانەکەی هەڵیواسێ، ئەمەش وەك بەڵگەی شەریف بوونی ئەوە. ئەگەرهاتوو لەکوشتنی سستی نواند، ئەوا لەلای خەڵك ئابرووی دەچێ، ئەگەر لە دیوەخان دانیشێ قاوەی پێ نادرێت و کەسیش سەلامەکەی لێ وەرناگرێتەوە.

لەوبارەیەوە چیرۆکێك هەیە، من لە چەندین حیکایەتخوانم بیستووە، گوایە پیاوێکی لادێی هەبووە لە چایخانە دانیشتووە، یەکێك لەچایخانەکە پێی دەڵێ" پووشکە بەسەر عەگالەکەتەوەیە". ئەوا پیاوە لادێیەکە بەپەلە دەچێتەوە ماڵەوە یەکێك لە ژنەکانی دەکوژێ، دواتر دەگەڕێتەوە هەمان چایخانە دووبارە پیاوێکی دیکە هەمان قسەی پێدەڵێ، ئەوجارەش دەچێتەوە ماڵەوە ژنێکی دیکەی دەیکوژێ. دواجار دەردەکەوێ بەراستی پووشێك کەوتەتە سەرعەگالەکەی .

دەزانم ئەو چیرۆکە خاڵی نییە لە زێدەڕۆیی، لەوانەشە لەبنەڕەتەوە هەڵبەسترابێت، بەڵام بە هەرحاڵ مانایەکی کۆمەڵایەتی هەیە، ئاماژەیە بۆ پەلەکردنی پیاوی لادێی لە کوشتنی ژن، تەنها لە بەر وشەیەکی سادە یان ئاماژەیەك بۆ بەدرەفتاری ژن. خەڵکی لادێ نەریتی پاککردنەوەی شەرەفیان لە بیابانەوە بۆهاتووە، ئەمەش نەریتێکە بۆ بیابان گونجاوە، بەڵام بۆ ژیانی لادێی ناگونجێت، ژنانی لادێیش بوونەتە قوربانی ئەم " نەگونجانە کۆمەڵایەتیە".

**نەخۆشییەکان لەلادێدا:**

گرنگترین جیاوازیە دیارەکانی نێوان کۆمەڵگای بەدو لە بیابان وکۆمەڵگای لادێی لە عێراقدا، کەمی نەخۆشییە لە یەکەمیان وزۆربوونیەتی لە دووەمیان، ئەم جیاوازیەش گرنگییەکی زۆری هەیە لەرووی دەروونی وکۆمەڵایەتییەوە. نەخۆشییەکان لە بیابان زۆر کەمن، ئەمە سەرەڕای ئەوەی بەدوەکان بایەخ بە پاکی جەستە و پۆشاك وماڵەوەیان نادەن[٢٧٧]. هۆکارەکەش ئەوەیە ئەوان لە رەشماڵی گوێزراوە دەژین، ماوەیەکی زۆر لە شوێنێك نامێننەوە. ئەو لمەی بەسەری دەرژێن خۆر و با هەمیشە پاکی دەکەنەوە، بۆیە زەحمەتە میکرۆب لەو دەوروبەرە گەشە بکات، دەگمەنیشە پەتا و نەخۆشی گوێزراوە لە نێوانیان بلاوبێتەوە.

دەکرێت بگوترێت شووشتن وبایەخدان بەخاوێنی، بەدو هۆگری نەبووە وتەنانەت ماناشی نازانێت. ئاو لە بیابان دەگمەنە، ئەوان پێویستیان بەئاو نییە تەنها بۆ خواردنەوەی خۆیان و ئاژەڵەکانیان نەبێت. بەکارهێنانی ئاو بۆ شووشتن و پاککردنەوە، ئەوا بەلای ئەوانەوە سەیرە و نکۆڵی لێ دەکەن. جارێك پیاوێکی شارنشینی لە مەجلیسی بەدویەك باس لەوە دەکات ساڵی جارێك یان دووجار خۆی دەشوات، بەدوەکان بەسەرسامییەوە دەڵێن: بۆ تۆ مراوی! .

ئەوان زۆربەی کات پێ خاوسن. ئەوان جلیان ناشۆن ودەیپۆشن تا دەدرێ. هەروەها قاپ وقاچاخ و دەستیان دوا نانخواردن ناشۆن، بەڵکو دەستیان بەریش وپەردەی رەشماڵەکە دەسرنەوە. دکتۆر جۆن فانیس باس لەوە دەکات پیاوێکی

[٢٧٧] Hashim Witry (health service in Iraq ) p 23-24

شارنیشین سەردانی بەدوێکی کردووە، هەندێك ماستیان لە جامێکی برسیکدار پێداوە، ساڵێك دواتر هەمان پیاو سەردانی بەدوەکە دەکات، ئەوجارە لە جامێکی پیس ماستی پێدەدەن، شارنشینەکە پرسیار لە هۆکارەکەی دەکات، بەدوەکە وەڵامی دەداتەوە" بەڵی، بەداخەوە سەگەکەمان نەماوە، سەگەکە دەفرەکانی بەزمان دەلێستەوە و پاکی دەکردنەوە"[٢٧٨].

بەدوەکان ئاودەست بەکارناهێنن، بەلای ئەوانەوە قێزەوەنە، ئەوان لەچۆڵەوانی پیسایی دەکەن، لێرەشەوە لەزمانی عەرەبی پێشتر بە ئاوەدەست دەگوترا (الخلاء ) واتە چۆڵەوانی. جگە لەمانەش ئەوان بەپێی رێکەوت تف و چڵمیان دەرێشت. دەگوترێت جارێك کۆمەڵێك بەدو پیاوێکی شاریان بینی بەدەسرەکەی چڵمی دەسڕێ ئەوان وا تێگەیشتن ئەو پیاوە چڵمەکەی لە دەسرەکەی هەڵدەگرێت وەك دەرمان بۆ هەندێك نەخۆشی بەکاردەهێنێ.

ئەوان پاشماوەی خۆراکەکانیان بەدەست بۆ دوور فڕێ دەدەن، بایەخ بەوە نادەن وەك خەڵکی شار لە شوێنێکی تایبەت فڕێ بدەن. بەسەرهاتێك هەیە لەو بارەیەوە دەڵێن شێخێکی بەدو سەرانەی لەو حەجیانە وەردەگرت، کە بەناوچەکەی ئەو تێپەڕدەبوون. بەدوەکان جیا دەکردەوە و لێیان خۆش دەبوو. وا رێکدەکەوێت پیاوێکی شار بەو ناوچەیە تێدەپەڕی، بەڵام شێوەزاری بەدو بەچاکی دەزانێ، بۆیە بۆئەوەی سەرانە نەدات، وا خۆی دەردەخات بەدوە. شێخ گومانی لێدەکات و دەیەوێ تاقی بکاتەوە، بۆیە خورمای پێشکەش دەکات، کاتێك پیاوەکە خورماکە دەخوات ناوکەکەی لە نزیك خۆی دادەنێت، نەوەك وەك بەدوەکان بۆ دوور فڕێی بدات، شێخ ئەمە دەبینێ، یەکسەر داوای سەرانەکەی دەکات.

مەبەستم لە باسکردنی ئەو نەریتانەی بەدو ئەوەیە، بە ئەنجامێکی کۆمەڵایەتی گرنگ بگەم کە بریتیە لەوەی: بەدوەکان ئەو نەریتانە لەگەڵ خۆیان دەگوازنەوە کاتێك بۆ عێراق دێن و پیشەی کشتوکاڵ دەکەن. ئەو نەریتانە وەك پێشتر باسمان کرد، لە بیاباندا زیانی بۆ بەدو نییە، بەڵکو گونجاوە لەگەڵ ژیانی ئەوێ، بەڵام

[٢٧٨] جون فانیس (المصدر السابق) ص ١١٦

کاتێك دەگوازرێتەوە عێراق ئەوا گونجاو نابێت و بەڵکو زیانێکی گەورەی بۆ سەر تەندروستی دەبێت.

ئەمەش یەکێك لە سیماکانی دیاردەی " نەگونجانی کۆمەلایەتی" لە عێراقدا. نەریتەکان لە بیابانەوە بۆ عێراق دەگوازرێنەوە، خەڵکیش پابەند دەبێت بەو دابونەریتانەوە، سەرەڕای ئەوەی لەگەڵ ژینگەی نوێ گونجاو نین. بۆ نموونە دوو نەریت لەمانە وەربگرە، پێی خاوس و پیسایی لەسەر زەوی. ئەو دوو نەریتە لەژیانی بیابان زیان بە بەدو ناگەینێ، چونکە ئەو لمەی لەسەری دەڕۆن خاوێنە و وەك ئەوەیە خاڵی بێت لەمیکرۆب. کاتێك پیساییەکە لە دەرەوەی رەشماڵەکەیان جێدەهێڵن دوای ماوەیەکی کورت هیچ زیانێکی تەندروستی نابێت .

زیانی تەندروستی لەلای هۆزەکان ئەو کاتە دروست دەبێت کاتێك لەگوندەکانی عێراق جێگیر دەبن، بۆیە دەبینین ئەو دوو نەریتەی سەرەوە دەبێتە هۆی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی ئەنکلستوما بەشێوەیەکی فراوان، ئەو نەخۆشیە لەڕێگای گەراکانی کرمێکەوە دەبێت کە بەکرمی قولابی ناودەبرێت. کاتێك جووتیاری تووشبوو بەو نەخۆشییە لە سەر زەوی پیسایی دەکات، ئەوا گەراکانی ناوپیساییەکەی لەگەڵ خاکەکە تێکەڵ دەبێت، ئەگەریش بەپێی خاوسی دەڕوات ئەوا گەراکان لەرێگای شەقاری پێییەکانەیەوە دەچنە ناوجەستەی، زۆرجار پێی جووتیار شەق شەق بووە. دواتر لەرێگای خوێنەرەکانەوە بەرەو سییەکان ودواتر بۆ قورگ و لەوشێوە بۆ سورێنچك بۆ گەدە شۆڕ دەبێتەوە، دواجاریش لە ریخۆڵەی جووتیارەکە جێگیر دەبێت و تووشی نەخۆشییەکە دەبێت[٢٧٩]. هەر ئەم جووتیارەش دەبێتەوە سەرچاوەیەکی نوێ بۆ نەخۆشییەکە، بەمشێوەیەی پێشوو دووبارە دەبێتەوە.

شایەنی باسە ئەو دوو نەریتەی سەرەوە تەنها لە لادێکانی عێراق نییە، بەڵکو لەشارەکانیش هەیە، بەلام لەسنوورێکی تەسکتر. دکتۆر (دو) کە بەڕێوەبەری تەندروستی خانەقین بوو لەساڵی ١٩٢٠ دەڵێ: لە شارەکە کۆمەڵێك ئاودەستمان دروست کرد، بەلام سەرەڕای دروستکردنیان خەڵکە هەر لەسەر نەریتە

[٢٧٩] متي العقراوي (المصدر السابق) ص ٢٢٦

کۆنەکەیانن، مەبەستم ئەوەیە شەقامەکان میز دەکەن و پیسایی لە کەناری رووبارەکان دەکەن[٢٨٠].

ئەوەی دەیەوێ بزانێ ئەو نەریتە چەند لەعێراق بڵاوبۆتەوە، با لەمیانەی سەردانی (چلە) دا سەردانی کەربەلا بکات، لەوێ نزیکەی نیو ملیۆن یان زیاتر خەڵکی گوند وشارەکان کۆدەبنەوە، ئەوا بەچاوی خۆت لە کۆڵان وکەناری رووبارەکان بەچاوی خۆی شتی سەیر وسەمەرە دەبینێت...

هەندێك لەو ئامارانەی لە ساڵی ١٩٢٦ ئەنجامدراوە، ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن نەخۆشی کرمی قولآبی لەنێوان دانیشتوانی عێراق بە رێژەیی ٪٣٧ بڵاوبۆتەوە[٢٨١]. مەزندەش دەکرێت رێژەی بڵاوبوونەوەکەی لەنێوان لادێکان زۆر لە شارەکان زیاتر بێت. کێشە لەو نەخۆشیە ئەوەیە تووشبووان بەو نەخۆشییە هەست بە نەخۆشییەکە ناکەن و لە کارکردنیش ناوەستن. دکتۆر هاشم وەتری دەڵێ: زۆرینەی جووتیاران لە نیمچە برستیەتی هەمیشەیی دان. خۆراکەکانیان لە ماددەی رەق و گەورە پێك دێت، بەلآم لەرووی خۆراکییەوە بەسوود نین، لە ئەنجامی ئەمەش گەدەیان دەکشێ و تووشی پەشۆکانی هەرسکردن دەبن، ئەگەریش تووی نەخۆشی کرمی قولآبی بن، ئەوا ئەنجامەکەی لەسەر ئەوان ترسناك دەبێت[٢٨٢].

دەتوانرێت بگوترێت نەخۆشی کرمی قولآبی یەکێکە لەو سێ نەخۆشییەی کە خەڵکی عێراق، بەشێوەیەکی تایبەت لادێیەکان، تووشی کەمخوێنی و لاوازبوونی بەرگری دەکات. دوو نەخۆشییەکەی دیکەش بریتین لە مەلاریا و بەلهارزیا. دەکرێت ئاماژە بۆ ئەوە بکەین، رێژەی تووشبووان بە بەلهارزیا لە نێوان دانیشتوانی باشووری عێراق دەگاتە ٪٨٠ ، تەنانەت" لە هەندێك ناوچەی شاری دیوانیە خەڵك لە بەلهارزیا راهاتووە ئەگەر یەکێك تووشی ئەو نەخۆشیە نەبێت، ئەوا بە بابەتێکی نائاسایی دەزانرێت"[٢٨٣].

---

[٢٨٠] المصدر السابق ، ص ١٨٣

[٢٨١] المصدر السابق ، ص ٢٢٦

[٢٨٢] Hisham witry (op.cit) p 18

[٢٨٣] متي عقراوي (المصدر السابق) ص ٢٢٤- ٢٢٥

سەبارەت بە نەخۆشی مەلاریا، ئەوا زۆر خراپترە. دکتۆر هاشم وەتری لەساڵی ١٩٤٤ دەڵێ: لە عێراق مەلاریا لە هەموو نەخۆشییەکی دیکە زیاتر بڵاوە[٢٨٤]. ئەوەی شایەنی باسکردنە، ئەم نەخۆشیە لە عێراق کەمبۆتەوە دوای ئەوەی گۆماوەکان بەدەرمانی دی دی تی دەرشێنرێت، بەڵام بەر لەوە نەخۆشییەکی باو بوو، بە ئاسایی دادەنرا، بەتایبەتی لەناوچەی کەربەلا و بەسرا. خەڵکی ئەوی بە(گەرمی و ساردی ) ناویان دەبرد. دەگمەن بوو کەسێ بدۆزینەوە لەژیانی زیاتر لەجارێکی تووشی ئەو نەخۆشییە نەبووبێت.

پوختەی قسەکان ئەوەیە ئەو سێ نەخۆشییە، ئێستاشی لەگەڵدابێت هۆکاری لاوازی بەرگریی جەستەیی لەلای دانیشتوان بەتایبەتی لەلای خەڵکی لادێکان. هەر ئەو نەخۆشیانەش هۆکارن بۆ نەخۆشیە گوزاراوەکان و پەتاکان، وەك نەخۆشی سیل و تیفۆئید و کولیرا و چەندین نەخۆشی دیکە. جا لێرەدا دەبێت ئاماژە بۆ ئەوە بکەین بڵاوبوونەوەی نەخۆشی لە لادێکان رۆڵێکی گرنگی هەیە لە پێکهێنانی کەسێتی، چونکە وایکردووە تێروانینی کەسی لادێی تێروانینی بۆ ژیان لەگەڵ کەسی بەدو جیاواز بێت، لەوانە کەسی لادێی پێویستی بە پەناگەیەکی دەروونی هەیە، دوای تووشبوونی بەنەخۆشییەکە پەنای بۆ ببات، بۆ ئەمەش روو لە مەزارگەیەکی پیرۆز دەکات بۆ ئەوەی ئازاری کەم بکاتەوە نەزاشی بۆ دەکات تا شیفای بدات. هەروەها کەسی لادێی روو دەکاتە پیاوچاکان و وەلییەکان بۆ ئەوەی شەفاعەتی لەلای خودا بۆ بکەن، ئەمەش بابەتێکە لەبەشی داهاتوو بەوردی دەگەڕێینەوە باسی دەکەین.

کەسی لادێی درك بەوە دەکات، لە زۆربەی حاڵەتەکان تەنها شمشێر سوودی بۆ ئەو نییە، وەك ئەوەی پیاوی بەدو سوودی لێ دەبینی. ئەو کاتێك تووشی نەخۆشی دەبێت ناتوانێت بێڵەکەی هەڵبگرێت، جا چۆن دەتوانێت شمشێر هەڵگرێت، بۆیە کاتێك دونیا لە دەوربەری گۆڕاوە ئەوا تێروانینشی بۆ دونیا دەگۆڕێت.

## پوختـــە

[٢٨٤] Hashim watry ( op.cit ) p 16

ئەم بەشە بەوە پوخت دەکەینەوە و دەڵێین: هۆزەکانی بەدو کاتێك دێنە عێراق دەکەونە ژێر باروودۆخێکی قورس کە پێشتر لەژیانی بیابان نەیانبینوە، هەر لەبەرئەمەش لەعێراق بەدەست کۆمەڵێك فشاری دەروونی وکۆمەڵایەتی دەناڵێنیّ و تواناشی نابێت کەم تا زۆر دەست بە بەها رەسەنەکانی بیابانشینی بگرێت.

هۆزەکان بە رۆشنبیری بیابانشینی و پێکهاتە وخەسڵەتەکانییەوە دێنە عێراق، لە شانازیکردنیش بەو رۆشنبیرییەوە بەردەوام دەبن، رێزێکی گەورەی لیّ دەگرن، بەڵام ئەو باروودۆخەی لەعێراق هەیە ناچاریان دەکات لە بەشێکی خەسڵەتەکانی لابدەن. لەوانەشە دروست بێت بڵێین ئەمە دەبێتە هۆی دەرکەوتنی ململانێیەکی دەروونی لەپێکهاتەی کەسێتی لادێیدا. کەسی لادێی لەناخی دەروونییەوە دەیەویّ وەك پێشوو بەدو بێت لە هەموو خەسڵەتەکانیدا، بەڵام دەبینی لەزۆر حاڵەتدا لەمەدا کەم توانایە.

## بەشی نۆیەم

### رووخسارەکانی دینداری لەعێراقدا

زۆرێك لە فەیلەسوف و زانایان مەیلی ئەوەیان هەیە بڵێن، دەروونی مرۆیی پێویستی بە دینداری هەیە، وەك چۆن جەستە پێویستی بە خۆراك هەیە، بۆیە دینداری وەك ئەوەیە خۆراکێکی دەروونی بێت بۆ مرۆڤ. مرۆڤ هەمیشە لە ژێر هەڕەشەی مەترسی و کێشەکان دایە، ئەو لە مردن دەترسێت، کەوات پێویستی بە باوەڕ و کەشێکی ئایینی هەیە بۆئەوەی لە رووبەڕووبوونەوەی ئەو بابەتە ترسێنەرانە هاوکاری بکات، توانای بەهێز بکات، ئاسوودەیی بخاتە دەروونییەوە.

مرۆڤ لەمەدا جیاوازی لەگەڵ ئاژەڵان هەیە، ئاژەڵ لە چرکەساتی ئێستا دەژیت، نازانێ قەدەر چ کارەساتێکی بۆ حەشارداوە، کەچی مرۆڤ توانای بیرکردنەوە وبەدەستهێنانی دەرئەنجامەکانی هەیە، ئەگەر دەبینی کەسێك تووشی کارەساتێك بووە، ئەوا خەیاڵی ئەوە دەکات زوو یان درەنگ ئەو کارەساتە بەسەر ئەویش دێت. کاتێك مرۆڤ دەبینی کەسانی پێشوو هەموویان مردوون، یان لە سەرمەرگدا، ئەوا درك بەوە دەکات ئەویش دەبێت بمرێت، لەبەر ئەمەش پێویستی بە هۆکارێکە بۆ هیوا وگەشبینی بۆ ئەوەی رووبەڕووی مردن و کارەساتەکان ببێتەوە.

توێژەران لەزۆربەی ناوچەکانی زەوی گەڕاون، توێژینەوەیان لەبارەی زۆربەی گەلانی سەر زەوی کردووە، جا گەلانی سەرەتایی بن یان شارستانی. گەلێکیان نەدۆزیوەتەوە بە شێوەیەك لە شێوەکان دیندار نەبێت. بیروباوەڕ و کەسە ئاینیەکان لە گەلێکەوە بۆ گەلێکی دیکە دەگۆڕێت، بەڵام لەنێو هەمووشیان بوونی هەیە.

هەندێك جار لەنێو هەندێك گەلانی شارستانی دەردەکەوێت، کەسانێك باوەڕیان بە ئایین نییە، یان رەخنە لە ئایینەکان دەگرن، هەرچەندە ژمارەی ئەوانە لە سەدەی نوێییەوە زیاتر دەبێت، بەڵام لەگەڵئەوەشدا ژمارەیان لە بەرامبەر زۆرینەی دانیشتوانی جیهان کەمە، تەنانەت دەتوانین بەپێی یاسای گشتی ئەوان بەریزپەڕ دابنێین، ناشزانین چارەنووسیان لە ئاییندا دا چی دەبێت، ئایا ژمارەیان زیاد دەبێت، یان کەم دەکات؟ ئەمەیان خودا دەزانێ!

هەرچۆنێك بێت ئەو کەسانە سەرەڕای خۆدەرخستنیان بەوەی باوەڕیان بە ئایین نییە، کەچی لەناخی دەروونیان خاڵی نین لە دینداری، جا زۆر یان کەم. کاتێك تووشی کارەستێك دەبێت یان لەمەرگ نزیك دەبنەوە، ئەوا سەیری ئاسمان دەکەن و شتێك لە خۆزگە و باوەڕ بە نەجاتبوونی لێ چاوەڕوان دەکەن. پێشینان درکیان بەمە کردووە، ئەوان کاتێك لەناو کەشتییەك دەبن و خەریکە نقوم دەبن ئەوا یەکێك لە دەهرییەکانیان لەگەڵ دەبێت، بینیان ئەویش وەك ئەوان دەستی بۆ خاڵی گەردوون بەرز کردۆتەوە، بەگەرموگوڕی داوای نەجاتبوونی لێ دەکات.

دەبێت لێرەدا ئاماژە بۆ ئەوە بکەین، ناکرێت رووخسارەکانی دینداری لە هەموو هەموو گەلان وەك یەك بێت، بەڵکو بەپێی جیاوازی رۆشنبیری و سروشتی ئەو کێشە و مەترسیانەی رووبەروویان دەبێتەوە، دەگۆڕێت. کاتێك ئایینێك لەنێو نەتەوەیەك دەردەکەوێت، دەبینین ناتوانن بۆ ماوەیەکی زۆر پارێزگار لە رێنماییە سەرەتاییەکانی بکەن، ئەوان ناچارن گۆڕانکاری تێدا بکەن و یان بەپێی بارودۆخی نوێ بیگونجێنن.

ئایینی ئیسلام بەنموونە وەربگرە، سەرەتا نزیك بوو لە زگماکی و سادەیی، لەرووی باوەڕ و رێورەسمەکانەوە ئەو ئاڵۆزییەی تێدا نەبووە کە ئێستا لە زۆربەی وڵاتانی ئیسلامی بەدی دەکرێت. هەر یەکێك لە موسڵمانان لەو وڵاتانە بەشێکی لە رێنماییە سەرەتاییەکانی ئیسلام وەرگرتووە، ئاڵۆزیان کردووە و زێدەڕۆییان تێدا ئەنجام داوە، لەبەرامبەریشدا لایەنی دیکەیان فەرامۆش دەکەن، ئەمەش بە تێڕوانینی کۆمەڵایەتی بابەتێکی سروشتییە ناکرێت خۆمانی لێ بەدوور بگرین.

ئێمە زوڵم دەکەین کاتێك رەخنەیان لێ دەگرین لەبەر ئەوەی بەدوای باوەڕ و کەشە ئایینە هاوشێوەکانن، کەچی خودا لە قورئان دەفەرموێ(( **ولوشاء ربك لجعل الناس امة واحدة ولايزالون مختلفين** ))[285]. دەبێت ئاماژە بۆ ئەوە بکەین مانای وشە (**أمة**) لە زمانی قورئاندا جیاوازی هەیە لەو مانایەی کە ئێستا ناسراوە. مەبەست لەو وشەیە لەقورئاندا بۆ کۆمەڵە کەسێکە کە ئایینێکی دیاریکراویان هەبووبێت، کەواتە مانای ئەو ئایەتەی قورئانە ئەوەیە خەڵك لەئایینەکانیان جیاوازن، هێشتا بەجیاوازیش ماونەتەوە.

ئیبن خەلدون بۆچوونێکی لەوبارەیەوە لەسەر ئەو جیاوازییە هەیە، کاتێك باسی ناکۆکی توندی نێوان سەحابە دەکات لەدوای وەفاتی پێغەمبەرەوە، ئیبن خەلدون دەڵێ" ... باوەڕم وایە جیاوازییەکانیان بۆ داهاتووی ئوممەت رەحمەتە، چونکە هەرکەسێك یەکێکیان هەڵدەبژێرێ و یەکێکیان دەکات ئیمام و رێنیشاندەری خۆی..."[286]. ئیبن خەلدون بەمە ئاماژە بۆ ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر دەکات کە وتویەتی" **اختلاف امتي رحمة**" واتە (جیاوازی نێوان ئوممەتەکەم رەحمەتە). جا ئوممەتی ئیسلامیش دوای پێغەمبەرەکەی بووە چەندین رێباز وتایفە، وەك هەموو ئوممەتەکانی دیکە. ئەمەش سوننەتی خودایە لەسەر هەموو بەندەکانییەوە، بۆ ئەوانیش سوود و رەحمەتە.

**لەنێوان بیابانشینی و لادێدا:**

لەبەشێکی رابردوودا ئاماژەمان بۆ ئەوەکرد دینداری لە بیابان لەگەڵ رۆشنبیری کۆمەڵایەتی ئەوێ گونجابوو. کاتێك رۆشنبیری بیابانشینی خەسڵەتێکی بریتی دەبێت لە خۆزاڵکردن و جەنگی هەمیشەیی، ئەوا دینداری لە بیابان کاریگەر دەبێت بەو خەسڵەتەوە، کاتێکیش هۆزەکانی بەدو بەرەو لادێکانی عێراق دێن ئەوا دەبینین بەرە بەرە دینداریەکەیان دەگۆڕێت بەپێی ئەو بارودۆخەی کەپێشتر هۆزەکان نەیانبینیوە.

[285] سورة هود، الاية : ١١٨
[286] ابن خلدون (المقدمة) ص ٢١٨

تێبینی ئەوە دەکرێت باوەڕ وکەشە ئاینیەکانی ئێستا لە بیابان هەیە، هێشتا لە لایەنە زگماکییەکەی خۆی نزیکە. هێشتا دینداری لەوەی لە باوەڕهێنان بەخودا و پێغەمبەر و ئەنجامدانی فەرزەکانی نوێژ و ڕۆژوو و حەج تێپەڕی نەکردووە، کەچی لەڕووی ئاکاری کردەیی ئەوان هێشتا بە پێشنانیان دەچن لەسەرەتای ئیسلامدا، بەدوەکان جیاوازیان لەگەڵ ئەوان نییە، هێشتا دەمارگیری و داگیرکاری و تۆڵەکردنەوە و ڕەوشتی دیکەی هاوشێوەی ئەو ڕەوشتانەیان هەیە، پێشیانوایە بەو کارانەیان سەرپێچی فرمانی خودا و پێغەمبەر ناکەن.

هەندێك لەتوێژەران تێبینی دیاردەیەکی کۆمەڵایەتیان کردووە، لەسەردەمی عوسمانییەکاندا. ئەو دیاردەیە سەرنجی ڕاکێشاون بێئەوەی بتوانن هۆکارەکەی چییە، ئەویش بریتیە لەوەی زۆرێك لە هۆزەکانی بەدو دوای هاتنیان بۆ عێراق بۆ ماوەیەکی زۆر یان کەم، چوونەتە سەر مەزهەبی شیعە. یەکێك لەوانەی ئاماژەی بۆ ئەو دیاردەیە کردووە، ئیبراهیم فەسح حەیدەرییە، لەکتێبەکەی دا کە ناونیشانی (عنوان المجد)ە، لەساڵی ١٢٨٦ نووسراوە کە دەکاتە نزیکەی سەد ساڵ لەمەوبەر. ئەو لە کتێبەکەی دا ناوی هەندێك لە هۆزەکانی هێناوە، ئەوانە بوونەتە شیعە و ئەو بە گوتەی خۆی بە( ڕەوافز) ناویان دەبات. بەشێوەی نزیکەیی مێژووی شیعەبوونی ئەو هۆزانەی دیارکردووە، بۆ نموونە دەڵێ هۆزی تەمیم نزیکەی شەست ساڵ دەبێت بۆتە شیعە، خەزاعل نزیکەی سەدوپەنجا ساڵ، زوبێد نزیکەی شەست ساڵ، کەعب نزیکەی سەد ساڵ، ڕوبەیعەش نزیکەی حەفتا ساڵێك دەبێت بووتە شیعە.

دواتر ناوی چەندین هۆزی دیکەش دەهێنێ بێئەوەی مێژووی شیعەگەریان دیاربکات، وەك هۆزی ئەلبومحەمەد و بەنی عمیر، خەزرەج ، شەمەر تۆقە، دفافعە، بەنی لام، ئال ئەقرەع، ئال بەدیر، جبور، جلیحە[287].

هەندێك لە توێژەران پێیانوایە ئەو گواستنەوە فراوانەی بەرەو شیعەگەری لە ئەنجامی کاریگەری پروپاگەندە بەهێزەکەی ناوەندەکانی شیعە بووە لەعێراق وەك حیلە و کەربەلا ونەجەف. ئەو بۆچوونە سەنگی خۆی هەیە، وەك دەزانرێت

[287] ابراهیم فصیح الحیدری (عنوان المجد) ص ١١٠-١١٤

ناوەندەکانی شیعە لەرابردوودا بە ئێستاشەوە، ژمارەیەکی زۆر قوتابخانەی ئایینی لەخۆیەوە دەکرێت، ئەو قوتابخانانەش لەسەر ئاستێکی فراوان فەقیە و خەتیبان پێدەگەینن، دواتر رەوانەی لای هۆزەکانی لادێیان دەکەن، ئەو خەڵکانەش دەبێت بەشێك کاریگەریان لەسەر ئەو هۆزانەوە هەبوو بێت، بەڵام دەمانەوێ لێرەدا بپرسین : ئەگەر ئەو فەقیە و خەتیبانە لە بیابان دەچوونە لای هۆزەکانی بەدو، ئایا لەتوانایان هەبوو هەمان کاریگەریان هەبێت کە لەسەر هۆزەکانی لادێیان هەبووە؟

هەر پروپاگەندەیەك، جا هەر جۆرێك بێت، ناتوانێت کاریگەری بەسەر میللەتێکەوە هەبێت، ئەگەر بارودۆخە کۆمەڵایەتیەکە بۆی گونجاو نەبێت. پروپاگەندە وەك رووەکە پێویستی بە خاکێکی گونجاو هەیە بۆ گەشەکردنی، ئەگەرهاتوو لەخاکێکی نەگونجاو دابنرێت، ئەوا ناتوانێت برووێت و گەشە بکات.

بەبڕوای من ئەو بارودۆخە دەروونی و کۆمەڵایەتیەی لە عێراق دەوری هۆزەکانی داوە، وایکردووە هۆزەکان لەسەر ئاستێکی فراوان کاریگەر بن، بە پرۆپاگەندەی شیعەگەرایی، بۆیە ئەگەر بارودۆخی نوێیان هاوشێوەی بارودۆخە کۆنەکە بووایە، ئەوا هۆزەکان هەرچەندین پرۆپاگەندەیان بەسەر زاڵ بکرایە، ئەوا هێشتا پابەند دەبوون بە عەقیدە و رێوەرەسمە کۆنەکان.

لێرەدا بۆچوونێکی سەیر دەگوازینەوە، هی شێخ عوسمان بن سندی بەسرییە، ئەمەش لەکتێبەکەی هاتووە بەناوی ( مطالع السعود بطيب أخبار الوالي داود) بەسرێ ئەو کتێبەی لەساڵی ١٢٤٢ی کۆچی نووسیوە، لە بارەی هۆزە بەناوبانگەکەی زوبێد لەعێراقدا دەڵێ"... شێخەکانی ئەو هۆزە لە ئەهلی سوننە بوون، دواتر بوونە رەوافیز (شیعە)، ئەمەش بە هۆکاری ئەوەی شیعە بانگخواز و خەتیبی خۆیان هەیە، ئەوان بەناو هۆزەکانی بەدو دەگەڕێت و ئامۆژگاریان دەکەن و بەدنیازی خۆیان هەڵدەرژێن، بەدوەکان خەڵکی عەوام و گێلن، هیچ شتێك لەبارەی ئایین و عەقیدە نازانن، هەر لەبەرئەوەش هەندێکیان گومڕابوون و هاتنەسەر رێبازی قسەگوتن بەسەحابەکان، ئەگەر خودا دەوڵەتی پایەبەرز لەو بابەتە ترسناکە ئاگادار بکاتەوە، کە رووبەرووی دەوڵەت دەبێتەوە، ئەوا دەزانێ تەنها زیانەکەی

بۆ ئایین نییە، بەڵکو زیانتی بۆ مەلیك و سیاسەتیش هەیە. هەر کاتێك دەوڵەت لەسەر مەزهەبێکەوە بێت و هەندێکیش خەڵك لەو مەزهەبە دەربچن، ئەوا ئەو خەڵکانە کۆسپ وئاژاوەی ئەوتۆ بەرپا دەکەن کە دەوڵەت ناتوانێ سەرکوتیان بکاتەوە... پێویست بوو دەوڵەت سیخوری لە بیابان هەبێت لەلای بەدوەکان بۆ ئەوەی رێگری لە بەدنیازی رەوافیز بکات، یانیش دەبوایە زانیایانی ئەهلی سوننە رەوانەی لای ئەو خەڵکە عەوامە بکات، بۆ ئەوەی فێریان بکات، کە چۆن دەست بە مەزهەبی سوننە و جەماعەتەوە بگرن، بۆئەوەی کاتێك بۆ مەزهەبێکی دیکە گوێزرانەوە، ئەوا بەشێوەیەکی هێواش بێت، نەوەك بەو خێراییەی کە لەلای ئەو عەوامە مێشك بەتاڵانە بینیمان.."[288].

شێخی بەسرى پێیوایە تەنها پروپاگەندە دەتوانێت خەڵك لەسەر مەزهەبێك جێگر بکات، یانیش بیانخاتە سەر مەزهەبێکی دیکەوە، لەراستیدا زۆرێك لە بیرمەندانی سەدەکانی کۆن نموونەی ئەو بۆچوونەیان هەبوو، تەنانەت هەندێك تا ئەمرۆ ئەو بۆچوونەیان ماوە و پێیانوایە بەهۆی ئامۆژگاری و قسەوە، مرۆڤ دەکەوێتە ژێر هەر کاریگەرییەکەوە، لە باوەڕ و ئاکاریدا. ئەوان ئاگاداری هەقیقەتی مرۆڤ نین، کە چۆن زیاتر بە بارودۆخە واقیعیەکەی کاریگەر دەبێت نەوەك بەو بیرۆکە ئایدیالانەی کە ئامۆژگاری بۆ دەکرێت، ئامۆژگاریش سوودی نابێت تەنها ئەو کاتە نەبێت لەگەڵ بارودۆخی واقیعی گونجاو کۆك بێت.

**شیعەگەری لە عێراقدا:**

بۆئەوەی لەو بارودۆخە بگەین کە وای لە هۆزەکانی عێراق کردووە، مەیلیان بەلای شیعەوە هەبێت، دەبێت شتێك لە بارەی مێژووی شیعەگەری لەعێراق تاوتوێ بکەین. لەراستیشدا ئەو بابەتە درێژ وئاڵۆزە، هەوڵدەدەین بە وردی لەکتێبی داهاتوو توێژینەوەی لەسەر بکەین. لێرەدا دەتوانین تەنها ئەوەندە بڵێین عێراق زێدی لەدایکبوونی شیعەیە هەر لەسەرەتاوە و دواتر لەوڵاتانی دیکە بڵاوبۆتەوە.

[288] ابن سند البصري (مطالع السعود) – اختصار أمين الحلواني – ص ١٦٩-١٧٠

هەندێك لەتوێژەران لەسەدەی رابردوودا پێیانوابوو، شیعەگەری سەرچاوەیەکی فارسی هەیە، دواجار هەڵەی ئەو بۆچوونە دەرکەوت[٢٨٩]، چونکە زۆرینەی فارس لە ئەهلی سوننە وجەماعەت بوون، لەسەر ئەو مەزهەبەش مانەوە تا سەدەی دەیەمی کۆچی، لەنێو ئەوانیش زۆرێك لەزانایانی سوننە پێگەیشتووە[٢٩٠]، جا ئەوان نەبوونە شیعە تەنها بەزۆر نەبێت لەسەردەمی دەوڵەتی سەفەویدا، وەك پێشتریش ئاماژەمان بۆ کرد.

شیعەگەری لەنێو ئەو هۆزانەی عەرەب دەرکەوت، کە لە کوفە نیشتەجێ بوون. دواتر بەرە بەرە لەنێو خەڵکی سەواد بڵاوبۆیەوە، واتە لەنێو ئەو مەوالیانەی لەناوچە نیشتەنییەکانی عێراق نیشتەجێ بوون. شیعەگەری لە عێراق لەسەرەتادا هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ مەزهەبەکانی دیکەی ئیسلامی نەبوو، تەنها لە ئاراستە سیاسیەکەی نەبێت، واتە مەزهەبێکی شۆرشگێری بوو پاڵپشتی عەلەوییەکانی دەکرد لەشۆرشەکەیان لەدژی ئەمەوییەکان.

کاتێك دەوڵەتی عەباسی دەرکەوت و بەسەر دەوڵەتی ئەمەوییەکان زاڵ بوو، ئەمە بە سەرکەوتنی شیعەگەری لە قەڵەم درا، چونکە عەباسیەکان لەسەردەمی ئەمەوییەکان لە شیعەکان بوون، لەگەڵ ئامۆزاکانیان لەشۆرشی دژە ئەمەوییەکان بەشدار بوون. ئیبن خەلدون دەوڵەتی عەباسی بە دەوڵەتێکی شیعە دادەنێت[٢٩١]، بەڵام شیعەگەری ئەو دەوڵەتە زۆر بەردەوام نەبوو، کاتێك ململانێیەکی توند لەنێوان عەباسیەکان و عەلەوییەکان دروست بوو ئەوا شیعەکان لەعێراق بوون بەدوو بەشەوە، یەکێکیان لایەنگیری عەباسییەکان کرد و ئەوانە " ئەهلی سوننە و جەماعەت" ناودەبرێن، بەڵام بەشی دووەم ئەوان لایەنگیری عەلەوییەکانیان کرد، ئەوان هەر بەناوی (شیعە) وە پابەند بوون.

شێخ عبدولعەزیزی دەهلەوی دەڵێ" ئەهلی سوننە لەشیعە دڵسۆزەکان بوون، بەڵام بۆ خۆلادان لە تێکەڵبوون نازناوی شیعەیان جێهێشت. ئەمەش وەك

---

[٢٨٩] أدم متز (الحضارة الاسلامية في القرن الرابع الهجري ) – ترجمة محمد عبدالهادي أبو ريدة، ج١، ص ٩٦

[٢٩٠] ابن خلدون (المقدمة) ص ٥٤٣-٥٤٥

[٢٩١] ابن خلدون (كتاب العبر و ديوان المبتدأ والخبر) ج ٣، ص ٣٦٩

رقبوونەوە لەوەی لەناودا لەگەڵ شیعە سەبئییەکان هاوبەش بن، تەنانەت لە هەندێك کتێب لەوانە (تاريخ الواقدي والاستيعاب) هاتووە فلان شیعەیە، ئەمەش نموونەیەکە دژی ئەوانی دیکە نییە، چونکە رێبەرانی ئەهلی سوننە وجەماعەت، شیعە بوون، مەبەستیش لەمە شیعەی سەرەتا بوو کە ئەهلی سوننەش بەشێك بوون لەوان.."[292].

بەهەرحاڵ، هەرچۆنێك بێت ئەو دابەشبوونەی لەنێوان شیعە و ئەهلی سوننە روویدا ئەوا کاریگەری گەورەی لەسەر سروشتی کۆمەڵگای عێراقی هەبوو، تەنانەت دەتوانرێت بگوترێت وڵاتێکی ئیسلامی نییە هاوشێوەی عێراق بێت لە دروستبوونی ململانێ لەنێوان ئەو دوو تایفەدا. ئەو دوو تایفەیە کە لە سەرەتادا یەك بوون، دواجار بوون بە دووانەی جیاواز لەزۆر رووی عەقیدە و رێورەسمەکانەوە. ئەو جیاوازیانەش نەوە دوای نەوە زیادی دەکرد و کەڵەکە دەبوو، ئەمەش بابەتێکی سروشتیە، شایەنی سەرسام بوون نییە، ململانێی مرۆڤ بە تێپەربوونی رۆژگار توندرەوی و زێدەرۆیی لەلای بەشداربووانی دەردەکەوێت، هەر لایەنێك تێیدا لەلایەن خۆیەوە توندرەو دەبێت و زیاتر زێدەرۆیی لەو بیرۆکەیە دەکات کە کۆمەڵەکەی دیکەی نەیاریەتی، دواتریش هەرچەندە ململانێی و مشتومڕی نێوانیان درێژتر بێتەوە ئەوا توندرەوی لەنێوانیان دروست دەبێت.

ئەمەش دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی گشتییە تەنها لەبابەتی ململانێی تایفی قەتیس ناکرێت، بەڵکو هەموو جۆرەکانی دیکەی ململانێ مرۆیی لەخۆیەوە دەگرێت. ئەو توندرەوییەی ئێستا لە ململانێی نێوان حزبەکان و دوڵەتان و گەلان دەیبینین، لە زۆر رووەوە جیاوازییەکی زۆری لەگەڵ ململانێی نێوان شیعە و سوننەوە نییە.

هەندێك لەبیرمەندان لەبەرئەوە ئاین رەتدەکەنەوە، چونکە بەبۆچوونی ئەوان دوژمنایەتی و رکابەری دەخاتە نێوان خەڵکەوە، کەچی ئەوان بیریان چووە کە ململانێی بابەتێکی سروشتی مرۆڤە، ئەگەریش بە پاڵنەری دەمارگیری ئایینی ململانێی نەکەن، ئەوا بە پاڵنەرێکی دیکە ململانێیەکە ئەنجام دەدەن. دەکرێت بگوترێت مرۆڤ ململانێی مانەوەی لە ئاژەڵی باپیرەیەوە بۆ بەمیرات ماوەتەوە!

---

[292] عبدالعزيز الدهلوي ( مختصر التحفة الاثني عشرية) تلخيص محمود شكري الالوسي ص ٧

**ئایین و کۆمەڵگا:**

لێرەدا مەبەستمان نییە یەکێك لە شیعەگەری یان سوننەگەری بە چاکتر بزانین و بەڵگەی دروستی بۆ راستی یەکێکیان بهێنینەوە، کە کامەیان لە روحی ئیسلام نزیکە. ئەمە لە پسپۆڕی پیاوانی ئایین و زانیانی کەلامە، ئەوانە بێهودە ئیستاشی لەگەڵدا بێت مشتومڕ لەسەر ئەو بابەتە دەکەن. ئەوەی ئێمە لەوبارەیەوە مەبەستمانە ئەوەیە تاوتوێی ئەو دوو مەزهەبە بکەین لەرووی پەیوەندیان بە کۆمەڵگاوە، ئەمەیش بابەتێکی گرنگی بابەتەکانی کۆمەڵناسی نوێیە، کە بە کۆمەڵناسی ئایینی ناودەبرێت.

خەریکە باوەڕی ئەوەم هەبێت یەکێك لە هۆکارەکانی زیادبوونی کەلێن و جیاوازی نێوان شیعە و سوننە، ئەو سەرچاوە بژێوییە کە پیاوانی ئایینی هەردوو مەزهەبە لەسەری دەژین. پیاوی ئایینی سوننی بۆ بژێوی خۆی پشت بە حکومەت دەبەستێ، کەچی هاوکارە شیعیەکەی پشت بە عەوامی خەڵك دەبەستێ. ئەمەش وا دەکات هەر یەکەیان بە تێڕوانینێك سەیری ژیان بکات، لەتێڕوانینی ئەویتر جیاواز بێت.

ئەهلی سوننە مەیلیان بەلای گوێڕایەڵی حکومەت هەیە، رێز لە فرمانەکانی دەگرن، ئەوان بڕوایان وایە سوڵتان سێبەری خودایە لەسەر زەوی، گوێڕەیەڵی سوڵتانیش گوێڕەیەڵبوونە بۆ فرمانەکانی خودا، لەمەشدا پشت بەو ئایەتە دەبەستن کە دەفەرموێ(( اطیعوا الله و أطیعوا الرسول و أولی الامر منکم )) جا ئەو (اولی الامر)ە، ئەوان دەبێت گوێڕایەڵی بن، ئەگەر بەدکار و زۆرداریش بێت[٢٩٣].

کەچی شیعەکان بە رەخنە و رقەوە لەحکومەت دەڕوانن، ئەوان دوورەپەرێزی لە حکومەت دەکەن، حەز ناکەن لێی نزیك ببنەوە، یان حەز ناکەن پاداشت و مووچەی لێ وەربگرن. کولتوری شۆڕشگێڕیان وایان لێ دەکات گریمانەی ئەوە بکەن سوڵتان دەبێت وەك عەلی کوڕی ئەبی تاڵب بێت لە دادپەروەری و زوهدا، کاتێکیش زانیان سوڵتان توانای ئەوەی نییە، ئەوا سەرزەنشتی دەکەن و فەرامۆشی دەکەن.

[٢٩٣] ابو یوسف (کتاب الخراج) ص١٠-١١.

دەتوانین بڵێین شیعە لە پەتی حکومەت نەجاتیان بوو، کەوتنە پەتی عەوامەوە. پیاوانی ئایینی لەناو شیعە لەسەر زەکات و (پێنجیەکی)، یان لەسەر یەك لەسێ ماڵی مردووان دەژین، ئەمەشی لایەنی باش و خراپی خۆی هەیە وەك هەموو بابەتەکانی دیکەی ژیانی مرۆڤایەتی[٢٩٤].

**لایەنی چاکە:**

لەوانەیە زیدەڕۆیی نەکەم، ئەگەر بڵێم فەقێیەکانی شیعە لەهەموو کەسێك زیاتر کۆشش بۆ بەدەسهێنانی زانستە ئایینی و زمانەوانییەکان دەکەن و کێبرکێی لەسەر دەکەن. ئەوان لەسەر مووچەی تایبەت ناژین لەحکومەتەوە بۆیان بێت، بەڵکو لەسەر ئەو داهاتە دەژین کە لەلایەن خەڵکەوە بۆیان دێت، سروشتی خەڵکیش وایە ئاگاداری سامانی خۆیانن و پارە بەفەقێیەك نادەن، باوەڕیان بەزانست و تەقواکەی نەبێت. لەبەرئەمەشە هەر فەقێیەکی شیعی دڵنیایە لەوەی چارەنووسی بژێوی و کۆمەڵایەتی بەندە بە بری قوڵبوونەوەی لەزانست و زوهدی لەدونیادا.

ئەوەی سەردانی نەجەف بکات، ئەمە بەڕوونی دەبینیت. ئەو شارە ئێستا بۆتە مەڵبەندی شیعەگەری لەهەموو وڵاتانی ئیسلامی، بەشێوەیەك هەموو فەقێ وقوتابیان وڵاتی شیعەگەری، لەوێ کۆدەبنەوە. من چەندین جار سەردانی نەجەف کردووە، تەنانەت بەختی ئەوەم هەبووە دیداری مەرجەعی باڵا موحسین حەکیم بکەم. من ئیعتراف بەوە دەکەم کەسانێکم نەدیوە وەك خەڵکەکەی ئەوەی سەرقاڵ بێت بەزانست و کێبرکێ لەسەر بکات.

لەراستیدا زۆرێك لەوان بەدەست بێبەشبوون و سەختی ژیان دەناڵێنن، چونکە ئەو داهاتەی بۆیان دێت بەشی ژیانێکی خۆشگوزەران ناکات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەوان بەشێوەیەکی سەرقاڵی خوێندنن، مایەی سەرسامبوونە. هەر یەکێك لەوان هیوای ئەوە دەخوازێ بە زانست و زوهدەکەی رەزامەندی خەڵك وەربگرێت، ئەمەش ئەو ئامانجەیە بەدرێژایی ژیانی هەوڵی بۆ دەدات. کاتێکیش دوای کۆششێکی زۆر بەو ئامانجەی دەگات و دەبێتە موجتەهیدێکی بەناوبانگ ئەوا

---

[٢٩٤] علي الوردي (وعاظ السلاطين) ص ٣٩٤

ناتوانێ شوێنەکەی خۆی بۆ خۆشگوزەرانی و خۆمەزنکردن بەکاربهێنێت. کاتێکیش هەندێك ئاماژەی خۆشگوزەرانی بە جلوبەرگ و ماڵەکەی دیاربوو، ئەوا قسەوقسەلۆکی لەبارەوە دروست دەبێت، بەرە بەرە پێگە بەرزەکەی لەدەست دەدات.

ڕۆژنامەنووسێکی میسری سەردانی چەند موجتەهیدێکی گەورە دەکات لەنەجەف، لە ڕۆژنامە لەسەریان دەنووسێ و سەرسامی خۆی بە ژیانی زوهد و سادەییەکەی ئەوان دەردەبڕێت، سەرەڕای ئەوان دەسەڵاتیان بەسەر دەیان ملیۆن خەڵك هەیە، لەهەر کوێیەك بێت سامانیان بۆ دێت. ئەو ڕۆژنامەنووسە نازانێ دەسەلاتی ئەوان بەسەرخەلکەوە لەزوهدەکەیان وەرگیراوە، ئەگەر ئەوان خۆشگوزەران بن ئەوا ئەو دەسەلاتەیان لەدەست دەدەن.

**لایەنی خراپ:**

ئەوەی ژیانی باسکردن بێت، فەقێیەکانی شیعە میراتگری موعتەزیلەن لەئاراستەی فەلسەفەکاری وئازادای بیرکردنەوە[295]. لەبەر ئەمەش لە پێشختنی فیقهی خۆیان گەیشتوونەتە پلەیەکی بەرزی وردەکاری و فرەیی، ئەوەی لەمەشدا هاوکاری کردوون ئەوان بابی ئیجتهادیان لە فیقهدا دانەخستووە. ئەوەی بازنەی خوێندن لەلای ئەوان ببینێ، سەرسام دەبێت لەو مشتومڕە قوڵانەی کە لەبواری فیقهدا ئەنجامی دەدەن.

لەهەمان کاتدا ئەودیاردەیە خاڵی نییە لەلایەنی خراپی. وەك دەزانرێت پیاوانی ئایینی شیعە فەلسەفەکاری ناکەن، تەنها لە ئەلقەکانی خوێندن و مشتومڕە تایبەتەکانیان نەبێت، ئەوان لەو جۆرە دانیشتنانە دەگەنە ئەوپەڕی ئازادی بیرکردنەوە و فراوانی ئیجتهادکردن، بەلام ناتوانن ئەمە بۆ عەوامی خەڵك ئاشکرا بکەن، لەترسی ئەوەی لەدژیان هەڵ بچن و لێیان پاشگەز ببنەوە. خەلکی عەوام بەشێوەیەکی گشتی لەکاروباری ئایینی خۆیان مەیلیان بۆ ئەفسانە هەیە، زۆرجاریش عەقیدە و ڕێورەسمی نوێ دادەهێنن، بەپێی بارودۆخی و پێویستیە کۆمەلایەتی و دەروونیەکانیان. تێبینی ئەوە دەکرێت پیاوانی ئایینی لەناو شیعە

[295] ادم متز (المصدر السابق) ج ۱، ص ۹۷

زۆرکات درك بەمە دەكن، بەڵام ناتوانن لەبەرامبەریدا شتێك بكەن. ئەوان زۆر لەخەڵكی عەوام دەترسن، حەزن ناكەن لەشتێك بەرەنگاریان ببنەوە زۆر كەم نەبێت.

هیبەدین شەهرستانی لە گۆڤاری (العلم ) ئاماژەی بۆ ئەو دیاردەیە كردووە، گۆڤارەكە بەر لەجەنگی یەكەمی جیهان دەردەچوو، شەهرستانی وتارێكی تێدا نووسیوە بەناوی ( زانایانمان و دەرخستنی هەقیقەت) لە وتارەكەی هاتووە".. لەو سەردەمانی دواییدا دەسەڵاتی رای گشتی بەسەر رای زانایان دەركەوتووە... وایلێهاتووە زانا و فەقیە قسە لەسەر مەترسییەكانی خۆی دەكات لەنێو قوتابیان، بە پێچەوانەی ئەوەی عەوام بەچاكی دەزانێ. لەكتێبە لۆژیكیەكانی خۆی ئەو شتانە هەڵدەبژێرێ، ئەوە نییە لەوتارە زانستیەكانی فەتوای لەبارەوە دەدات، لە فەتواكانیشی بۆ خەڵك چەندین هونەری سیاسەت و كوشكێشی بەكاردەهێنێ لەترسی هەڵچوونی خەڵك. تەنانەت فەقێیەك بۆی گێڕاینەوە كە یەكێك لەخەڵكی عەوام لێی پرسیوە: گوایە جولەكەیەك بۆ حوسێن گریاوە، فرمێسكەكەی كەوتۆتە سەر كراسەكەی ئەو، ئایا كراسەكە پیس بووە یان نا؟ فەقێیەكەش بەترسەوە وەڵامی دەداتەوە و دەڵێ: وەڵامی ئەو بابەتە لەلا فاتیمەی زەهرایە. یەكێكی دیكە لە فەقێیەكی پرسیوە بۆ لەلای كێ بۆ حوسێن سەری خۆ شەق بكات. ئەوا بەهەمان شێوەی پێشوو وەڵامی دەداتەوە. ئەو دیادەیە هەڕەشە لەئایین دەكات و سیماكەی لەناو دەبات و بنەماكانی دەتوێنێتەوە، چونكە نەزانەكانی میللەتان لەكەمی زانست و كەمی ئامادەییان، لاوازی خەسڵەتەكانیان مەیلیان بەلای خورافات و داهێنانی شتی نەخوازراو هەیە، ئەگەرهاتوو زانایان لێی بێدەنگ بوون و وەڵامیان نەدەنەوە، یان لەخواستەكانیان هاوكاریان كردن، ئەوا زیادكراوەكان بەسەر بنەماكانی ئایینەوە زاڵ دەبێت، بیدعە بەسەر هەقیقەتەوە زاڵ دەبێت، كاتێك شەریعەتی بتپەرستی و هەمەجی بەسەر ئایینەوە زاڵ بێت ئەوا نەتەوەكانیش هەڵدەتەكێن..."[٢٩٦].

---

[٢٩٦] مجلة العلم ، السنة الثانية ، ص ٢٦٦- ٢٦٧

**لەنێوان شیعەگەری و سوفیگەریدا :**

کاتێك دەبینین عەوامی خەڵك ئارەزوو دەکەن بیدعە لەعەقیدە و ڕێورەسمە ئایینیەکان بکەن، ناکرێت لەمەدا گلەیی لەوان بکەین، وەك لەسەرەتای ئەم بەشەدا ئاماژەمان بۆ کرد، ئەوان ناچارن ڕووبەرووی ئەو مەترسی و کێشانە ببنەوە کە لەژیانیاندا بەدەستیانەوە دەناڵێنن.

عەوامی خەڵك لەهەموو تایفە و ئایینەکان لەمەدا هاوشێوەن، ئەوان لە شێوەی ئەو عەقیدە و ڕێورەسمە جیاوازیان هەیە کە دایانهێناوە، ئەگینا لەرووی پاڵنەرەکەوە جیاوازیان نییە. ئەمەش بەروونی لەنێوان هەر یەکە لەشیعە و سوننە دەبینین، ئێمە کاتێك لە ناوچە سوننیە جیاجیاکان دەگەڕێین، بەجیاکردنەوەی خودی بیابان، ئەوا جۆرە عەقیدە و ڕێوەرەسمێکی ئایینی دەبینین، لەرووی بنەمای کۆمەڵایەتەکەی هیچ جیاوازی لەگەڵ ئەوە نییە کە لە شیعەکانی عێراقمان بینیوە. دەتوانین بڵێین سوفیگەری لەو وڵاتانە ئەو عەقیدە و ڕێورەسمانەی پێشکەشی خەڵك کردووە کە ئەوان پێویستیان پێیەتی، بەشێوەیەك دڵنیایی وگەشبینیان پێ دەدات، لەبەرامبەر کێشەکانی ژیان و مەترسیەکانی.

لەراستیدا لەم لایەنەوە لێکچوونێکی زۆر لەنێوان شیعەگەری وسوفیگەری هەیە، بۆیە بۆ هەر وڵاتێکی سوننی یان شیعی بچین، ئەوا مەزارگەی پیرۆز دەبین، خەڵك سەردانیان دەکەن و نزا و نەزریان بۆ دەکەن. هەروەها خەڵکی پیرۆزیش دەبینین خەڵك داوای بەرەکەتیان لێدەکەن، داوای پاڵپشتیان لێدەکەن لە ناخۆشی و شیفای نەخۆشیەکان. سەیدەکانی شیعە بەو ئەرکە دەروونییە هەڵدەسن، لەلای ئەهلی سوننە شێخەکانی سۆفیگەری ئەو ئەرکە دەبینن....

یەکێك لەو بابەتانەی لەمیسر سەرنجی راکێشام ئەوەبوو زیارەتی (سەید بەدوی) لە تەنتا، جیاوازییەکی زۆری لەگەڵ زیارەتکردن حوسێن نەبوو لەکەربەلا، هەروەها بینیم سوفییەکان بەبۆنەی لەدایکبوونی زەینەب و حوسێن ئاهەنگ دەگێرن، ئەلقەی زیکر ساز دەکەن و بە کەژاوە وئاڵاوە دەردەکەون، هاوشێوەی ئەوەی شیعەکان لەیادی مردنی ئیمامەکانیان دەیکەن.

ئیبن خەلدون لە کتێبی موقەدیمە (المقدمە)[٢٩٧] ئاماژەی بۆ ئەو لێکچوونە کردووە کە لەنێوان باوەڕی سوفیگەری و باوەڕی شیعەگەری هەیە، ئەو دەڵێ" وەك دەرکەوت سوفیەکانیش باسی (قوتب) دەکەن، ئەمەش مانای سەرۆکی عارفەکانە، بڕوایان وایە کەسێك لەپێگەی مەعریفەدا هاوشانی نییە، تا خوا گیانی دەکێشێ، دواتر یەکێکی دیکە لە ئەهلی عیرفان دەبێتە میراتگری.... ئەمە هەمان ئەو شتەیە کە رافیزەکان لە میراتگری ئیمامەکان باسی دەکەن، سەیر بکە چۆن ئەو کەسانە بۆچوونی رافیزەکانیان بردووە، باوەڕیان پێیەتی. دواتر باسیان لە رێکخستنی شوێنگرەوەی ئەو قوتبە کردووە، وەك چۆن شیعەکان باسی نەقیبەکانیان کردووە. تەنانەت ئەوان کاتێك دەیەوێ بچنە ناو سوفیگەریەوە بۆئەوەی بیکەنە رێباز و باوەڕێك بۆخۆیان ئەوەی لەلای عەلی (خوا لێی رازی بێ) دەوەستن، ئەمەش هەمان مانای هەیە... کەچی عەلی لەنێوان سەحابەکاندا نە رێباز و نە مەزهەبی تایبەتی خۆی هەبوو.... دواتر لە مەعریفەت بەخودا کردیان بەقوتب، چونکە سەرۆکی عاریفەکانە، دواتریش جیایان کردۆتەوە وەك لێکچواندن بە ئیمام لەروخساردا، دەبێت لە ناوخنیشدا هاوشێوە بێت...بیر لە قسەی ئەو سوفیانە بکەوە لەبارەی (فاتمی: بەواتەی مەهدی چاوەڕوانکراو) گوتویانە، کتێبەکانیان پڕکردووە لەو باسەوە... ئەمەش لە قسەی شیعە و رافیزەکان و رێبازەکەیان وەرگیراوە. خوا رێنیشاندەری هەقە."[٢٩٨].

دکتۆر کامل شەبیبی، یەکێکە لە مامۆستایانی بەشی فەلسەفە لەزانکۆی بەغدا، ئەو توێژینەوەیەکی تێروتەسەلی لەوبارەیەوە هەیە. لەتوێژینەوەکەی دەریخستووە تا چەند پەیوەندی و هاوشێوەیی لەنێوان بیروباوەڕەکانی شیعەگەری و سوفیگەری هەیە[٢٩٩].

---

[٢٩٧] ئەو تێکسانەی هاوشێوەی تێکستی ئیبن خەلدونن، وەرگێڕانیان بۆ زمانی کوردی کارێکی زەحمەتە ئەگەر بمانەوێ وەرگێڕانێکی زۆر وردیان بۆ بکەین، چونکە بەزمان و روانبێژیەکی کۆن نووسراوە، بۆیە ئێمە تەنها ویستومانە بەپێی توانا ماناکە بگوازینەوە. وەرگێڕ

[٢٩٨] ابن حلدون (المقدمة) تحقيق علي عبدالواحد وافي – ج ٣، ص ١٠٧٤-١٠٧٥

[٢٩٩] بگەڕێوە سەر کتێبەکەی بەناوی( الصلة بين التصوف و التشيع) بەم نزیکانەش کتێبێکی دیکە لەو بارەیەوە لەسەر هەمان بابەت دەردەچێت. عەلی وەردی

هەندێك لە پیاوانی ئایینی لەناو سوننە هەوڵ دەدەن رەخنە لە سۆفیگەری بگرن و نکۆڵی لە باوەڕ و کشەکانی بکەن، گوایە ئەمە بیدعەیە لە ئیسلام دا نییە، بەڵام هەوڵەکەیان پوچەڵ دەبێت. ئەوەی بەرەخنەگرتن لە سوفیگەری ناوبانگی هەبوو ئبن تەیمیە بوو، ئەو پیاوە دژایەتی سوفیگەری و شیعەگەری بەیەکەوە دەکرد، بانگەوازی بۆ موسڵمان دەکرد بۆئەوەی بگەڕێتەوە سەر رێنمایە سەرەتاکانی ئیسلام، بەڵام بۆچوونەکانی برەوی نەبوو، تەنها لە بیابان نەبێت، ئەویش بەچەند سەدە داوای مردنی بوو، کاتێك محەمەد عەبدولوەهاب دەرکەوت لەناوەڕاستی سەدەی هەشدەم، بانگەوازی بۆ هەمان بۆچونەکانی ئیبن تەیمیە دەکرد. لەناوچەکانی دیکەی وڵاتانی دیکەش ئیسلامیش خەڵك وەك خۆیان مانەوە، لەسەر رێبازی سوفیگەری یان شیعەگەری، ئەمەش بەپێی بارودۆخی خۆیان. ئەوان لە ژیانیان بەدەستی چەندین جۆر نەخۆشی و ستەم و نیگەرانی دەناڵێنن، کەواتە پێویستیان بەشتێك هەیە هاوکاریان بێت، لە رووبەڕووبوونەوە و بەرگەگرتن.

**دابەشبوونی تایفی لەعێراقدا:**

یەکێك لەو دیاردە کۆمەڵایەتیانەی لەعێراق جێگای سەرنجە ئەوەیە: دابەشبوونی تایفی لە ناوچە جیاجیاکان، بەگوێرەی پەیوەندی هەر ناوچەیەکە بە بیابانشینەوە. لە ناوچەی جەزیرە بەتایبەتی بەشی باکووری هەموو هۆز و شارەکان لەسەر مەزهەبی ئەهلی سوننەن، زۆر لەنزیکن لە عەقیدە و کەشە ئاینیەکانیان هاوشێوەی بەدوی بیابان بن، کەچی ناوچەی بچووك دەبینین، وەك ریزپەرێك کەمینەی ئایینی تێدا دەژێن لەوان شەبەك لەنزیکی موسڵ و نەسیریە لە نزیك عانە.

کاتێك کەمێك بەرەو باشوور دەڕۆین، دەبینین خەڵکەکە پارێزگاری لەسوننەبوونی خۆیان دەکەن، کەچی سوفیگەری لەنێویان پەرەدەستێنێ، بەڵام هەرکە دەگەینە ناوەڕاستی عێراق، تێبینی ئەوە دەکەین سوننەگەری لەنێو هۆز وشارەکان ون دەبێت شیعە جێگەی دەگرێتەوە. لەوێ دەبینین شیعەگەری لەلای هەندێك هۆز هەیە و لای هەندێکی دیکە نییە، تەنانەت لەوانەیە هەندێك هۆز لەیەك

شیعە و سوننە هەیە، واتە هەندێك لە لقەکانی هۆزەکە لەسەر مەزهەبی سوننەیە و بەشێکی دیکەش لەسەر مەزهەبی شیعەن، ئەمەش لە شارەکانیش بەدی دەکرێت، بەشێوەیەك دوو شاری دراوسێی یەکتر هەر یەکەیان لەسەر مەزهەبێکن، یان دوو گەڕەکی یەك شار، یەکیان سوننە و ئەویتریان شیعەیە.

ئەمەش بەشێوەیەکی تایبەت لە ناوچەی دیالە دەردەکەوێت، لەوێ تێکەڵبوونی تایفی دەگاتە ئەوپەڕی، رەنگە بتوانین بڵێین پێکەوەژیانی ئاشتیانە لەنێوان دوو تایفەکە زۆرە، دەگمەن نییە ببینین گەڕەکێکی سوننی بەشداری گەڕەکێکی شیعی بکات لە کەژاوە و دانیشتن لە حوسەینیەکان، تەنانەت بەشداری پیرۆزکردنی هەندێك لە مەزارگە و ئیمامەکانی یەکتریش دەکەن.

کاتێك لەناوەراستی عێراق بەرەو باشووری دەڕۆین، کە دەگەینە ناوچە نیشتەنییەکان، ئەوا شیعە لە هەموو لایەکەوە بەسەر ناوچەکە زاڵە، زۆر بە دەگمەن دەبینی لەو ناوچەیە هۆزێك یان شارێك یان گەڕەکێك سوننی بێت، ئەو ناوچەیە ئەوەیانە کە شیعە لەسەرەتادا لێی گەشەی کردووە، پروپاگەندەی شیعەگەراییش زۆر بەتوندی جەخت لەسەر ئەم ناوچەیە دەکاتەوە.

لەوپەڕی باشووری ناوچە نیشتەنییەکان و لەناوچەی بەسرا، هەندێك شوێنی بچووکی سوننە دەبنین، وەك شاری زوبێر و ئەبوخەسیب، چەند گەڕێکی سوق شیوخ و هەندێك ناوچەی دیکە. ئەوانە درەنگ لە بیابانەوە هاتوون، هێشتاش پەیوەندیان بە هۆزەکانی بیابانەوە ماوە، خەڵکانێکی کەمیش لە ئەهلی سوننە لە هەندێك ناوچەی نیشتەنییەکان دەژین وەك ناسرییە. ئەوەی تێبینیش دەکرێت ئەوان بەرە بەرە کەوتونەتە ژێر کاریگەری شیعەگەرایی، بۆیە بەشداری لە هەندێك رێورەسمی شیعەکان دەکەن و لە دانیشتنەکانیان بەشدار دەبن، تەنانەت هەندێکیان لە بۆنەکان کەژاوەی تایبەتیان دەبێت ئەمەش مانای ئەوەیە بەرە بەرە بەرەو شیعەگەرایی دەچن.

## ئامرازەکانی پروپاگەندەی شیعەگەرایی:

شیعەکان ڕێورەسمی ئایینی تایبەت بەخۆیان هەیە، ئەم ڕێورەسمانەش لە رابردوودا وەك مەزنترین هۆکار وئامرازی پروپاگەندەبوون بۆ کاریگەری لەسەر دەروون، لەخوارەوە ناوی گرنگترینیان دەهێنین:

١- سەردانی مەزارگە پیرۆزەکان: شیعە پارەیەکی زۆری لەبنیادنانی مەزارگەی ئیمامەکان خەرجکردووە، منارەی مەزارگەگان درێژ دەکاتەوە، گەومەزەکانیان زێرپۆش دەکات و ناوەوەی مەزارگەکانیش جوان نەخش دەکات، بەشێوەیەك هاوشێوەیان لەجیهان نییە، هەموو ئەمانەش کاریگەرییەکی زۆری لەسەر راکێشانی خەڵك هەیە بۆ شیعەگەری. کاتێك یەکێك سەردانی ئەو مەزارگانە دەکات ئەوا بە کەشە روحانیەکەی سەرسام دەبێت، هەرچەندیش زیاتر بۆ ئەو شوێنانە بکات، ئەوا کاریگەری شیعەگەری بەسەر ناخیدا زیاتر دەبێت.

٢- کەژاوە و کاروانی حوسەینی: شیعەکان لەوە راهاتوون لەدە رۆژی یەکەمی مانگی موحەرەم بە کەژاوە وکاروانی گەورە دەربکەون بۆ یادکردنەوەی کوشتنی حوسێن. ئەو کاروانانە بە شەقامەکان دەرون و ئاڵا و تەپڵ و زورنایان هەیە، چەندین قەسیدەی خەمناکی میللی تێدە دەخوێنێتەوە، خەڵکەکە لەسەنگی خۆیان دەدەن، بە زنجیر لەپشتی خۆیان دەدەن، لە رۆژی دەیەمیش مەراسیمی (تەتبیر) ئەنجام دەدەن، خەڵکەکە لەو مەراسیمە کفن دەپۆشن و خوێن لەسەریان دێتەخوارەوە، دواتریش نواندنی رووداوی کوشتنی حوسێن لە کەربەلا ئەنجام دەدرێت... هەڵچوونی سۆز دەگاتە ئەوپەڕی.

٣- پرسەکان: هەر پیاوماقوڵ و دەوڵەمەندێکی شیعە ئارەزوو دەکات پرسەیەکی دە رۆژی دابنێت، بۆ خوێندنەوەی بابەتی کوشتنی حوسێن، بەتایبەتیش لە مانگی موحەرەم و سەفەری هەر هەموو ساڵێك ئەمە دەکرێت. ئەوەی ئەو پرسانە ببینێ و گوێ لە شیعرە خەماوییەکان بێت کە لەلایەن خەتیبەکانی شیعەوە دەخوێنرێتەوە و تێیدا وەسفی کوشتنی حوسێن و کوڕان و برا و کەسوکاری دەکرێت، ئەوا مەیلی بۆ گریان دەبێت. خەتیبەکانی شیعە لەو بوارەدا هونەرکارییەکی سەیریان کردووە، بەشێوەیەك دەتوانن لەهەر

مەجلیسێکدا گریان و فیغان دروست بکەن. ئەو خەتیبانەش بەگوێرەی عەقڵ و زمانی خەڵک قەسە دەکەن، زۆرجاریش شیعی میللی بە دەنگێکی خەمبار و ئاوازدار دەخوێننەوە، کاریگەرییەکی زۆر دەخەنە سەر دەروون.

ئەو هۆکارانەی سەرەوە ئێستا لەلایەن خوێندەوارەکانی شیعە بۆتە کارێکی عەیب، زۆرێك لەپیاوانی شیعە پێی رازی نین و هەندێکیش نکۆڵیان لێکردووە و بەحەرامی دەزانن. لەراستیدا ئەو هۆکارانە ئەمڕۆ لەبری ئەو خەڵك بۆ لای شیعەگەری رابکێشن، ئەوان لێی دوور دەخەنەوە، بەڵام دەبێت ئەوە لەبیر نەکەین ئەو هۆکارانە لە سەدەکانی رابردوودا لەگەڵ عەقڵی خەڵك گونجاو بوو و دەیانتوانی کاریگەریان بەسەر خەڵکەوە هەبێت، تەنانەت لەگرنگترین هۆکارەکانی پروپاگەندە بوون، بەشێوەیەك پاڵنەر بوون بۆ بەشداریی عاتیفیانەی خەڵك و فرمێسك رشتن، دەرفەتێکیش بوو بۆ دەردە دڵی خەڵك کە بەدەست کێکردن و ئازاراوە دەیاننالاند.

لیدی درۆر دەگێڕێتەوە، ژنێکی مەسیحی نواندنی بەسەرهاتی حوسێنی لەمزگەوتی گەورەی کازمیە بینیوە لە رۆژی عاشورادا، سەیری خەڵکەکەی کردووە کە خەم بەسەریان زاڵە، بەم رووداوانە زۆر کاریگەر دەبێت، ئەوا فرمێسکی بەگوڕ دێتە خوارەوە. لەو کاتەدا ژنێکی شیعە دەیبینی و هاوار دەکات و دەڵێ" سوپاس بۆ خودا، هیدایەتی وەرگرت و بوو بە شیعە"[٣٠٠].

دکتۆر جوزیف درك بەرادەی کاریگەری ئەو ئامرازەی شیعەگەری کردووە لە هیند، لەوێ بینیویەتی شیعەگەری لەسەردەمێکی دوورەوە بڵاو بۆتەوە. شیعەکان لە هیند هاوشێوەی براکانیان لە عێراق پرسە و ماتەمینی دادەنێن و بە کەژاوە و ئاڵاوە لەشەقامەکان دەردەکەون. جوزیف دەڵێ ئەوان گەورەیی ئەو ستەمە دەردەخەن کە ئیمامەکانیان کراوە، بەمەش کاریگەرییەکی گەورە لەدەروونی خەڵك دروست دەکەن، چونکە مرۆڤ بە سروشتی خۆی مەیلی بەلای

[٣٠٠] ليدي درور (في بلاد الرافدين) ترجمة فؤاد جميل. ص٩٢

مەزڵوم هەیە تەنانەت ئەگەر لەسەر ناهەقیش بێت، لەبەرامبەر رقیان لە زاڵم دەبێتەوە ئەگەر لەسەر هەق بێت[301].

## ژنییە هەستیارەکان:

کاتێك هۆزەکانی بەدو دێنە عێراق دەکەونە ژێر کاریگەر پروپاگەندەی شیعەگەرایی، وەك پێشتر بینیمان ئەو پروپاگەندەیە ئامرازی زۆر سەرکەوتووی هەیە، ژنییە هەستیارەکان لە دڵی رۆڵەکانی ئەو هۆزانە دەژەنێ و زۆر بەهێزەوە بەرەو شیعەگەراییان کێش دەکات.

دوو بابەت هەیە پروپاگەندەی شیعە زۆر جەختی لەسەر دەکاتەوە، یەکەمیان باسکردنی خەسڵەتە باشەکانی ئەهلی بەیتە؛ دووەمیش باسکردنی ئەو زوڵمەیە کە لە ئەهلی بەیتکراوە. دەکرێت بگوترێت دوو کەس هەن لە ئەهلی بەیت ئەو خەسڵەتانەیان تێدا دەرکەوتووە و ئەو زوڵمانەیان بەرکەوتووە. ئەوانیش عەلی کوڕی ئەبوتالب و حوسێنی کوڕیەتی، بۆیە زۆرترین وتار و شیعرەکانی شیعە لەبارەی ئەو دوو ئیمامەیە. ئەوان زۆر لەسەر ئەو سیفەتانە دەڕۆن کە عەلی هەیبووە، وەك پاڵەوانێتی، رەوانبێژی، دادپەروەری و زوهد، دواتریش باسی ئەو کارەستانە دەکەن، کە رووبەرووی ئیمام بۆتەوە، دواجاریش بەدەستی تاوانبارێکەوە کوژراوە. لەسەر حوسێنیش بەهەمان شێوە، ئەوەی شایەنی باسە کوشتنی حوسێن بابەتێکی گرنگە لە پروپاگەندەی شیعەگەری؛ بۆیە خەتب و شاعیرانی شیعە تا ئەو پەڕی بەکاریان هێناوە و ئەنجامی زۆریشیان بەدەستهێناوە.

لەراستیدا ئەو شێوازەی پروپاگەندە کردن لەگەڵ هۆزەکانی لادێ دەگونجێ، لەگەڵ بارودۆخی دەروونی و کۆمەڵایەتیان گونجاوە، لەلایەك چیرۆکی نایابیان لەبارەی پیاوەتی و ئازایەتی و مروەتەوە دەگێڕێتەوە، لەیەکی دیکەشەوە، مەیلی رۆشنبیری بیابانشینان لەلا دەوروژێنێ کە لەناخی دڵیان هەیە، تەنانەت جۆرە چیرۆکێکیان پێ دەدات پڕیەتی لە خەم و پەژارە، ئەمەش دەرفەتێکە بۆ نەفەسێکی دەروونی ئەوان کە ژیانیان پڕیتی لە نەخۆشی و ستەم و تەنگانەیی.

---

[301] مجلة العلم ، السنة الثانية ، ص ٢٥٠ ـ ٢٦٠

ئەگەرهاتوو ئەو پروپاگەندانەی شیعە لە نێو هۆزەکانی بەدوی بیابان بەکاربێت، ئەوا ئەو کاریگەرییەی نەدەبوو کە لەسەر هۆزەکانی لادێی هەبووە، بەدو حەز دەکەن گوێی لە سەرگوزەشتەی چاکەکاری بگرن، بەڵام نایەنەوێ گوێیان لە ستەم و خەم بێت. ئەوان لە بیابان بەرگەی هیچ ستەمێك ناگرن، بۆیە بێباکانە رووبەرووی کوشتن و مردن دەبنەوە، زۆر کەم لەسەر کوژراو و مردوو دەگرین، گریان بە تێڕوانینی ئەوان سیفەتی ژنانە، بەڵام سیفەتی پیاوان سەبر و ئامادەباشی بۆ شەڕەشمێر و تۆڵەکردنەوەیە.

برادەرێکم گێڕایەوە، شێخێکی بەدو، لەبارەی باوەڕی شیعە پرسیاری لەشێخێکی بەنی تەمیم کردووە، ئەویش لەوەڵامدا وتویەتی: باوەڕی شیعە بریتیە لە خۆشەویستی عەلی کوڕی ئەبو تاڵب و بەچاکتر زانینی لەهەموو خەڵك لەدوای پێغەمبەرەوە، شێخی بەدو هەڵدەچێت و دەڵێ" هەموومان شیعەین، ئەوە عەلییە باوکی حوسێن، سوارچاکی(مەیمونە)[302]، کەس هەیە وەك ئەو بێت!".

ئەو وەڵامە وێنەیەکی روومان لەبارەی باوەڕی ئایینی لای بەدوەکان پێدەدات، لەراستیدا ئەوان عەلیان زۆر خۆشدەوێ، سەرسامن بە پاڵەوانێتی و رەوانبێژی و مروەتەکەی عەلی، بۆیە لە تێڕوانینی ئەوان عەلی نموونەی سوارچاکی عەرەبە، لەگەڵ ئەوەشدا ناتوانن ببن بەو شیعەیەی کە لە عێراق هەیە، ئەوان تەنها لە کاتی سەرسامی و خۆشەویستی لەلای عەلی دەوەستن، کاتێك بگاتە حاڵەتی گریان لەسەر عەلی و کورەکانی و پارانەوە لەسەر گۆڕەکانیان، ئەمانە بابەتێکە بەدوەکان قبوڵی ناکەن و تێی ناگەن. ئەوان بڕوایان وایە شانازییە بۆ پیاوی قارەمان بە کوژراوی بمرێت، نەنگییە پیاو لەسەر جێگاکەی بمرێت.

شوێنەکانی سوێندخواردن:

لە بەشێکی رابردوودا باسی ئەوەمان کرد تاکی بەدو راستگۆیی و راشکاویی و ئەمانەت و وەفای بەسەر زاڵە، لەبەر ئەوانە لە قسە و بەڵێنەکانی پەنا بۆ سوێندخواردن نابات، بەکەمی نەبێت. گەورەترین سوێندی بەدو ئەوکاتە دێت کە

---

[302] وشەی (میمون) مان وەك خۆی داناوەتەوە، لەبەر ئەوەی ناوی ئەسپەکەی عەلی کوڕی ئەبو تاڵب بووە- وەرگێڕ

چیلکەدارێك لەزەوی هەڵدەگرێتەوە ودەڵێ: (وحق هذا العود و الرب المعبود)[٣٠٣] (واتە بە راستی ئەو چڵکەیە و بەخودای پەرستراو). بۆ نموونە لەوانەیە بەکوشتن تۆمەتبار بکرێت، ئەگەر داوای سوێندیان لێکرد ئەوا ئامادەیە دان بەتاوانەکەی بنێت، بەڵام بەدرۆ سوێند ناخوات[٣٠٤].

بەڵام کاتێك بەدو بەرەو عێراق دێن ئەوا بەرە بەرە ئەو خەسڵەتەیان لەدەست دەدەن، ئەوان دەکەونە ژێر فشاری باج و پیاوانی حکومەت و ریباکاران، ناچاردەبن نەریتی درۆ و ئیمانداری درۆ بەکاربێنن بۆ ئەوەی ئەو فشارەی سەریان کەم بکەنەوە. لەواقیعدا ئیمانداری بەدرۆ بەشێوەیەکی ترسناك لە لادێکان بڵاوبۆتەوە، بەتایبەتی ئەوانەی کرین وفرۆشتن لەگەڵ خەڵکی شار دەکەن، تۆ هەرکە لە باشی کاڵا و نرخەکەی دەپرسی، ئەو بەوپەڕی ئیمانداریيەوە سوێند دەخوات و زۆربەی جاریش قسەکانی درۆیە. ئەو دیاردەیە بەشێوەیەکی تایبەت لەلای ژنانی لادێ بەدی دەکرێت، ئەوان بەرهەمی کیلگە و شیرەنی دەهێنێە بازارەکانەوە، ئەو کاتە گوێبیست دەبیت بەشێوەیەکی سەیر کەشەکە پڕ دەکەن لە ئیمانداری و سوێندخواردن.

ئەم بارودۆخە کۆمەڵایەتیە وا دەکات پێویست بە جۆرێك لە سوێندخواردن بێت خەڵك لێی دڵنیا بێت و درۆی تێدا نەکات. کاتێك خەڵکەکە لە ئیمانی بەدرۆ راهاتووە بەناوی خودا و پێغەمبەر و ئیمامە پیرۆزەکان، دەبێت سوێندێکی تایبەت لەنێوانیان دەربکەوێت خەڵکەکە لەبەکارهێنانی بترسن.

کاتێك لەلادێکان دەگەڕێین هەندێك مەزارگە دەبینین خەڵك بۆ سوێند بەکاریان دەهێنێ، پێشیانوایە درۆ لەسوێندی ئەو شوێنانە نەخۆشی و کارەساتیان تووش دەکاتەوە، ئەمەش ئەو مەزارگانەیە کە لە خوارەوە بەپێی گرنگە کۆمەڵایەتییەکەی هاتووە:

١-مەزارگەی عەباسی کوڕی عەلی لە کەربەلا

٢- مەزارگەی سەید محەمەد لەنزیك بەلەد

---

[٣٠٣] عبدالجبار الراوي (البادية) ص ٢٣٤

[٣٠٤] عباس العزاوي (عشائر العراق) ج١، ٤٠٦

٣- مەزارگەی عەبدوڵڵای کوڕی عەلی لە باشووری قەلعەی سالح
٤- مەزارگەی عەلی شەرقی لە نزیک کومیت
٥- مەزارگەی عەلی یەسربی کوڕی موسای کازم لە نزیک بەدرە

چەندین مەزارگەی دیکەش هەیە گرنگیان لەمانەی سەرەوە کەمترە، هەمووشیان خەڵکی دەوروبەریان هانایان بۆ دەبەن و لە مەسەلەی بازرگانی و هاوپەیمانێتی هۆز و شتی دیکە پەنایان بۆ دەبەن، وا باوە گوایە هەر مەزارگەیەك نیشانەی خۆی یە، دەتوانێ ئەو کەسە نەخۆش بکات، کە سوێندی بەدرۆ خواردووە. وەك دەردەکەوێت درۆزنەکە بە کاریگەر دەروونی لەکاتی سوێندخواردنەکە نەخۆش دەکەوێت.

لەیەکێك لەپەندەکانی خەڵك عێراق هاتووە " الامام الذي لا يشور يضربه الناس بالخرق" " ئەو ئیمامەی نیشانەی نەبێت ئەوا خەڵك بەبەردەوام خراپ بەکاری دەهێنن". ئەمەش مانای ئەوەیە خاوەنی مەزارگەکە ئەگەر نیشانەی نەبوو خەڵکی تووش نەکرد ئەوا تەنها سوکایەتی پێدەکرێت، بە بێ ترس سوێندی پێ دەخۆن، بەلاّم ئەگەر نیشانەی هەبوو ئەوا درۆی لەگەڵ ناکەن، هەر چەندە نیشانەکەشی ترسناکتر بێت ئەوا زیاتر ڕێزی دەگرن.

**عەباسی کوڕی عەلی:**

مەزارگەی عەباسی کوڕی عەلی، مەزنترین شوێنە بۆ سوێندخواردن لەناوچە نیشتەنییەکانی عێراقدا. خەڵکی عەوام لەو ناوچەیە عەباس بە سەرگەرم وەسف دەکەن، مەبەستیان ئەوەیە خاوەن سەلیقەیەکی توندە و زۆر توڕەیە نیشانەکەی خۆی دوا ناخات. خەڵك بوێری دەکات بەناوی پێغەمبەر و ئیمامە گەورەکان سوێندی درۆ بخوات، بەلاّم ناوێرن لەبەرامبەر عەباس درۆ بکەن، لە بارەی هۆکارەکەوە پرسیارم لە هەندێکیان کرد، دەیانگوت" پێغەمبەر و ئیمامەکان مەعسومن و ئازاری کەسێك نادات، خەتایان بەرامبەر بکات، کەچی عەباس وانییە سەرگەرمە".

لیدی درور دەڵێ" ... ئەگەر شیعە بەدرۆ بەناوی حوسێن سوێند بخوات، ئەوا سزای بۆ نابێت، ئیمامە نەرمونیانەکە لێی خۆش دەبێت، بەلاّم عەباس توڕەیە و

کەسێکی سەربازی توندە، باوەڕی بەفشار وگوشار هەیە، بۆیە کەسێك جورئەت ناکات بەدرۆ بەناوی ئەو سوێند بخوات. ئایا نەتبینیوە لەساپیتەی مزگەوتەکەی عەباس سەری پیاوێك هەڵوسراوە؟! دەگوترێت ئەمە بەدرۆ بەناوی عەباس سوێندی خواردووە، بۆیە سەرەکە هیچی دیکەی لە دەست نەبوو تەنها لە جەستە جیا بێتەوە و بە ساپیتەکە بلکێت. بۆیە مرۆ هەر کاتێك بەدرۆ بەناوی عەباسەوە سوێند بخوات وەك ئەو پیاوەی لێ دێت"[٣٠٥].

لەراستیدا کاریگەری عەباس تەنها لە بواری سوێندخواردن قەتیس ناکرێت، بەڵکو بۆ زۆر بواری دیکە دەڕوات. تێبینی دەکرێت هۆزەکانی ناوچەی نیشتەنییەکان گەڵ باوەڕ و نەریتیان لە بارەی عەباسەوە هەیە، وەك فاتیحەی عەباس، پلانی عەباس، ئاڵای عەباس ، شمشێری عەباس، دارعەسای عەباس، نانی عەباس، چەندین نەریتی دیکە. ئەوان ئەگەر بیانوی یەکێك بەکەمی دینداری وەسف بکەن، ئەوا دەڵێن" عەباسی لەبیرچووە". شاکر مستەفا سەلیم باس لەوە دەکات سالم خەیون شێخی بەنی ئەسەد ، دوای پێنج ساڵ دوور خرانەوە لە هیند دەگەڕێتەوە، هەندێك لە ئەندامانی هۆزەکەی تێبینی دەکەن هەڵسوکەوتی فەرەنجی هەیە و وازی لە دینداریيە توندەکەی هێناوە، بۆیە دەڵێن: ئەو سەید و عەباسەکانی بیرچووە، ریشی تاشیوە، عەرەق دەخواتەوە، قسە لەبارەی سیاسەتەوە دەکات، سەگ رادەگرێت[٣٠٦].

بۆیە ئەم دیاردە کۆمەڵایەتیە، جێگای سەرنجە: جا هۆکارەکەی چییە؟ بۆچی عەباس لەنێو هۆزە لادێیەکان ئەو پێگە بەرزەی هەیە؟ من بڕوام وایە هۆزەکان لەبەر ئەوە زۆر پەرۆشی عەباسن، چونکە نموونەی سوارچاکێکی بەدویان تێدا دۆزیوەتەوە. وەك دەرکەوێت ئەوان ناتوانن بە روونی گوزارشت لە ناخی دەروونی خۆیان بکەن، بەشێوەیەك بینیمان عەباس بەسەرگەرمی وەسف دەکەن، گوایە تورەیە ونیشانەکەی پەلەیە، لەڕاستیدا ئەوان وا سەیری عەباس دەکەن کەسێتی سوارچاکێکی ئازایە، کە زۆر رێزی هەیە بەپێی بەهای بەدوی کۆنیان.

[٣٠٥] لیدی درور (المصدر السابق) ص ٨٤
[٣٠٦] شاكر مصطفى سيم (الجبايش) ج١ ص ٢٠٥

کاتێك بەسەرهاتی عەباس لە کتێبەکەی مێژوو دەخوێنینەوە، ئەوا دەتوانین ئەو هۆکارانە بدۆزینەوە کە هۆکارن بۆ سەرسامبوونی هۆزەکان بە عەباس، ئەمەش چەند خاڵێکە لەسەر گوزەشتەی عەباس:

یەکەم: مێژوونووسان باس لەوە دەکەن ئیمام عەلی، قاسیدی ناردۆتە لای عەقیلی برای بۆ ئەوەی پرسی پێ بکات بۆ دەست نیشان کردنی هاوسەرێك کە رۆڵەیەکی سوارچاکی بۆ بێنێتە دونیاوە. وەك دەزانرێت عەقیل رەچەڵەکناسی عەرەب بوو شارەزابوو تێیدا، بۆیە ئامۆژگاری براکەی دەکات تا فاتیمەی کچی حەزام کلاب خوازبینی بکات، دەشڵێ" لەنێو عەرەب کەسێك نییە لەباوانی ئەو ئازاتر وسوارچاکتر بێت". ئیمامیش خوازبێنی ئەو ژنە دەکات و عەباس لەدایك دەبێت.

دووەم: عەباس لەهەرەتی لاویدا خاوەن سیفەتی جەستەیی مەن بووە بەپێی پێوەرەکانی بیابانشینی، ئەبوفەرەج ئەسفەهانی لەوەسفی عەباس دەڵێ" سوارچاکێکی قۆز بوو، جەستەی بەهێز بوو، کەسواری ئەسپەکەی دەبوو، رێکوپێك، وەك ئەوەبوو قاچەکانی بگاتە زەوی".

سێیەم: عەباس لەجەنگی کەربەلا، بەرگری لەحوسێنی برای دەکات، پاڵەوانێتیەکی بێوینە دەنوێنێ. لەراستیدا ئەو هەڵگری ئالاَ و پاڵەوانی جەنگەکە بووە. نازناوی " ئاودەری تێنوەکانی کەربەلا"ی لێنراوە، چونکە توانی ئابلۆقەی سەر سەربازگەکەی حوسێن بشکێنێ و بگاتە قەراغ رووبار، دێمکەکەی پڕ دەکات لە ئاو، دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ئاو بدات ژن و منداڵەکانی حوسێن.

چوارەم: دایکی عەباس وەك پێشتریش ئاماژەمان بۆ کرد لە هۆزی کلاب بوو. وا رێکەوت لە سەربازگەی دوژمن پیاوانێك دەبن، لەهەمان هۆز دەبن، سەرکردە و خاوەن دەسەلاَتیش دەبن لەسەربازگەکەدا، لەوان شەمەر زی جوشن، عەبدوڵڵای کوڕی حەزام کە خاڵی عەباس و براکانی دەبێت، ئەمەیان هەوڵ دەدات عەباس لە مردن رزگار بکات، لەمەشدا شەمەڕیش پاڵپشتی دەکات. بەلاَم هەوڵەکانیان بەرباد دەبێت، کاتێك عەباس پێداگری دەکات لەوەی خۆی و براکانی لەگەڵ حوسێن بمرن، بەمەش نموونەیەکی نایابی شەهامەت و سەرراستی دەنوێنێ.

پێنجەم: حوسێن عەباسی زۆر خۆشویستوە، داواشی لێ دەکات بەهاواری خاڵەکانی بچێت و خۆی نەجات بدات. حوسێن دڵنیابوو خۆی دەکوژرێت، سوودی نییە عەباسیش لەگەڵ ئەو بکوژرێت، کەچی عەباس رەتی دەکاتەوە پشت لەبراکەی بکات و دەڵێ: وازت لێ ناهێنن و دوای تۆش ناژین[307].

ئەو خەسڵەتانەی سوارچاکی کە لە سەرگوزەشتەی عەباس دەرکەوتووە، دەبێت کاریگەری بەسەر دەروونی هۆزەکانی لادێ هەبێت. خەتیبەکانی پرس و ماتەمینەکان لەوە راهاتوون لەسەر مینەبەرەکان دووبارەی بکەن، لەوانەشە زیادی بکەن و زێدەرۆیی تێدا بکەن، دواتریش چەندین قەسیدە لەستایشی عەباس دەخوێننەوە، پێموایە مرۆڤێك نییە بتوانێ گوێ لەو شیعرانە بگرێت، بەشێوەیەك لەشێوەکان کاریگەر نەبێت.

**پیاوچاکێکی دیکە:**

لەرووی کاریگەری بەسەر هۆزە لادێییەکان، پیاوچاکێکی دیکە دێت، ئەویش سەید محەمەدی کوڕی ئیمام عەلی عادیە. ئەو لە نزیك شاری بەلەد لەناوەڕاستی عێراق نێژراوە. وەك پێشتر ئامازەمان بۆ کرد لەناوچەی ناوەراستی عێراق هۆزەکانی شیعە و سوننە بەیەکەوە نیشتەجێن. ئەوەی جێگەی سەرنج بێت ئەو هۆزانە سەید محەمەد بە پیرۆز دەزانن و بە نازناوی " سبع الدجیل" ناوی دەبەن، ئەم لەو ناوچەیە هەمان ئەو پێگەیەی هەیە کە عەباس لە ناوچە نیشتەنییەکان هەیەتی.

مەزارگەی سەید محەمەد چەند میلێکی لەشاری بەلد دوورە، خانوو و بێستانی لەدەوروبەر نییە، بۆیە میوانەکان دەتوانن لەو ژورانە بمێننەوە کە لەدەوروبەری حەوشی مەزارگەکە بۆیان ئامادەکراوە، دەشتوانن هەموو پێداویستیەکانی قاپ وقاجاخ ورایەخ و لانکی منداڵان لە مجێورەکان وەربگرن. میوانەکان ئەو کەلوپەلانە بەکاردەهێنن بێئەوەی یەکێك بتوانێ بیدزێ، رۆلەی هۆزەکان لەوە راهاتوون هەر شتێك بدزن کە دەکەوێتە بەردەستیان بەلام ناتوانن دزی لەسەید محەمەد بکەن، چونکە ئەوان دەزانن بەو دزییە کارەساتێکیان تووشی دەبێت،

---

[307] محسن الامین (أعیان الشیعة) ج ٣٧، ص ٧٥-٧٧

بۆیە دەبینین قاپ و قاچاخی مەزارگەکە لەهەموو شوێنێکی دەرەوە و ناوەوەی مەزارگەکە جێماوە، کەس نەیبردووە.

لەراستیدا سەید محەمەد ئەرکێکی گرنگی کۆمەڵایەتی و دەروونی هەیە لەنێو هۆزەکانی دەوروبەری، ئەوان بۆ چارەسەری نەخۆشەکانیان و بۆ دوعاکردن، چارسەری کێشەکانیان پەنای بۆ دەبەن و نەزری بۆ دەکەن و سوێندی بەدرۆ بەناوی ئەو ناخۆن، ئەگەر عەباس سەرگەرم بێت ئەوا سەید محەمەد شێرە، چا قوربەست ئەو کەسەی لەبەرامبەر دەوەستێت و بەکەمی دەزانێ.

نوری لەکتێبەکەی (**النجم الثاقب**) دەڵێ" سەید محەمەد چەندین کەرامەتی لەلای ئەهلی سوننە وبەدوەکان هەیە، ئەوان پیرۆزی دەکەن و لێی دەترسن، سوێندی بەدرۆ بەناوی ئەو ناخۆن، نەزریشی بۆ دەکەن، زۆربەی سکاڵاکان لەسامەڕا ودەوروبەری بە سوێندخواردن بەناوی ئەو یەکلادەبێتەوە. جارێکیان بینیم کەسێك نکۆڵی لەوە کرد قەرزاربێت، بەڵام کاتێك هاتەسەر سوێندخواردن بە سەید محەمەد ئەوا پارەکەی دایەوە و سوێندی نەخوارد[٣٠٨].

موجتەهیدی بەناوبانگ حەسەن سەدر دەگێڕێتەوە، بەچاوی خۆی یەکێك لە کەرامەتەکانی سەید محەمەدی بینیوە، گوایە دزێك ویستویەتی مەروماڵاتێك بدزێ کە لەناو شورایەکی تەنیشت حەوشی مەزارگەکەوە بووە، کاتێك دزەکە دەیەوێ لە دەلاقەیەکی شوراکە بپەڕێتەوە ئەوا یەکسەر گیانی دەردەچێت. حەسەن سەدر بەچاوی خۆی لاشەی مردووەکەی بینیوە کە لەدەلاقەکە بووە[٣٠٩].

چەندین چیرۆکی دیکە هەیە خەڵك لەبارەی کەرامەتەکانی سەید محەمەد دەیانگێڕێتەوە، وەك شیفادانی نەخۆش، بەجێهێنانی خۆزگە، سزادانی توند، بەشێکیش لەوانە خاڵی نییە لە هەقیقەت. توێژینەوە نوێیەکانی زاست سەلماندوویەتی باوەڕ کاریگەریەکی گەورەی بەسەر دەروونی مرۆڤەوە هەیە، بۆ نموونە ئەگەر کەسێك بڕوای وابێت لەئەنجامی تاوانێك دەرهەق بە پیاوچاکێك تووشی نەخۆشی دەبێت، ئەوا تووشی دڵەڕاوکێ و وەسوەسە دەبێت، زۆرجاریش

---

[٣٠٨] محمد علي النوري ( محمد بن الامام علي الهادي ) ص ٤٠

[٣٠٩] المصدر السابق ص ٤٦

تووشی ئەو شتە دەبێت کە لێی دەترسێ؛ هەر ئەمەش روودەدات کاتێك کەسێك بڕوای وابێت ئەو نەخۆشیەی نەماوە کەتووشی بووە.

دەروونی مرۆیی جیهانێکی سەیرە پڕیەتی لە نهێنی؛ زۆرێك لە کەرامەتەکانی کە دەدرێتە پاڵ پیاوچاکەکان لەو نهێنیانەوە سەرچاوە دەگرێت.

**سەیدەکان لەعێراقدا:**

سەیدەکان چینێکی بەرێزی کۆمەڵگای عێراق پێکدەهێنن، ئەوا دەگەڕێنەوە سەر رەچەڵەکی پێغەمبەر، هەندێك جاریش بە ناوی " منداڵانی پێغەمبەر" و " بێچەوەکانی زەهرا" ناودەبرێن. لەراستیدا ئەو چینە لەزۆربەی وڵاتانی ئیسلامی بوونیان هەیە، لەو شوێنانەش پێگەی بەرزیان هەیە، لە میسر و حیجاز و مەغریب بە ئەشراف ناودەبرێن، تەنانەت لەمیسر سەندیکایەکی تایبەت بەخۆیان هەیە[٢١٠]. سەرۆك و تۆماری رەچەڵەکیان هەیە، بۆ هەر یەکێکیان مووچەیەکی رەمزی هەیە، لەکاتی دیاریکراو وەری دەگرێت.

سەیدەکان لەنێو هۆزەکانی شیعەی عێراق، ئیمتیاز و پێگەیەکی زۆر بەرزیان هەیە، هاوشێوە هیچ وڵاتێکی ئیسلامی نییە، سەید لە هۆزەکانی عێراق هەقی یەك لە پێنجی داهاتە کشتوکاڵییەکان هەیە، بەبێ پاڕانەوە و هەستکردن بەوەی هاریکاریە وەری دەگرێت و ناوی دەنێت " هەقی باپیرەم" ئەگەر یەکێك لەنێو سەیدەکان نیشانەی بەهێزبوو ئەوا پێگەی لە ناو هۆزەکان بەرزدەبێتەوە و بەناوی ئەو سوێند دەخۆم، داوای دوعاکردنی لێدەکەن و نەزری بۆ دەکەن. ئەگەر یەکێك نەخۆش بکەوێت ئەوا دەچێتە لای سەید و داوای (تفرەك)ی لێدەکات کە داوێکی سەوزە نەخۆشەکە لە مەچەکی خۆی دەبەستێ بۆئەوەی شیفای بەرکەوێت.

دەگێڕنەوە سەیدێکی ناسراو هەبوو، رۆژێك لە شێخێك تورە دەبێت و هەڕەشەی کارەساتی لێدەکات. وا رێکدەکەوێ پاشماوەیەکی کەم جۆخینی شێخ دەسوتێ؛ خەڵکەکە ئەمە بەنیشانەی سەید دەزانن و لەبەر چاوی ئەوان پیرۆز دەبێت و سامانێکی گەورە کۆدەکاتەوە، تەنانەت منداڵەکانیشی سوودیان لە پیرۆزیی باوکیان وەردەگرت. یەکێك لە منداڵەکانی دەناسم، بۆم دەرکەوت لە لادێ

---

[٢١٠] حسن النجار (الاشراف) ص ٧٢-٧٣

پارەیەكی زۆر كۆدەكاتەوە بۆ ئەوەی دواتر لە شار لە ئارەزووەكانی خۆی خەرجی بكات.

دكتۆر شاكر مستەفا سەلیم لەبارەی پێگەی سەیدەكان لە گوندێكی چبایش دەڵێ" خەڵكی چبایش وەك تەواوی شیعەكانی دیكەی عێراق، سەیدەكان بەپیرۆز دەزانن و لەسەرووی مرۆڤی دیكەیان دادەنێن، لەبەر ئەوەی ئەوان نەوەی پێغەمبەرن ئەوا رێزگرتن و پیرۆزیان ئەركێكی ئایینی دەبێت، ئەهلی چبایش سوێند بەسەیدەكان دەخۆن، بەتایبەتی ژمارەیەكی كەمیان بەناوی دیندار و لە خواترس ناسراون. كاتێك خوازبێنی كچێك دەكرێت، یان دەیانەوێ كێشەیەك یەكلا بكەنەوە و، دڵی شكاو و تورەیی كەسێك چاك بكەنەوە، ئەوا سەیدێك سەرۆكایەتی جەماعەتەكە دەكات، چونكە هەر شتێك داوا بكات ئەو رەت ناكرێتەوە. سەیدەكان لە سەرووی دیوەخانەوە دادەنیشن و بەپێشینە و چاكتر دادەنرێن بۆ هەر شوێنێك بچن. سەركارەكان سەرانە لە بەرهەمی ئەو سەیدانە وەرناگرن، كە لە زەوییەكانی ئەوان كاردەكەن"[٣١١].

وەك ئەوەی سەید لەنێو هۆزەكاندا پارێزراو و نابەرپرس بێت، دەتوانێ لەهەر پیاوێكی لادێی بدات یان ریسوای بكات و هێرشی بكاتەسەر جا ئەو پیاوە پێگەی كۆمەڵایەتی هەرچییەك بێت نابێت تورە بێت و بەناشیاو وەڵامی سەید بداتەوە. ئەمەش وایكردووە زۆرێك لەسەیدەكان زوو تورە ببن و كەلەرەق بن. خەڵك سەید بە " رەچەڵەكی بەنی هاشم" وەسف دەكەن، هەندێك جاریش شێتیان دەدرێتە پاڵ، لەیەكێك لە پەندەكانیان هاتووە" **السيد بلا جنون كالعنزة بلا قرون**" (واتە سەید بێ شێتی وەك بزنی بێ شاخە).

لەدوایین سەردانم دا بۆ ناحیەی عەفك، دیاردەیەكی كۆمەڵایەتی سەرنجی راكێشام، چێورمەی بچووكم بینی بە قوڕ دروستكرابوو، ئاڵای سەوزی بەسەرەوە بوو، تەنها لەرێگای عەفك و دەغارە سێ چوار دانەم بینی، پرسیارم لەبارەی ئەوانەوە كرد وتیان ئەمە ئەو شوێنانە جەستەی مروودی سەیدەكانی تێدا شۆراوە، دواتر لاشەكەیان بۆ نەجەف رەوانە دەكرێت، بەڵام ئێستا شوێنی

[٣١١] شاكر مصطفى سليم (المصدر السابق) ج١ ،ص ١٢٥

شووشتنیان پیرۆز بووە و خەڵك نەزی تێدا دەکەن. کێ دەزانێ لەوانەیە رۆژێك لە رۆژان ئەو شوێنانە ببنە مەزارگە، گومەزیان بۆ دروست بکرێت و مجێوریان هەبێت.

**زۆری گومەزەکان:**

گەشیاری ئەڵمانی نیبور باس لەوە دەکات لەمیانەی سەفەرەکەی بۆ فوراتی ناوەراست لە ساڵی ١٧٦٥ تێبینی زۆر گومەزی کردووە، یان ئەو خانووە بچووکانەی بینیوە کە لەسەر گۆڕی کەسانێك دروستکراوە خەڵك بەپیاوچاکیان دەزانێ، ئەو شوێنانەش لەنزیك گوندەکان یان هەندێك جاریش لە چۆڵەوانی هەیە[٣١٢].

لەراستیدا هێشتا بەشێکی زۆر لەو گومەزانە لە سەرتاسەری لادێکانی عێراقدا هەیە. زۆرێك لەوان ئەسڵیان نازانرێت، ناشزانرێت کێ لەناو گۆڕەکان نێژراوە، تەنانەت لەوانەیە خاڵی بن لەتەرم. تێبینی ئەوە دەکرێت هەندێك بە کچانی حەسەنی دەزانن، گوایە کچانی حەسەنی کوڕی عەلی ئەبوتاڵب لەوێ نێژراون، ئەمەش قبولکردنی زەحمەتە، چونکە ژمارەی کچانی حەسەن ئەوەندە زۆر نەبووە، دواتریش مەزندە ئەوە دەکرێت لەمەدینە نێژرابن.

خەڵکی لادێ پێویستی بەو گۆڕە پیرۆزانە هەیە، بۆ ئەوەی لەکاتی نەخۆشییەکان و کێشەکان پەنایان بۆ ببات. ئەو پێویستبوونەش وا دەکات بەهەرحاڵێك بێت، گۆڕی پیرۆزیان لەلا دەربکەوێت بەپێی ئەو پرەنسیپەی دەڵێ" پێداویستی دایکی داهێنانە".

جەعفەر خەلیلی دەگێڕێتەوە، پیاوێك هەبووە بەناوی مزعل فحام، ئەو زۆر هەژار ونەداربوو، بیری لەوە کردەوە فێڵێك بدۆزێتەوە، تا هەژاری لەخۆی وخێزانەکەی دووربخاتەوە، رۆژێك رایگەیاند حەزرەتی خدری لەخەون بینیوە پێیگوتووە گۆڕی یەکێك لەپیاوچاکان لەماڵەکەی ئەودا هەیە، هەواڵی ئەو خەونە بەناو خەڵك

[٣١٢] کارستن نیبور (مشاهدات نیبور) – ترجمة سعاد العمري ص ٧٢- ٧٢

بڵاودەبێتەوە و ماڵی مزعل دەبێتە مەزارگەیەکی گەورە، مزعل خۆی دەبێتە مجێوری مەزارگەکە، دواتریش بەهۆی نەزر ودیارییەکان دەبێتە پیاوێکی بەرێز[٣١٣].

چیرۆکێکی دیکە هاوشێوەی ئەوەی سەرەوە هەیە، نزیکەی چل وپێنج ساڵ لەمەوبەر روویداوە، ئەویش ئەوەیە جووتیارێك لە گوندی قریشاتی نزیك نەجەف، گوایە خەونێکی دیکەی بینیوە، لەخەونەکەی ئاشکرابووە گۆڕی پیاوچاکێك بەناوی سەید محەمەد لەتەنیش ماڵەکەی هەیە، لەگەڵ بڵاوبوونەوەی ئەو هەواڵە خەڵك دێنە سەر گۆڕەکە و بۆپیرۆزکردن. جووتیارێکی دیکەش گوایە گۆڕی سەید برایمی لەخەون بینیوە، دەوڵەمەند بوو، گۆڕی سێیەم و چوار... تا گوندەکان پڕبوون لە گۆڕی پیرۆز!

نزیکەی سەد ساڵێك لەمەوبەر گۆڕێك لەنزیك شاری هیندیە دەرکەوت گوایە هی نەوەی ئیمام جەعفەری سادقە، ناوی " سەگڤان بوو"[٣١٤]، سەیر ئەوەیە ناوەکە عەرەبی نییە، بەمانای " پاسەوانی سەگ" دێت. لەسەردەمی عوسمانییەکان بە جۆرە سەربازێك دەگوترا سەگڤان. جا ماقوڵ نییە ناوی نەوەی جەعفەری سادق بەو ناوە بێت، بەڵام خەڵك بایەخیان بەوە نەدا رژانە سەر گۆڕەکەی و پیرۆزیان کرد[٣١٥].

چیرۆکێکی دیکە هەیە خەڵکی عێراق، بۆ نوکتە دەیگێڕنەوە، گوایە دوو پیاو لە لادێ هەبوون، لاشەی کەرێکی تۆپی دەدۆزنەوە و دواتر دەینێژن و گومەزی لەسەر دروست دەکەن، خۆشیان دەبنە مجێور، خەڵکی لادێی بۆ پیرۆزیی سەردانی ئەو شوێنە دەکەن، نەزردەکەن و سوێند بەوشوێنە دەخۆرن. رۆژێك وا رێکەوت هەردوو مجێورەکە شەڕ لەگەڵ یەکتر دەکەن و یەکێیان تورە دەبێت سوێند بەگومەزەکە دەخوات، هاورێیەکەی بەسەرسامی دەڵێ" ئایا ئەو شوێنە خۆمان دروستمان نەکرد؟!".

---

[٣١٣] جعفر الخليلي (اولاد الخليلي) ص ١١-١٤

[٣١٤] عەلی وەردی (صەگبان)ی نووسیوە لەبری وشەی سەگڤان – وەرگێڕ

[٣١٥] علي الوردي : الاحلام بين العلم و العقيدة ص : م-ن

وەك دەردەکەوێت ئەو چیرۆکە خاڵی نییە لە زێدەڕۆیی و لەوانەشە لەسەرەتاوە هەڵبەستراو بێت. بەهەرحاڵ بەڵام خاڵی نییە لە مانای کۆمەڵایەتی، ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەوەی خەڵك پێویستیان بە گومەز هەیە و بەلایانەوە گرنگ نییە کێ لەژێر گومەزەکەوە نێژراوە.

ئەم پێویست بوونە بۆ گومەز و گۆڕی پیرۆز تەنها بوونیان لە عێراق نییە، بەڵکو لەزۆر لادێکانی جیهان هەیە کە بارودۆخەکەی وەك لادێکانی عێراق بێت، تەنانەت لە هەندێك شاریش هەیە کە بارودۆخەکە لەبارودۆخی لادێی بچێت. گۆڤارێکی میسری لەساڵی ١٩٥٩ بەدواداچوونی بۆ یەکێك لە گۆڕە پیرۆزەکان کردبوو کە لەشاری بەنی سویف دەرکەوتبوو. لەبەدواداچوون دەرکەوتبوو خاوەنی ئەو گۆڕە کەسێك نییە تەنها لاوێکی شێت بووە، زۆر لەمردن ترساوە بێهۆش دەبوو کاتێك تەرمێکی دەبینی، بەڵام دوای مردنی مەزارگە لەسەر گۆڕەکەی دروستکراوە خەڵك بۆ پێویستی خۆیان رووی تێدەکەن، تەنانەت هەندێك خەڵك لەدوورەوە بینیویان رووناکی لەسەر گۆڕەکەی دەدرەوشێتەوە..."[٣١٦].

گۆڤاری (العربی)ی کوێتی، لەیەکێك لە بەدواداچوونە رۆژنامەوانی و وێنەدارەکانی لەبارەی شاری سوێسی میسر دەڵێ" تەنها لە سوێس ٣٧ مزگەوت هەیە، ئەو شارە وەك هەموو شارەکانی دیکەی میسر شێخی تایبەتی تێدایە کە خەڵك بەپیرۆزی دەزانن، ئەفسانە و موعجیزە دەدەنە پاڵ شێخەکە! سەرەرای ئەوەی سوێس زیاتر لەشێخێکی تێدایە، بەڵام سەیدی غەریب (سیدی الغریب) لەهەموویان بەناوبانگترە.... تاڕادەیەك کە خەڵکی ئیسماعیلیە لە هەفتەی لەدایکبوونی ئامادە دەبن لە ئاهەنگەکان دیاری ونەزری پێشکەش دەکەن، هەر یەکێکیش لەو شێخانە وەك نەریتێك لەناو گۆڕێکی تایبەتی ناو مزگەوت دەنێژرێت، هەندێکجار دەبینین زیاتر لە گۆڕێك هەیە، کاتێك چووینە مزگەوتی (الغریب و الاربعین) لەبارەی ئەسڵە مێژووییەکەی شێخ پرسیارمان دەکرد، کەچی ئیمامەکان بە راشکاوی وەڵامیان دەدایەوە دەیانگوت" بێهوودە زۆر لە هەموو شوێنێك لەبارەی ئەو مێژووانە

---

[٣١٦] مجلة اخر ساعة، العدد الصادر في ١٩٥٩/٢/١١

گەڕاوین تەنانەت وەزارەتی ئەوقافیش نەگەیشتۆتە ئەنجامێك، بۆیە هیچ زانیاریمان نییە، تەنها ئەوە نەبێت پشتاوپشت دەیگێڕنەوە..."[317].

وەك دەردەکەوێت گۆڕی سەیدی غەریب لە شاری سوێس وەك گۆڕەکەی سەگڤان یان کچەکانی حەسەنە لەعێراق، خەڵك پێویستی بە لێکۆڵینەوەی مێژوویی نییە بۆ ئەوەی بزانێ خاوەنی گۆڕەکە کێیە، بەڵکو ئەوەی کاری پێیەتی خودی گۆڕەکەیە و بەس !

**ناشتنی مرووداں لە نەجەف:**

لەنزیکەی سەرەتای سەدەی هەژدەمەوە، شیعە مردووەکانیان دەگوازنەوە بۆ ئەوەی لە نەجەف بیاننێژن، گۆڕستانەکەی ئەویش بە (وادی السلام) ناسراوە، کاتێك نیبۆر لەساڵی ١٧٦٥ سەردانی نەجەف دەکات، ژمارەی ئەو تەرمانەی ساڵانە رەوانەی نەجەف دەکرێن بە دوو هەزار مەزندە دەکات[318].

ئەو ژمارەیە ساڵ لەدوای ساڵ زیاتر دەبێت، کاتێکیش هۆکارە نوێیەکانی گواستنەوە لەدوای جەنگی یەکەمی جیهانەوە بەکاردێت، ئەوا زۆرێك لەمردووەکانی شیعە لەهەموو جیهانەوە لە نەجەف دەنێژرێن، لەوانەیە زێدەڕۆیی نەبێت ئەگەر بڵێم گۆڕستانی وادی سەلام گەورەترین گۆڕستانە لەهەموو جیهاندا. لەئەنجامی ئەمەش دا لە نەجەف جۆرێك لە دابونەریتی ئاڵۆز دروست بووە، لەلایەن کەسی تایبەتەوە سەرپەرشتی دەکرێن و لەسەر ئەو کارانەش دەژین. یەکێك لە قوتابییەکانم لەساڵی ١٩٥١ لەو بارەیەوە راپۆرتێکی وردی کردبوو، راپۆرتەکەی پێشکەش کردم کە چەندین بابەت و رووداوی سەیر لەخۆیەوە دەگرێت و تکای لێکردم ئەو راپۆرتە بەنهێنی بمێنێتەوە و کەس نەیزانێ. ئەگەر ئەو داوایەی ئەو نەبوایە ئەو خوێنەرم لە یەکێك لەدیاردەیەکی گرنگی کۆمەڵایەتی لەکۆمەڵگای عێراق ئاگادار دەکردەوە[319].

---

[317] مجلة العربي ، العدد الصادر في كانون الاول عام ١٩٦٣ ص ٨٦

[318] كارستن نيبور (المصدر السابق) ص ٧٦-٧٧

[319] نازانم ئێستا ئەو قوتابییەم لەکوێیە و چی بەسەرهاتووە، ئەگەر ئەم کتێبەی منی دەخوێنێتەوە ئەوا خوازیارم لێی بۆچوونی خۆیم پێ بڵێ: ئایا هەر سوورە لەسەر ئەوەی راپۆرتەکەی نهێنی بێت ، یان چی؟ — عەلی وەردی

دکتۆر شاکر مستەفا سەلیم ئاماژەی بۆ ئەو بابەتەکردووە لەناوچەی هۆرەکانی عێراق، دەڵێ" دانیشتوانی هۆرەکان پێیانوایە پاراستنی ئیمام عەلی کوڕی ئەبوتاڵب زامن دەکەن لەژیانەکەی دیکە، کاتێك مردووەکانیان لە خاکی نەجەف دەنێژن، بۆی تەرمەکە لەهەر ناوچەیەکی سەختی هۆرەکان بێت ئەوا بە بەلەم و ئۆتۆمبیل و شەمەندەفەر دەگەیەنرێتە نەجەف، ئەگەر کاری یەکسەر گواستنەوەی تەرمەکە سەخت بێت ئەوا وەك ئەمانەت لەشوێنێك دەنێژرێت تا لە توانای خێزانەکە دەبێت دواتر تەرمەکە بۆ نەجەف بگوازێتەوە. دەبێت کەسوکاری یەك بار لە گواستنەوەی تەرمەکان هاوکاری یەکتر بکەن، تەنانەت ئەگەر ئەو هاوکارییە بە کۆکردنەوەی سامان و بەشداری راستەقینەی گواستنەوەش بێت"[٣٢٠].

دەبێت ئاماژە بۆ ئەوە بکەین ئەو هەژارانەی ناتوانن تەرمی مردووەکانیان بۆ نەجەف ببەن، ئەوا مردووەکان لە یەکێك شارە پیرۆزەکانی نزیك خۆیان دەنێژرێن، ئەگەر ئەمەش نەکرا، ئەوا لە نزیك گۆڕی هەر سەیدێك یان زانایەك یان زاهیدێکی بەناوبانگ دەنێژرێت[٣٢١]. هەندێك جاریش شارەوانی هاوکاری هەژاران دەکات لە گواستنەوەی مردووەکانیان بۆ نەجەف[٣٢٢]. هەندێك جاریش هەندێك لەدەوڵەمەندان ئەو ئەرکە دەگرنە ئەستۆی خۆیان باوەڕیان وایە لەئەنجامی ئەمە خێرێکی مەزنیان پێدەگات.

یەکێك لە چاکسازەکان لەبواری ئایینی کە ئەویش هبەدینی شەهرستانییە، هەوڵی داوە لەمە رێگری لەخەڵك بکات، لەساڵی ١٩١٢، ئەوەی راگەیاند ئەو دیاردەیە حەرامە و پێچەوانەی شەریعەتی ئیسلامە، دواتر زۆرێك لە موجتەهیدانی شیعە فەتوایان دا و زۆرێکیان لەگەڵ شەهرستانی هاوڕا بوون، کەچی خەڵکی عەوام لەگەڵ ئەو حەرامکردنە نەبوون، بەردەوامبوون لەسەر ناردنی مردووەکان بۆ نەجەف، تەنانەت هەندێکیان هەوڵی کوشتنی شەهرستانیان دا بەتۆمەتی کافربوون و زندیقی. ئەمەش هاوشێوەی رووداوەکەی ١٩٣٠ بوو کە موحسین ئەمین، کاروان و کەژاوەکانی حوسێنیە و ئەو کارە نەخوازراوانەی تێیدا ئەنجام

---

[٣٢٠] شاکر مصطفى سليم (الجبايش ) ج ١، ص ٣٧

[٣٢١] شاکر مصطفى سليم (المصدر السابق) ج ١، ص ٣٧

[٣٢٢] عبدالجبار فارس (عامان في الفرات الأوسط) ص ١٠٤

دەدرێ، بەحەرام زانی. خەڵك لەدژی هەڵچوون وەك شەهرستانی بەکافر و زندیقیان زانی.

پێداگری خەڵك لەسەر ناشتنی مردووەکانیان لە نەجەف، لەو باوەڕەوە دێت گوایە مردووەکە خۆی مافی خۆدەخیلکردنی لە ئیمام عەلی کوڕی ئەبوتاڵب وەردەگرێت. کەواتە لە تێڕوانینی ئەوانەوە ماقوڵ نییە ئیمام پارێزگاری لەو پیاوە نەکات کە هانای بۆ هیناوە و لە تەنیشت ئەو خەوتووە و لە ئەستۆی ئەوە، بۆ ئەمەش زۆرێك لە ئەفسانە لەنێو خەڵك بڵاوبۆتەوە لەبارەی چۆن ئیمام بۆ فریاکەوتنی مردووەکە دێت و هاوکاری دەکات و دواتریش چۆن لە کاتی حسێبی (منکر و نکیر) یان لەڕۆژی قیامەت شەفاعەتی بۆ دەکات.

ئەوان وا دەزانن ڕۆژی قیامەت وەك دانیشتنی ئەو دادگایانەیە، کە لە ژیانی خۆیان لێ ڕاهاتوون، بەڵام لە ئاستێکی فراوانتر، لەوێ خودا لە عەرشە مەزنەکەی دادەنیشێ، پێغەمبەر محەمەد لەلای ڕاستی و ئیمام عەلیش لەلای چەپییەوە دادەنیشن، ئەو دووانەش دەبێ شەفاعەت بۆ ئەو کەسانە بکەن، کە ئەوانیان خۆشەویستووە و لە تەنیشتیان نێژراون.

ناشتنی مردووەکان لە نزیك مەزارگە پیرۆزەکان، لەڕاستیدا هەر لەو بنەمایەوە وەرگیراوە، کە خەڵك لەژیانیان لەکاتی نەخۆشی و پێویستیەکانیان پەنا بۆ ئەو مەزارگانە دەبەن. ئەوان وا ڕاهاتوون پەنابەرنە بە واسیتە بۆ ئەوەی داواکانیان بە فرمانڕەواکان بگەیەن، هەرچەندیش کەسی واسیتەکە مەزن بێت ئەوا ئەگەر سەرکەوتنی واسیتەکە زیاترە، بۆیە ئەوان وا دەزانن خودا وەك فرمانڕەواکانی دونیایە، خودا لەدیدی ئەوان داواکانی ئەوان ناهێنێتەدی و لەگوناهی ئەوان خۆش نابێت، تەنها بەکاریگەری واسیتە و شەفاعەتکاری نەبێت.

لە فەرمودەیەك هاتووە" مرۆڤ بە کارەکانیەوە دەنێژرێت" کەچی عەوامی خەڵك لەم فەرموودەیە ناگەن و لەناخی دڵیانەوە ناتوانن بەمە ڕازی بن. عەوامی خەڵك لەتوانیان نییە لەسەر بنەمای لۆژیك و بیرکردنەوە عەقیدەیان بونیاد بنێن، بەڵکو ئەوان باوەڕ وعەقیدەیان لەسەر بنەمای ئەوەی لەژیانی کۆمەڵایەتی لەسەری ڕاهاتوون بونیاد دەنێن.

گۆڤاری (العربي) ئاماژەی بۆ نەریتی خەڵك كردووه لەشاری سوێس و دەوروبەری كردووه، ئەوان مردووەكانیان لەناو مزگەوتی سەیدی غەریب و مزگەوتەكانی دیكه دەنێژن، گۆڤارەكه دەڵێ" ئیمامەكانی ناو مزگەوتەكه تكایان لێكردین هەڵمەتێكی رۆژنامەوانی ئەنجام بدەین بۆ نەهێشتنی گۆڕستان له مزگەوتەكان، تا مێشكی خەڵك پەیوەست نەبێت بە باوەڕهێنان بەخورافاتی نادروست، بەڵام ئێمه ئەو ئەركه بۆ وەزارەتی ئەوقافی میسری جێدەهێڵین، دەزگاكانی ئەم وەزارەته توانای جیاكردنەوەی شته رەسەنەكانی هەیه له خوڕافات "[٢٢٣].

من خەیاڵی ئەوه دەكەم ئەگەر وەزارەتی ئەوقافی میسری ئەو كاره بكات، وەك شەهرستانی تووشی شكست دەبێت كه پێشتر لەعێراق هەوڵی دابوو. خەڵك پێویستیان بەوەیه یەكێك له دوای مردن شەفاعەتیان بۆ بكات، وەك ئەوەی له ژیان بۆ پێداویستیەكانیان شەفاعەتیان بۆ دەكرێت.

شمشێری چاكسازی:

ماوەیەك بەر له ئێستا كوشتارگەیەكی تایفی لەشاری تیری پاكستان ئەنجام درا، ئەو رووداوه پەیوەندی بەبابەتی ئەم بەشەمان هەیه، پوختەكەی ئەوەیه، شاری تیری و ناوچەكانی دەوروبەری زۆرێك شیعه لەخۆوه دەگرن، ئەوانیش راهاتوون مەراسیمی حوسێنی له رۆژانی عاشورا ئەنجام بدەن. سەیر ئەوەیه لەو شاره قوتابخانەیەكی ئایینی هەیه مەزهەبی وەهابی تێدا دەخوێنرێت، زۆرێك قوتابی لەو قوتابخانەیه دەخوێنن و ناوی قوتابخانەكەش (هودا)یه.

وەهابییەكان دەستیان كردبوو بەوەی شیعەكان تەنگاو بكەن، هەڕەشیان لێدەكردن بۆ ئەوەی مەراسیمی خۆیان وەك هەموو ساڵێك ئەنجام نەدەن، چونكه ئەو مەراسیمه بەتێڕوانینی ئەوان بیدعه و دەرچوونه لەئیسلام. ئەوەبوو لەساڵی ١٩٦٢ وەهابیەكان ئامادەكارییان كرد بۆ رێگرتن لەرێورەسمەكانی شیعه، له رۆژی عاشوراش به توندی هێرشیان كرده سەر كاروانەكانی شیعه و هەموو جۆره چەك و بیل و تەور و داریان تێدا بەكارهێنابوو، لەئەنجامدا سەدان كەس كوژرا و بریندار

[٢٢٣] مجلة العربي، العدد الصادر في كانون الاول عام ١٩٦٣ ، ص ٨٦

بوو، کوشتارگەیەکی ترسناك بوو. ئەوەی جێگای سەرنجە ژمارەیەك سوننەش کوژران چونکە لەکاروان وکەژاوەی شیعەکان بەشداربوون، وەك ئەوەی لە هەندێك ناوچەی عێراق ئەنجام دەدرێت.

ئەم رووداوە مەرجەعی باڵای شیعەی لەعێراق ئازار دا، کە سەید حەکیم بوو، بۆیە بروسکەی بۆ باڵوێزی پاکستان لەبەغدا و چەندین بەرپرسی دیکەی پاکستان نارد، داوای لێکردن رێگری بکرێت و رێکاری لەوبارەیەوە ئەنجام بدرێت...[٣٢٤]

ئەم رووداوە لە هەندێك لایەنەوە لەو رووداوانە دەچێت، کە وەهابییەکان لە کەربەلا لەساڵی ١٨٠٢، لە شاری تایف لەساڵی ١٩٢٤ ئەنجامیان دابوو، لەگەڵ چەندین شاری دیکە کە وەهابیەکان توانیویانە داگیری بکەن و دەسەڵاتیان بەسەر زاڵ بکەن. تەنانەت جارێك لەگەڵ کەژاوەی هەڵگیراوی میسریەکان بەریەکتر کەوت، میسرییەکان وا راهاتوون لەکاتی حەج ئەو کەژاوانە لەگەڵ خۆیان بگوازنەوە شام.

وەهابییەکان دەیانەوێ موسڵمانان بگەڕێننەوە سەر ئەو تەعالیمە سادەیەی ئیسلام لە سەرەتای بانگەوازەکەی خۆی هێناویەتی، بێ ئەنجامدانی هیچ زیاد و کەمێك. ئەمەش بابەتێکە جێبەجێکردنی لە زۆربەی وڵاتانی ئیسلامی ئەستەمە، یان وەك ئەوەیە مەحاڵ بێت. لەوانەیە لە بیابان جێبەجێ بکرێت، چونکە بارودۆخی کۆن و نوێی لەیەکتر دەچێت، کەچی لە لادێ و شارەکان بارودۆخ زۆر گۆڕاوە، وای لێهاتووە مرۆڤ پێویستی بەوە هەیە یەکێك لە بەرگەگرتنی بارودۆخەکە هاوکاریان بکات.

وەهابیەکان هێشتا پێیانوایە لە توانایان هەیە بە شمشێر وکوشتارگە چاکسازی لە باوەڕی خەڵك بکەن. ئەم شێوازەش لەلایەن زۆرێك لەسوڵتانەکانی کۆن بەکارهاتووە، کەچی ئەنجامەکە پێچەوانەی خواستی ئەوان بووە، بەکارهێنانی شمشێر لە گۆڕینی باوەڕ و عەقیدە دەبێتە هۆی زیاتر هەڵقوڵانی عەقیدەکە لەدڵی خەڵکەکە و زیاتر دەستگرتن بەعەقیدەکەوە.

---

[٣٢٤] احمد الحسيني (الامام الحكيم السيد محسن الطباطبائي) ص ١٢٣-١٤٧

وەهابییەکان مەزارگەی هەندێك ئیمامیان لە بقیع رووخاند، باوەڕیان وابوو بەتەواوی بەسەر ئەوان زاڵبوون، ناشزانن ئەوان مەزارگانە لەدڵی خەڵکەکە ئاودانتر دەبێت، ئەگەرچی لەسەر رووی زەوی تەخت کراوە بەڵام لەناخی دڵ گەشەی کردووە، رۆژێك دادێ ئەو مەزارگانە سەرلەنوێ دروست دەکرێنەوە و زێر و نەخشەکانی لەدۆخی پێشووی زیاتر دبێت.

ئەوەی دەیەوێ باوەڕی خەڵك بگۆڕێت ئەوان دەبێت لەهەمان کاتدا بارودۆخی بژێوی و کۆمەڵایەتی و دەروونیان بگۆڕێت، چونکە بیروباوەڕەکان لە ئەنجامی ئەو بارودۆخانە دروست دەبن، نەوەك لە ئەنجامی لۆژیك و بیرکردنەوەی رووت. بێهودەشە داوای شتێك لەخەڵك بکەین کە تێی ناگەن، ستەمیشە شتێکیان بەسەر فەرز بکەین لەتوانای ئەوان نەبێت.

## قسەیەك دەبێت بگوترێت:

تکا لەخوێنەر دەکەن وا لەقسەکەی من نەگات، پێویستە واز لەخەڵکی عەوام بهێنین بەخواستی خۆیان مامەڵە لەگەڵ باوەڕی خۆیان بکەن بێنەوەی هەوڵی چاکسازیان بدەین. لەراستیدا چاکسازی ئایینی لەو بارودۆخەی لەعێراقمان بینی پێویستە، بەڵام لەهەمان کاتیشدا ئەستەمە، بۆیە ئەوەی دەیەوێ چاکسازی بکات نابێت باوەڕی تەنها بەو بیرۆکەیە بێت کە لەمێشکی هەیە، پەرۆشی ئەو بیرۆکەیە بێت و خەڵك بە شمشێر ناچار بکات بۆ پەیرەوکردنی بیرۆکەکەی.

چاکسازی ئایینی وەك هەموو جۆرەکانی دیکەی چاکسازی کۆمەڵایەتی، هونەرێکە بنەما و رێسای خۆی هەیە، دەبێت لەسەر بنەمایەکی زانستی بتەو لەگەڵی بڕوات. لێرەدا دەرفەت بۆ توێژینەوەی رێساکانی چاکسازی ئایینی نییە، تەنها لەو بۆنەیەدا باس لە سێ مەرج دەکەین، بەلای کەمەوە دەبێت لەچاکسازی ئایینی هەبێت:

یەکەم: دەبێت چاکسازی لەناوەوە بێت، نابێت لەدەرەوە بێت. مەبەستم ئەوەیە ئەو تایفەیەی خوازیاری چاکسازییە، دەبێت خۆی بایەخ بەچاکسازی کەموکورییەکانی بدات. لێرەوە دەبێت ئەوە لەبیر نەکەین ئەو کێشانەی لەعێراق رووبەروومان دەبێتەوە ئەوەیە هەر تایفەیەك وا راهاتووە کەموکوری ئەویتر ببینێ

و کەموکورییەکانی خۆشی لەبیر بکات. ئێستا کاتی ئەوە هاتووە واز لەو نەریتە بهێنین و بۆ چاکسازی خۆمان کار بکەین نەوەك چاکسازی کەسانی دیکە. ئەو چاکسازییەی لەناو تایفەیەکەوە هەڵدەقوڵێ بە سوودتر و زیانی کەمترە لەو چاکسازییەی لەدەرەوە دێت. زۆرجار ئەو چاکسازییانەی لەدەرەوە دێت دەبێت هۆی وروژاندنی کینە و ململانێی لەنێوان تایفەکان، لەگەڵ زیاترکردنی دەمارگیری تایفی بۆ عەقیدە کۆنەکانیان خۆیان.

دووەم: ئەوەی دەیەوێ چاکسازی بکات دەبێت خۆی لە شێوازی ناچارکردن و هێرشکردنە سەر خەڵك بەدوور بگرێت، بەڵکو دەبێت شێوازی نەرم و رەحمەت ومشتومڕ بۆ چاکتریان لەگەڵ پەیڕەو بکات، ئەمەش ئەو رێگایەیە کە ئیسلام فرمانی پێدەکات " ادع الى سبيل ربك بالحكمة والموعظة الحسنة وجادلهمبالتي هي احسن"[٣٢٥].
لەراستیدا رەچاوکردنی سۆزی مرۆیی چاکترین رێگایە بۆ دانانی کاریگەری بەسەر خەڵکەوە تا بەرەو باوەڕێك بێن، کەچی ناچارکردن بۆ عەقیدەیەك ئەوا خەڵك لەبەری رادەکات لەبری ئەوەی بەرەوپیری بێت. مێژوو باسی گەلێك عەقیدەمان بۆ دەکات لەنێو خەڵك بڵاوبۆتەوە لە ئەنجامی ئەوەی خەڵکە چەوساندنەوە و دڵڕەقی لەپێناودا بینیوە.

سێیەم: چاکسازی دەبێت پێویستی و بارودۆخی کۆمەڵگاکە لەبەرچاو بگرێت. بیروباوەر دیاردەی کۆمەڵایەتییە زیاتر لەوەی بیرۆکەی رووت بێت. بیرمەندانی کۆن هەڵەیان کردووە کە گوتویانە مرۆڤ ئاژەڵێکی عاقڵە، لەراستیدا مرۆڤ ئاژەڵێکی کۆمەڵایەتییە. لەهەموو جۆرەکانی رەفتار و بیکردنەوەی لەسەر ئەو رێرەوە دەبێت کە بارودۆخی کۆمەڵایەتی ودەروونی دەیخوازێ. عەقڵی تاکیش شتێك نییە زیاتر لەوەی دروستکراوی کۆمەڵگایە، روخسارێکی رۆشنبیرە باوەکەی کۆمەڵگایە.

[٣٢٥] القران سورة النحل الاية ١٢٥

## بەشی دەیەم

# بارودۆخی کۆمەڵایەتی لە شارەکاندا

لەمیانەی قسەکانمادا لە بەشەکانی رابردوودا، ئاماژەمان بۆ هەندێك سیما کۆمەڵایەتی شارەکانی عێراق کرد، بینیمان چۆن بەهای بیابانئشینی تێدا بلاوبۆتەوە لەئەنجامی پەیوەندیان بەهۆزەکانی دەوروبەریانەوە. ئێستاش دەمانەوێ بەشێوەیەکی تایبەت توێژینەوەکەمان جەخت لەسەر شارەکان بکاتەوە. بەپێی ئەو جەختکردنەوەیەش دەبێت ئاماژە بۆ ئەوە بکەین، لەنیوەی سەدەی رابردووەوە شارەکانی عێراقی بەخێرایی ژمارەی دانیشتوانیان زیاتر دەبێت وئاوەدان دەبێتەوە. ئەمەش مانای ئەوەیە شارەکان بۆتە سەرچاوەیەك بۆ بەهاکانی شارستانی، بەشێوەیەك بەبەرەکانی تەوژمی بەهای بیابانئشینی دەکات کە پێشتر لەعێراق باو بووە.

دەکرێت بگوترێت ململانێی نێوان بیابانئشینی وشارستانی لەعێراق خۆی لەدوو جەمسەری بەرامبەر دۆزیوەتەوە ئەوانیش: بیابان لەلایەکەوە، شارەکانیش لەلایەکی دیکەوە، کەچی لادێ لەنێوان ئەم دوو جەمسەرە دەوەستێ. لەسەدەکانی رابردوودا کاتێك تەوژمی بەدوەکان لە بیابانەوە دەهات، لەگوندەکان بلاودەبۆوە، دواتر لەشارەکان بلاوەی دەکرد، کەچی ئێستا تەوژمەکە پێچەوانە بۆتەوە، تەوژمی شارستانی لەشارەکانەوە دەستپێدەکات و دواتر بەرەو لادێکان دەچێ، بەم درەنگانەش شتێکی کەم بەرەو بیابان دەچێت.

بەر لەسەد ساڵ، رێژەی بەدوی کۆچکردوو لەکۆی دانیشتوانی عێراق نزیکەی ٪ ٣٥ بوو، دواتر ئەو رێژەیە بەرە بەرە، ساڵ لەدوای ساڵ دابەزی ئێستا گەیشتۆتە نزیکەی ٪ ٢ی دانیشتوان، کەچی ئەو کات رێژەی شارنشینەکان ٪٢٤ دانیشتوانی عێراق، وای بۆ دەچین ئێستا ئەو رێژەیە بەرز بووبێتەوە و لەنیوەی دانیشتوانی

عێراق کەمتر نەبێت، تەنانەت بەرزبوونەوەکەش ساڵ لەدوای ساڵ بەبەردەوامی زیاد دەکات.

تێبینی ئەوە دەکرێت، لادێکان لەم سەد ساڵەی دواییدا، بەدوی کوچکردووی لەلایەك قوت دەدا، لەلایەکی دیکەوە بەشێك لەدانیشتوانی خۆی بەرەو لادێ رەوانە دەکرد، ئەو دیاردەیەکەش گرنگی گەورەی کۆمەڵایەتی هەیە، ئاماژەیە بۆ ئەو پێشکەوتنە خێراییەی کە وا لەدانیشتوانی عێراق کردووە لە قۆناغی یەك لەدوای یەك لە بیابانشینەیەوە بەرەو شارستانی برۆن. ئەم پێشکەوتنەش لەم ماوەیەی دواییدا گەشەی کردووە و بەرهەم و کێشەکانی جۆراوجۆر بووە.، ئەمەش کاتێك کە شارستانیەتی نوێ لەسەرتاسەری عێراق بڵاودەبێتەوە و کاریگەری بەپلەی جیاجیا لەسەر تەواوی دانیشتوانی دەبێت.

## شار چییە؟

بەر لەوەی دەست بکەین بە توێژینەوەی بارودۆخی کۆمەڵایەتی لە شارەکان، پێویستە شار پێناسە بکەین و چۆن دەکرێت جیاوازی لەنێوان شار و گوند بکەین؟.

لەراستیدا پێناسەیەکی روون نییە بۆ جیاکردنەوەی نێوان شار و گوند، شارەزایانی بوارەکە بۆچوونیان لەسەر ئەم بابەتە لەیەکتر جیاوازە. هەندێك هەوڵیان داوە لەسەر بنەمای ژمارەی دانیشتوان شار و گوند لەیەکتر جیابکەنەوە. بۆ نموونە لە ویلایەتە یەکگرتووەکان هەردەم لە فەرمانگەکانی ئامار وا سەیری شار دەکرێت کە دەبێت دانیشتوانی ٢٥٠٠ کەس یان زیاتر بێت. ئەگەر یەك کەس کەمتر بێت ئەوا گوندە. لە فەرەنسا وا باوە ژمارەی دانیشتوان ٢٠٠٠ کەس بێت، لە بەلجیکا دەبێت ٥٠٠٠ کەس بێت[٢٢٦].

وەك دەردەکەوێت ئەم پێوەرەی جیاکردنەوەی شار وگوند، لەعێراق سوودی نییە، بۆیە بەبڕوای من دروستترە پێوەرێکی دیکە لەعێراق بەکاربهێنین، ئەویش پێوەری کۆمەڵایەتییە. مەبەستم لەو پێوەرەش ئەوەیە تا چەند پیشەی شارستانی لەنێو دانیشتوانی بڵاوبۆتەوە. ئەگەرهاتوو زۆرینەی دانیشتوانی

[٢٢٦] Gist and Halbert ( urban sociology )p 4

کشتوکاڵ بکەن ئەوا من بەگوندی دەزانم، بەڵام کاتێک بازرگانی و پیشەسازی وکاری کرێ دەکەن، ئەوا شوێنی ئەو دانیشتوانە بەشار دەزانم. لەگەڵئەوەشدا ئێمە ناتوانین ئەم پێوەرە بە وردبین بزانین، بەڵام بەهەرحاڵ لە جیاکردنەوەی نێوان گوند وشار لەعێراقدا سوودبەخش دەبێت بۆ ئامانجی ئەو توێژینەوەیەکان.

بۆ نموونە شارۆچکەی خرنابات لە دیالی، هەندێك لە توێژەران بە گوندی دەزانن، دانیشتوانی کەمە و زۆربەیان خەریکی بێستانن، بەڵام من مەیلم هەیە بەشاری لەقەڵەم بدەم، ئەمەش بەپێی ئەو پێوەرە کۆمەڵایەتییە پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد. بە بڕوای من کشتوکاڵی بێستان جیاوازی لەگەڵ کشتوکاڵی دانەوێڵە هەیە کە لەلادێکان دەکرێت، کشتوکاڵی بێستان وەك پیشەیەکی شارنشینی وایە، زۆربەی جار لەپێناوی قازانج دەکرێت و بەهای خێڵەکی کەمتر کاریگەری بەسەرەوە دەبێت. سەرەڕای ئەمەش خرنابات زۆرێك لەدوکاندار و پیشەگەر و کاسب و کرێکاری تێدایە، زۆربەشیان لەخانووی جێگیر نیشتەجێن کە لەخشتی سوور دروست کراوە، تەنانەت لەو شارە هۆکارەکانی خۆشگوزەرانی وداهێنراوەکانی شارستانی تارادەیەکی زۆر بڵاو بۆتەوە.

**ململانێی رۆشنبیری کۆمەڵایەتی لەشارەکاندا:**

لەبەشی شەشەمی ئەم کتێبەدا بینیمان ململانێی رۆشنبیری دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی گشتییە لە عێراقدا، بەڵام ئەو ململانێیە بەشێوەیەکی تایبەت لە شارەکان دەوروژێت و توند دەبێت، هۆکارەکەش ئەوەیە شارەکان ئەو شوێنەن کە سیمای شارستانیەتی نوێیان تێدا دەردەکەوێت ولەوێشەوە بۆ شوێنەکانی دیکە بڵاودەبنەوە. ئەمەش وایکردووە خەڵکی شارەکان بکەونە نێوان دوو تەوژمی پێچەوانەی یەکترەوە: یەکێك بەرەو پابەندبوون بەو بەهایانەی بەدویان دەبات کە لە باپیرانیانەوە ماوەتەوە، ئەویتریش بەرەو وەرگرتنی بەهای شارستانیەتیان دەبات کە تازە لەنێویان بڵاو دەبێتەوە، جا تاچەند دەتوانین ئەو دوو تەوژمە لەگەڵ یەکتر بگونجێنین؟

ئەوەی شایەنی باسە ململانێی رۆشنبیری لەشارێکەوە بۆ شارێکی دیکە جیاوازە بەپێی ئەو هۆکارانەی خوارەوە:

١- بڕی زاڵبوونی تەوژمی بەدو لە شارەکان

٢- کەنارگیربوونی شارەکە لە کۆمەڵگای دەرەوە

٣- فراوانی بازاڕ و زۆری بێگان و گەشتیاران تێیدا

٤- بڕی دەسەڵاتی حکومەت تێیدا

٥- چۆنیەتی هاتنی شارستانیەتی نوێ بۆ شارەکە

با نموونەی شاری (دوجەیل)[٣٢٧] وەربگرین، کە دەکەوێتە باکووری بەغدا بە دووری ٧٠ کیلۆمەتر. دوجەیل شارێکی بچووکە ژمارەی دانیشتوانی ١٥٠٠ کەس دەبێت. دانیشتوانی دوجەیل بۆ دوو گرووپی دەمارگیر دابەش دەبن ئەوانیش:(خەزرج) و (مەحاویل)ە خەزرج لەلای رۆژئاوای شارەکەوە نیشتەجێن، کەچی مەحاویل لەبەرەی رۆژهەلاتن[٣٢٨].

ئەوەی تێبینی دەکرێت ئەو شارە بەشێوەیەکی رێژەیی لە کۆمەڵگای دەرەوە دابڕاوە، کەچی پەیوەندییەکی توندی بە هۆزەکانی دەوروبەری هەیە. لەبەر ئەمەش تەوژمی بەدوەکان تاڕادەیەکی زۆر زاڵە بەسەر دوجەیلەوە. زۆرجار لەسەردەمی عوسمانییەکان جەنگ لەنێوان خەزرج ومحاویل هەڵدەگیرسا وهاوپەیمانانیش لەهۆزەکانی دەوروبەر بەشداریان تێدا دەکرد. کاتێك کەسێکی بێگانە دەیویست لەشارەکە نیشتەجێ بێت، ئەوا دەبوایە خۆی لەسەر یەکێك لە هۆزەکان تۆمار بکات بۆ ئەوەی پارێزراو بێت.

ساڵی رابردوو لەگەڵ کوڕ وکچە قوتابییەکانم سەردانی ئەو شارەمان کرد، سەردانەکەی ئێمە رووداوێکی گرنگ بوو لە مێژووی شارەکەدا، جێگای سەرنج بوو. لەراستیدا خەڵکی شارەکە بە پێیی نەریتی عەشایەری خۆیان ئەرکی میواندارییان ئێمەیان لەئەستۆ گرت، بەڵام لەناخی دڵیانەوە لەگەڵ بوونی کچە قوتابی سفور نەبوون لەگەڵ کوڕەکان بەیەکەوە بڕۆن، لەوانەیە لەنێو خۆیان دا

[٣٢٧] ئەو شارە بە (سمیکە) ناو دەنرا، دواتر بووە شاری (ئیبراهیمیە) لەبەر ئەوەی ئیبراهیمی کوڕی مالیکی ئەشتەر لەنزیك ئەوێ نێژراوە. ئەو ناوگۆڕینە بۆ چەندین شاری دیکە عێراق کراوە لەبەر چەند هۆیەکی مێژوویی. ئەمەش دیاردەیەك تکامان وایە بەردەوام نەبێت، چونکە ناوی شارەکان دروستکراوی کۆمەڵگایە، جا گۆڕینی ئەو ناوانە بێ هیچ پاساوێك تێکەڵی لە مێشکی خەڵك دروست دەکات- عەلی وەردی

[٣٢٨] عبدالرزاق الحسني (العراق قديما و حديثا) ص ١١٥

پرسیاریان کرد بێت ئەمە چ زانستێکە وا لەو کچ و کوڕانە کردووە بەیەکەوە سەفەر بکەن بۆ ئەوەی شارۆچکەیەکی وەك دوجەیل ببینن...!

تێبینی ئەوەمان کرد شارەکە هەر لەو دۆخەدایە کە لەسەردەمی عوسمانییەکان هەیبووە. زۆربەی ماڵەکانی یەك نهۆمین، زۆربەیان لەقوڕ دروستکراون، کەمێکیان لە کەرپوچ، هەندێك دوکانی لێرە ولەوێ هەیە، وەك دەردەکەوێت خاوەن دوکاندارەکان لەچینی بەرزی شارەکە نین. سەرۆکەکانی شار و پیاوماقوڵانی هێشتا وازیان لە گۆتەگەتی خۆیان نەهێناوە. ئەوان هێشتا خۆیان لەوە بەدوور دەگرن ببنە بەقاڵ و تەرازوو بەکاربهێنن.

لەسەردەمێکی نزیکەوە سیمای شارستانیەتی نوێ لەشارەکە دەردەکەوێت ئەویش لەدوو لایەنەوە، یەکەمیان گەشەکردنی دەسەلاتی حکومەت، دووەمیش دەرکەوتنی توێژێکی خوێندەوارانە کە رۆشنبیری نوێیان هەیە. لەلایەنی یەکەمەوە کاریگەری حکومەتان لەلایەکی شارەکەوەبینی ئەمەش لە سەرەتای دوجەیل لەو شوێنەیە کە شەمەندەفەری لێیە. لەوێ حکومەت خانووی نوێی بۆ فەرمانگە و قوتابخانەکانی دروست کردووە، ئەمەش وایکردووە بەشێك لە پیاوماقوڵانی شارەکە لاسایی بکەینەوە خانووی نوێ بۆ خۆیان لەنزیك فەرمانگەکانی حکومەت دروست بکەن، لەنێوان ئەوانیش بۆتە مایەی شانازی تا لە حکومەت نزیك ببنەوە و منداڵەکانیان بنێرنە بەرخوێندنی قوتابخانەکانی حکومەت.

هەر چۆنێك بێت حکومەت توانیویەتی ئەو ململانێیە توندە سەرکوت بکات، کە لە رابردوودا لەنێوان خەزرەج و مەحاویل هەبوو، یەکێکی بەمتمانە بۆی گێڕامەوە ئەو ململانێیە ئێستا چۆتە قۆناغێکی نوێیەوە، هێشتا لە ناخی دڵیان ماوەتەوە، بەلام ئاشکرا نەکراوە و لەشێوەی رابردوو نییە، بەڵکو زۆرجار لەشێوەی فێڵ وتەڵەکەی شاراوە دەبێت، خەڵکەکە بەچرپەوە باسی دەکەن لەدانیشتنە تایبەتەکانیان، کەچی لەلای کەسانی بێگانە باسی ناکەن و لەوانەشە نکۆڵی لەبوونی بکەن و وا دەربخەن کە وازیان لەو ململانێیە هێناوە. ئەمەش بەشێوەیەکی روون لەلای ئەفەندییەکانی خەڵکی دوجەیل دەردەکەوێت، ئەوان رۆشنبیری نوێیان هەیە و لەقوتابخانەکانی بەغدا خوێندویانە، دواتریش

گەڕاونەتەوە دوجەیل بوونەتە مامۆستا و فەرمانبەر. من قسەم لەگەڵ هەندێکیان کرد و لەبارەی ئەوەی چەند دەمارگیری هۆزیان لەماوە پرسیارم لێکردن، کەچی ئەوان نکۆڵیان لێکرد، بەڵام هێشتا قسەکانم تەواو نەکردبوو بۆم دەرکەوت ئەوانەی دەیڵێن پێچەوانەی ئەوەیە کە لەناخیان هەیە.

گومانی تێدا نییە ئەو کەسانە کەمتر لەکەسانی دیکە پابەندن بەدەمارگیری هۆز و بەهاکانی دیکەی بیابانشینی، دەبێت ئەو بەهایانەش لاوازتر دەبێت کاتێك بری پەیوەندیکردنیان بەشارستانیەتی نوێ زیاد دەبێت، بەڵام سەرەڕای ئەمانەش ئەوان ناتوانن بەیەکجار خۆیان لەو پاشماوەی رۆشنبیری کۆمەڵایەتی نەجات بدەن. تەنانەت دەتوانرێت بگوترێت ململانێی رۆشنبیری زیاتر لەنێو ئەوکەسەخوێندوارانە دەردەکەوێت نەوەك لەخەڵکەکەی دیکەی دوجەیل.

**نموونەیەکی دیکە:**

شاری بەلەد دەکەوێتە باکووری دوجەیلەوە، دووری نێوانیان تەنها شانزە کیلۆمەترە. ئەم شارە دانیشتوانی لەدوجەیل زیاتر و زیاتریش پەیوەندی بە کۆمەڵگای دەرەوە هەیە. لەنزیك بەلەد مەزارگەی سەید محەمەد هەیە، لەهەموو لایەکەوە خەڵك سەردانی دەکات. سەرەڕای ئەمەش بەلەد لەقەراغی دیجلە نزیکە هەموو هۆکارەکانی گواستنەوە لەرووبارە بەلای ئەو شارۆچکەیە تێدەپەڕن، ئەمەش یەکێکە لەوهۆکارانەی وایکردووە خەڵکی بەلەد زیاتر لەخەڵکی دوجەیل لە بازرگانی شارەزاتر وسەرقاڵتر بن. ئەوەی تێبینی دەکرێت بەمدواییە زۆرێك لەدانیشتوانی ئەم شارە بەرەو بەغدا کۆچ دەکەن و هەندێکیان بوونەتە بازرگانی گەورە و ژمارەیەکی زۆریشیان بوونەتە فەرمانبەر و خاوەن بڕوانامەی بەرز.

خەڵکی بەلەدیش بۆ دوو جەماعەتی دژ بەیەکتر دابەش دەبن، ئەوانیش ئەلبوحەسبوڵلا و بەلداوییە. هەر یەکێك لەو جامەعەتانە گەڕەکێکی تایبەتیان نییە وەك دوجەیل و شارەکانی دیکەی عێراق، بەڵکو لەناو یەکتر لەناو گەڕەکانی شار بڵاوبوونەتەوە، بۆیە دەبینین هەرکە گوێیان لەهاوارێك دەبێت ئەوا بەپەلەوە چەکەکانیان هەڵدەگرن و بەرەو سەرچاوەی هاوارەکە بێ دوودڵی رادەکەن. ئەگەریش مەترسییەکی گشتی روو لە خەڵکی شارەکە بکات ئەوا هەموین دەبن

بەیەك جەماعەت، خەڵکی ئەو شارە واراهاتوون بەخۆیان بڵێن " ئەبو واحید" ئەمەش ئاماژەیە بۆ یەکگرتنیان لەدژی مەترسیەکی هاوبەش. ئەو یەکگرتنانە بە روونترین شێوە لەو کاتە دەرکەوت کە هۆزی شەمەڕ لە کۆتایەکانی سەدەی نۆزدەم هێرشی کردە سەریان. ئەوان تا ئێستا بە شانازییەوە باس لەم رووداوە دەکەن، گوایە بەتوندی بەرپەرچی هۆزی شەمەریان داوەتەوە گەیشتونەتە رەشماڵی شێخەکەیان، شێخیش رای کردووە، ئەوان تەنها بۆ شەرمەزارکردنی تانەیەکیان لە رەشماڵەکەی داوە.

دەمارگیری هۆز لە بەلەد وەك دەمارگیریەکەی دوجەیل گەشەی کردووە، واتە ئێستا بە نهێنی ململانێیەکان ئەنجام دەدرێت، خەڵك لەبری ئەوەی چەك بەکاربهێنن، ئەوا پەنا بۆ بەدنیازی و پیلانگێری دەبەن. ئەگەرهاتوو رووداوێك روو بدات کە مایەی وروژاندنی رق و کینەی هۆزگەرایی بێت، ئەوا خەڵکەکە وەك پێشتر بە پەلە پەنا بۆ چەکەکانیان نابەن، بەڵکو هەر لایەك هەوڵ دەدات تۆمەت بۆ ئەوانی دیکە دروست بکات، تەنانەت بەرتیل و واسیتە بەکاردەهێنێ بۆ ئەوەی لە ململانێیەکە حکومەت لەتەنیشت ئەو لەدژی نەیارەکەی بوەستێ.

لەساڵی ١٩٤١ ئەمە روویدا، کاتێك لەبەلەد یەکێك لەفەرمانبەرەکان کوژرا، هەر لایەنێك هەموو کۆششی بۆ ئەوە بوو تۆمەتی کوشتنەکە بداتە پاڵ جەماعەتەکەی دیکە. لەساڵی ١٩٥١ بەهەمان شێوە بوو کاتێك بۆمبێك خرایە ماڵی بەڕێوەبەری ناحیەوە... دەبێت ئەوە لەبیر نەکەین ئەو پێشکەوتنی دەمارگیری هۆز بەتەواوی شەڕەکانی ڕیشەکێش نەکردووە، هێشتا ناوە ناوە جەنگ لەنێوان ئەو هۆزانە روودەدات، ئەمەش لە کاتێکدا دەبێت کە خەڵکی شارەکە لەگەڵ خەڵکی شارێکی دیکە یاخەی یەکتر دەگرن.

لەساڵی ١٩٤٤ کاتێك خەڵکی بەلەد لەسەردانی چلە بوون لە کەربەلا، کەژاوەکەیان بەدوای کەژاوەی خەڵکی بەسرا بوو، شەڕێك لەنێوان خەڵکی بەسرا و خەڵکی شینافیە دروست دەبێت و خەڵکی بەلەدیش غیرەتیان دەجوڵێ و لەسەرکەوتن لایەنگری پشتی بەسرا دەگرن، ئەوان پاڵەوانێتیان لەجەنگەکە نواند بوو داری ئاڵاکانیان بەکارهێنابوو، دواجار بەپێی قسەی خۆیان ئەوان سەرکەوتن.

سەردەمێکی نزیکدا جەنگێکی توند لەنێوان خەڵکی بەلەد وشروگییەکان لە بازاڕی بەزازەکانی بەغدا (بازاڕی کوتاڵفرۆشەکان) دروست بوو. شەڕەکە لەئەنجامی دەمەقاڵی نێوان بازرگانێکی بەلەد و بازرگانێکی شرۆگی بوو، دواتر هەر جەماعەتێك داکۆکی لە تاکەکەی خۆی کرد، جەنگەکە توند بوو، تەنانەت مەتری ئاسنی تێدا بەکارهات، وا رێکەوت ئەو کات من بەو بازاڕە تێدەپەڕیم، کاتێك مەترە ئاسنەکانم بینی بەر سەری خەڵکەکە دەکەوت، ئەوا رامکرد...

ئەم شەڕە ئاماژەی کۆمەلأیەتی خۆی هەیە، چونکە ئاماژە بۆ ڕادەی ئەو ململانێیە رۆشنبیریە دەکات کە لەلای بەشداربووانی شەڕەکەوە هەیە، ئەوان بەرەو شارستانێتی دەڕون بوونەتە بازرگان لە بازاڕدا، لەلایەکەوە بەپاڵنەری قازانج کاردەکەن، بەڵام لەلایەکی دیکەوە نەیانتوانیوە خۆیان لە دەمارگیری کۆن نەجات بدەن، ئەوان بەدو وشارنشینن لەیەك کاتدا. ئەمەش ئەو کێشە گەورەیەیە کە خەڵکی شارەکانی عێراق لەئێستادا بەدەستیەوە دەناڵێنن.

**رواڵەتی میوانداری لەشارەکاندا :**

زۆرێك لە شارەکان لە سەردەمی عوسمانییەکاندا، شانازییان بەهەندێك رواڵەتی میوانداری و بەخشندەیی دەکرد بەو جۆرەی کە لەلای خەڵی لادێکان و بیابان هەیە. ئەمەش بەشێوەیەکی تایبەت لە لای خەڵکی شارە بچووکەکان بەروونی دەردەکەوت کە پەیوەندی بەهێزیان لەگەڵ هۆزەکانی دەوروبەریان هەیە. پیاوی خانەدان لەخەڵکی ئەو شارانە خانەدانی و پێگەی کۆمەلأیەتی خۆی لە زۆربەی کاتەکان لە زۆری میوان و پێشکەشکردنی قاوە وەردەگرت.

دیوەخانی شارەکان لەزمانی عەرەبی دا وشەی (دیوان) بۆ بەکاردێت، هەردەم ئەو دیوەخانە لەو کەرەستانە دروست دەکرێت کە خاوەنەکەی خانووەکەی خۆی پێ دروست کردووە. شوێنەکەشی لەناو خانوودا لەدەرگا نزیك دەبێت بۆ ئەوەی هاموشۆی میوانەکان ئاسان بێت و بێ شەرمکردن بێت. کەچی تەواوی بەشەکانی دیکەی خانووەکە بە (حەرەم) ناودەبرێت، تایبەت دەبوو بەژنان، ناولێنانی ژن لەعێراق بە (حورمە) لێرەوە هاتووە.

ئەوەی شایەنی باسە بارودۆخی میوانداری لەشارەکان لەم ماوەیەی دواییدا، پێشکەوتنی بەخۆیەوە دیوە، وەك چۆن پێشکەوتن لە دەمارگیری هۆز و بەهاکانی بیابانئشینی روویداوە، بۆیە ژمارەی دیوەخان لەزۆربەی شارەکان کەم دەبێتەوە، بەتایبەتی لەو شارانەی کە بەرەو شارستانیەتی نوێ دەچن، بۆ نموونە لەشاری بەلەد بەر لەسی ساڵ پێنج دیوەخان هەبووە، لەوانەیە پێشتر زۆرتر بووبێت، کەچی ئێستا لەبەلەد تەنها یەك دیوەخان هەیە، ئەویش دیوەخانەکەی علی حوسێن عەبودە. دەگوترێ ئەو تاکە دیوەخانە ئێستا بەرەو نەمان دەچێت، خاوەنەکەی زەحمەتیەکی زۆر دەبینێ لەپێناو پاراستنی لەو بارودۆخەنوێیەی شارستانییدا، لەوانەشە رۆژێك ناچار بێت دایبخات.

دیارە ئەوەی لەبەلەد روویداوە، ئێستا لە زۆربەی ئەو شارانە روودەدات کە لە ئاستی کۆمەڵایەتی هاوشێوەی بەلەدن، خانەدانەکان لەشارەکان دەرفەتی نوێیان لەبەردەمە بۆ ئەوەی پاڵپشتی پێگەی کۆمەڵایەتی خۆیان بکەن. وەك کۆکردنەوەی سامان و دروستکردنی کۆشکی فراوان و نزیك بوونەوە لە دەسەڵاتداران و ئامادەکردنی خوانی نایاب و چەندین دەرفەتی دیکە، هەموو ئەو دەرفەتانەش پێگەیەکی بەرزتر لەوەی دیوەخان، بە خاوەنەکەی دەدات.

لایەنێکی دیکە هەیە لەسەر ئەو بابەتە نابێت لەبیری بکەین، کاتێك خاوەنە کۆنەکەی دیوەخان دەمرێت کەسێك لەمنداڵەکانی دەرناکەوێت تا شوێنی ئەو بگرێتەوە و پارێزگاری لەدیوەخان بکات، زۆربەی رۆڵەکانی ئەوان چوونەتە قوتابخانە و بوونەتە ئەفەندی، کەواتە پێیان باشە بە بروانامەی بەرز و پۆستی باڵا لەسەرفرازی خۆیان بەرز ببنەوە، نەوەك دانیشتن لەدیوەخان و بەرگەگرتنی گزتەگۆتی کۆن.

ئێستا پێوەرێکمان هەیە بۆ پێوانەکردنی رادەی ئەو پێشکەوتنەی لەرواڵەتی میوانداری شارەکان روویداوە، ئەویش دەرکەوتنی خواردنگە وهوتێلەکانە. وەك دەزانرێت پێشتر زۆرێك لەشارە بچووکەکان رێگای کردنەوەی میوانخانە و چێشتخانەی تێدا نەدەرا. ئەگەر کەسێك بوێر بوایە شتێکی لەوبابەتەی بکردایەوە، ئەوا خانەدانی شارەکە دەهاتن سەرزەنشتیان دەکرد و دەریان دەکرد، چونکە

ئەو کارەیان بەناوزڕاندنی خۆیان و شارەکەیان دەزانی، دیوەخانەکەی ئەوان بەس بوو بۆ پێشکەشکردنی خواردن و جێگای حەوانەوەی هەر ڕێبوار و غەریبێك کە ڕووی لەشارەکە بکردایە.

بەڵام ئێستا حاڵەتەکە گۆڕانکارییەکی ڕوونی بەسەر داهاتووە، چێشتخانە و میوانەخانەکان لەهەموو شارەکانی عێراق دەکرێتەوە، تەنانەت ئەگەر شارەکە بچووکیش بێت. یەکێك لەو بابەتانەی چەند مانگێك لەمەوبەر سەرنجی ڕاکێشام لەمیانەی سەردانێکم بۆ عەفەك، کردنەوەی هوتێلێکی بچووك بوو وەك دەرکەوت تازە دروست کراوە، لە ڕۆژدا داخرابوو، زانیم تەنها لەشەودا دەرگای هوتێلەکە دەکرێتەوە. ئەوەی تێبینی دەکرێت ئەمەش تۆبەرەی تەوژمێکی نوێییە لەشارەکان، دەبێت ئەو تەوژمەش بەتێپەڕبوونی ڕۆژگار بەرەوپێش بچێت.

**نەریتەکانی بەخشندەیی بەدو:**

خواردنگە و هوتێل لە سەردەمی عوسمانییەکان وەك ئەوە بوو تەنها لەو شارە گەورانە بوونی هەبێت کە بازاڕی فراوانیان هەبوو، یان لە هەندێك وەرزدا جەماوەرێکی زۆری لە میوانان تێدا کۆدەبۆوە. وەك شاری بەغدا وموسڵ وکەربەلا و نەجەف وکازمیە و شاری دیکە هاوشێوە، کەچی دیوەخانەکان لەم جۆرە شارانە بایەخیان بە ئامادەکردنی خواردن و جێگەی حەوانەوە نەدەدا بۆ میوانەکان، بەوشێوەیەی کە لەدیوەخانی شارە بچووکەکان هەیە، بەڵکو وەك هەندێك مەجلس بوو قاوەی تێدا پێشکەش دەکرا و خەڵکی گەڕەك بۆ بەسەربردنی کات بە قسەوباس هاموشۆی دیوەخانیان دەکرد.

بەڵام ئەو شارە گەورانە، بەهەرحاڵێك خاڵی نەبوون لەبەخشندەیی هەندێك نەریتی بەخشندەیی ومیوانداری لەشێوەی بەدو. یەکێك لەو نەریتانە ئەوەیە کە لەشێوەزاری بەغدایی بە (الوير) ناسراوە، مانای ئەو وشەیە ئەوەیە پیاوێك پاری خواردن و خواردنەوەی هاوڕییەکی دەدات لە چێشتخانە یان چایخانە. بۆ نموونە ئەگەر کەسێك بچێتە چایخانە، چای بۆ بێت، یەکێك لە هاوڕێکانی لەچایخانەکە دانیشتووە بانگ دەکات( وێر) ! مەبەستی ئەوەیە نرخی چاییەکە لەسەر حیسابی ئەو دەبێت. زۆرجار ڕکابەری لەنێوان دانیشتوان دەبێت لەسەر دانی

پارەی چاکان، لەوانەشە لەبەر دەرگای چاخانەکە دەبێت پاڵپەستۆ بۆ پەردان، ئەمەش بابەتێکی سەیرە.

یەکێك لەو بەسەرهاتە خۆشانەی لەو بارەیەوە دەگێڕنەوە، گوایە خوالێخۆشبوو زاری شێخ زەوبەع رۆژێك لە چایخانەیەکی کازمییە دانیشتووە. گوێبیستی ئەوە دەبێت موشتەرییەکان لەدوای یەك دەڵێن (وێر) کاتێك هاوڕێکانیان دێت، لەبەر ئەوەی شێخ کەم هاموشۆی چایخانەی کردووە، پێشتر ئەمەی نەبینیوە، لەبارەی وشەی وێر پرسیار دەکات. کاتێك ماناکەی دەزانێ ئەوا روو لەچایچییەکە دەکات و هاوار دەکات" من برای فاتیمەم، وێر بۆ هەموو ئامادەبووان" بەراستیش پارەی هەموویان دەدات.

نەریتی وێر دواتر لەشارەکانی دیکەی عێراق بڵاوبۆتەوە، وایلێهاتووە پارەدانی پاس و سینەما و مەلهەکانیشی گرتۆتەوە. بۆیە لەناو پاس و لەبەر دەرگای سینەما و مەلهاکان هاوشێوەی ئەو دیاردەیە دەبینین کە پێشتر لە بەردەرگای چایخانە و چێشتخانەکان هەبووە.

ئەو نەریتە زەمەنەکەی بەسەرچووە، لەگەڵئەوەشدا زۆرێك لەخەڵك پابەند بەو دیاردەیەوە و نایانەوێ دەستبەرداری بن. تەنانەت هەندێك دەکەونە حاڵەتی شەرمەزارییەوە. یەکێك لەوانە من حەز دەکەم هاموشۆی چایخانەکان بکەم، چونکە گرنگترین سەرچاوەیە بۆ توێژینەوەی کۆمەڵگای عێراقی. زۆرجاریش تووشی کێشە و هەڵوێستی ناخۆش دەبم نازانم چۆن خۆمی لێ دەرباز بکەم، چونکە پێویست دەکات لەکاتی دەرچوون پێشبرکێ لەگەڵ کەسانی دیکە بکەم، لەسەر پارەدان، نەریتەکەش وایە دەبێت پەلە بکەم و هاواربکەم و پاڵپەستۆ دروست بکەم بۆ ئەوەی لەدیدی دانیشتوان بە قرچۆك دەرنەکەوم، ئەمەش هەندێك جار کارێکی ئەستەمە لەش سوکی دەوێت، کەچی ناچار ئەنجامی بدەم. خوا پەنای هەمووومان بدات!

نەریتێکی دیکە هەیە زۆر لە زۆر لایەنەوە لەنەریتی وێر دەچێت، ئەویش شەرمەزاربوونی تێدایە. کاتێك تۆ سەردانی ماڵێك دەکەیت، ئەوا خاوەن ماڵ شتێك لە خواردن و خواردنەوەت پێ دەدات، پێویستە تۆ رێگری لەخۆت بکەی، ئەویش

پێویستە پێداگری بکات و موکڕ بێت، خاوەن ماڵ رەحمەت پێناکات ئەگەر قورحەی گەدەت هەبێت، ئەو پاروو لەدوای پاروو دەخاتە دەمتەوە، پێداگری دەکات دەبێ بیخۆی. ئەگەر خواردت پاروویەکی دیکە دێت.. بەمشێوەیە. سوێندت بەپیرۆزترین شت بۆ دەخوات کە دەبێت بخۆی، تۆش سوێند دەخۆی کە ناخۆی....

هاوشێوەی ئەمە لەکاتی پێشکەشکردنی دیاری روو دەدات، وا پێویست دەکات کەسەکە قبوڵی نەکات و کەم بایەخ سەیری دیارییەکە بکات، هەرچەندە ئەو کەسەی دیارییەکە دەبەخشێ پێداگری بکات ئەوەی دیکەی پێداگری دەکات کە وەریناگرێ. ئەو لەوانەیە پێویستی بەدیارییەکە بێت و لەدڵەوە حەزی لێی بێت بەڵام نەریتی کۆمەڵایەتی وا پێویست دەکات پێچەوانەی ناخی دڵی دەربخات. ئەگەرهاتوو دواجار دیارییەکەشی قبوڵ کرد وا دەردەخات لەبەر پێداگری کەسەکە قبوڵی کرووە، دواتریش بەلێوەکانی نیشانەی قێزەونی و لوتبەرزی لەقبوڵکردنی دیارییەکە نیشان دەدات.

ئەگەر خواردن بدرێتە ماڵێك، دایکەکە هاوار دەکات ئەوان پێویستیان بەخواردن نییە و دەیخەنە بەردەم مریشکەکان، زۆرجاریش لەمە درۆ دەکات، کەچی دواتر لەدوەری خواردنەکە کۆدەبنەوە و بەپەلەوە قوتی دەدەن. کاتێك لە ویلایەتە یەکگرتووەکان بووم تێبینی ئەوەم لەخەڵکەکە کرد پێچەوانەی ئێمە لەبەرامبەر دیاری هەڵسوکەوت دەکەن، کاتێك دیارییەکە بەکەسێك دەدەیت، هەرچەندە دیارییەکە بێ بایەخ بێت، ئەوا پێویست دەکات خۆشی خۆی دەربڕێت و باسی بەهای دیارییەکە بکات، ئەو کەسە بۆ رووخۆشی ئەو قسانە دەکات، لەوانەیە دواتر دیارییەکە بخاتە تەنەکەی زبڵەوە. لەوێ کاتێك بانگ لەکەسێك دەکرێت خواردن بخوات، ئەوا ئەو کەسە چاوەڕێی ناکات خاوەن بانگهێشتەکە پێداگری بکات لەسە خواردنی. هێشتا لەژیانی ئەمریکا رانەهاتبووم جارێك سەردانی ماڵێکم کرد، خاوەن ماڵەکە نانی ئێوارەی دەخوارد بانگی لێکردم بۆ ئەوەی لەخواردنەکە لەگەڵی بەشداربم. لەراستیدا من ئەو کاتە ئارەزووی خواردنم هەبوو، بەڵام چاوەڕوانی پێداگریی و موکڕبوون لەخاوەن ماڵەکە دەکرد وەك ئەوەی لەعێراق

لێی راهاتووین، راز نەبووم و بێهودوە خۆم گران کرد، کەچی تەنها بێدەنگیم لەخاوەن ماڵ بینی، لەئەنجامیش خواردنە بەتامەکەم لەکیس چوو!

ئێمە ئەو نەریتەمان لە بیاباننشینی بۆ ماوەتەوە، خودی نەریتەکەش لە بەهاکانی لوتبەرزی و نەفس بەرزییەوە وەرگیراوە کە خەسڵەتە سەرەکییەکانی بیاباننشینیە وەك لەبەشی پێشوو ئاماژەمان بۆ کرد، ئەو نەریتەش تەنها لەبواری میوانداری و دیاریدا قەتیس ناکرێت بەڵکو زۆر بواری دیکەش دەگرێتەوە. زۆرجار تێبینی کوشکێشی نێوان خەڵکانێك دەکەین لەکاتی چوونەژوورەوە یان دەرچوون لەشوێنێك، یەکێك پێداگری دەکات کە کەسێکی دیکە پێشکەوێ، لەئەنجامی ئەمەش پاڵپەستۆ دروست دەبێت و رێگاکەش دەگیرێ.

کاتێك دوو کەس لەسەر شتێك پەلەیان بوو، بێئەوەی یەکتر بناسن، ئەگەرهاتوو یەکێکیان وتی "فەرموو" ئەوا ئەویتر بەپەلە دەڵێ" تۆ فەرموو" بەڵام ئەگەر یەکێکیان وشەی فەرمووی بەکار نەهێنا، ئەوا بارودۆخەکە وەك رووبەڕووبوونەوە و زۆرانبازی لێدێت، کەواتە دەتوانین بڵێین تاکی عێراق لەو لایەنەوە بە بەدو دەچێت، دەیەوێ ئەو چاکتر بێت لەکەسانی دیکە، نەوەك چاکەی خەڵکی بەسەرەوە بێت.

**داوەتی خواردن لە شارەکان:**

زۆرێك لەخانەدانی شارە گەورەکان پێگەی بەرزی کۆمەڵایەتی خۆیان لە زۆری سازکردنی داوەت وزۆری بانگهێشتکراوەکان دەدۆزنەوە. ئەمەش کولتورێکی کۆنی بەدوەکانە، تەنانەت مانا وئەرکە کۆمەڵایەتیەکەی لەدەست داوە، بۆتە سەرچاوەی دەستبڵاوی و خۆهەڵکێشان و بێ سوودیی.

ئەگەر یەکێك بمرێت، یان زەواج بکات، لەحەج بگرێتەوە، یان کوڕەکەی سوننەت بکرێت، یان هەر بۆنەیەکی دیکە، ئەوا خوانێکی گەورە ساز دەکرێت و خواردنی چەوری تێدا دادەنرێت، خەڵکێکی زۆریش بانگهێشت دەکرێن. تێبینی ئەوەم لەهەندێك لەو خاوەن داوەتانە کردووە، لەسەر کەمترین پارە مامەڵە لەگەڵ کۆڵکێشەکان دەکەن، بەشێك لەقەرزەکانی فرۆشیارەکان دەخۆن، کەچی لەسازکردنی داوەت وەك حاتەمی تەی دەردەکەون، ژمارەیەك ئاژەڵ سەردەبڕن،

مەنجەڵی گەورە پڕ دەکەن لەخواردن، دواتریش لەکاتی پێشکەشکردنی خواردن وەك خزمەتکار دەوەستن، قۆڵیان هەڵدەماڵن و بەهاواکردنەوە فرمان دەدەن وەك ئەوەی شێخەکانی بەدو بن.

پێشتر ئاماژەمان بۆ ئەوە کرد میوانداری لە لادێ و بیابانشینی ئەرکێکی کۆمەڵایەتی گرنگی هەیە، لەوانە هەڵێك بە رۆڵەکانی هۆز دەدات خواردنێکی چەور بخۆن، کە لەژیانی ئاسایی خۆیان نایخۆن. کەچی داوەتەکان لەشاردا، کەمێك نەبێت ئەگینا ئەو ئەرکە کۆمەڵایەتیە ئەنجام نادەن، زۆربەی بانگهێشتکراوەکان لەهاوڕێ و هاوکاری خاوەن داوەتەکەن، ئەوان لە زۆرحاڵەتدا لەخواردنی چەور راهاتوون.

نکۆڵی لەوە ناکەین خاوەن داوەتەکان رێگە بەهەژارەکان دەدەن بێ بانگهێشت کردن بێنە سەرخوانەکانەوە. لە زۆر داوەت تێبینی ئەوەکراوە هەژارەکان بە تامەزرۆوە لە ریزی دەوڵەمەند و خانەدانەکان خواردن دەخۆن، بەڵام لەراستیدا ئەمە لەسەر ئاستێکی فراوان لەرابردوودا روویداوە، کەچی بەمدواییە ئەو دیاردەیە لاواز دەبێت لەئەنجامی گۆڕینی دەستووری داوەتکردنەوە.

لەرابردوودا لە داوەتەکان شێوازی راخستنی سەفرە هەبوو، لەهەندێك لایەنەوە هاوشێوەی شێوازی میوانداری لادێبوو. سفرە بریتی بوو لەپارچە قوماشێك لەسەر زەوی رادەخرا، قاپەکانی لەسەر دادەنرا، داوەتکراوەکان واراهاتبوون دەوری سفرەکانیان دەدا و خواردنیان بەدەست دەخوارد، هەرکە قاپەکانیان بەتاڵ دەبوو، دووبارە پڕ دەکرایەوە لە خواردن، هەر کە جەماعەتێك لەخواردن تەواو دەبوون، جەماعەتێکی دیکە شوێنی ئەوانی دەگرتەوە.

کەچی ئێستا خاوەن داوەتەکان کورسی ومێز بەکاردەهێنن لەگەڵ چەقۆ وچەنگاڵ، چەندین هونەریی خۆشگوزەرانی و رازاندنەوە بەکاردێت، ئەمەش وایکردووە داوەتەکان خاوەن خەسڵەتی تایبەت بن، تەنها لەگەڵ خەڵکانی دیار و خۆشگوزەران بگونجێت. جا ئەگەر هەژاران بچنە ئەو داوەتانەوە بەهەر پێنج پەنجەی دەستیان بەشێوازی کۆن خواردن بخۆن، ئەوا کەسانی دەوروبەریان بە نارێکیان دەزانن، لەوانەشە هەژارەکان ببنە هۆی قێزبوونەوەی ئەوان.

کەسانێکی هەژار دەناسم لەکازمیە بە (سواریە) ناودەبران، ئەوان زۆربەیان لەنەوەی رابردوو بوون. کاتێك هەواڵی دەوەتێکیان لەشار دەزانیّ، ئەوا مزگێنیان بەیەك دەدا و سکیان بۆ ئامادە دەکرد، تا کاتی داوەتەکە دەهات، ئینجا زۆر سەیر دەوری داوەتەکەیان دەدا. هەر چۆنێك بووایە دەبوو خاوەنی داوەتەکە بەخێرهاتنیان بکات. وەك دەردەکەوێت ئەو کەسانە ئێستا درکیان بەوە کردووە سەردەمی زێڕینیان بەسەرچووە، بۆیە ئەو بەخێرهاتنە لەخاوەن داوەتەکە وەرناگرن کە پێشتر لێی راهاتبوون، بەڵکو لەبری ئەوە رووگرژی و چاوسوورکردنەوەیان بەردەکەوێت.

**شێوازی خواردن:**

زۆرێك لەخەڵکی شار لە شێوازێکی خواردن راهاتوو کە لەشێوازی خەڵکی لادێ و بیابان دەچێت. ئەو شێوازەش بریتیە لەخواردن لەپەلە وبایەخ نەدان بەجوینی خواردنەکە، لەلایەکی دیکەشەوە بریتیە لە پڕکردنەوەی گەدە بەخۆراکێکی زۆرەوە. چەندین پەندی بەدو هەیە لە لادێیەکان باوە، هەروەها کاریگەریشیان لەشاریش هەیە، لەوانە گوتەی ( **أكل الرجال على قدر افعالها** ) واتە: خواردنی پیاو بەقەد کارەکانیەتی (**كل مثل الجمال وقم قبل الرجال**) واتە: وەك حوشتر بخۆ بەڵام بەر لە پیاوەکان هەڵسە ( **كل مثل سباع وقم قبل الرجال بساع**) واتە: وەك شێر بخۆ بەڵام زووتر لەپیاوەکان هەڵسە.

لەراستیدا ئەم جۆرە پەندانە لە سروشتی ژیانی بەدو هەڵقوڵاوە، لەگەڵ نەریتی میوانداری ئەوان گونجاوە. بەدو لەوە راهاتووە لە زۆرترین کاتدا خواردنێکی سادە و ساکار بخوات وەك ماست و خورما و نان، ئەوان خواردنی چەور ناخۆن تەنها ئەو کاتە نەبێت کە شێخەکەیان میوانێکی بەڕێزی دێت، یان لە ژنهێنان و پرسە و ئەو جۆرە بۆنانە نەبێت. ئەوکاتەش دەبینین خواردن بە جەماعەت لەدوای جەماعەت دەدرێت، دەبێت لەوکاتەش پەلە لەخواردنەکە بکەن بۆئەوەی دەرفەت بدرێتە کەسانی دیکە لەدوای ئەوان بێن خواردنەکە بخۆن بەر لەوەی ساردبێتەوە.

بەدو بۆ خواردن شێوازێکی تایبەت بەخۆیان هەیە، بە (خواردن بەپێنج) دەناسرێت، ئەم شێوازەش بریتیە لەوەی بە پێنج پەنجەکە خواردنەوە

کۆدەکەنەوە دواتر دەیخەنە دەمیانەوە بە چاوتروکانێك قوتی دەدەن. کاتێکیش لەخواردن دەبنەوە ئەوا لەسەر زەوییەکە رادەکشێن بۆ ئەوەی هاوکاری گەدە بکەن لەهەرسکردنی خواردنەکە. خەڵکی لادێ ئەو نەریتەیان لەبیابانەوە بۆ ماوەتەوە، دواتریش لەشار بڵاوبۆتەوە، ئەمەش یەکێکە لە رواڵەتەکانی تەوژمی بەدو لەنێوان دانیشتوانی شاردا، کە زۆرجار بۆتە هۆی فراوانبوونی گەدە و زۆرێك لە پەشۆکاوی لەهەرسکردندا.

دکتۆر هاشم وتری ئاماژەی بۆ ئەو زیانە تەندروستیانە کردووە لەئەنجامی ئەو نەریتە لەلای خەڵکی لادێ پەیدا دەبێت[٢٢٩]. لەراستیدا ئەو نەریتە زیانی بۆ سەر خەڵکی شار زیاترە لە خەڵکی لادێ، تاکی لادێی وەك بەدوە شێوازی پێنج پەنجە تەنها لەچەند بۆنەیەکی دیاریکراو بەکاردەهێنێ، کە خواردنی لەپێش کەڵەکە دەبێت، ئەمەش بە هەلێك دەزانێ بۆ ئەوەی زۆرترین خواردن هەڵوشێ بۆ ئەوەی قەرەبووی ئەو برسێتیە هەمشەییە بکاتەوە کە تەواوی رۆژەکان بەدەستیەوە دەناڵێنێ.

کەچی لەشارەکان بارودۆخەکە لەزۆر لایەنەوە جیاوازە، ئاستی بژێوی لە شار بەرزترە لەلادێ. لەشارەکان توێژێکی گەورەی خەڵك لەتوانیان هەیە هەردەم خواردنی چەور حازر بکەن، تاکێك لەوان کاتێك شێوازی خواردن بەپێنج پەنجە رۆژ لەدوای رۆژ بەکاردەهێنێ، لە نیوەرۆ وئێوارەدا، وەك ئەوەی بەبەراورد لەگەڵ خەڵکی لادێ لە داوەتێکی هەمیشەیی بێت.

خواردنی پەسەند بەلای خەڵکی شارەوە هەمان ئەو خواردنانەیە کە لەلای خەڵکی لادێیەوە پەسەندە، زۆربەی جارەکان لە برنجی پارێزین و بەروونی مەقلی، دواتر لە لەگەڵ مەرەگە وگۆشت تێکەڵ دەکرێت. ئینجا بە تامەزۆرییەکی سەیر دەیخۆن. ئەوەی شایەنی باسە ئەو جۆرە خواردنە زۆرترین زیان و کەمترین سوودی هەیە، کەچی ئەوان پەرۆشن و جگە لەو خواردنە لەزەت لەخواردنی دیکە وەرناگرن. بۆیە دەبینی یەکێکیان تا رادەی رشانەوە خوردانەکە دەخوات و دواتریش لەسەر یەك قرپی دێتەوە.

---

[٢٢٩] Hashim witry ( health service in Iraq )p. 18

لەراستیدا ئەمە نەریتی زۆربەی دانیشتوانی شار نییە، بەڵکو نەریتی دەوڵەمەند و تاکەکانی چینی ناوەڕاستە، کەچی هەژارەکان جیاوازییەکی ئەوتۆیان لەگەڵ دانیشتوانی لادێ نییە، زۆربەی کاتەکاینا خواردنی سادە دەخۆن، بۆیە لەوەی دەرفەتی داوەت دەگەڕێن بۆ ئەوەی سکیان پڕ بکەن.

**شانازیکردن بە مەنجەڵی گەورە:**

یەکێك لەشانازییەکانی زۆرێك لەخەڵکی شار گەورەیی ئەو مەنجەڵەیە بۆ چێشت لێنان بەکاردێت، لەگەڵ ئەو چەورییەی لەمەنجەڵەکە دەکرێت. وەك نەریتێك پیاو شەرم دەکات لەبازاڕ بڕێکی کەم خۆراك بۆ ماڵەکەی بکڕێت، ئەگەر ئەمەی کرد ئەوا خەڵکی بازاڕ بە قرچۆکی دەزانن و قسەوقسەلۆکی لەسەر دەکەن. هەژار ئەگەر ئەمە بکات ئەوا لێی خۆش دەبن، بەلام ئەگەر کەسێکی دەوڵەمەند یان کەسێك لەچینی ناوەڕاست ئەو کارە بکات لێ خۆشبوونی بۆ نییە.

خانەدانی پیاو ئەوەیە زیاد لەپێویستی خێزانەکەی چێشت لەماڵەکەی حازر بکرێت، ئەمەش نەریتێکی کۆنە لەئەنجامی ئەوە دروست بووە خەڵکی پێشبینی میوانی ناوەختی کردووە. زۆرجار تێبینی ئەوە دەکرێت لە کۆڵانەکان پاشماوەی خواردن لەبەردەرگای ماڵەکان فڕێ دەدرێت، لەوانەشە هەندێك بە ئەنقەست وا بکەن بۆ ئەوەی سەرنجی خەڵك بۆ زۆری خواردنی ماڵەکەیان رابکێشن.

دەتوانم بڵێم خەڵکی شار لەبابەتی خواردنەوە بەدەست گرێیەکی دەروونییەوە دەناڵێنن، کە دەتوانین بە " گرێی چێشت لێنان" ناوی ببەین. ئەو گرێیە وا لە هەندێك هەژار دەکات زێدەڕۆیی بکەن وەك هەوڵێك بۆ بەرزکردنەوەی پێگەی کۆمەلایەتییان، ئەوانەی لاسایی دەوڵەمەندەکان دەکەنەوە لە گەورەیی مەنجەڵ و زۆری خواردن. پیاوێك لەو هەژارانە دەناسم، هەوڵەکانی بۆ ئەوەی خۆراك بە بڕێکی زۆر بکڕێت لەسەرووی داهاتە کەمەکەی بێت. وا راهاتووە ئەو خۆراکان بەرز هەڵبگرێت کاتێك لەبازاڕەوە بەرەو ماڵ دەچێتەوە، وەك ئەوەی بڵێ" تەماشا بکەن" ئەو لەپێناوەدا خۆی و منداڵەکانیشی تەنگەتاو دەکات. واباشتر بوو ئەو پیاوە داهاتەکەی بۆ شتی بەسوودتر بەکاربهێنێ، بەلام گرێ دروونییەکە رێگەی پێنادات.

یەکێك لەو چیرۆکانەی لەبیری ناکەم، چیرۆکی بێوەژنێکی پیرە، لەگەڕەکە کۆنەکەمان دەژیا. یەکێك لەژنانی دراوسێ ڕۆژێکیان جنێوی پێدا و وەها وەسفی کرد کە زۆر هەژارە بەشێوەیەك چێشت لەماڵەکەی حازر ناکرێت و ئاگر لەماڵەکەی هەڵناکرێتەوە. لەراستیشدا ئەم ژنە وا بوو، بەڵام نەیتوانی بەرگەی ئەو سوکایەتیە بگرێت، ئەو جنێوەش وەك خاڵی وەرچەرخان بوو لەژیانیدا، بۆیە دواتر سەرجەم قسەکانی ئەو ژنە لەسەر خواردن بوو، ئەو دەیویست بۆ خەڵکی گەرەك بسەلمێنێ کە هەمیشە مەنجەڵەکەی لەسەر ئاگرە و دراوسێیەکەی درۆ دەکات. هەموو بەیانییەك دەمبینی بە زەمیلیەکەوە بەرەو بازاڕ دەڕۆیشت دواتر دەگەڕایەوە بۆخەڵکی گەڕەك باسی گرانی نرخی خۆراکی دەکرد، هەندێك جاریش قسەکانی دەبڕی و بەپەلە بەرەو ماڵەوە دەچوو، وای دەردەخست دەیەوێ لەخواردنەکەی سەر ئاگر دڵنیا بێتەوە نەوەك بسوتێ[330].

**گیانی دراوسێیەتی لەشارەکاندا:**

بنەمای باو لەلای خەڵکی شار لە رابردوودا بریتی بوو لە" **الجار قبل الدار**" دراوسێ بەر لەخانووەکە. هەردەم ئەو گوزارشتەیان دووبارە دەکردەوە" **جارك ثم جارك ثم جارك**". تەنانەت زۆرێك لەخەڵکی شار هێشتا دراوسێ کۆنەکانیان وەبیردێتەوە و لایەنگری بۆ دەکەن و لەکاتی نەهامەتی بەهانایانەوە دەچن.

ئەگەر کەسێکی بێگانە بێتە گەڕەکەکەوە، خانوویەك بۆ خێزانەکەی دابین بکات، ئەوا خەڵکەکە لێکۆڵینەوە لەبارەی ئاکاری خۆی و خێزانەکەی دەکەن. ئەگەر زانیان شەریفە، ئەوا بەیەکێك لەخۆیان دەزانن، ئەگەریش دەرکەوت ناشەریفە ئەوا هەوڵ دەدەن بەهەر هۆکارێکی رەخساو لەگەڕەکەکەی دەربکەن. لەوانە بەئەنقەست جارسی دەکەن و بەرد دەخەنە ماڵەکەی یانیش دەرگاکەی بەپیسایی دەکەن.

دراوسێی نوێ لەگەڕەك لە رۆژی یەکەم سەرقاڵ گواستنەوەی ناوماڵیەتی، بۆیە لەم رۆژەدا دراوسێیەکانی خواردنی پێشکەش دەکەن وەك هاوکارییەکە،

[330] علي الوردي (الاحلام بين العلم و العقيدة) ص ١١٣

ئەویش ئەگەر لەخواردنەکەی خوارد، ئەوا پەیوەست دەبێت بەدراوسێیەتی و نەمەك دەکەوێتە نێوانیان و نابێت ناپاکی بکات.

ئەوەی شایەنی باسە بەمدواییە، گیانی دراوسێیەتی بەرە بەرە لە ئەنجامی فراوانبوونی شارەکاندا لاواز دەبێت و هەڵدەوەشێتەوە. ئەم فراوان بوونە بۆتە هۆی ئەوەی خەڵکەکە ماڵیان لەگەڕەکە کۆنەکان بۆدەوروبەر بگوازنەوە، لەراستیشدا ئەو گەڕەکە نوێیانەی شار کە لەدەوروبەر فراوان دەبن، نەیتوانی بەتەواوی پارێزگاری لە گیانی دراوسێیەتی کۆن بکات، خەڵك تاکە تاکە دەچنە ئەو گەڕەکانە و رەوتی تاکی کەسی بەسەریان زاڵ دەبێت. کاتێك یەکێك پارچە زەوییە بۆخۆی تەرخان دەکات بۆ ئەوەی خانووی لەسەر دروست بکات، بایەخ بەوە نادات کێ دراوسێیەتی، لەوانەیە هەندێکجار بۆی دەربکەوێ ژنێکی بەدناو دراوسێیەتی، ئەو کاتە بێزاری و سکاڵای خۆی دەردەبڕێ بەڵام ناتوانێ بەرامبەر ئەو ژنە ئەو کارانە دووبارەبکاتەوە کە پێشتر خەڵك لە گەڕەکە کۆنەکان لەحاڵەتێکی وەها ئەنجامیان دەدا.

دانیشتوانی ئەو گەڕەکانەی دەوروبەر هێشتا لەناخی دەروونیانەوە پاشماوەی گیانی دراوسێیەتی کۆن هەڵدەگرن، بەڵام ئەو پاشماوەیە بەس نییە بۆ ئەوەی لەخۆشی وناخۆشی لەگەڵ یەکتر هاوکار بن، ئەمەش بووە هۆی دەرکەوتنی کێشەیەکی کۆمەڵایەتی نوێ لەنێو دانیشتوانی ئەو گەڕەکانە، ئەویش کێشەی (ماڵە گومان لێکراوەکانە)، ئەو کێشەیە لە بەغدا دوای داخستنی لەشفرۆشەکان سەری هەڵداوە، بەشێوەیەك لەشفرۆشی لەو گەڕەکە نوێیانە لەسەر ئاستێکی فراوان سەری هەڵداوە خەڵك بێهودە بێزاری خۆی دەردەبڕێت.

ئەو کێشەیە لە زۆربەی شارە گەورەکانی وڵاتانی پێشکەوتوو هەیە، بەڵام خەڵك لەو شوێنانە بایەخ بەو مەسەلەیە نادات، کەچی لەلای ئێمە بایەخێکی گەورەی پێدەدرێت، چونکە هێشتا رەگوریشەی مەسەلەی دراوسێیەتی و شەرەفی گەڕەك لە پێکهاتەی خەڵکی ئێمە قوڵە .

**لاوازی پێکەوە ژیان لەماڵدا:**

ژیانی ماڵەوە لەشارەکانی عێراق لاوازە ویەکگرتوو نییە. مەبەستیشم لەژیانی ماڵەوە، پەیوەندی هۆگری و پێکەوەژیانی نێوان ئەندامانی یەك ماڵە، واتە لەنێوان پیاو وژن ومنداڵەکانی، کە لە زمانی ئینگلیزی بە(Home life ) ناودەبرێت[٣٣١].

پیاو بۆماوەیەکی کەم نەبێت، ئەگینا لەگەڵ ژن ومنداڵەکانی دانانیشێ. دوای تەواوبوونی کارەکانی، لەماڵەوە هەرکە نانەکەی خوارد، ئەوا دەست بۆ عەباکەی دەبات و بەرەو چایخانە ودیوەخان وهاوشێوەی ئەو شوێنانە دەچێت. وەك نەریتێك ماڵ تایبەتە بەژنان، پیاویش حەز ناکات لەگەڵ ژنان لەماڵەوە بمێنێتەوە، ئەوانیش لەلایەن خۆیانەوە نایانەوێ پیاو لەماڵەوە بمێنێتەوە سەلیقەیان تێك بدات. هەروەها منداڵانیش وەك چاوەڕوانیان لێدەکرێت لەماڵەوە نامێننەوە، ئەوانیش دەچنە کۆڵان بۆ ئەوەی لەگەڵ منداڵانی دراوسێ یاری بکەن. زۆرجاریش دەبینین دایك خۆیان منداڵەکانیان رەوانەی دەرەوە دەکەن. بەمشێوەیەش ئەندامی ماڵەکە پەرت دەبن، تەنها لە چەند کاتێکی دیاریکراوی وەك کاتی خواردن و نوستن کۆدەبنەوە.

دەتوانین بڵێین لاوازی پەیوەندی پێکەوەژیان لەماڵەوە دیاردەیەکی گشتیە لەعێراقدا، بەڵام لەشارەکان زۆر روونترە لە بەر ئەو هۆکارانەی خوارەوە:

١- دابڕانێکی توندی ژنان: ئەمەش ژنی لەماڵەوە گۆشەگیر کردووە. بەشێوەیەك ماڵ تاکە بواری ژنە دەتوانێ تێیدا ئازاد بێت. ژنان لەوە راهاتوون لەماڵەوە سەردانی یەکتر دەکەن. ئەگەرهاتوو سەردانی ماڵێکیان کرد ئەوا دەبێت پیاوەکە ماڵەوە جێبهێڵێ، بۆ ئەوەی ئازادی ئەوان تێك نەدات. ئەوکاتەش ژنان دەستدەکەن بە قسەکردنێکی چڕوپڕ لەبارەی کاروباری تایبەت بەخۆیان و کەسوکار و دراوسێیان. بێ هیچ کۆت و بەربەستێك. بەمەش دەتوانن نەفەسەیێك وەربگرن لەو تەنگەبەرییەی لەنێو دیواری ماڵەوە هەیانە.

٢- قەرەباڵغی ماڵ: ئەمەش بابەتێکە لەزۆر ماڵی شارەکانی عێراق بەدی دەکرێت. هەردەم چەند خێزانێك لەخانوویەك پێکەوە دەژین، لەوانەیە هەر

---

[٣٣١] متی عقراوي (العراق الحديث) ص ٢٤٢-٢٤٣

خێزانێك لەناو ژوورێك یان چەند ژوورێك بژیت، بەمەش حەوشی خانووەکە دەبێت شوێنی هات وهاواری ژنان، لەو کاتەشدا پیاو ناچار هێمنی وحەوانەوە لە دەرەوەی ماڵ بدۆزێتەوە.

٣- خۆ بەگەورەزانینی پیاو: پیاوان لە بیابانشینی ئەو نەریتەیان بۆ ماوەتەوە کە خۆیان لە ژن بە گەورەتر بزانن و خۆی لەمەجلیسی ژنان بەدوور بگرێت. ئەگەر پیاوێك نەریتی وەها بێت لەماڵەوە لەگەڵ ژنان بمێنێتەوە ئەوا لە روانگەی هاوڕێیەکانیەوە کەسێکی لوسکەڵە و ژنانییە. لەبەر ئەوەی ئەو پیاوە دەبێت لەگەڵ پیاوانی هاوشانی خۆی دابنیشێت.

٤- بارودۆخی ماڵ: وەك دەزانرێت ماڵی عێراقی بەشێوەیەکی گشتی فەرامۆشکراوە و هۆکاری پشوودان و خۆشی و رازاوەیی تێدانییە تا پیاو بۆ مانەوە رابکێشێت. ژنی عێراقی لەوە راهاتووە زیاتر بایەخ بە قاپ وقاچاخ و ئاگردان دەدات هێندە بایەخ بە رازاندنەوەی ماڵ و خۆشی ماڵەوە نادات. زۆرجار دەبینین ئافرەت لەشاری عێراق شانازی بەبارەگەی بوکێنی دەدات گوایە گرانبەهایە و دەستبلاوی تێدا کراوە، کەچی بایەخ بەوە نادات چ سوودێکی کردەیی هەیە، بۆیە ماوەیەکی کورت بەسەر بوکێنیّ تێناپەرێت بارەگەکە فەرامۆش دەکرێت و ئاژاوە و پیسی روو لەماڵەکەی دەکات.

کاتێك بەراوردی نێوان ماڵی عێراق دەکەین بەماڵەکانی وڵاتانی دراوسیّ وەك سوریا وتورکیا و ئێران، ئەوا جیاوازییەکی روون لەنێوانیان بەدی دەکرێت. ژن لەو وڵاتانە هەوڵ دەدات بەپێی توانای خۆی، ماڵەکەی رازاوە وسەرنج راکێش بێت، ئەو ماڵەوە جوان دەکات و خۆشی لەگەڵ ماڵەکەی جوان دەکات، بۆ ئەوەی دەرفەتێك بە پیاو دەدات تێیدا بمێنێتەوە دوای کارەکانی، کەچی ژنی عێراق بارودۆخەکەی ناچاری کردووە خۆی فەرامۆش بکات و لەزۆر لایەنیشەوە ماڵەکەی فەرامۆش بکات.

نکۆڵی لەوە ناکەین بەم دواییانە ژنی عێراقی بایەخ بەخۆی وماڵەکەی دەدات، لەمەشەدا بە بەها شارستانییەکان کاریگەربووە. ئێمە ئێستا سەرەتای گۆدەتاییەك دەبینن لەبارودۆخی ماڵی عێراقیدا. لەراستیدا ئەمە گرنگترین کارە

وەزارەتی پەروەردە دەبێت لە قوتابخانەی كچان بایەخی پێ بدات، چونكە ژیانی ماڵ بنەمای دروستبوونی كۆمەڵگایەكی چاك و گەشەكردنی كەسێتی دروستە.

دەبێت گرێی خواردن لە ماڵ نەمێنێت، ژیانی ئارامی وئاسوودەیی شوێنی ئەو بگرێتەوە. لە فەرمودەیەكش هاتووە "رحم الله من جعل في بيته جنته". (واتە خوا رەحمەت بۆ ئەو كەسە دەبێت كە ماڵەكەی خۆی دەگات شوێنێكی وەك بەهەشت– وەرگێڕ)

## یەكانگیری خێزان:

لەگەڵئەوەی ژیانی ماڵ لەشارەكانی عێراق لاوازە، كەچی یەكانگیری خێزان لەنێوانیاندا زۆر بەهێزە. تاكەكانی خێزان وێرای كەم كۆبوونەوە وپێكەوە دانیشتیان لەماڵەوە، كەچی لە هەمان كاتدا دەبینین لەهەست بە رایەڵێكی بەهێزیان نیوانیان دەكرێت لەبەرامبەر بێگانەدا، ئەوان لەخۆشی وناخۆشی لەگەڵ یەك هاوكار و یەكانگیر دەبن، بۆیە ئەگەر یەكێك تووشی كارەساتێك بێت ئەوا هەموویان دەوری دەدەن و هاوكاری دەكەن.

یەكانگیری خێزان لەشارەكانی عێراق یەكێكە لەرواڵەتەكانی كولتوری بەدو. خێزان وا هەست دەكات لەبەرامبەر ئەوانی دیكە وەك هۆزێكی بچووكە، بۆیە هەر نەنگی و هەر شانازییەك لە تاكێكی خێزانەكە بەر تەواوی ئەندامی خێزانەكە دەكەوێت، ئەمەش بابەتێكە دەتوانین لە جنێوەكانی عەوام وەری بگرین، ئەگەرهاتوو گوێمان لەكەسێك بوو جنێو بەكەسێكی دیكە دەجات ئەوا تێبینی ئەوە دەكەین جنێوەكان تەنها بۆ كەسی جنێوپێدراو نییە، بەڵكو باوك و دایك و برا و كەسوكاریشی دەگرێتەوە. بچووكترین جنێویش لەو بارەیەوە كەسەكە رووبەرووی دەبێتەوە ئەوە پێی دەگوترێت "سەگی كوڕی سەگ" پێویستیش ناكات باسی جنێوەكانی دیكە بكەین هەموویان زانراون....

بەهەرحاڵ ئەو یەكانگیریەی خێزان بۆتە هۆی دەركەوتن جۆرێك لە بیمەی كۆمەڵایەتی لەنێوان تاكەكانی خێزاندا، ئەگەر ژنێك بێوەژن بكەوێتەوە، منداڵێك هەتیو بێت، پیاوێك پیر بوو، ئەوا یەكێك لە خێزانەكە دەركەوێت بژێویان دابین بكات و چاودێریان بكات. ئەگەرهاتوو ئەو جۆرە كەسانە بێ سەرپەرشت مانەوە

ئەوا کەسانی خواپێداو لە تاکەکانی خێزانەکە لەلایەن خەڵکەوە رووبەرووی توانج دەبنەوە و بەکەم دەزانرێت، بۆیە پێویست دەکات هەر کەسێکی دەوڵەمەند بەهەموو توانای خۆی هاوکاری کەسی نەدار بکات لەئەندامانی خێزانەکەی، ئەگەر کەمتەرخەمیشی نەواند ئەوا پاساوی لێ قبوڵ ناکرێت.

هەروەها لەسەر ئەندامانی خێزانەکە پێویستە وەك یەك پیاو بوەستن کاتێك یەکێکیان رووبەرووی دەستدرێژی و سووکایەتی دەبێتەوە. هەندێك جار تۆڵەکردنەوە و قینە دەکەوێتە نێوان خێزانەکانەوە هاوشێوەی ئەوەی لەلادێ و بیابان دەکەوێتە نێوان هۆزەکانەوە.

ماوەیەکی دوور نییە کازمییە رووداوێکی بەخۆیەوە بینی کە ئاماژەیەکی کۆمەڵایەتی گەورەی هەیە. پوختەی رووداوەکە ئەوەبوو پیاوێك لە خێزانێکی ناسراوی گەڕەکی ئەنبارییەکان لەسەر دەستی هۆزێکی لادێی کوژرا. یەکێك لە ئەندامانی ئەو خێزانە بەپەلە بەرەو چایخانەیەك چوو کەیەکێك لە ئەندامانی هۆزەکەی لێ دانیشتبوو، یەکسەر کوشتی. لەراستیدا ئەو پیاوەی کوژرا پەیوەندی بەرووداوی کوشتنەکەی پێشوو نەبوو، لەوانەشە هەر ئاگاداری رووداوەکە نەبێت، کەچی بەشێوازی بیاباننشینی لەپێناو تۆڵەکردنەوە کوژرا. ئەمەش مانای ئەوەیە یەکانگیری خێزان لەشارەکانی عێراق دوولایەنی هەیە: چاك وخراپ. لایەنی خراپ ئەوەیە دەمارگیرییەکی توندە بەرامبەر دەمارگیرییەکانی دیکە، کەچی لایەنە چاکەکەی بریتیە لەهاوکاری و زامنکردنی کۆمەڵایەتی لەکاتی پیربوون و نەخۆشی و کارەسات، ئاسانیش نییە ئەم دوو لایەنە لەیەکتر جیابکەنەوە.

ئەوەی شایەنی باسە ئەم یەکانگیرەی خێزان لە بەرامبەر ئەو تاکگەرایی شارستانیەتی نوێ هێناویەتی خەریکە لاواز دەبێت، ئەمەش لەنێو خوێندەواران روونە، خەڵکی دیکەش بەرە بەرە بەو تاکگەراییە کاریگەر دەبن.

**رەوشی ژنان لە شارەکاندا:**

بارودۆخی ژنان لەشارێکەوە بۆ شارێکی دیکە بەپێی جیاوازی بارودۆخی شارەکە و بڕی زاڵبوونی تەوژمی بەدوەکان دەگۆڕێت. لەو شارە بچووکانەی

پەیوەندیان بەهێزیان لەگەڵ هۆزەکانی دەوروبەر هەیە، ئەوا دەبینین بارودۆخی ژنان لە زۆر رووەوە لەبارودۆخی ژنانی لادێ دەچێت. ژن دەموچاوی دەردەخات وهاوکاری پیاوان دەکات لە کاروبارەکانی، تێکەڵ پیاوان دەبێت وقسەیان لەگەڵ دەکات، تەواو وەك ئەوەی لەلادێ هەیە. لەهەمان کاتیشدا تێبینی دەکرێت کوشتن لەسەر شەرەف لەو جۆرە شارانە وەك نێو هۆزەکانی لادێ هەیە.

ئەگەر شارەکە گەشەی کرد و بازاڕەکانی فراوانبوو بێگانە زیاتر هاموشۆی کرد، ئەوا حیجاب و گۆشەگیری ژنان بەرە بەرە زیاتر دەبێت، کاتێکیش شارەکە دەبێتە مەڵبەندێکی بازرگانی گەورە، وەك ئەوەی لە بەسرا و موسڵ و بەغدا هەیە، ئەوا دەبینین حیجاب و گۆشەگیری ژنان زێدەڕۆیی تێدا دەکرێت تەنانەت پاکی ژن بە بڕی خۆداپۆشین و زیاتر مانەوەی لەماڵەوە پێوانە دەکرێت. ئەگەر خەڵك بیانەوێ وەسفی ئافرەتێکی داوێن پاك بکەن ئەوا دەڵێن" کچی ماڵە کەسێك پەنجەی نەدیوە، کەس گوێی لەدەنگی نەبووە". یان دەڵێن" ژن لەدرێژایی تەمەن مافی هەیە دوو جار لەماڵەوە بچێتە دەرەوە، جاری یەکەم رۆژی بوکێنیێ کاتێ لەماڵی باوکی بۆ ماڵی مێردەکەی دەچێت. جاری دووەمیش کاتێك دەکرێت تەرمەکەی لەماڵەوە بەرەو گۆڕ دەبرێت"[٣٣٢].

ئەوەی پێویستە باس بکرێت ئەوەیە: ئەو کەسانەی بەمشێوە توندڕەوە پابەند دەبن بە جێبەجێکردنی حیجابی ژنانەوە، نەریتی کوشتنی بەتۆمەت ناموس لەلایەن لاوازە، دەگمەنە یەکێك لەوان بەتۆمەتی گومانکردن ژنێك بکوژێت. ئەمەش وەك ئەوەیە بەحیجاب قەرەبووی نەریتی کوشتنیان کردۆتەوە. نەریتی کوشتن بەتۆمەتی شەرەف وەك هەڕەشەیە، کەچی حیجاب وەك زیندانە. کاتێك ژن کراوە دەبێت و لەگەڵ پیاوان کاردەکات وەك ئەوەی لەشارە بچوك و لادێکان هەیە ئەوا دەبێت بەخەنجەری شەرەف پاککردنەوە هەڕەشەی لێ بکرێت بۆ ئەوەی لەرێگای راست لانەدات، کەچی ئەگەر لەماڵەوە زیندان بێت و حیجاب بێت ئەوا رێگە بەتێکەڵبوونی نادرێت لەگەڵ پیاوان، لەو کاتەش هۆکارێك نییە بۆ هەڕەشەکردن لەو ژنە.

---

[٣٣٢] عبدالرزاق الهلالي (تاريخ التعليم في العراق في العهد العثماني) ص٥٩

ئەمە بارودۆخەکە بوو لە سەردەمی عوسمانییەکاندا، بەڵام ئێستا سیماکانی شارستانیەتی نوێ لە شارەکان بڵاو دەبێتەوە، رەوتێکی نوێیش دەرکەوتووە کە گرنگییەکی زۆری هەیە. لەشارە گەورەکان ژنانی نوێ بە خێرایی لەحیجابەوە باز دەدەن بۆ سفووری، ئەمەش لەماوەیەکی زۆر کورت روویدا. لە دەیەی سێیەمی ئەم سەدەیەمان ژن لەماڵەوە دەردەچوو ئەگەر دوو عەبای بەسەرەوە نەبووایە، یەکێکیان بەسەر ژانی و ئەویستیان لەسەر سەری، رێگای خۆی نەدەبینی تەنها لەمیانەی کونێکی بچووکەوە نەبێت، یان لەدوای ئەو پەردەیە نەبێت کە پێدەگوترا(پوشیە) کەچی ئێستا قژ وهەندێك لەسنگ و قاچی دەردەخات و بەنوێترین هونەرەکانی شارستانیەتی نوێ خۆی دەرازێنێتەوە.

ئەوەی جێگای سەرنج بێت لەوکاتەی لەشارە گەورەکان ژنان بەخێرایی لەحیجابەوە بەرەو سفوری دەڕۆن، کەچی لەهەندێك شاری بچووکدا بەپێچەوانەوە ژن لە سفورییەوە بەرەو حیجاب دەچێت.

لەساڵی ١٩٥١ یەکێك لە قوتابیەکانم راپۆرتێکی لەبارەی شاری هیتەوە کردبوو، باسی ئەوەی کردبوو پێش چەند ساڵێك حیجاب لە شارەکە بڵاوبۆتەوە. ژنانی هیت لەرابردوودا وەك هەموو ژنانی لادێ وشارە بچووکەکان حیجاب نەبووە، بەڵام دواتر لە ئەنجامی تێکەڵبوونی بە ژنانی شار مەیلی حیجابیان بۆ دروست بووە. ئەوان لاسایی ژنانی شاریان کردۆتەوە وەك ئەوەی حیجابیان بەنیشانەی پێگەی بەرز ودەسەڵات زانیوە، هۆکارەکەش ئەوە بووە حیجاب لەرێگای ژنە فەرمانبەرەکانەوە هاتۆتە هیت، بۆیە ژنانی هیت وەك مۆدە سەیری حیجابیان کردووە گوایە پێگەی خۆیانی پێ بەرزدەکەنەوە، سەرەتاش ژنانی خانەدان داوایان لەمێردەکانیان کردووە عەبایان بۆ کڕن هاوشێوەی ژنانی فەرمانبەر، بەمەش ئەو مۆدەیە بەرە بەرە لەهیت بڵاو دەبێتەوە.

مەزندەی ئەوە دەکەم ئەوەی لەهیت روویداوە لە زۆربەی شارە بچووکەکانی عێراق روو دەدات، بەڵام دەبێت بزانین ئەمە لەو شارانەدا قۆناغێکی کاتیە و ماوەیەکی زۆر بەردەوام نابێت. مۆدەی سفووری کە لەشارە گەورەکان بڵاوبۆتەوە زوو یان درەنگ تەوژمەکەی بەرەو ئەو شارە بچووکانە دەچێت، ئەمە رواڵەتێکی

تەوژمی شارستانیەتی گەورەیە خەریکە بەسەر کۆمەڵگای عێراقی زاڵ دەبێت و ناکرێت کەسێك بەرەو رووی بوەستێ.

ئەو سفورە بەدوەی لەسەردەمی عوسمانییەکان لە نێو زۆربەی ژنان بڵاوبوو، ئەمڕۆ بەرەو نەمان دەچێت. لەراستیدا ئەو جۆر سفورێکی سەنگین بوو هاوسەنگی لەنێوان حیجاب و سفوری ئێستا کرد بوو، سەرەڕای ئەمەش ناتوانێ خۆی لە بەرامبەر مۆدا نوێیەکان بگرێت.

**ریش وسمێڵ:**

ریش لە رۆشنبیری بیاباننشینی پلەیەکی بەرزی هەیە. لە تێڕوانینی بەدو ریش گرنگترین نیشانەی جیاکردنەوەی پیاوە لەژن، بۆیە کەپیاوێك ریشی تاشراو دەبوو ئەوانی بەچاوی رقەوە سەیریان دەکرد و گوایە پیاوەتی کەمە. وەك لەکۆندا زانراوە کاتێك دەیانویست سووکایەتی بەپیاوێك بکەن ئەوا ریشیان دەتاشی یان دەیانسووتاند، بەمەش دەیانویست هاوشێوەی ژن بێت، لێرەوە شاعیر دەڵێ:

**من حلقت لحية جار له فليسكب الماء على لحيته**

(واتە: ئەگەر کەسێك ریشی بینی ریشەی دراوسێیەکەی تاشراوە، ئەوا ئاو بەریشی خۆی دابکات. مەبەست ئەوەیە ئەگەر خراپەیەك بەسەر دراوسێیەکەت هاتووە تۆش خۆتی بۆ ئامادەبکە– وەرگێڕ)

خەڵکی شار ئەو نەریتەیان لەبەدوەکان بۆ ماوەتەوە، تا ماوەیەکیش لەمەوبەر پابەندبوون بەو نەریتەوە. کاتێك هانای بۆ کەسێك دەبرد ئەوا دەستی بۆ ریشی دەبرد، یانیش کاتێك بەڵێنی دەدا ئەوا دەستی لەریشی دەدا بۆ زامنکردنی بەڵێنەکەی کاتێك بەڵێنەکەی دەبردەسەر ئەوا دەیبڕێ یان دەیتاشی.

لە کۆتاییەکی سەدەی نۆزدەهەم، مۆدەی ریشتاشین هاتە عێراق، وەك دەردەکەوێت ئەو مۆدەیە لە رێگای ئەو ئەفەندیانەوە بووە کە لەقوتابخانە نوێیەکانی ئەستەنبوڵ دەرچووبوون، دواتریش هەندێك لەدانیشتوانی شار لاساییان دەکردنەوە، لە ئەنجامی ئەمەش ململانێیەك لەنێوان لایەنگرانی ریش ونەیارانی ریش دروست بوو، پیاوانی ئایینی لایەنگربوون، فەتوای حەرامبوونی ریشتاشیان دا، تەنانەت زۆرێکیان تا ئەمڕۆ لەگەڵ ئەو بۆچوونەن.

دەکرێت بگوترێت بایەخدان بە سمێڵ لەلایەن هەندێك لەخەڵکی شار شوێنی ریشی گرتەوە، بەتایبەتی لەلای (شەقاوەکان) ئەوان بایەخیان بەدرێژکردن وبابڕکردنی ریشیان دەدات، بەنیشانەیەکی پیاوەتی خۆیان دەزانی، پیاو لەنێو ئەوان لەکاتی بەهاناچوون و شانازیکردن بەپەنجەکانی سمێڵی بادەدا، ئەو کاتە لەزمانی بەغداییەکان پێیان دەگوت (البرم) واتە شانازی بەسمێڵی خۆی دەکات و بای دەدات.

ئەمەش وایکرد سمێڵ پەیوەست بێت بەمروەت و وەفاداری پیاوەوە، وەك چۆن پێشتر ریش ئەو ئەرکەی هەبوو، بۆیە ئەگەر خەڵك داوای شتێکیان لەپیاوێك بکردایە دەیانگوت" لەسمێڵی تۆمان دەوێ" ئەگەریش خۆی بەڵێنی دەدا دەیگوت" لەسمێڵی من وەری بگرن" لەوکاتەشدا نادەیتوانێ لەبەڵێنەکەی پەشیمان بێتەوە.

بەسەرهاتێکی خۆش دەگێرنەوە، دەڵێن پیاوێك لەوانەی شانازی بەسمێڵی خۆی دەکات لەبازاڕ شت دەکرێت، کاتێك سەیری گیرفانەکانی دەکات دەبینی ئەو پارەیەی هەیەتی بەشی نرخی شتەکان ناکات، بۆیە موویەك لەسمێڵی خۆی دەکاتەوە ووەك زامنکردنێك بەدوکاندارەکەی دەدات، دوکانداریش بێ دوودڵی قبوڵی دەکات بەخۆشحاڵییەوە کەلوپەلەکانی پێدەدا، چونکە لەوە دڵنیابووە پیاوەکە قەرزی خۆی دەداتەوە و مووی سمێڵەکەی دەباتەوە. لەنزیك دوکانەکەوە پیاوێك ئاگاداری رووداوەکە دەبێت، دەیەوێت سمێڵی خۆی وەك پیاوی یەکەم بەکاربهێنێ، بۆیە چەند تاڵەموویەکی سمێڵی دەردەهێنێ و بەدووکاندارەکەی دەدات، بەڵام دوکاندارەکە رەتی دەکاتەوە، چونکە بەهای پیاوان دەناسێ و دەتوانێ سمێڵی" ئەسڵی وعادی" لەیەکتر جیابکاتەوە.

هەروەها دەزانرێت ئەو کات ژنان بەو جۆرە سمێڵانە سەرسام دەبوون و رێزیان دەگرت، لەکاتی ناخۆشی بۆ کارێك هانای بۆ پیاو دەبرد بانگی دەکرد" وەرە سمێڵ قنج" . دەگوترێت ژنێك شووی بەپیاوێك کردبوو لەبەر سمێڵ بابڕییەکەی، کەچی دەرکەوت پیاوەکە شایەنی ئەو سمێڵە نییە، بۆیە دەڵێ:

**شفت شواربه تعزت بيه    لوما شواربه ما كنت ألفيه**

( واتە : سمێڵەکەی ئەوم بینی شانازیم پێکرد، ئەگەر سمێڵەکەی نەبوایە ئەوا هاوسەری نەدەبووم —وەرگێڕ)

هەرچۆنێك بێت ئەو جۆرە سمێڵانە لەدوای جەنگی یەکەمی جیهانەوە باوی نەما، لەشوێنی ئەو سمێڵێ بروا، لەشێوەی چارلی چاپلن، شوێنی گرتەوە...دواتر مۆدەی سفرکردنی تەواوی سمێڵ هات. بۆیە ئێستا پیاوان زیاتر بایەخ بە قژیان دەدەن، ئەمەش لەلای نەوەی رابردوو بە ژنانی و پیاوی لوسکەڵە ناودەبرێن. ئەوان دەیانەوێ پیاوان پارێزگاری لەسیمای پیاوەتی خۆی بکات هاوشێوەی پیاوانی رابردوو.

پیاوێکی بەساڵاچوو لەنەوەی رابردوو دەناسم، زۆرجار لەگەڵی دادەنیشم باسی یادگاریەکانی رۆژانی بەسەرچوو دەکات. ئەو زۆر بەرقەوە لەگەنجانی ئێستا دەڕوانێ. کاتێك گەنجان بەلای تێدەپەڕن، لەسەر یەك حەسرەت دەکێشێ بۆ رۆژانی (سەرفرازی) کە پیاو تێیدا بەواتەی وشەکە پیاو بوو " وێنەی ئەو گەنجە دەبەنگانە بێت، کە ناتوانن مریشکێك سەرببڕن، هەموو خەمیان ئەوەیە سمێڵیان بتاشن وقژیان شانەکەن و چاوبازی لەگەڵ ژنان بکەن" ئەو بە حەسرەتەوە دەڵێ" پیاو نەما" مەبەستی لەو سمێڵ فشانەیە کە کاتێك دەڕۆیشتن زەوی لەبەر پێیان دەلەرزی.

## بەشی یازدەم

### دووفاقی کەسێتی لەشارەکاندا

دووفاقی کەسێتی بابەتێکی سەخت و ئالۆزە. من لەکتێبی (کەسێتی تاکی عێراقی) کە لەساڵی ١٩٥١ دەرچووە، باسی ئەو بابەتەم کردووە. ئەم کتێبە ئەوکات هەرا ومشتومڕێکی زۆری لەسەر کرا. من ئەو کات بۆچوونم وا بوو دووفاقی کەسێتی دیاردەیەکی کۆمەلأیەتیە لەهەموو کۆمەلگای مرۆیی بوونی هەیە. لەهەندێك شوێن لاوازە یان بەهێزە ئەوا بەپێی جیاوازی باروودۆخی هەر کۆمەلگایەکە. هۆکارەکەشی ئەوەیە کۆمەلگا دەکەوێتە نێوان دوو سیستەمی دژبەیەکتری بەهاکان، لەئەنجامی ئەمەشدا تاکەکان ناچار دەبن لەهەندێك کاتدا پەنا بۆ سیستەمێکیان ببەن وهەندێك کاتی دیکەش بەدوای سیستەمەکەی تر دەبن و دژی خۆیان دەوەستن بێئەوەی لەڕواڵەتدا بایەخی پێ بدەن.

بۆچوونی ئەوەم هەبوو کۆمەلگای عێراقی بەشێکی زۆری ئەم دووفاقیەی بەرکەوتووە، بۆیە دەبینین تاکی عێراقی لەهەموو کەسێك زیاتر بەدوای ئایدیاڵی بەرزە، لەوتار ونووسین ومشتومڕەکانی بانگەشەی بۆ دەکات، کەچی لەهەمان کاتدا لەهەموو کەسێك زیاتر لەژیانی خۆیدا لەو ئایدیالأنەی لاداوە.

**بۆچوونی هەندێك رەخنەگر:**

دەبێت ئاماژە بۆ ئەوە بکەم، ئەو گریمانەیەی لەساڵی ١٩٥١ هێناومە بەلای زۆرێك لەرەخنەگران ومامۆستایانی عێراق قبوڵ نەبوو؛ هەندێکیان سەرسام بوون وبەتوندی هێرشیان دەکردە سەر گریمانەکە، گوایە لەسەر بنەمایەکی دروستی زانستی بونیاد نەنراوە.

یەکێك لەوان پسپۆڕێکی دەروونناسی بوو، هەڵگری بڕوانامەی دکتۆرا بوو. ئەو کەسە لەساڵی ١٩٥٨ لە هۆڵی کۆلیژی زانستەکان موحازەرەیەکی داوە، لەوێ بابەتی دووفاقی کەسێتی لەعێراق بەتەواوی پوچەڵ دەکاتەوە، ئەمەش دەقی

قسەکانیەتی:" زۆرجار لەخانەی باڵای مامۆستایان کاتێك باسی بابەتی کەسێتی دەکەین، قوتابیەکانم دەپرسن: ئایا راستە تاکی عێراقی دووفاقی لەکەسێتی دایە؟ دەڵێم: بەدڵنیایەوە نەخێر. کەسێتی دووفاقی لەرووی دەروونییەوە نەخۆشە و نەخۆشیەکەشی هەمیشەییە. کەسەکە کەسێتیەکەی دابەشبووە، زیاتر لەیەك کەسێتی هەیە، هیچ پەیوەندیەکیش لەنێوان ئەو کەسێتیانە نییە. تەنانەت کەسەکە بەهۆی لەبەرچوونەوەی هەمیشەیی، خۆشی هەست بەو دژایەتیەی کەسێتیەکانی ناکات. وایت مامۆستای دەروونناسی لەزانکۆی هارفەرد لە کتێبەکەی بەناوی (کەسێتی ریزیەڕ) لە لاپەرە ٢٩٩، باسی ئەو بابەتەی کردووە، ئەو پێیوایە ئەو کەسەی تووشی ئەم نەخۆشییە بووە ئەوە لەبیر دەکات خۆی کێیە و لەکوێ دەژی، رووداوەکانی رابرووی بەبیرنایەتەوە. ئایا کەسێك لە ئێمە تاکێکی عێراقی بینیوە ئەو نیشانانەی هەبێت؟ دواتر ئەو کەسانەی تووشی ئەم نەخۆشیە دەبن، ژمارەیان زۆر کەمە، تایلەر و مارتن ئامارێکیان بۆ تووشبووانی ئەم نەخۆشیە حازر کردووە زیاتر لە ٧٦ کەسیان نەدۆزیوەتەوە. لێرەوە تێدەگەین ئەو نەخۆشییە بوونی دەگمەنە. مارتن لەکتێبەکەی دا بەناوی (کەسێتی دابەشبوو) باسی ئافرەتێکی کردووە کەسێتیەکانی دابەشبووە بەسەر سێ جۆر کەسێتی:١- کەسێتی چاکەخواز و پاکیزە ٢- کەسێتی سەربەخۆ وتوندڕەو و بەخواست. ٣- کەسێکی خۆش مەشرەب و مەکرباز."[٣٣٣].

ئەمە قسەکانی مامۆستای بەرێزە، بەراستی جێگای داخە مامۆستایەکی زانکۆ مەیلی بەلای بنبڕبوونی بۆچوونە زانستیەکانەوە هەبێت. ئەو کاتێك پرسیاری لەبارەی بوونی کەسێتی دووفاقی لەعێراق لێکراوە وەڵامەکەی ئەوە بووە" بەدڵنیاییەوە نەخێر". ئەگەرهاتوو سەیری بۆچوونی زانایانی کۆمەڵناسی بکات لەو بارەیەوە، ئەوا ئەو بۆچوونە یەکلاکەرەوەی دەگۆڕێت. میتۆدی زانستی بنبڕ ویەکلاکردنەوە ودڵنیاکردنەوە نازانێت، بەڵکو زیاتر ئەم میتۆدە بۆ گومانکردن و مەزندە و باشتر زانینی بۆچوونێك دەڕوات. بەمەش نەبێت رۆژێك لەرۆژان زانست بەرەوپێش ناچێت و گەشەناکات.

[٣٣٣] جريدة الشعب البغدادية الصادر ٣٠ نيسان ١٩٥٨

وەك دەردەکەوێت مامۆستا کاتێك موحازەرەکەی داوە لەژێر کاریگەری چەمکەکانی دەروونناسیەوە بووە، بیری چووە زانستێکی دیکە هەیە چەمکی خۆی هەیە، ئەویش کۆمەڵناسییە. پێویستە ئاماژە بۆ ئەوە بکەین هەندێك چەمك هەیە لەنێو زانستەکاندا لەرووی زمانەوانییەوە لەیەکتر دەچن، بەڵام لەرووی واتاوە جیاوازن. ئەمە بابەتێکە دەبێت توێژەران تێی بگەن، بۆئەوەی بەپەلە بڕیار لەسەر بابەتێك نەدەن، کە ئاگاداری نین.

لەراستیدا جیاوازییەکی گەورە لەنێوان تێگەیشتنی دەروونناسی وکۆمەڵناسی هەیە بۆ چەمکی دووفاقی کەسێتی. دووفاقی لەڕوانگەی دەروونناسیەوە نەخۆشییەکی دەگمەنە، کەسانێك تووشی دەبن لەئەنجامی بارودۆخی تایبەت بەخۆیان. ئەم نەخۆشیەش ریزپەری لەپێکهاتەی کەسێتی دروست دەکات. کەسەکە لەکاتێکدا کەسێتیەك وەردەگرێ، کەچی دواتر کەسێتیەکی دیکەی دەبێت. کاتێکیش کەسێتیەکەی دەگۆڕێت ئەوا بیری دەچێت لەکەسێتی یەکەمدا چی کردووە. هەندێك جاریش وا روودەدات تووشبوو بەم نەخۆشیە دەروونیە، سێ کەسێتی یان زیاتری دەبێت، وەك مامۆستای بەرێز ئاماژەی بۆ کردووە.

کەچی دووفاقی کەسێتی بەمانا کۆمەڵایەتیەکەی بابەتێکی دیکەیە. ئەمەیان نەخۆشییەکی دەروونی نییە، بەڵکو دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە، لەلای زۆرێك لەخەڵك روودەدات کاتێك ململانێی رۆشنبیریان لەنێودا دەبێت. ئەمەش دوو توێژەری کۆمەڵایەتی کە ناویان پیج و مکایفەرە ئاماژەیان بۆ کردووە، ئەو دوو توێژەرە دیاردەی دووفاقی کەسێتی بە (دووانەی کولتووری Cultural Ambivalence) ناودەبەن. ئەوان لەو بارەیەوە دەڵێن" کاتێك تاك رووبەرووی داواکانی رۆشنبیریەکی کۆمەڵایەتی دژبەیەکتر دەبێتەوە، بەتایبەتی لەقۆناغی یەکەمی گەشەکردنیدا، ئەوا ناتوانێ کەسێتیەکی تەواو لەخودی خۆی بونیادبنێ. بێهوودە هەوڵیش دەدات گونجانێك لەنێوان ئەو داوا دژبەیەکانە دروست بکات، بۆیە ئەو تاکە کەم یان زۆر دەبێتە خاوەن کەسێتیەکی دووفاقی"[٣٢٤].

---

[٣٢٤] Maelver and Pege (society)p 580

توێژەری کۆمەڵایەتی کیمبل یۆنگ ئاماژەی بۆ هەمان شت کردووە، کاتێک باسی بۆ ململانێی بەهاکانی کردووە لەکۆمەڵگای ئەمریکی، باسی لەوە کردووە تاك لەوێ بەدەست ململانێیەکەوە دەناڵێنێ، کە لەلایەك بەها نەرمونیانەکانی مەسیحیەتە کە لەپێشینە دیندارەکانی وەرگرتووە، لەلایەکی دیکەوە ئەو بەها دڵڕەقە ئابووریانەیە، کە لەدەورووبەردا رووبەرووی دەبێتەوە، بۆیە لەئەنجامی ئەم ململانێیەدا دووفاقی کەسێتی یان کەسێتی دابەشبوو دروست دەبێت (Schizoid or Split personality)[٣٣٥].

ئەوەی شایەنی باسکردنە زانایانی کۆمەڵناسی بایەخێکی گەورەیان بە بابەتی دووفاقی کەسێتی نەداوە، ئەوان بەخێرایی ئاماژەیان بۆ کردووە، نەچوونەتە بنج وبنەوانی. هۆکارەکەش ئەوەیە دووفاقی بەو رادەیە لەکۆمەڵگای ئەوان بڵاونەبۆتەوە کە لەکۆمەڵگای ئێمەدا هەیە. لەگەڵئەوەشدا تێبینی دەکەین بەمدواییە زیاتر بایەخ بەم بابەتە دەدەن، لەوانە لەساڵی ١٩٦٢ لەویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کتێبێکی کۆمەڵایەتی دەرچوو، بەشێکی کتێبەکە پەیوەندییەکی بتەوی بە بابەتی دووفاقی هەیە بەناونیشانی (رۆشنبیری دووفاقیمان، our schizoid culture). لەساڵی ١٩٦٣ کتێبێکی دیکە دەرچوو، بەشێکی پەیوەندی بەبابەتی دووفاقییەوە هەیە بەناونیشانی ( دووانەی کۆمەڵایەتی، Sociological ambivalence)[٣٣٦].

هەرچۆنێك بێت ئێمە نابێت کوێرانە لاسایی توێژەرانی بیانی بکەینەوە وبەدوای بایەخ و بابەتەکانی ئەوان بین. کۆمەڵگای ئێمە لەزۆر لایەنەوە لەکۆمەڵگای ئەوان جیاوازە. ئەرکی زانستی ئەوەیە کۆمەڵگای خۆمان لەژێر رۆشنایی بارودۆخی تایبەتی خۆی تاوتوێ بکەین، ئەوکاتەش لەوانەیە بگەینە دەرئەنجامێك جیاواز بێت لەدەرئەنجامەکانی ئەوان.

[٣٣٥] Kimbal young (social pshychology)p 154

[٣٣٦] Edward Tiryakian (sociological theory, values , and sociocultural change)p 91-120

**جەدەل ودووفاقی :**

لێرەدا دەرفەت نییە بەوردی توێژینەوەی لەبارەی دووفاقی کەسێتی بکەین لەعێراق[٣٢٧]. تەنها لەم دەرفەتە هێندە دەڵێم دووفاقی کەسێتی لە سەردەمێکی کۆنەوە لەعێراق دەرکەوتووە. دەرکەوتنەکەشی لەسەرەتای ئیسلامدا رۆشن بوو. رەنگە ئەمەش هۆکارێك بێت وای لەخەڵك کردووە خەڵکی عێراق بە ( خەڵکی دووبەرەکی و دووڕوویی: آهل الشقاق و النفاق) وەسف بکەن. هەتا ئێستاش ئەو تۆمەتە بە عێراق لکاوە، زۆرجاریش خەڵکی عێراق خۆیان لەهەندێك بۆنەدا ئەم وەسفەیان دێتە سەرزار.

مەزندەی ئەوە دەکەم یەکێك لەو هۆکارە کارایانەی هاوکار بووە لە دەرکەوتنی دووفاقی کەسێتی لەعێراق ئەو مەیل و پەرۆشەیە بوو کەخەڵکی عێراق بۆ جەدەل هەیانە. لەراستیشدا ئەو رەوتە جەدەلییە لە کۆندا، بەئێستاشەوە لەعێراق بەهێزە، لەوانەیە لەهەموو وڵاتێکی عەرەبی وئیسلامی بەهێزتر بێت. لەوانەیە سوودی هەبێت ئەگەر شتێك لەمێژووی ئەو رەوتە لە عێراق باس بکەم، کە چۆن گەشەی کردووە و رەگوڕیشەی داکوتاوە.

یەکێك لەو تایبەتمەندیانەی لەسەرەتای دەرکەوتنی ئیسلام کۆمەڵگای عێراقی پێ دەناسرێتەوە ئەوەیە ئیمام عەلی کوڕی ئەبوتالب زۆرینەی رۆژانی خەلافەتی خۆی تێدا بەسەر بردووە. ئەم پیاوەش لەخەلافەتەکەیدا وەك زانراوە نموونەیەکی نایابی زوهد و دادپەروەری و لەخواترسی بوو، بەڵام خەڵکی عێراق لە ژیانیدا تێنەگەیشتوون و بەهای خۆیان بۆ دەنەناوە، بۆیە لەدوای رۆژانیدا زۆر گلەیی لەوان دەکرد، لەبارەی ئەوان وتویەتی دڵیان پڕ لەزام کردووە. کەچی کە مرد ئەوان لەکارەکانی خۆیان پەشیمان بوونەوە، درکیان بەوەکرد ئیمامێکیان لەدەست داوە نموونەی لەزەمانە کەمە، ئەوکاتەش دەستیان کرد بە پیرۆزکردن ومەزنکردن و زێدەرۆیی کردن لە باسکردنی چاکەکانی.

---

[٣٢٧] کتێبێکی سەربەخۆم بۆ ئەو بابەتە تەرخان کردووە بەناونیشانی ( دووفاقی کەسێتی لەعێراق : لەسەردەمی کۆن و نوێدا) ئینشاڵاً بەمن نزیکان بڵاوی دەکەمەوە- عەلی وەردی

عێراق لەسەردەمی ئەمەوییەکان بووە شوێنی موعارەزەی دەوڵەت، شۆرش لەدوای یەك لە عێراق هەڵدەگیرسا ئەمەش وایکرد والییەکان ئەوکی خەڵکی عێراق بگرن، ستەمیان دەرهەق بکەن. دەوڵەتیش هێرشکردنە سەر عەلی کردە دروشمی خۆی و لەسەر مینبەرەکانیش باسی دەکرد، ئەمەش وایکرد خەڵکی عێراق زیاتر پابەند بن بەعەلی و پیرۆزکردنی ئەو. تەنانەت وایلێهات خۆشەویستی عەلی بووە دروشمی خەڵك بۆ دژایەتیکردنی دەوڵەت[٣٢٨].

ئەمەش مانای ئەوەیە کولتوری فیکری لەعێراق خەسڵەتی ئایدیالیزمی عەلەوی وەرگرت. جا خەڵکی عێراق لەبیرکردنەوەی ئایدیالن بەرز دەبوون، تەنانەت خەیاڵی سیستەمێکی سیاسی و کۆمەڵایەتیان دەکرد کە لەسەر سەرگوزەشتەی چاکەکەی عەلییەوە وەرگیرابوو. زۆر زەحمەتیش بوو ئەو سەرگوزەشتەیە دوای مردنی خاوەنەکەی جارێکی دیکە بێتەدی، بەتایبەتیش دوای خەلافەت گۆڕا بۆ پاشایەتی وەك ئیبن خەلدون ئاماژەی بۆ کردووە[٣٢٩].

خەڵکی عێراق زێدەڕۆییان لە بیرکردنەوەی ئایدیاڵانەی خۆیان دەکرد، لەکاتێکدا کە ژیانی واقیعیانەیان بەرە بەرە لەو حاڵەتە دوور دەکەوتەوە کە سروشتی ئەو بیرکردنەوەیان دەیخوازێ. لەئەنجامی ئەمەش کەلێنێکی گەورە کەوتە نێوان ئایدیاڵی ئەوان و واقیعی کۆمەڵایەتیان. ئەوەی هاوکار بوو لەزیادبوونی ئەو کەلێنە دەرکەوتنی مەزهەبی موعەتەزیلەکان لەعێراقدا، ئەو مەزهەبەش بۆ بڵاوکردنەوەی باوەڕەکانی خۆی پشت بە جەدەلی لۆژیکی وبەڵگەی عەقڵی دەبەستێت. هەلی ئەوە بۆ موعەتەزیکەکان رەخسا ماوەیەکی زۆر بەسەر بیرکردنەوەی عێراقییەکان زاڵ بن، لەماوەی دەسەڵاتی سێ خەلیفەی عەباسی کە ئەوانیش مەئمون وموعەتەسەم و واسیق بوون، توانیان دەوڵەت بۆلای خۆیان راکێشن، دواتریش لەعێراق چەندین بابەتی گەورەی جەدەلیان وروژاند، خەڵکیش لەهەموو مەجلیسەکانی خۆیان لەبارەی باوەڕە ئاینیەکانەوە جەدەلیان دەکرد.

---

[٣٢٨] علي الوردي (مهزلة العقل البشري )ص٨١-٨٥

[٣٢٩] ابن خلدون (المقدمة) ص ٢٠٢-٢٠٩

دواجار موتەوەکیل هات توانی بەسەر موعتەزیلەکان زاڵ بێت و سەرکوتیان بکات، لەمەشدا حەنبەلییەکان پاڵپشتی بوون. ئەوان بەغدایان پڕکرد لە خۆپیشاندان و راوەدوی هەر کەسێکیان دەنا کە گومانیان لێدەکرد موعتەزیلە بێت یان لەگەڵ ئەوان هاوڕا بێت. بەهەرحاڵ نەیتوانی رەوتی جەدەلی ریشەکێش بکەن کە لەناخی عێراقییەکان رەگی داکوتابوو. زۆرجاریش سەرکەوتکردن ئامانجی ئەنجامەکەی پێچەوانەی ئامانجەکەی دەبێت.

پرەنسیپی حەنبەلییەکان لەو وتەیە کورت دەکرایەوە " ئەوەی لۆژیک بەکاربهێنێ، زندیقە"، بەلآم ئەو پرەنسیپە لەعێراق سەرناکەوێ، هەرچەندە حەنبەلییەکان کۆششێکی زۆریان لەپێناودا نواندن. تەنها ماوەیەکی کورت تێپەڕی ئەبوحەسەنی ئەشعەری دەرکەوت، ئەو پیاوە رۆڵێکی گەورەی هەبوو لەپاڵپشتیی کردنی رەوتی جەدەلی ، گێڕانەوەی گوڕوتینەکەی لەعێراقدا.

ئەشعەری سەرەتا موعتەزیلە بوو، دواتر سوننەبوونی خۆی راگەیاندن. توانی باوەڕی سوننەکان لەسەر بنەمای جەدەلی لۆژیکی و عیلمی کەلام هەڵبسەنگێنێ، ئەو کاتە شیعەکانیش هەمان کاریان کرد، بەمەش عێراق بووە مەیدانی جەنگێك لەبری شمشێر چەکی لۆژیکی تێدا بەکاردەهات، بۆیە هەر تایفەیەك لەڕێگای پێوەرەکانی لۆژیك و بەڵگە عەقڵییەکان بەرگری لە باوەڕی خۆی دەکرد و هێرشی دەکردە سەر باوەڕی نەیارەکەی.

کاتێك بارودۆخی زاڵبوو لە عێراقی سەدەی چوارەمی کۆچی دەخوێنینەوە ئەمە روونی دەبینین. لەم سەدەیەدا شارستانیەتی ئیسلامی دەگاتە ئەوپەری گەشەکردنی، هەروەها رەوتی جەدەلیش دەگاتە ئەوپەڕی هێزی خۆی، ئەو کاتە بەغدا پایتەختی جیهانی ئیسلامی و مەڵبەندی جەدەلی لۆژیکی بوو.

رەوتی جەدەلی سەدە لەدوای سەدە لەعێراق بەهێز و کارا مایەوە، تێکەڵبوونی بە ململانێی تایفی یەکێك بوو لەدیارترین سیماکانی، بۆیە دەبینین خەڵکی عەوام بەخەنجەر و دارعەسا شەڕیان دەکرد، کەچی فەقیهەکانیش بە بەڵگەی عەقڵی لەجەنگ دابوون. کاتێ سەردەمی عوسمانییەکان بوو لەعێراق ئەوا رەوتی جەدەلی زیاتر بوو ئەمەش لەئەنجامی ململانێی نێوان دەوڵەتی عوسمانی و دەوڵەتی ئێرانی

بوو، ئەو کاتە شارستانیەت لەدارووخان بوو کەپێشتر بینیمان، کەچی جەدەلی لۆژیکی تووشی ئەو دارووخانە نەبوو، هەردوو دەوڵەتی رکابەرش کۆشش و پارەیەکی زۆریان سەرفکردن لەپێناو پاڵپشتی کردنی ئەو رەوتە لەنێو دانیشتوانی عێراقدا. هەر دەوڵەتیکیش ئەم کارەی بۆ هۆی بەجۆرێك لە پروپاگەندەی سیاسی دەزانی.

دەکرێت بگوترێت رەوتی جەدەلی تا ئەمرۆ لەعێراق بەهێزە، کەم تا زۆر لەسەر خەسڵەتە ئایینیە کۆنەکەنەی نەماوە، بەڵکو لەبارەی بابەتە نوێیەکانی سیاسەت و کۆمەڵایەتی و ئابووری دەکرێت، بەڵام کاریگەریەکەی رۆشنە لەسەر کەسێتی تاکی عێراقییەوە، بۆیە دروست نییە توێژینەوە لەبارەی کۆمەڵگای عێراق بکەین، سەرنجی ئەو لایەنە گرنگەشی نەدەین.

**کێشەی رەوتی جەدەل:**

کاتێك رەوتی جەدەل لەنێون گەلێك دروست بێت، ئەوا ئەو گەلە زیاتر لەگەلانی دیکە مەیلی بەلای زانین وخوێندنەوە دەبێت. لەرووی بیرکردنەوەشەوە تێروانینی فراوان دەبێت، کەچی لەلایەکی دیکەوە بۆچوون و مەیلەکانی پەرتەوازە دەبێت، ماوەیەکی زۆر لەسەر بنەمایەك ناوەستیّ. سەرسامی سەرۆکێك نابێت لە دوری بێت و بەردەوام بێت لەپاڵپشتی کردنی.

رەوتی جەدەلی وا دەکات خەڵك زیاد لەپێویست لەبیرکردنەوەیان ئایدیالیست بن، ئەگەرهاتوو بۆچوونێك لەنێویان بلاوبۆیەوە، یان زەعیمێکیان لەنێو دەرکەوت، دەبێت لەهەر رووپەك بێت ئەوا کەموکورییەکی لیّ بدۆزنەوە. سەرەتا بۆی پەرۆش دەبن، دواتر پەرۆشیان بەرە بەرە کەم دەکات، لەو پێناوەشدا لەبەرامبەر پێوانەی لۆژیکی و نموونەی بالآیان بەکاردەهێنن، بۆیە دەبینن لەوە نزمترە کە سەرەتا خەیاڵیان بۆ کردبوو، لێرەشەوە لەبەری رادەکەن و پاشکشەی لیّ دەکەن.

کەموکورییەکی دیکەی رەوتی جەدەلی ئەوەیە تاك فێری ئەوە دەکات داوای ئەنجامدانی هەندێك کار لەکەسانی دیکە بکات، کەخودی خۆی ناتوانیّ ئەنجامیان بدات. ئەو دەیەویّ کەسانی دیکە نموونەیی بن بەپێی ئەوەی جەدەلی لۆژیکی دەیخوازیّ. ئەو کاتە دەبینین رەخنەی توند دەگرێت و زمانی درێژە، وا مەزندە

دەکات ئەوانەی رەخنەیان لێ دەگرێت دەبێت دووربن لەهەر هەڵەیەك، ئەگەر هەڵەیەکی بچووك ئەنجام بدەن ئەوا بە بەڵگەی عەقڵی گەورەی دەکات، کەچی لەهەڵەکانی خۆی خۆش دەبێت و لەبیری دەکات، بۆ ئەمەش بەڵگەی سەلماندن دەهێنێتەوە کە شتێکی نەکردووە تەنها کاری دروست نەبێت.

تاکێکی جەدەلی زیاتر لەئەرکەکانی داوای مافەکانی دەکات، بەڵگە عەقڵیەکانیشی بۆ ئەمە ئامادەیە. کاتێك بۆ داواکردن لەخەڵك بەڵگەیەك دەهێنێتەوە، ئەگەرهاتوو داوا لەو بکرێت، ئەوا بەڵگەی پێچەوانەی هەیە. ئەو زیاتر دەیەوێ وەربگرێ نەوەك ببەخشێ. ئێمە نکوڵی لەوە ناکەین ئەمە سروشتی مرۆڤە لەهەموو سەردەم و شوێنێکدا، بەڵام ئەم جۆرە کەسانە جیاوازیان ئەوەیە چەکێکی یەکلاکەرەوەی هەڵگرتووە ئەویش چەکی لۆژیکە. ئەگەرهاتوو کەمتەرخەمی لەئەرکەکانی نواند وەك کەسانی دیکە، ئەو گلەییەکان دەخاتەوە سەرکەسانی دیکە و خۆی لێ دەرباز دەکات. ئەو دەتوانێ بسەلمێنێ کە بەچاکترین شێوە ئەرکەکانی خۆی ئەنجام داوە، قورببەسەر ئەوەی رووبەرووی دەبێتەوە و نکوڵی لێ دەکات، ئەوکاتە چەکی لۆژیکی لەبەردەم هەڵدەکێشێ، وازناهێنێ تا زامداری نەکات.

لەفەرموودەیەك هاتووە "اذا اراد الله بقوم سوءا أورثهم الجدل و قلة العمل" ( واتە: ئەگەر خوا چارەنووسی خراپی قەومێکی بوێ ،ئەوا جەدلیان پێدەدات لەگەڵ کەم کارکردن- وەرگێر). ئەو فەرموودەیە وێنەیەکی روونمان بۆ ئەو گەلە پێدەدات کە رەوتی جەدەلی لەنێو گەشەی کردووە، ئەو جەدەلەکەی بەهێزە لەپێناو داواکردن لەکەسانی دیکە، لە هەمان کاتیش جەدەلەکەی بەهێزە لەدژی ئەوەی داوای شتێکی لێ بکرێت.

یەکێك لە خەسڵەتەکانی پێوانەکانی لۆژیك ئەوەیە بۆ پاڵپشتی هەر بۆچوونێك بەکاردێت، تەنانەت بۆ پێچەوانەی دژەکانیشیان بەکاردێن[٣٤٠]. بۆیە دەبینین کەسی جەدەلی ئێستا کە ئارەزووی شتێکی هەیە بەڵگەی لۆژیکی بۆ دەهێنێتەوە، بەڵام ئەگەر ئارەزووەکەی گۆڕا ئەوا دەتوانێ بەڵگەی دیکە بهێنێتەوە بۆ پاڵپشتیکردنی

[٣٤٠] Henry Thomas (the living world of philosophy)p. 91

ئارەزووە نوێیەکەی، زۆرجاریش نکۆڵی لەو دژبەیەکە دەکات کەتێی دەکەوێ. هەر لەبەر ئەمەشە زۆربەی کات کەسی جەدەلی کەسێتیەکەی دووفاقە.

**شوێنی دووفاقی لەعێراق:**

کاتێك دەڵێن دووفاقی کەسێتی لەعێراق گەشەی کردووە، مەبەستمان ئەوە نییە بە یەك پلە لەنێو هەموو دانیشتوانی هەیە. پێشتر ئاماژەمان بۆ ئەوە کرد دووفاقی لەنێو کۆمەڵگایەك دەرناکەوێ، تەنها ئەو کاتە نەبێت دوو سیستەمی بەهای دژ بەیەکتر هەن، ئەمەش هەردەم لەشارەکان هەیە و لەلادێ کەمترە و لەبیابان دەگمەنە.

شار ئەو شوێنەیە کە زۆر ئامۆژگارییە ئایینەکانی تێدا دەخوێنرێتەوە و رەوتی جەدەلی تێدا توند دەبێت. خەڵك لەشار فێری ئایدیالی بەرز دەبن کە دژی ئەو ئاکار ونەریتانە ئەوان لەژیان لێی راهاتوون، بە گوزارشتێکی دیکە ئەوان لە ئامۆژگاری و جەدەلەکانیان لەگەڵ ئایدیاڵەکان بەرزەفڕن، کەچی لە واقعی ژیانی خۆیان پێچەوانەی ئەمە دەڕۆن، هاوشێوەی ئەمەش لە بیابان و زۆرێك لە لادێکان دەگمەن.

کۆمەڵگای بەدوەکان لەژێر سایەی تاکە رۆشنبیریەکی کۆمەڵایەتی دەژیت، تەنانەت لەمە زیاترە نازانێ، تاکی بەدو لەژینگە دابڕاوەکەی خۆی دا فێر بیرکردنەوە وئایدیالی ئەوتۆ نەبووە پێچەوانەی ئەو بەها و نەریتانە بێت کە لەمنداڵییەوە لەسەری پەروەردە کراوە. ئەو بڕوایەکی یەکلاکەرەوەی هەیە بەوەی ژیانەکەی ژیانێکی نموونەییە ناکرێت چاکتر لەو ژیانە هەبێت. دکتۆر ئەحمەد ئەمین لەوەسفی کەسی بەدو دەڵێ" خەیاڵی سنووردارە، هەمەجۆر نییە، زۆر کەم خەیاڵی وێنەی ژیانێکی دیکە، جگە لەژیانی خۆی دەکێشێ، بەدوای ژیانێکەوە نییە باشتر بێت لەژیانی خۆی لەبەر ئەوە ئایدیاڵ و نموونەی باڵا ناناسێ، چونکە ئەمانە وەچەی خەیاڵن، لەزمانەکەیدا وشەیەك نییە ئاماژە بێت بۆ ئایدیاڵ، ئەو لەقسەکانی ئەوانمان زانیێت هەرگیز باسیان نەکردووە. خەیاڵی شیعری ئەو زۆر

کەم دەچێتەوە ناو جیهانێکی نوێ بۆ ئەوەی واتای نوێ بدۆزێتەوە. کەچی لەبازنەیەکی تەسکدا توانیوەتی بۆ هەموو ڕێچکەیەك بچێت"[241].

بەدوەکان کاتێك هاوسۆز دەبن لەگەڵ داگیرکردن، تاڵانکاری، تۆڵەکردنەوە، دەمارگیری، ئەوان درك بەوە ناکەن سەرپێچی خودا وفرمانەکانی ئاین دەکەن، دکتۆر فازل جەمالی باس لەوە دەکات سەردانی هۆزی عنزەی کردووە لە بیابانی شام، مشتومڕێکی زۆری لەگەڵ کردوون لەسەر خووی داگیرکردن و تاڵانکاری، ئایا خوا لەو کارانە ڕازییە یان نا؟ ئەوان وەڵامیان ئەوەبوو، خۆیان بەبیرکردنەوە لەو بابەتانە نیگەران ناکەن[242].

دەتوانین هەمان بۆچوونمان لەبارەی خەڵکی لادێکان هەبێت، بەتایبەتی ئەوانەی زۆر پەیوەندیان بەشار و ئامۆژگارییە ئاینیەکانەوە نەکردووە. ئەو خەڵکانە لەژیانی کۆمەڵایەتی خۆیان تەنها ئەو بەها عەشایریانە دەناسن کە لەمنداڵیەوە لەسەری پەروەردەکراون. نکوڵی لەوە ناکەین زۆرجار لەچەندین بۆنەی جیاوازدا واعیز وخەتیب لەشارەوە دێنە لادێکان، بەڵام ئەو جۆرانە بەدوای بژێوی خۆیان دەگەڕێن، بایەخ بەوە نادەن خەڵکی لادێ لەژیانی کۆمەڵایەتیان چی دەکەن، لەوانەشە هەندێك جار لە بەها عەشایرییەکاندا پاڵپشتی لادێیەکان بکەن[243].

لەوانەیە دووفاقی لەنێو هەندێك تاکی لادێی دەربکەوێت، ئەمانەش ئەو کەسانەن تێکەڵی خەڵکی شار دەبن و بە جەدەلە لۆژیکی و ئامۆژگارییە ئاینیەکانەوە کاریگەر دەبن. بەهەرحاڵ ئەوانە ڕێژەکەیان کەمە، هەرچۆنێك بن وەك خەڵکی شار نییە لە بەهێزی دووفاقی کەسێتیدا.

کێشەی خەڵکی شار لەوەدایە زۆرجار ئاروەزووخەکەیان دەبێتە هۆی بڵاوبوونەوەی بەدرەفتاری لەسەر ئاستیکی فراواندا، وەك لەبەشی داهاتوودا باسی دەکەین، کەچی هێندەی ڕەوشتیان (بەد) دەبێت کەچی بەبیرکردنەوە بەرزەفڕ دەبن، ئەمەش مانای ئەوەیە کەلێنی نێوان بیرکردنەوە و ڕەفتاریان زۆر فراوانە، ئەمەش دەبێت هۆی سەرهەڵدانی دووفاقی لەنێویاندا.

[241] احمد أمين (فجر الاسلام ) ص ٣٧-٣٨

[242] Jamali (new iraq)p 46

[243] على الخاقاني (شعراء الغري) ج١٢، ص ٤٧٧-٤٧٨

**دامەزراوە ئاینییەکان لە شارەکاندا:**

یەکێك لەو دیاردە کۆمەڵایەتیانەی شارەکان لە لادێ و بیابان جیادەکاتەوە، زۆری دامەزراوە ئاینییەکانە لەشاردا، وەك مزگەوت، قوتابخانە، حوسێنیە، مەجلیسی وەعزخوێنی وپرسەکان. ئەو دامەزراوانە چینێکی کۆمەڵایەتی دیاریکراوی دروستکردووە کە لە فەقیە، واعیز، خەتیبەکان پێکدێت، ئەوانەش وا هەست دەکەن ئەرکیان بریتیە لە رێنمایی کردنی خەڵك بۆ ئەو ئاکارێکی نمونەی کە ئاینی هێناویەتی، بۆیە ئەوان ئامۆژگاری وخوتبە بەسەر خەڵك دەبارێنن، ئەگەرهاتوو یەکێك لەوان لەم کارەدا کەمتەرخەم بوو ئەوا خەڵك بەچاوێکی کەم سەیری دەکەن، ئەگەریش رەوانبێژ بوو لەئامۆژگارییەکانی زمانی پاراو بوو ئەوا بەتێروانینی خەڵك پێگەی کۆمەڵایەتی بەرز دەبێتەوە، بەرێز دەبێت ودیاری پێدەدرێت، خەڵکیش بە (دەم زێڕین) وەسفی دەکەن.

کێشەی خەڵکی شار ئەوەیە رێز لە ئامۆژگاری رەوان دەگرن، کەچی ناتوانین رێنمایی و نموونە باڵاکانی جێبەجێ بکەن. ئەوان هەر لەمنداڵییەوە لەسەر ئاکارێکی دیکە پەروەردەکراون بەپێی بەهاکانی گەڕەك، ئەو ئاکارەش تەواو پێچەوانەی ئەو بەهایانەیە کە ئامۆژگاریە ئاینیەکان ئاماژەی بۆ دەکەن. ئامۆژگاریە ئاینییەکان بانگەشە بۆ بەهای سەبر و لێبوردن و یەکسانی و دادپەروەری دەکات، نکۆڵی لە دەمارگیری و تۆڵەکردنەوە و شاناز و زاڵبوون دەکات. کەچی بەهاکانی گەڕەك بە پێچەوانەی ئەوە. ئەمەش مانای ئەوەیە خەڵك دەکەونە ژێر کاریگەری دوو سیستەمەی دژەیەکتری بەهاکان، لەبەرامبەر ئەم بارودۆخەشدا چی دەکەن؟

لەسەردەمی عوسمانییەکان لەشارەکاندا تێبینی کەسانێکی ناسراو دەکرا، بە شەقاوەکان (الاشقیاء) ناودەبران، ئەوانە بەپابەندبوونی توندیان بە بەهاکانی گەڕەکەوە لەخەڵکی دیکە جیادەکرانەوە، بایەخیان بە بەها ئاینیەکان نەدەدا، ئیعترافیشیان بەمە دەکرد وئەمەیان نەدەشاردەوە. ئەوانە جێگای رێز وسەرسامی خەڵك بوون لەبەر ئەو ئازایەتی و پیاوەتیە دەیان نواند، کێشەش نەبوو دواتر دز

بوون، خوێنرێژ بوون، دەچوونە سەرماڵی خەڵك، دەستدرێژیان دەکردە سەرخەڵك، گرنگ ئەوە بوو لەسەر بەهاکانی گەڕەك دەڕۆیشتن.

لەپاڵ ئەو کەسانەی سەرەوە کەسانی دیکە هەبوون، پێچەوانەی ئەوان بوون، ئەمانە دەیانویست لەسەر بەها ئاینیەکان بڕۆن، بەپیاوچاك و ئاینپەروەر ناودەبران (الاخیار، المتدینین) واباشتر ئێمە بە (لەخواترسەکان)(الاتقیاء) ناویان ببەین چونکە ناوەکەیان لەسەر وەزنی جەمعەتەکەی پێشوو دەبێت. واتە (الاتقیاء، الاشقیاء). ئەو پیاوەچاکانەش هاوشێوەی شەقاوەکان لەلای خەڵك جێگای ڕێز و سەرسامی بوون.

دەتوانین بڵێین شەقاوەکان و پیاوچاکەکانیش کێشەی دووفاقی کەسێتیان نەبوو، زۆرکەم نەبێت، چونکە ئەوان لەژیانی خۆیان لە سەر تاکە شێوازێك دەڕۆیشتن هیچ دژایەتیەك لەنێوان بیرکردنەوەی ئایدیاڵی ورەفتاری واقیعیانەیان نەبوو؛ لەگەڵئەوەشدا ئەوان لەچاو زۆرینەی خەڵکی شار کەمینە بوون.

زۆرینەی خەڵکی شار شەقاوە یان پیاوچاك نین، بەڵکو لەنێوان هەردووکیانن، ئەوانەن دووفاقی کەسێتیان لەلا دروست دەبێت. ئەوان لەیەك کاتدا ڕیزی شەقاوە و پیاوچاکەکانیش دەگرن، ئەمەش وایکردووە هەندێك جار لەسەر ڕێگای شەقاوەکان بن، لەهەندێك کاتی دیکەش لەسەر ڕێگای لەخواترسەکان بن. بۆ نموونە یەکێك لەوانە دەبین ئایەتی قورئانی، فەرمودەی پێغەمبەر و یاران و ئالی بەیتی لەسەر زارە، کەچی شمشێری زمانی لەو کەسانە هەڵدەکێشێ کە لەسەرنەمانە ناڕۆن، ناشزانێ خۆشی لەوە راهاتووە لە بەها و کردار سەرپێچیان دەکات. ئەو کاتێك تورە دەبێ و جنێو دەدات، دەمارگیر دەبێت وتۆڵە دەکاتەوە، خودا و پێغەمبەر لەیاد دەکات و باکی بەهیچ نییە بەدوای بەهاکانی گەڕەك دەڕوات. کەچی کاتێك لە مەجلیسی ئامۆژگاری سەنگین دادەنیشێ، ئەوا دەبێت زاهید و لەخواترس، لەلای خودا دەست دەکات بەسکاڵا لە بەدرەفتاری خەڵك، وەهاش زەمی ئەخلاقی خەڵکدەکات وەك ئەوەی تاکێك نەبێت لەوان و لەکۆمەڵگایەکی دیکە پەروەردە بووبێت.

جارێکیان لەچایخانەی گەڕەك دانیشتبووم، گوێم لە جەماعەتێك گرتبوو قسەیان دەکرد، بۆم دەرکەوت باسی ئامۆژگاریەکی رەوان دەکەن کە لەمزگەوتێکی نزیك واعیزێکی ناسراو داویەتی، رێنماییەکانی وەعزەکەیان بەرز رادەگرت گوایە هانی لەخواپەرستی وسەبر و تۆبەکردن دەکات. کاتێك ئەوان سەرقاڵی قسەکردن بوون پیاوێك بەکۆڵان تێپەڕی ئەوان دەیانناسی، قسەکانی خۆیان بڕی و کەوتنە داشۆرین و زەمکردنی پیاوەکە گوایە لەچاوی ئەوان بێدەسەڵاتە، لەبەر ئەوەی خەڵك دەستدرێژی دەکەنە سەر، ئەویش ناتوانێ بەرپەرچی یەکێکیان بداتەوە.

**پەروەردەی کۆڵانەکان:**

لەشارەکانی عێراق هەرکە منداڵ چاوی دەکاتەوە، خۆی لە کۆڵان دەبینێتەوە لەگەڵ هاوتەمەنەکانی لەمنداڵی دراوسێ و گەڕەك یاری وگەپ دەکات. لێرەوە لایەنی واقیعی کەسێتیەکەی گەشە دەکات، ئەم لایەنەش رەگێکی قوڵی لە پێکهاتەی کەسێتیەکەی دەبێت، بەڵام کە گەورە دەبێت لایەنێکی دیکە لەکەسێتی ئەو گەشە دەکات، ئەویش لایەنی ئایدیالیە کە لە ئامۆژگارە ئاینی و مشتومڕە لۆژیکیەکان وەرگیراوە.

لەبەشی رابردوو ئاماژەمان بۆ لاوازی پێکەوەژیانی ماڵەوە کرد لەشارەکانی عێراقدا، بینیمان ژن هەوڵ دەدات پیاوەکەی بچێتە چایخانە ومنداڵەکەی بچێتە کۆڵان، بۆئەوەی خۆی لەنێو دیوارەکانی ماڵەوە ئازاد بێت. ژن بەلایەوە گرنگ نییە منداڵەکەی لەکۆڵان چی دەکات مادەمەکی سەردەست و ژێردەست نییە. ئەگەرهاتوو منداڵەکە بەگریان و گازەندە بگەڕێتەوە ماڵەوە گوایە یەکێك لێی داوە، ئەوا ژنە دەیکاتە قیژەقیژ؛ ئەوکاتەش کۆڵان دەبێت گۆڕەپانی جەنگێکی توندی ژنان و لەوانەشە پیاوانیش تێیدا بەشداری بکەن.

دەکرێ بڵێین، کۆڵان منداڵ پەروەردە وئامادە دەکات بۆ ئەوەی ببێتە شەقاوە و زاڵبوو، بەسەر خەڵکی زاڵبێت و کەس دەستدرێژی ناکەتە سەر، دایکیشی هانی دەدات بۆ ئەوەی وەك باوکی بێت، " کاتێك دەڕوا، زەوی لەژێر پێی بلەرزێ".

هەندێك خێزانی موحافیزکار، بەپاڵنەری پاراستنی ئاکاری منداڵەکانیان رێگریان لێدەکەن لە کۆڵان یاری بکەن. ئەوان پێیانوایە پەروەردەیەکی چاکی منداڵەکانیان

دەکەن، ناشزانن لەواقیعی کۆمەڵایەتی خۆیان دادەبڕێن، وایان لێدێت لە جیهانێکی تایبەت بەخۆیان بژین. کاتێکیش گەورە دەبن وەك بێگانە لەناو خەڵك دەردەکەون، بەفیز و داخراو دەردەکەون و بیرکردنەوەی یۆتۆپی بەسەریان زاڵ دەبێت، بۆیە ئەوان کاتێك لە ئاکاری کۆڵان نەجاتیان دەبێت ئەوا تووشی ئاکارێکی دیکە دەبن زیانی زیاترە. ئەوان لەو کۆمەڵگایە ناگەن کەتێیدا دەژین، کۆمەڵگاش لەوان ناگات.

خێزانە موحافیزکارەکان لەسەردەمی عوسمانییەکان زەحمەتی زۆریان لەوە دەبینی ڕێگری لەمنداڵەکانیان بکەن لەکۆڵان یاری بکات، چونکە ئەو کات قوتابخانە وباخچەی تایبەت بەمندالان نەبوو، بۆیە ئەو جۆرە خێزانانە ناچار دەبوون لەماڵەکانیان هۆکانی یار وگەپ بۆ منداڵەکانیان دابین بکەن. کەچی ئێستا بارودۆخەکە زۆر یان کەم گۆڕاوە، زۆرێك لەخەڵك دەتوانێ منداڵەکانیان لەژیانی کۆڵان دووربخەنەوە، تەنانەت هەندێکیان توانیویانە منداڵەکانیان ڕەوانەی دەرەوەی عێراق بکەن.

پیاوێکم بینی منداڵەکانی ڕەوانەی قوتابخانەکانی دەرەوەی عێراق کردبوو، بیانوەکەی ئەوەبوو دەیەوێ پەروەردەیەکی چاکیان هەبێت، دووربن لە بەدکارییەکانی کۆڵان، لەڕاستیدا ئەو لەلایەکەوە لەسەرهەقە و لەلایەکی دیکەشەوە ناهەقە. منداڵەکانی دوای تەواوکردنی خوێندن دەگەڕێنەوە عێراق و بە پێی ئەو شتانەی لە قوتابخانە بیانییەکان فێرکراون سەیری ژیان دەکەن، لەم کاتەشدا تووشی بەدفەڕی دەبن و بیانی دەردەکەون بەقێزەوە دەست بەلوتیانەوە دەگرن کاتێك بە کۆڵان تەسك و گەڕەکە کۆنەکان تێدەپەڕن، جا قوڕ بەسەر ئەو کۆمەڵگایەی ئەو جۆرە کەسانەی بۆ ببێتە دەسەڵاتدار و جێبەجێکار، ئەوان لەدۆڵێك دەبن و کۆمەڵگاش لەدۆڵێکی دیکە.

لەگرنگترین هۆکانی یاریکردن و ڕابواردن کە منداڵان لە کۆڵانەکان فێری دەبن، ئەوەیە لە زمانی بەغدادیەکان بە ( الكسار) ناودەبرێت، ئەمەش مانای ئەوەیە کۆمەڵێك منداڵی گەڕەك جەماعەتێك دروست دەکەن بۆ ئەوەی شەڕ لەگەڵ جەماعەتی گەڕەکەکانی دیکە بکەن. ئەوان شانازی بەوە دەکەن، ئەگەر بۆ شەڕ

ڕۆیشتن و بەسەرکەوتوویی گەڕاوە گەڕەك ئەوا دڵخۆش و دەم بەگۆڕانی دەبن، لەوانەیە تیمێك لەوان بپرسێت ( ئایا بەسەریان زاڵ بوون؟) ئەوانیش وەڵام دەدەنەوە" ئەرێوەڵا" دواتر تیمی یەکەم جارێکی دەپرسێت" ئەوان زاڵ بوون؟" وەڵامەکەش ئەوە دەبێت" ناوەڵا" ... هتد.

زۆرجار دوژمنایەتی لەنێوان منداڵانی گەڕەکەکانی تەنیشت یەکتر دروست دەبێت و دارعەسا و بەرد بەکارهاتووە، هەندێك جاریش خەنجەر و چەقۆی تێدا بەکاردێت، بەتایبەتی ئەوکاتانەی منداڵی گەورە و هەرزەکاران تێیدا بەشدار دەبن. منداڵان تەنها بەوەندە وازناهێنن، بەڵکو گێچەڵ بە ڕێبواران و دوکاندارەکان دەکەن، بەتایبەتی ئەگەر ئەوانە لەکەسانی بێدەسەڵات و کوێر بن. هەندێك جار هەڵمەت بۆ بێستانەکان بۆ ئەوەی خورمان و میوە بدزن. ئەوان لەزەت لە دزی و دەستدرێژی وەردەگرن، چونکە ئەمە لەتێڕوانینی ئەوا بەڵگەی قارەمانێتی و ئازابیە. لەوانەیە خورما ومیوە لەماڵەکانیان هەبێت، بەڵام ئەوان پێیان باشترە لەکەسانی وەری بگرن و بیدزن، چونکە سەرچلی و شانازی لەمەدایە. بۆیە لەنێو خۆیاندا کێبرکێ لەسەرخواردنی دەکەن و دڵخۆش دەبن و پێدەکەنن.

ئەوان رقیان لەمنداڵێك دەبێتەوە، ئەگەر لەشەڕ و دزییەکان لەگەڵیان بەشدار نەبێت ئەوا بەتێڕوانینی ئەوان منداڵێکی لوسکەڵە وبێدەسەڵاتە، بۆیە دەکەوێتە ژێردەستی بەهێزەکانیان، جا زەلیلی دەکەن ودەیچەوسێننەوە یانیش هاوڕەگەزبازی لەگەڵ دەکەن.

لەراستیدا مەیلی خۆزاڵکردن، کەخەڵکی شارەکان لەبیابانەوە وەریانگرتووە گەیشتۆتە منداڵانی کۆڵان، بەڵام لەلای منداڵەکان شێواوە و بەتوندی بەدگۆڕان لەشێوەی سەرەکییەکەی کراوە. پێگەی منداڵ لە کۆڵان بەرز ونزمی بەپێی توانی زاڵبوونی بەسەرکەسانی دیکەوە دەگۆڕێت، ئەم توانایەش لەچەند شێوەیەك دەردەکەوێت، دەتوانین لەم خاڵانەی خوارەوە کورتیان بکەینەوە:

١-پاڵەوانێتی لەشەڕەکان: ئەو منداڵەی توانایەکی زیاتر دەنوێنێ ئەوا بێگومان دەبێتە سەرکردە، یان رابەری جەماعەتەکەی، زۆرجاریش سەرۆکایەتی خۆی دەقۆزێتەوە و خراپ بەکاری دەهێنێ.

٢- توانـای تـالآنکردن و دەسـت بەسـەرداگرتن: توانـای بەدەسـتهێنانی ئـەو دەسکەوتانەی کەمنداڵێك لەشەڕەکان بەدەستی دەهێنێت ئەوا بۆ ئەو مایەی شانازییە، بەڵام وەك بەدوەکان لەگەڵ هاوڕێیەکانی دابەشی ناکات بەڵکو بۆخۆی قورخی دەکات و بەو دەسکەوتانە تەحەدای هاوڕێکانی دەکات.

٣- زۆرانبـازی: ئەمـەش لـەنێو منـداڵان بـاوە دەیکەنـە پێوەرێـك بـۆ هێـز و زاڵبوون، رابەر ئەو کەسەیە زۆرانبازی لەگەڵ هاوشانەکان بکات و بیانخاتـە سـەر ئەرزەوە. ئەگەرهاتوو کەسێك دەرکەوت زۆرانبازی لەگەڵ بکات، ئەوا سەرۆکایەتی بۆ کەسە سەرکەوتووەکەیە.

٤- توانای فرتوفێڵ وپیلانگێڕی: فیڵبـازی وەك زاڵبـوون دەزانن، بۆیـە دەبیـنین هـەر منـداڵێك بـەدوای هـەلێك دەگـەڕ تـا لەبابـەتێك فیـڵ لەکەسـانی دیکـە بکـات، ئەگەریش سەرکەوت هاوار دەکات و دەڵێ" تۆم قەشمەڕ کرد !". ئەمـەش مانـای ئەوەیە سەرکەوتووە. ئەوان ئەگەر بیانەوێ وەسفی کەسێکی فێڵباز بکـەن ئـەوا دەڵێ" هاوڕێکەی دەباتە سەر رووبارەکە، بە تینوویی دەیگەڕێنێتـەوە"، واتـە زۆر بـەتوانیا لـە فیلکردنـی هاوڕێیەکـەی، بەشـێوەیەك قەشمـەڕی دەکـات ڕێگـای ئاوخواردنەوەی نادات لەسەر رووبارەکە.

٥- پێکـەنین بەخـەڵك وگاڵتـەپێکردن: ئەمـەش لـەتێڕوانینی ئـەوان جۆرێکـە لـە زاڵبوون و هێز، ئەوان هەوڵدەدەن گێژێك یـان خۆشباوەڕێك بدۆزنـەوە، بۆئـەوەی تەڵەکەبازی لەگەڵ بکەن و پێی پێبکـەن، هەرچـەندە ئەوکەسـە خۆشباوەڕ بێت ئەوا زیاتر گاڵتەی پێدەکەن. لەکۆتایشدا دەبێتـە کەسێکی ملکەچ و بێزراو، بـێ شەرم کردن لێی دەدەن و دەستدرێژی دەکەنەسەر.

٦- هاوڕەگـەزبازی: زۆرێـك لەمنداڵـەکان نەگەیشـتونەتە بـاڵغبوون، کەچـی بەپاڵنەری شانازییەوە هاوڕەگەزبازی دەکەن، ئەوەی بکـەر ئـەوا شـانازی بـەخۆی دەکات و بەزاڵبوونی دەزانێ، کەچی ئەوەی دیکە، ژێـر کـەوتوو و لاوازە، نـاتوانی سـەیری چـاوی خـەڵك بکـات، بۆیـە دەڵـێن چـاوی شـکاوە، چاوشـکاندن لـەکۆڵان یەکێکە لەگەورەترین رواڵەتی زاڵبوون لەنێو منداڵاندا.

هەرچۆنێك بێت، ئەو رواڵەتانەی زاڵبوون کە منداڵ لەکۆڵان لەسەری پەروەردە دەبێت، لەگەورەیش کاریگەری بەسەرەوە دەبێت، بەڵام ئەگەرهاتوو لەکاتی گەورەیی بارودۆخەکەی نەگونجاو بوو ئەوا دەیەوێت کپی بکات و یان بەپێچەوانەوە خۆی دەربخات، بۆیە دەبینین رەفتاری سەنگین و لەخواترسی دەبێت و خۆی بەئایدیالەکانەوە هەڵدەواسێ. لەگەڵئەوەشدا هەندێك جار خۆی لەبیر دەکات، بێئەوەی هەست بکات هەندێك بابەت ئاماژەن بۆ لایەنە کەپکراوەکانی دەروونی.

هەندێك لەزانایانی دەروونناسی دەڵێن" پیاو منداڵێکی گەورەیە" مەبەست ئەوەیە هەردەم کەسێتی مرۆڤ لەمنداڵییەوە دروست دەبێت. لەساڵانی سەرەتای تەمەنیدا زۆرترین ئەو سیفەتانە دروست دەبێت کە لەگەورەیی دەردەکەون. لەوانەیە کەم یان زۆر گۆڕانکاری لەکەسێتی ئەو رووبدات ئەمەش بەپێی گۆڕانی بارودۆخەکانی دەوروبەری لەگەورەییدا، بەڵام رەگوریشەی منداڵی لەناخی دەمێنێتەوە، هەر ئەمانەش لەکەسێتی ئەو دەردەکەون، بەشێوەیەك لەشێوەکان رەنگدانەوەیان لەسەر بیرکردنەوە و رەفتاری دەبێت.

**دووفاقیەکی خەست:**

هەر دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی ناتوانرێت لەلایەن هەموو ئەوکەسانەی کاریگەر دەبن پێیەوە، لەیەك ئاست دابێت. ئەوان بەپێی هۆکارە دەروونی و کۆمەڵایەتیەکانی دەوروبەریان بەدیاردەکانەوە کاریگەردەبن.

من مەزندەی ئەوە دەکەم خەسترین دووفاقی خەڵکی شار لەلای منداڵی پیاوانی ئایینی و واعیز و لەخواترسەکان بێت. ئەوانە هەر لەمنداڵیەوە لەماڵێك گەورە دەبن پڕیتی لەئامۆژگاری و رێنمایی ئایینی، رۆژی لەدوای رۆژ گوێبیستی دەبن، تەنانەت ئەزبەری دەکەن، لەوانەشە بەرەوانی لەنێو منداڵانی گەڕەك باسی بکەن، ئەوان دەیانەوێ وەك باوکانیان ببن بە واعیز، بۆیە دەبێن گوزارشتەکانی وەعز دووبارە دەکەنەوە، بێئەوەی بڕی ئەو دژایەتیە بزانن کە لەنێوان بەهای وەعز و بەهاکانی ژیانی کۆڵانەکان هەیە.

یەکێك لەوانە دەناسم، هاوتەمەنی منداڵیم بوو، زۆر بەدفەڕ و چەقاوەسوو بوو، کەس لەزمان ودەستی ئەو نەجاتی نەدەبوو، بەلام کاتێك لەکارە شەرانگێزیەکانی تەواو دەبوو، ئەوا لەنێو منداڵان دادەنیشتن باسی ئامۆژگاریە ئاینیەکانی دەکرد و رەخنەی لەخەڵك دەگرت کە وازیان لە رێنماییە ئایینیەکان هێناوە.

دواجار بینیومە، ئەو پیاوێکی دیندارە، نوێژەکان لەکاتی خۆی ئەنجام دەدات، شەوانە قورئان دەخوێنێتەوە و دوعا دەکات، بەلام لەهەمان کاتدا بەرەخنە و بوختانچییە لەپلەی یەکەمدا. ئەو کە لەمنداڵی خەڵکی بەزمان و دەستی ئازار دەدا، ئێستا تەنها بە زمانی خەڵك ئازار دەدا، کەچی دڵی ئەو هێشتا وەك منداڵی (پڕە لەئیمان)!

**پەروەردەی حوجرەکان:**

کاتێك باوکێك کورەکەی لەحوجرەیەك دەخستە بەر خوێندن، بەمامۆستایەکەی دەگوت" گۆشت بۆ تۆ، ئێسقان بۆ من". ئەو مەبەستی ئەوە بوو دەکرێت، لە پێناو پەروەردەکردنی منداڵەکە لێدانیش بەکاربهێنێت تا گۆشتی دادەماڵێ. هەندێك جار مامۆستا لەم کەمتەرخی نەدەنواند، زۆر هۆکاری تەمێکردنی هەبوو. لەوانەشە زێدەڕۆیی نەکەم ئەگەر بڵێم مامۆستا لەلایەك منداڵەکەی فێری خوێندنەوە و نووسین دەکرد و لەلایەکی دیکەش فێری دووفاقی کەسێتی دەکرد.

مامۆستا داوا لە قوتابیانی دەکات، بەوپەڕی ئاقڵی وسەنگینی و ئەدەبەوە دابنیشن، بۆلای چەپ و راست نەسوڕێن. پێویست دەکات بەتەواوی سەرقاڵی خوێندنەکانیان بن، ئەمەش بابەتێکە مەحاڵە لەلای منداڵ ئەنجام بدرێت، چونکە منداڵ بە سروشتی خۆی لە جوڵەی بەردەوام دایە و حەزی لەسەر یاری وگەپە. زانایانی پەروەردەی نوێ درکیان بەوە کردووە بۆیە فێرکردنی نوێیان بەشێوەیەك داناوە لەگەڵ ئارەزووی منداڵان بگونجێت، کەچی خوێندنی حوجرەکان پێچەوانەی ئەوە بوو. مامۆستا لەوێ بڕوای وابوو کەسێتی منداڵ وەك هەویرە دەتوانێت بە خواستی خۆی لەقاڵبی بگرێت، لەمەشدا بەر لەهەموو شتێك پشتی بە وەعز و ئامۆژگاری دەبەست و جار لەدوای جار بەسەر قوتابیانی دەباراند، ئەگەر بێنی

هەندێك لەقوتابییەکان ئاقڵ نابن، ئەوا پەنا بۆ دارعەساکەی دەبات و لێیان دەدات تا تۆبە دەکەن و گوێڕایەڵی ئامۆژگارییەکانی دەبن.

ئەمەش مانای ئەوەیە منداڵەکە ناچارە لەبەردەم مامۆستاکەی خۆی بەسەنگین و ئەدەبەوە دەربخات. ئەگەر مامۆستا سەیری بکات ئەوا خۆی بەخوێندنەکەی دەردەخات گوایە لەمەزیاتر هیچ شتێکی دیکە نازانێ. کەچی هەرکە مامۆستا بێ ئاگا دەبێت ئەوا قوتابیەکە هەڵدەچێت، هەموو هۆکانی بەدەستی بۆ دەرفەتدان بە کپبوونەکانی بەکاردەهێنێ. کاتێکیش منداڵەکە لەحوجرە دەردەکەوێت ئەوا جلەی خۆی بەردەدات، بە غاردان و هات وهاوارەوە بەکۆڵانەکان دەڕوات، لەم دەدات و شتێك لەو دەفڕێنێ.

دکتۆر متی عەقراوی دەڵێ" نەریتی باو ئەوەیە بچووکەکان لەبەردەم گەورەکان قسە نەکەن، ئەگەر پرسیاریان لێ نەکرێت. چاوەڕوانی ئەوە لەبچووکەکان دەکرێت هێمن وسەنگین بن. لەئەنجامی ئەمەشدا رواڵەتی سەنگینی رووکەش و نەخوازراو بەرووخساری منداڵەکانەوە دەبینین، کە روحی چالاکی و کۆششیان تێدا دەکوژێت"[٣٤٤].

لەراستیدا ئەو سەنگینە دروستکراوەی، دکتۆر عەقراوی ئامارەی بۆ کردووە، ماوەیەکی زۆر بەردەوام نابێت، بەڵکو بەشێوەیەکی کاتی منداڵەکە تەنها لەبەردەم باوك و مامۆستا و گەورەکان دەینوێنێ، ئەوا کاتەکانی دیکە بەدفەڕ و ئاژاوەگێر و ئاژاوەگێرییەکەشی سنووری بۆ نییە.

ئەوەی شایەنی باسە قوتابخانە نوێیەکان، ئەوانەی بەمدواییە شوێنی حوجرەکان دەگرێتەوە، توانیویان تارادەیەك منداڵان لەو سەنگینیە رواڵەتیە نەجات بدەن، بەڵام نەریتیکی دیکە شوێنی نەریتەکانی پێشوو گرتۆتەوە، هەمان کاریگەری لەسەر پێکهاتەی کەسایەتیان هەیە. ئەو قوتابخانانە منداڵ بۆ هەندێك پرەنسیپ و چەمکی نوێ پەروەش دەکەن، ئەمەش جۆرێکی نوێی دووفاقی کەسێتیان لەلای دروست دەکات، لەبەشی داهاتوودا باسی ئەمە دەکەین.

[٣٤٤] متي عقراوي (العراق الحديث) ترجمة المؤلف و مجيد خدوري . ص ٢٨٤

## کاریگەری پەتا بەسەر دووفاقی:

لەوانەیە لە کۆتایی ئەم بەشەدا گونجاو بێت باسی پەتا و رادەی کاریگەری پەتا بکەین لەسەر کەسێتی خەڵکی شارەکان. بە بڕوای من پەتاکان بەشێوەیەک لەشێوەکان هۆکار بوون بۆ بەهێزبوونی هەندێك رووخساری دووفاقی. لەسەردەمی عوسمانییەکان پەتا ناوە ناوە رووی لەعێراق دەکرد، زۆرجار بە تێکرایی دەساڵ جارێك پەتا دەهات، بەڵام قورساییەکەی لەشارەکان زیاتر بوو لەلادێکان و لەلادێکان زیاتر بوو لە بیابان. هەرچەندەش شارەکە گەورەتر وقەرەباڵغتر دەبوو بە دانیشتوان ئەوا کاریگەری پەتاکە ترسناکتر دەبوو.

بۆ ئەوەی بزانین کاریگەری پەتا لەسەر شارەکانی عێراق چەندە ئەوا دەبێت ئەو کتێبە بخوێنینەوە کە گرۆڤز پیاوە تەبیشریەکەی ئینگلیز، لەبارەی ئەو دیمانەنانەی تاعون نووسیویەتی، کە خۆی لە ساڵی ١٨٣١ لە بەغدا بینویەتی. گرۆڤز ئەوکاتە لەبەغدا نیشتەجێ بووە، ئامادە نەبووە وەك هاوشێوەی جالیەی ئەورووپی لەبەغدا بڕوات، قەدەرەکەی ئەوە دەبێت لەمردن دەربازی دەبێت، ئەو دیمانانەی خۆی بینیویەتی لە ساڵی ١٨٣٢ بەکتێبێکدا لەلەندەن بڵاوی دەکاتەوە[٣٤٥].

گرۆڤز باس لەوە دەکات ژمارەی مردووەکان رۆژ لەدوای رۆژ زیاتر دەبێت تا لەیەك رۆژدا دەگاتە نۆ هەزار کەس، دەڵێ" ئێستا مردن بۆتە شتێکی باو، وایلێهاتووە خەڵك نزیکترین کەسی خۆیان بێباکانە دەنێژن، وەك ئەوەی کارێکی ئاسایی بکەن". کاتێك ئەو پیاوە لەرێگاکانی دەخولێتەوە، رێکەوتی هیچ مرۆڤێك ناکات، تەنها ئەو کەسانەی نەبێت لاشەی مردووان و ئەوکەسانەیان هەڵگرتووە کە بەر تاعونەکەکە کەوتوون. زۆر کۆڵی جلوبەرگی مردووەکان لەبەردەم زۆرێك لەدەرگاکان کەوتبوو. لەبەرئەوەی لاشەکان بەپێی نەریتی باو بنێژرێن، ئەوا دەخرانە سەر پشتی کەر و بارگیرەکان بۆ چاڵێك دەبران بۆ ناشتن. دواجار حاڵەتەکە بەوە گەیشت خەڵك لەرێگاوبانەکان بکەوێت، سەگیش دەکەوتە سەر جەستەیان تەنانەت هەندێکیان هێشتا لەسەرمەرگ دابوون و نەمردبوون.

---

[٣٤٥] Groves (journal of a resident in Baghdad )

یەکێك لەئازاربەخشترین و نارەحەترین دیمەن، بوونی سەدان منداڵی ساوا بوو لە ڕێگاوبانەکان، زۆربەیان تەمەنیان لە دە ڕۆژ زیاتر نەبوو، گریانی ئەو منداڵانە تێکەڵی دەنگی ئەو سەگانە دەبوو کە بەپارچە پارچەکردنی لاشەکانەوە سەرقاڵ بوون.

دوای ئەم پەتایە لافاو هات، ئاو بەهەموو هێزی خۆی هاتە ناوشارەکەوە، هێشتا شەوی دووەمی لافاو نەهاتبوو بەشێی خوارەوە شار بەتەواوی کەوتەژێر ئاوەوە، دەگوترێت حەوت هەزار کەس بەیەك جار کەوتنە ئاوەوە، بەشێوەیەك نەخۆش و مردوو و لەشساغ بەیەکەوە نێژران.

لەم قۆناغەدا پەیداکردنی پیتاك زۆر زەحمەت بوو، تەنانەت خەڵکی زۆر بەرێز، لەوانەی هێشتا لەژیان مابوون، لەبەردەرگاکان دەگەڕان بۆ ئەوەی سادەترین پێداویستی ژیانیان دەستکەوێت، لەم کاتەشدا ژمارەی ئەو مردووانەی لاشەکانیان لەسەر ڕێگاکان کەوتبوو زۆر ترسناك بوو، کەلوپەلی هەڵگرتنی مردووەکانیش نەبوو بۆ ناشتنیان[٣٤٦].

لەراستیدا ئەو پەتایەی ڕووی لەبەغدا کردبوو، زۆرێك لەشارەکانی عێراقی گرتەوە، دەکرێت بڵێین لەهەموو ئەو پەتایانەی کە پێشتر و دواتریش عێراقی گرتۆتەوە کاریگەرتر و زیانی زۆرتر بووە. بەهەرحاڵ ئەم پەتایە نموونەیەکمان دەداتێ بۆ ئەوەی ڕوونی بکەینەوە، چۆن پەتا لەگەشەکردنی هەندێك ڕووخساری دووفاقی کەسێتی خەڵکی شارەکانی عێراق، هاوکار بووە.

لەکاتێکدا خەڵکی شار هەر لەمنداڵیانەوە لەسەر حەزکردن بە زاڵبوون و شانازی و دەمارگیری و تۆڵەکردنە و هێرشکردن، پەروەردەکراون، ئەوا وەك بینیمان پەتا ناوە ناوە بەرۆکی دەگرتن و ئاراستەیەکی پێچەوانەی پێشووی لەلا دروست دەکردن، ئەمیش خەم و ملکەچی و سکاڵاکردن بوو لەزەمانە، لێرەوە دەکرێت بڵێین کەسێتی شارەکان دوو خەسڵەتی پێچەوانەی یەکتریان هەیە: یەکەمیان مەیلی ئازار و ملکەچی وسکاڵاکردنە، دووەمیان مەیلی ڕووبەڕووبوونەوە و زاڵبوونە.

[٣٤٦] جیمس فریزر ( رحلة فریزر) ترجمة جعفر الخیاط ص ٩٧- ١٠٤

## هۆکارەکانی پەتا لەعێراق:

لەراستیدا پەتا لەرابرووودا زۆرینەی ولاتانی شارستانی دەگرتەوە، بێ جیاکاری، بەلاّم من مەزندەی ئەوە دەکەم عێراق لەسەردەمی عوسمانییەکان ئەگەر نەلێم لەهەموو ولاّتان ئەوا لەزۆربەی ولاّتان زیاتر مەینەتی بەدەست پەتاکانەوە، هەبووە.

دەکرێت لەم بارەیەوە ئاماژە بۆ ئەوە بکەین، عێراق دەکەوێتە سەر رێگای حەجی زۆرێ لەولاّتانی ئیسلامی، سەرەڕای ئەمەش چەندین مەزارگەی پیرۆزی تێدایە کەخەڵك لەولاّتانەوە رووی تێدەکەن، زۆرێکیش لەوان لاشەی مردووەکانیان لەگەڵ خۆیان دەهێنا، بۆ ئەوەی لەمەزارگانە بنێژرێن، جا کاتێك پەتا لەیەکێك لەو ولاّتانە روویدەدا ئەوا زۆر خێرا بۆ عێراق دەگوێزرایەوە.

وەك دەزانرێت هیند سەرچاوەی زۆربەی پەتاکان بووە، زۆرێکیش لەو پەتایانەی هیند بەشێوەیەکی راستەوخۆ یان لەرێگای ئێرانەوە بۆ عێراق گوێزراوەتەوە. ئەوکاتە رەوتێکی قەدەری بەسەر زۆربەی دانیشتوانی عێراق زاڵبوو، ئەمەش هۆکارێکی کارابوو بۆ بلاّوبوونەوەی پەتا، چونکە ئەوان وا سەیری پەتایان دەکرد، جۆرێك بێت لەقەزا وقەدەر، کە خودا بەسەریان دەهێنێ، بۆیە کاتێك پەتا دێت ئەوا وەك مەڕی کوشتارگەکان دەبن، ولشتاتی گەشتیار لەو بارەیەوە دەڵێ" کاتێك هەواڵی پەتا لەساڵی ١٩٣١ گەیشتە بەغدا، کونسوڵی بەریتانی کۆششێکی زۆری کرد بۆ ئەوەی والی رازی بکات رێکار پێویست بگرێتەبەر، جیاکردنەوەی تووشبووان رابگەیێنێت، کەچی پیاوانی ئاینی رێگریان لەوالی ئەم کارە بکات، گوایە پێچەوانەی حوکمەکانی قورئانە"[٣٤٧].

فریزەر پێیوایە خراپی کارێگری حکومی هۆکارێکی دیکە بوو بۆ گوێزرانەوەی پەتا بۆ عێراق، بۆ نموونە ئەو ئاماژە بۆ ئەوە دەکات هەواڵی کۆلێرا لە ساڵی ١٨٣٤ گەیشتۆتە بەغدا، کە ئەو کات لەکرماشان بلاّوبۆتەوە، نیشنگەی بەریتانی، والی لەئەنجامە ترسناکەکانی ئاگادار دەکاتەوە، کەچی والی بایەخی بەئاگادارکردنەوەکە نەداوە و رێگری لەهاتنی گەشتیارە ئێرانیەکان نەکردووە، چونکە چاوی بڕیبووە ئەو سەرانەیەی کە وەك نەریتێك لە گەشتیارە ئێرانیەکانی وەردەگرت.

---

[٣٤٧] سعاد العمري (بغداد كما وصفها السواح الاجانب) ص ٦٧

چەندین هۆكاری دیكە هەیە وا دەكات ببێتە نێچیرێ بەردەستی میكرۆبەكان، هاوكاریش بێت لەبڵاوبوونەوەی پەتا بكات. ئەمانەی خوارەوە چەند هۆكارێكن:

١- زۆری هۆڕ وگۆماوەكان لەعێراقدا، بۆتە هۆی بڵاوبوونەوەی نەخۆشیەكانی وەك مەلاریا و بەلهارزیا بەشێوەیەكی فراوان لەنێوان دانیشتواندا. ئەمەش تەندروستی دانیشتوانی لاواز كردووە و بەرگری ئەوانی لەبەرامبەر پەتاكان كەمكردۆتەوە.

٢- برسێتی لەدوای یەك: مێژووی باس لەهاتنی چەندین برسێتی دەكات لەعێراق، ئەمەش لەئەنجامی تێكچوونی ئاودێری و چەنگ و ئاژاوەكان بووە، زۆر بەڵگە هەیە كە زۆرێك لە پەتاكان بەدوای برسێتییەكان هاتوون.

٣- ئەو نەریتە خراپانەی خەڵكی عێراق لە شێوازی خواردن و كەمی فرەجۆری هەیە، وەك پێشتریش ئاماژەمان بۆ كرد، ئەمەش بەرگریان لەبەرامبەر پەتاكان كەم دەكاتەوە.

٤- كەم بایەخدان بە خاوێنی وشووشتن، بڵاوبوونەوەی نەریتی چڵم رشتن و تفكردن، پیسایی لەسەر رێگاكان. خەڵك لەچایخانەكان لەیەك جام ئاو بخۆنەوە بێئەوەی پاك بكرێتەوە وبشوورێت، ئەمەش وا دەكات نەخۆشیەكان بەئاسانی بڵاوببنەوە.

٥- حەوزی دەستشۆر: ئەمە حەوزێكی بچووكە زۆرێك خەڵكی شار وا راهاتووە لە ماڵەكانیان دروستی دەكەن و قاپ وقاچاخ و جەستەیان لێ پاك دەكەنەوە. زۆرجار لێل دەبێتو بۆگەن دەبێت پردەبێت لە میكرۆبی نەخۆشی ئەمە یەكێك بووە لەگرنگترین هۆكارەكانی گواستنەوەی نەخۆشی و پەتا.

٦- پیسبوونی ئاوی خواردنەوە، ئاوكێشەكان ئاویان لەكەنارە نزیكەكان دەهێنا. وا رێكدەكەوت هەندێك لە ژنان جلوبەرگیان دەشووشتن و پاشەڕۆی منداڵانیان دەشووشت، بەمەش پیسایییەكە لەگەڵ ئەو ئاوە تێكەڵ دەبوو كە ئاوكێشەكان دەیانبرد.

٧- درێژیی وەرزی هاوین و بەرزی پلەی گەرما لەعێراق، گەرما وەك دەزانرێت هاوكارە لەخێرایی بۆگەن بوون و گەشەكردنی میكرۆبی نەخۆشیەكان. هەر ئەم

گەرمایـەش هۆکـار دەبێـت بۆئـەوەی خـەڵك لەکـەنارەکانی رووبـار مەڵـە بکـەن، ئەوکەنارانەش زۆر جار بەپیسایی و جۆرەها پاشەڕۆ پیس دەبێت.

٨- پەینکردنی کێڵگەکانی سەوزە بە پیسایی و ئاوی پیسی شارەکان، خەڵکیش وا راهاتووە بێ شووشتنەوەی باش سەوزە بخۆن، لەگەڵ سەوزەکەش گەلێك میکرۆب و گەرای کرمەکان دەخۆن[٣٤٨].

## سروشتی گۆرانی عێراقی:

کاتێك توێژینەوە لەبارەی گۆرانی عێراقی دەکەین، بەتایبەتی مەقاماتی بەغدایی، زۆرجار خەسڵەتی پەژارە و کروزانەوەی تێدا دەبینین. زۆربـەیان گـۆرانی ماتـەمینین، بۆیە پڕیەتی لەسکالا لەدونیا و بەدبەختی و هەستکردن بە بێئومێدی و ئازار.

کاتێك لە شەوێکی ئارام لەدوورەوە گوێم لەمـەقامێکی بەغدادی دەبێت، وا هەست دەکەم لە ئەنجامی تاعونێکەوە گوتراوە کەسێك نەماوە، ئەمە دەنگی مرۆڤێکە هەموو خەڵکی مردووە، تەنها خۆی لـەو وەحشـەتە و دونیـای فـانی ماوەتـەوە. دەگوترێـت قوتابییەکی عێراقی کە لە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکای خوێندووە، رۆژێك لـەوێ سەردانی هاوڕێیەکی عێراقی دەکات. بەڵام لەماڵەکە نابێـت کـە لێـی نیشـتەجێبووە. کەچی خانمی خاوەن ماڵ لەوێ بووە و قسەی لەگەڵ کردووە، ئـەو خانمـە وتویـەتی کوڕەکە گەنجێکی باشە بەڵام هەرکە دەچێتە حەمام دەست بەگریان دەکات، دواجـار دەردەکـەوێت ئـەو گەنجـە عێراقیـە لـە حـەمام نـەگریاوە وەك خانمـە ئەمریکیەکـە تێگەیشتووە، بەڵکو (ئەبوزیاتی) عێراقی گوتوە[٣٤٩].

تێبینـی ئـەوە لەدانیشـتوانی شـار دەکرێـت کاتێـك بەشـەردێن وشـانازی دەکـەن رەفتاری شەقاوەکان هەڵدەگرن ئەوانەی وا راهاتوون تەحـەدی دەکـەن و خۆیـان زاڵ دەکەن، بەڵام هەرکـە دەسـت بـە گـۆرانی دەکـەن ئـەوا دەبنـە کەسـی بەسـتەزمان و زەمانە بەقورسایی خـۆی غـەدری لێکردوون، زەبـری کوشـندەی لێداون. ئەمـە زۆر

---

[٣٤٨] ئەوەی شایەنی باسە ئەو نەریتە تا ئێستاش هاوشێوەی رابردوو لەعێراق باوە، سەیر ئەوەیە حکومەتی عێراقی پارەیەکی زۆر و زەوەند لە کاروباری تەندروستی خەرج دەکات، کەچی رێگا بە جووتیاران دەدات سەوزە بە پیسایی و پاشەڕۆ پەین بکەن، بۆیە لەلایەك بەرەنگاری نەخۆشی دەبێتەوە و لەلایەکی دیکەش رێگە بە بڵاوبوونەوەی دەدات. نازانم ئاخۆ کەی بەرپرسان ئاگاداری ئەمە دەبن؟! - عەلی وەردی

[٣٤٩] علي الوردي (شخصية الفرد العراقي) ص ٤٤

بەرووی لەمەیخانەکان دەردەکەوێت، ئەگەر یەکێک لەوان سەرخۆش دەبێت ئەوا مەیلی بەلای گۆرانی کروزانەوە و ئازاربەخش دەبێت ( ئای دڵی بێئومێدم! ) ، بەڵام کاتێک هەست بەسووکایەتیەک دەکات رووبەرووی دەکرێت، جا بەئەنقەسەت بێت یان نا، ئەوا دەبێت درندە و لەئەنجامی ئەمەش مەیخانەکە دەبێتە مەیدانی شەڕێک خەنجەری تێدا بەکاردێت و کورسی بەریەک دەکەون و مێزەکان تێک دەشکێن.

وەك دەرکەوێت ژنان لەمەدا جیاوازییەکی زۆریان لەگەڵ پیاوان نییە، بۆیە جۆرێکی لەگۆرانی ماتمەینیان هەیە بەناوی (سەردولکە: التعديد) دەناسرێت. لەوانەشە ئەو وشەیە لەعەرەبیدا لەوەوە هاتبێت چاکییەکانی مردوو لەکاتی گریان دەژمێرن، ئەو جۆرە سەردولکەیەش لەنێو ژنانی شار و لادێ باوە. ژنی عێراق کارامەیی بێوێنەی لەو جۆرە گۆرانیە پیشانداوە، بۆیە بەدوای مەجلیسی پرسە و گریان دەگەرێت بۆ ئەوەی نەفەسێک بەناخی دڵی بدات، بەڵام لەهەمان کاتیش سڵ لەوە ناکاتەوە ببێتە درندەیەک کاتێک شەڕ لەگەڵ ژنێکی دراوسێ دەبێت لەگەڕەکدا. ئەوکاتە دەبینین بۆتە ژنێکی دەنگ گڕ و زۆر توڕ، بەجنێو دەست رادەوەشێنێ، قوربەسەر ئەو کەسەی بەرووی دەوەستێتەوە.

لەیەکێک لە پەندەکانی عێراق هاتووە" قەرەج خاتوونی گەڕەکە". مەبەست لە قەرەج ژنێکی بەدفەڕی، دەمشڕە، ئەویش خاتوونی گەڕەکە مانای خانمە بەرێزەکەی گەڕەکە. جا ژنان منداڵنیان بەو جۆرە رەفتارە پەروەردە دەکەن، ئەوان لەباوەشی ئەم جۆرە ژنە پەروەردە دەبن، لەلایەک جوێنفرۆش و لەلایەک گریاو، لەم نێوانەدا دێن و دەچن، بەو پێیەی پێویست بکات.

دەکرێت بگوترێت پەروەردەی کۆمەڵایەتی لە شارەکانی عێراق، تاك فێری ئەوە دەکات لەبەرامبەر مرۆڤ درەندە بێت، لەبەرامبەر قەدەرش بێدەسەڵات بێت، ئەمەش یەکێک لەرواڵەکانی دووفاقی کەسێتی لەعێراقدا.

## بەشی دوازدەم

### بەدناکاری لە شارەکاندا

هەندێك لەتوێژەران پێیانوایە ژیان لەشارەکان هاندەرە بۆ بەدبوونی ئاکار، ئیبن خەلدونیش هەمان بۆچوونی هەبوو. ئەو بەراوردی لەنێوان ئاکاری بەدو وئاکاری شارنشین کردووە، لەئەنجامدا جیاوازییەکی زۆری لەنێوانیان بەدی کردووە. لە تێروانینی ئەودا بەدو ئاکاری لەشارنشینەکان چاکترە، چونکە ئەوان دوورن لەشارستانیەت، بەخۆشگوزەرانی وهەڵپەی ماددە وخەریك بوون بە ئارەزووەکانیەوە. ئەوەی خوارەوە بەشێکە لەقسەکانی ئیبن خەلدون لەبارەی ئەم بابەتەوە:

"... بەدبوونی خەڵکی شار لەخۆیاندایە بەتایبەتی تاکە تاکەیان ، ئەمەش لەبەر زەحمەتی و ماندووبوون لەپێناو داهات و جۆراوجۆری شەڕانگێزی لەبەدەستهێنانیدا، لەگەڵ ئەو زیانانەی لەبەدەستهێنانی بۆ دەروونیان دەبێت. لەبەر ئەمەش خراپەکاری وشەڕانگێزی و هاشوهوشی، فێڵبازی لەپەیداکردنی بژێوی لەنێویاندا زۆر دەبێت. دەروونیش لە فیکر دوور دەکەوێتەوە وبە دوای فێڵبازی دەبێت، بۆیە دەبینین بەدوای درۆ و تەڵەکەبازی و ساختە و دزی و بەدرەوشی دەبن لە ئیماندا ، فێری ریباش دەبن لەفرۆشتن. دواتریش دەبینی لەشێوازەکانی بەدرەوشی شارەزا دەبن و دەستپێشخەرن لێی. دواتریش لەداوێنپاکی دوور دەکەونەوە. ئەگەر ئەمەش لەناو شارێك یان گەلێك زۆربێت ئەوا خوا فرمانی کاولبوون و لەناوچوونی دەدات، ئەمەش مانای ئەو ئایەتەیە کە دەفەرموێ:( وإذا أردنا أن نهلك قرية أمرنا مترفيها ففسقوا فيها فحق عليها القول فدمرناها تدميرا )

لەوێشەوە داهاتیان بەشی پێویستیان ناکات، لەبەر زۆر پێویستی و داواکانی

دەروونەوە، بارودۆخیان جێگیر نابێت، ئەگەر بارودۆخی خەڵکیش یەکە یەکە تێکچوو ئەوا رژێمی شارەکەش ئاڵۆز دەبێت و تێکدەچێت".

" لە بەدرەفتارییەکانی شارستانیەت سەرقاڵبوونە بە شەهوەت و زێدەڕۆیی کردنە لەخۆشگوزەرانی، ئەوا هونەرکاری لە شەهوەتەکانی سک دەکرێت وەک خواردن، شوێنی حەوانەوە، بەدوای ئەمانەش شەهوەتەکانی جووتبوون جۆراوجۆر دەبێت وەک زینا و نێربازی، ئەمەش دەبێتە بەدبوونی جۆر، ئەگەر ئامانجی کۆمەڵگا بریتی بێت لە شارستانی و خۆشگوزەرانی، کاتێک ئەم ئامانجە دەگاتە ئەوپەڕی ئەوا تێک دەچێت و بەرەو پیربوون دەچێت وەک تەمەنی سروشتی بوونەوەران"[350].

ئەوەی شایەنی باسە ئەم بۆچوونەی ئیبن خەلدون لەبارەی بەدڕەوشتی لەشارەکان هێناویەتی، لەسەر هەموو شارەکان جێبەجێ ناکرێت، بەتایبەتی لەسەر شارە نوێیەکان، چونکە ئاکار بریتیە لەبابەتی رێژەیی، ئاکار ملکەچی ئەو پێوەرە رۆشنبیریانەیە کە خەڵك لەکۆمەڵگاکەی خۆیان لێی راهاتوون. ئەوەی ئێمە لەکۆمەڵگای خۆمان بە ئاکارێکی خراپی دەزانین ئەوا لەوانەیە لەکۆمەڵگایەکی دیکە بەرەفتاری چاکەخوازی بزانرێت.

ئەوەی تێبینی دەکرێت لە شارە نوێیەکانی وڵاتانی پێشکەوتوو، بارودۆخی ئاکار نەگەیشتۆتە ئەو ئاستەی کە ئیبن خەلدون لە بەدبوون وەسفی کردووە، ئێمە نکۆڵی لەوە ناکەین هەندێك ناوچەی دیاریکراو هەیە بۆ بەدئاکاری، بەناوچەکانی (slums) دەناسرێت، کەچی ناوچەکانی دیکە لەزۆربەی کاتدا لەرووی ئاکارییەوە بەد نین، مەبەستمان ئەوەیە ئاکار لەو شوێنانە لەگەڵ پێوەرە باوەکانی رۆشنبیری کۆمەڵگاکە گونجاوە"[351].

وەك دەردەکەوێت ئیبن خەلدون بۆچوونی خۆی لەبارەی بەدئاکارییەوە لە ئاکاری ئەو شارنشینانە وەرگرتووە کەخودی خۆی لەو شارانە بینیویەتی و تێیدا ژیاوە. کاتێکیش ئەو ئاکارانەی بەراورد کردووە بەو رێنمایە بەرزانەی ئیسلام

---

[350] ابن خلدون (المقدمة) – تحقيق علي عبدالواحد وافي – ج ٣، ص ٨٧٧-٨٨٠

[351] Gist and Halbert (Urban society )p 163

هێناویەتی ئەوا ئەوکات بە ئاکارەکانی بەخراپ وەسفکردووە، وەك شاراوە نییە لەمەشدا لەسەر هەقە لەلایەنی ئیعتیبارەوە.

کاتێك توێژینەوە لەبارەی ئاکاری شارەکانی عێراق دەکەین لەسەردەمی عوسمانییەکان، دەبینین تا پلەیەکی بەرز بۆچوونەکەی ئیبن خەلدون لۆژیکیە. خەڵکی شارەکانی عێراق پێوەری ئەخلاقیان لە رێنماییە بەرزەکانی ئایینەوە وەردەگرت، کەچی لەژیانی واقیعی خۆیانەوە لەسەر پێچەوانەی ئەو بەها و رێنماییانە دەرۆیشتن.

لەراستیدا بەدوەکانیش لە زۆر نەریتیان پێچەوانەی رێنمایەکانی ئیسلام بوون، بەلأم ئەوان درکیان بەمە نەدەکرد و هەستیان پێنەدەکرد. کەچی خەڵکی شارەکان، لەبەرئەوەی زۆر ئامۆژگاری ئایینی و مشتومڕی لۆژیکیان لەنێوبلاوە، ئەوا جیاوازی لەنێوان نەریتی خۆیان و رێنماییەکانی ئایینەکەیان دەکەن. هەر لەو بارەیەوە جیاوازییەکی دیکە لەنێوان خەڵکی شار وبەدوەکان هەیە، ئەویش بریتیە لەوەی خەڵکی شارەکان زۆرێك لە نەریتەکانیان لە بەدوەکان وەرگرتووە، وەك لەبەشی پێشوودا بینیمان، بەلأم نەیانتوانیوە بێگەردی ئەو نەریتانە بپارێزن کە لە بیابانەوە وەریانگرتووە، بەلکو شێویاندوویان و بەدگۆڕانیان تێداکردووە تا زۆر لە رێنمایی ئاینی دوورکەوتۆتەوە کەپێشتر لەبنەڕەتەوە هەیبووە. هەر ئەمەش وایکردووە کاریگەری دووفاقی کەسێتی لەسەرخەڵکی شار زۆر روون بێت. ئەوان هەرچەندە لەرووی واقیعیەوە بەدرەفتارن، کەچی لەبیرکردنەوەی ئایدیاڵی خۆیان بەرزەفڕن.

هەرچۆنێك بێت ناکرێت لەمەدا گلەیی لەخەڵکی شار بکەین، چونکە ئەوان قوربانی بارودۆخی کۆمەلأیەتی دەوروبەریانن. پێشتریش ئاماژەمان بۆ ئەوەکرد مرۆڤ بەشێوەیەکی گشتی زیاتر بەرهەمی بارودۆخەکەیەتی لەوەی بەرهەمی ویستی تاك و بیرکردنەوەی ئەبستراکت بێت.

بۆئەوەی بەرونی لەمە بگەین؛ دەبێت تاوتوێی ئەو بارودۆخە جیاوازانە بکەین، کە لەسەردەمی عوسمانیەکان دەوری خەڵکی شاریان دابوو، دواجاریش چۆن

بووەهۆی بەدناکاری ئەوان، ئەمەش بەهیوای ئەوەی وانەیەك بێت بۆ سەدەی نوێمان.

## پەیوەندی نێوان دەسەلأتدار و خەڵك:

حکومەتی عوسمانی زۆر لەسەر ئەوە موکڕ بوو، لەبەرچاوی خەڵك پارێزگاری لەشکۆی خۆی بکات، بەلای ئەو گرنگ نەبوو خەڵك چی بەخۆیان دەکەن، مادەمەکی ئەوان ڕێز لەحکومەت دەگرن و خۆیان لەحکومەت نزیك دەکەنەوە. ئەمەش لەشارەکانی عێراق ببووە نەریتێکی کۆمەلآیەتی.

فەرمانبەران ئەوانەی لەسەدەی نۆزدەم بە ئەفەندییەکان ناودەبران، ئەوان لەهەموو هەڵسوکەوتیان دەستیانگرتبوو بەرواڵەکانی شکۆمەندی حکومەتەوە. ئەوان تێکەڵی خەڵك دەبوون، کە قسەیان بۆ دەکردن بەفیز و بەخۆمەزنکردنەوە لەخەڵکیان دەڕوانی، یانە و مەجلیسی تایبەت بەخۆیان هەبوو، داب و زمان و پۆشاکی تایبەت بەخۆیان هەبوو، بۆیە لەعەوام خەڵك جیادەکرانەوە.

ڕۆژێکیان قسەم لەگەڵ ئەفەندیەکی کۆن دەکرد، لەسەردەمی عوسمانیەکان لە فەرمانبەرە گەورەکان بوو، بینیم خەم وپەژارەی بۆ باری ئەفەندیەکانی ئەم زەمانەمان هەبوو. بەتێڕوانینی ئەو ئەم ئەفەندیانەی ئێستا شکۆ و پێگەی بالآی خۆیان لەدەستداوە، لەگەڵ خەڵك لەچایخانەکان دادەنیشن، لەداب و جلوبەرگ و بیرکردنەوەیان لە خەڵك جیاناکرێنەوە. وتیشی" ئەو زەمان ئەفەندی بەمانای وشەکە ئەفەندی بوو!".

ئەفەندییەکان لەشاردا چینێك بوون لەسەرووی خەڵکەوە، هەندێك لە پیاوماقوڵآن خۆیان لە ئەفەندییەکان نزیك دەکردەوە و هاموشۆیان دەکردن، بۆئەوەی شتێکیان لەدەسەلآت دەستکەوێت، خانەدانیان زیاتر بێت. لەئەنجامی تێکەڵبوونەش توێژێك دروست بوو بە ئەهلی جوبە ناودەبران. ئەوانە موکڕ بوون لەوەی هەڵسوکەوت لەگەڵ ئەفەندییەکان بکەن، هەوڵیان دەدا ببنە ئەندامی ئەنجومەنی شارەوانی وئەنجومەنی کارگێڕی. زۆربەی قسەکانیان ئەوە بوو( فلآن ئەفەندی وایگوت)، (فلآن بەگ وایگوت)، ئەگەریش پێگەیان بۆ پلەی بەرز هەڵدەکشا، ئەوا قسەکانیان لەبارەی (پاشا موشیر) دەبوو.

لەراستیدا تێکەڵبوون بە ئەفەندییەکان لەلای خەڵکی شارەکەن ببووە هۆی شانازیکردن، تەنانەت چەندین پەند و گۆرانی میللی هەیە ئاماژە بۆ ئەمە دەکەن. هێشتا ئەو گۆرانیەم لەبیرماوە کە لەمنداڵی گوێبیستی بووم، دەڵێ:

**راح للميري حبي    جاء من الميري حبي**

ئەو گۆرانبێژە ستایشی خۆشەویستەکەی دەکات، بەوە وەسفی دەکات گوایە هاتوچۆی فەرمانگەکانی میری دەکات، ئەمەش مانای ئەوەیە خۆشەویستەکەی لە خانەدانەکانە کە پەیوەندی و دۆستایەتیان لەگەڵ فەرمانبەران هەیە. لێرەوە نوکتەیەك لەبارەی پیاوێکی خەڵکی شار دەگێردرێتەوە، گوایە ئەو پیاوە بەشادییەوە دێتە لای هاورێیەکەی چونکە ئاغا پێی گوتوە" **انت جفطة**" ئەو وشەیە (**جفطة**) بەشتێك دەگوترێت کەهیچ کەڵکی نەبێت، کەچی پیاوەکە زۆر شانازی پێکردووە چونکە ئاغا بۆ سوعبەت و خۆشی پێی گوتوە" تۆ بێ کەڵکی، دەم چەفتی" ئەم نوکتەیە بۆتە پەندێك بۆ ئەو پیاوە ئاست نزمانە دەگوترێت کە شانازی بە قسەکردن لەگەڵ پیاوی گەورە دەکەن. بۆیە پێی دەڵێن" **قال له الاغا انت جفطة**"[٣٥٢]

کێشەی خەڵکی شار ئەوەیە ئەوان لەناخی دڵیانەوە فرمانڕەواکانیان خۆش ناوێت ، لەوانەشە رقیان لێ بێتەوە. ئەمەش مانای ئەوەیە ئەوان لەبەرامبەر دەسەڵاتداران پێچەوانەی ناخی خۆیان دەردەخەن، ئەمەش نەریتێکە رەگی لەناخی زۆربەیان داکوتاوە، بەشێوەیەك لە ژیانی رۆژانەیان رێز لە کەسێك دەگرن خۆشەویست نییە، کەسێکیان خۆشدەوێ رێزیشی ناگرن.

لەئەنجامی ئەمەدا شتێك هاوشێوەی گرێی دەروونی لەلایان دروست بووە، ئەوان گریمانەی ئەوە دەکەن کەسی بەرێز دەبێت کەسێکی بەفیز بێت و لەگەڵ ئەوان لوتبەرز بێت، کەم قسەیان لەگەڵ بکات. ئەگەر لەگەڵیان ساکار بوو، بەیەکێك لەخۆیان زانی ئەوا پێی دەوێرن و سوکایەتی پێدەکەن. ئەوان وا راهاتوون بە بەرزی لەئەفەندی بروانن، سەرەرای ئەمەش رێزی دەگرن، تەنانەت خەیاڵی ئەوە دەکەن، لووتبەرزی و پێگەی بەرز دوو بابەتی پەیوەست بن

---

[٣٥٢] ئەم بەسەرهاتە لەناو کوردەواریش باس دەکرێت بەڵام بەمشێوەیە" ئاغام پێیگوتم سەگە"– وەرگێر

بەیەکترەوە، لەیەکتر جیانەکرێنەوە، ئەگەر کەسێکیش سادە بێت ئەوا بەلای ئەوانەوە بەڵگەیە بۆئەوەی کەسەکە پێگەی بەرزی لەدەست داوە.

دەبێت ئەوە لەبیر نەکەین خەڵکی شار نەریتێکی بەدوەکانیان لەبەرامبەر بەدەسەڵاتداران بەپێچەوانەوە وەرگرتووە. بینیمان بەدوەکان لە بیابان رقیان لەکەسێك دەبێتەوە خۆی لەناو ئەوان بەگەورە بزانێت، ئەوان لەبەرامبەر سەرۆکەکانیان دیموکراسین، ئەگەر بینیان خۆی بەسەریان دەسەپێنێ ئەوا لێی دووردەکەونەوە و پشتی تێدەکەن. ئەو نەریتە گەیشتۆتە خەڵکی شارەکان، کەم یان زۆر بەو نەریتەوە کاریگەرن، ئەوانیش وەك بەدو رقیان لەکەسانی خۆسەپێنەر دەبێتەوە، بەڵام پەیوەندیان بە دەسەڵاتدار وایکردووە رێزی بگرن، سەرەڕای رقبوونەوەیان.

ئەوان لە دانیشتنە تایبەتەکانیان زەمێکی توندی کەسانی بەفیز دەکەن، بەڵام هەرکە لەرێگا بەلایان تێدەپەڕێ یان دەچێتە مەجلیسەکەیان ئەوا بۆ پێشوازی هەڵدەستنەوە و زەردەخەنەی کوشکێشی بۆ دەکەن. کاتێك ئەو کەسە قسیان بۆ دەکات ئەوا پڕ بە گوێچکە گوێ دەگرن، لەوانەشە بەدەنگێکی بەرز بە نوکتە بێتاماکانی پێ بکەنن. جاریێ وا رێك دەکەوێت ئەو کەسە بەسەر زەمی خۆی دادێت. لەناکاو بارودۆخەکە پێچەوانەوە دەبێتەوە، دەڵێن (باسی تۆمان دەکرد) مەبەستیان بەچاکە باسیان کردووە، کەچی راستیەکە ئەوەیە بەخراپە باسیان دەکرد.

دەکرێت ئەمە بەجۆرێك لە دووڕوویی بزانین، بەهەرحاڵ خاڵی نییە لە هەندێك مانای دووفاقی کەسێتی. ئەمە دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی باوە، خەڵك لێی راهاتوون و تەنها ئێستا شەرمی لێ ناکەن، تەنانەت لەوانەیە هەندێك شانازی بەوە بکات لەم دووڕووییە کارامەییە. ئەم دیاردەیە بەشێوەیەکی تایبەت لەنێو شاعیران باوە، شاعیر شەرمی لەوە نەدەکرد قەسیدەی ستایشکردن بۆ هەرکەسێك بنووسێ کە داوای سوود و پاداشتی لێ دەکات. خەڵکیش لەوە راهاتووە چێژ لە داڕشتن و کارامەیی شێوازەکەی وەربگرن، بەچاوپۆشین لەوەی شیعرەکە درۆ و ماستاوچیەتی زەقە.

لەپەندێکی میللی هاتووە( جیب نقش وكل عوافي) (نەخش بێنە و بیخۆ نۆشی گیانت بێ) ئەم پەندە ئاماژە بۆ رادەی بڵاوبوونەوەی کوشکێشی دەکات لەناو خەڵکدا، پەندەکەش مانای ئەوەیە ئەگەر توانیت نەخش بهێنی لە فێڵ و ماستاوچییەتی و بەرژەندیت دەستکەوت، ئەوا مافی خۆتە چێژ لەو بەرژەوەندیە وەربگری نۆشی گیانت بێت. چەندین پەندی دیکەی هەیە ئاماژە بۆ هەمان مانا دەکات، لەوانە" ئەگەر کارت کەوتە لای سەگ، پێی بڵێ حاجی سەگ" یان " ئەوەی دایکم دەبات پێی دەڵێم مامە"...هتد.

خەڵك بایەخ بەوە نادات کێ لە نێویان دەسەڵات دەگرێتە دەست وکێی خانەدان دەبێت، بەڵکو بایەخدانەکە بۆ ئەوەی رەزامەندی ئەو بەدەستبهێنن، بۆ ئەوەی خۆی لە شەڕی دەسەلاتدارەکە بەدوور بگرن و بەرژەندی بەدەست بهێنن. لەراستیدا ئەو نەریتە هێشتا لەنێو هەندێك خەڵك باوە. ئەوان رێز لەکەسانی خانەدان و خاوەن پۆستی گەورە دەگرن، سەرەڕای کینە ورقیان.

خەڵکانێك دەناسم، هێشتا لەناخی دەروونیانەوە گرێی( رێزگرتن لە کەسانی لوتبەرزیان) هەیە، ئەگەر کەسێك لەگەڵیان نەرمونیان و سادە بوو، ئەوان بەکەم سەیری دەکەن، ئەگەریش لوتبەرز بوو لەگەڵیان ئەوا رێزی دەگرن و لەبەردەمی کوشکێشی دەکەن، بەلام ئێستا ئەو جۆرە کەسانە ژمارەیان کەمبۆتەوە، رۆژ لەدوای رۆژیش کەمتر دەبنەوە. بەهای نوێی دیموکراسی بەمدواییە هەلی ئەوەیان پێنادات لەسەر رێگای کۆنی خۆیان برۆن.

دیموکراسی تەنها سیستەمێکی سیاسی نییە، بەڵکو سیستەمێکی کۆمەلایەتیشە. ئەگەر خەڵك لەژیانی کۆمەلایەتی خۆیان لە دیموکراسی رانەهاتوون، ئەوا ناتوانن چاکەی دیموکراسی لە ژیانی سیاسی بدۆزنەوە، ئەگەریش خەڵك لەسەر خوی کۆنیان بمێننەوە، رێز لە لوتبەرزەکان بگرن، ئەوا دەسەلاتداریان لەسەر رێگای ئەفەندیەکانی کۆن دەڕۆن و بۆیە لەفەرمودەیەك هاتووە" ئێوە چۆن بن، کەسانی وەك خۆتان حوکمرانیتان دەکەن".

**پاڵنەری قازانج لەشارەکاندا:**

لەبەشێکی رابردوودا، باسمان لەسەرەتای دەرکەوتنی پاڵنەری قازانج کرد لە هەندێك لادێدا، لەگەڵ چۆنیەتی دەرکەوتنی ململانێ لەنێوان ئەو پاڵنەرە و بەهاکانی هۆز، بەڵام کاتێك دێینە سەر شارەکان ئەوا دەبینین پاڵنەری قازانج کاریگەریەکی زۆری لەسەر پێکهاتنی ئاکارەوە هەیە.

شار بەسروشتی خۆی لە سەر بنەمای پیشەگەری وەستاوە. تاك لە شاردا دوای ئەوەی کەسێتیەکەی لەکۆڵان گەشە دەکات، بەرەو ژیانی گشتی دەڕوات وهەوڵ دەدات پیشەیەك فێر بێت بۆ ئەوەی بژێوی دابین بکات، لێرەدا رووبەرووی جۆرە ژیانێك دەبێتەوە جیاوازی لەگەڵ ئەو جۆرەیان هەیە کە لەمنداڵییەوە لێی راهاتووە.

لەراستیدا لەم لایەنەوە جیاوازیەکی زۆر لەنێوان تاکی شارنشین و تاکی بەدو هەیە. تاکی بەدو ئەوکاتەی پێ رادەگات و دەبێتە پیاو، ژیان لەبەردەمیدا جیاوازیەکی زۆری لەگەڵ ژیانی منداڵی نییە. ئەو بەهایەی خۆزاڵکردن کە لەمنداڵی لێی راهاتووە، ئەوا هەر هەمان شت لەو کۆمەڵگا گەورەیە باوە کە دەچێتە ناویەوە، بەمەش مەینەتی بەدەست ململانێی نێوان بەهای منداڵی و بەهای پیاوانەوە نابێت. دەکرێت ئەم قسەیە لەبارەی زۆرێك لە دانیشتوانی لادێ بکەین، کەچی لەشارەکان بابەتەکە زۆربەی حاڵەتەکان جیاوازە.

بەهای خۆزاڵکردن کە تاکی شار لەمنداڵیەوە لەسەری راهاتووە، لەگەڵ ژیانی بازاڕ وپیشەگەری ناگونجێ، چونکە خاوەن پیشە دەبێت بەدڵسۆزیەوە خزمەتی موشتەریەکانی بکات، دڵیان رابگرێت و بەپەلە وەڵامی داواکاری بداتەوە و دوودڵیان نەهێڵێ، هەموو ئەمانە بۆ ئەوەی متمانەی ئەوان بەدەست بهێنێ و ناوبانگی لەنێویاندا هەبێت، کەچی ئەگەرهاتوو لەمامەڵەکردن لەگەڵ موشتەریەکانی مەیلی بەلای خۆزاڵکردن هەبوو، ئەوا زوو یان درەنگ پیشەکەی مایەپوچ دەبێت.

ئەو بنەمایەی پیشەگەری سەرکەوتوو لەسەری دەڕوات ئەوەیە" کڕیار هەردەم لەسەرهەقە". ئێستا دەبینین ئەو بنەمایە لەزۆربەی وڵاتانی پێشکەوتوو لەسەر

ئاستێکی فراوان جێبەجێ دەکرێت. خاوەن پیشە لەوێ بازرگان بێت، سەنعەتکار بێت یان کرێکار، نایەوێ خۆی زاڵ بکات، چونکە دەزانێ ئەمە کاتیە و هەموو موشتەریەکانی لێ دەڕوێنەوە، دواجاریش دەبێتە هۆی مایەپوچی، بەشێوەیەك ئەمرۆ لەو نەریتە کەمێك قازانج دەکات، کەچی بەیانی زیانەکەی زۆرتر دەبێت.

زەحمەتە زۆرێك لە پیشەگەرانی شارەکانی عێراق لەم بنەمایەی سەرەوە بگەن، ئەوان مەیلیان بۆ ئەوە هەیە بەپەلە بەسەر موشتەریەکان زاڵ بن، بەلایەنەوە گرنگ نییە سبەی چی لەچارەنووسیان هەیە. ئەوان وەك نێچیرێك سەیری موشتەری دەکەن، بۆیە دەیهێنن و دەیبەن، هەموو شێوازەکانی رازیکردن بەکاردەهێنن. موشتەریەکەش لەوانەیە وەك ئەوان بێت، لە کۆڵانەکان گەورە بووە، بۆیە مامەڵەکردن لەنێوانیان درێژە دەکێشێ، لەوانەشە وێنەی ململانێی و زۆرانبازی وەربگرێت، هەر لایەك دەیەوێ سەرکەوتوو بێت نەوەك ژێرکەوتوو.

مامەڵەکردن لەکڕین وفرۆشتن لە بازاڕەکانی عێراق بۆتە هونەرێك پێویستی بەشارەزایی و زۆرزانی هەیە. ئەو کەسەی لەو هونەرە نەگات ئەوا لەبازاڕدا بەستەزمان دەردەکەوێت و تەماعکار دەوری دەدەن، تەنانەت دەبێتە هۆی گاڵتە وگەپی خەلکی بازاڕ، بەڵام کەسی شارەزا لەو هونەرە ئەوا شانازی بەخۆیەوە دەکات. وەها قسە لەسەر مامەڵە پڕ قازانجەکانی دەکات، وەك ئەوەی قسە لەسەر سەرفرازی پاڵەوانی ئازا بکات لە گۆڕەپانی جەنگدا.

لەراستیدا زۆرجار لەبازاڕەکاندا دژایەتی لەنێوان کڕیار وفرۆشیار دروست دەبێت، فرۆشیار زاڵبوو نایەوێ لەو قازانجانەی خۆی خۆش بێت کە بەشمشێری مامەڵەکردن بەدەستی هێناوە، هەروەها کڕیاری ژێرکەوتووش نایەوێ بەژێرکەوتوویی بمێنێتەوە، بۆیە بابەتەکەی نێوانیان بە لێدان و جنێو کۆتایی دێت.

دەگمەن نییە پیاوێکی دەوڵەمەند ببینین، زۆر بەخشندە بێت و داوەت ساز بکات و پارە بۆ کەژاوەکان ببخشێتەوە و پارەی چایخانەکان بۆ ناسیاوەکانی بدات، کەچی لەهەمان کات دوودڵ نییە لەسەر پارەیەکی زۆرکەم مامەڵەیەکی توند

لەگەڵ حەمباڵ بکات، لەوانەیە کرێی حەمباڵەکە بخوات، بەلای باشتر بێت ئەوەك حەمباڵەکە فێڵی لێ بکات، چەند فلسێکی زیاتر لێ وەربگرێت.

حەزکردن بەزاڵبوون تەنها لەمامەڵە نییە، بەڵکو لە ساختەکردنی کەلوپەلەکان و ئەنجامدانی کارەکان هەیە. تۆ کاتێك پیشەگەرێك بۆ کارێك دەگریت، دواتر ئاگاداری کارەکەی نابیت، ئەوا تەمبەڵی دەکات و هەوڵی فێڵکردن دەدات، ئەگەر سەرزەنشتت کرد ئەوا بەپیرۆزترین شت سوێند دەخوات بۆ ئەوەی بسەلمێنێ لەکارەکەی دڵسۆز بووە، دەشڵێ" خوا شاهێدە راست دەڵێم" ئەو بابەتە ئەو کەسانە درکی پێدەکەن کە خانوو بۆخۆیان دروست دەکەن، ئەگەر زۆر لەچاودێری کرێکارەکان توند نەبێت و ئامادەیی شەڕ نەبیت، ئەوا یاری پێدەکەن و فێڵێکی زۆری لێدەکەن.

بوارێکی دیکە هەیە حەزکردن بەزاڵبوونی تێدا دەرکەوێت، ئەویش ئەو دیاردەیەیە کە بە زمانی خەڵك شارەکان بە (قص التيل) ناودەبرێت، مانای ئەم زاراوەیە ئەوەیە کەسێك کەلوپەل بەقەرز دەکرێت دواتر لەدانەوەی قەرزەکە خۆی ون دەکات. رۆژێك لەگەڵ پیاوێك لەبازاڕ دەڕۆیشتم، تێبینی ئەوەکرد ئەو لەدوکانێك سڵ دەکاتەوە، پاساوەکەشی ئەوە بوو ئەم جۆرە قەرزەی لەدوکاندارەکە کردووە. دوکاندارەکە بێ ئابڕوویانە هاواری دەکرد، وەك دەمزانی قەرزارەکە توانای قەرزدانەوەی هەبوو، بەلام وەك دیارە نەدانەوەی قەرزەکە بەشێوازێکی زاڵبوون دەزانێ.

لەراستیدا شارەکانی عێراق هێشتا ژمارەیەکی زۆری هاوشێوەی ئەو پیاوە تێدایە. ئەو جۆرە کەسانەی شانازی بەوە دەکەن توانیان هەیە هەقی خەڵك بخۆن و کەسیش ناتوانێ هەقیان بخوات، جا کاتێك یەکێك لەوانە بیەوێ بۆ شوێنێك بڕوات ئەوا بەرێگای پێچ و پەنا دەڕوات بۆ ئەوەی خۆی لەو بازاڕە لابدات کە قەرزی تێدا کردووە، کە بێگومان ژمارەیان زۆرە، ئەگەرهاتوو کەسێك لەخاوەن قەرزەکان بەرێکەوت دەستگیری بکات، ئەوا سوێندی بۆ دەخوا بەیانی قەرزی بۆ دەگێڕێتەوە، دواتر دەڕوا وناگەڕێتەوە.

## حەزی سامان لە شارەکاندا:

حەزی سامان کۆکردنەوە یان ئەوەی هەندێك جار بە (پووڵەکی) ناودەبرێت، یەکێکە لەگرنگترین خەسڵەتەکانی خەڵکی شارەکان، ئەوان لەو خاڵەدا زۆر بەروونی لە بەدوەکان جیاوازن. پێشتر بینیمان بەدوەکان ماددەیان خۆش دەوێ، بەڵام لەبەر خودی ماددەکە نییە، بەڵکو لەبەر ئەوەیە بەخەڵکی ببەخشنەوە، تا پێگەی بەرز وناوبانگی باش بەدەست بهێنن، ئەو بنەمایەی بەدو لەسەری دەڕۆن لەو دێرەی زوهێر بن ئەبو سولما دەردەکەوێت:

**و من يك ذا فضل فيبخل بفضله    على قومه يستغن عنه و يذمم**[353]

(واتە: ئەوەی سامانی هەبێت و لەگەڵ قەومەکەی بەخیل بێت، ئەوا وازی لێ دەهێنن و گلەیشی لێ دەکەن– وەرگێڕ)

کەچی خەڵك شارە لەسەر بنەمایەکی دیکە دەڕۆن" پارەی سپی بۆ ڕۆژی ڕەش". پارە لە شارەدا کرۆکی ژیان پێك دەهێنێ، مرۆڤ دەتوانێ بەپارە پێداویستیە هەمەجۆرەکانی دابین بکات، ئایندەی مسۆگەر بکات، لە دەسەڵاتداران نزیك بێتەوە، خۆ بەهەندێك روخسارەوە دەربخات کە خانەدانی و دەسەڵاتی بۆ دەهێنێ.

دەوڵەمەند لەشارەکانی عێراق دەتوانێ زیان و سوود بگەیێنێ، لەوانەیە توانای لە زیانگەیاندن زیاتر بێت لەسوودبەخشین. ئەو ئەگەر بیەوێ زیان بەکەسێ بگەیێنێ، ئەوا چەند شەقاوەیەك بەکرێ دەگرێ بۆئەوەی هێرش بکەنە سەر ئەوکەسە، یانیش لەلای حکومەت ناوی دەبات و دەیخاتە زیندانەوە، هەر لەبەرئەمەش خەڵك رێز لەدەوڵەمەندەکان دەگرن و کوشکێشیان بۆ دەکەن، وەك چۆن لەبەرامبەر دەسەڵاتداران ئەو کارەیان دەکرد.

نابێت ئەوە لەبیر بکەین خەڵکی شار ئیرەیی بەدەوڵەمەند دەبەن و بەدوای نەنگیەکانی دەگەڕێن. زۆرجاریش لە مەجلیسەکانی باس لەو شێوازە نەگریسانە دەکەن کە سامانی پێ کۆکردۆتەوە، بەڵام هەرکە بینیان بۆلای ئەوان دەچێت ئەوا وەك رێزێك لەبەری هەڵدەستنەوە و دەیخەنە سەری مەجلیسەوە.

---

[353] الحسين بن أحمد الزوزني (شرح المعلقات السبع) ص ١٠٣

کەسی دەوڵەمەند دەزانێ چۆن پاڵپشتی خانەدانی خۆی بکات و پێگەی خۆی لەناو خەڵك بەرز بکاتەوە. ئەو لە پیاوانی ئاینی نزیك دەبێتەوە پارەیان بۆ سەرف دەکات و بۆ وەعزەکانیان دەگری، وەك ئەوەی هارون رەشید لەرۆژگاری پێشووی ئەو کارانەی دەکرد. ئەو دەوڵەمەندەش هەلی جەژن و کەشە ئاینیەکان دەقۆزێتەوە بۆ ئەنجامدانی داوەت و ئاهەنگ و دەبێتە سەرقافڵەی کەژاوەکان، بەشێکی زۆر لە سامانەکەی لەپێناوی خودا دەبەخشێ، ئەو جۆرە فێڵانە لەگەڵ زۆرێك لەخەڵك دەکات و ئەوانیش وا دەزانن ئەو پیاوە پاداشتی خۆی لەدونیا و قیامەت وەرگرتۆتەوە.

پیاوێکی دەوڵەمەند دەناسم لەسەرەتا دزێکی گەورەبوو دەچووە سەرماڵان، دوای ئەوەی سامانێکی زۆری کۆکردەوە، ویستی حەج بکات و بچێتە ماڵی خودا، یەکێك لە فەقیهەکان پێی دەڵێ حەجت قبوڵ نابێت ئەگەر داوای لێخۆشبوون لەو کەسانە نەکەی کەدزیت لێکردوون و دەبێ پارەکەش بگەڕێنیتەوە. وەك دەردەکەوێ بەم قسەیە رازی نەبووە، جا لە" چاوی فەقێ" چووە حەج، کاتێکیش گەڕایەوە بووە خانەدان و بەرێز خەڵکیش هەڵپەی مەجلیس و داوەتی ئەویان دەکرد، خوداش غەفور و رەحیمە!

دەتوانین بڵێین رێزگرتنی دەوڵەمەندان بەمشێوەیە وایکردووە خەڵك هەڵپەی کۆکردنەوەی سامان بکات، بۆ ئەوەی بەهەر شێوەیەك بێت بکەوێتە دەستیان، بایەخیش بەوە نادەن رەوایە یان نا، ئەوان لەسەر ئەو بنەمایە دەڕۆن کەپێشتر ئاماژەمان بۆ کرد " نەخش بێنە و بیخۆ نۆشی گیانت بێ".

**مەینۆشی لەشارەکاندا:**

مەینۆشی لە لادێکان دەگمەنە، لەبیابانیش وەك ئەوەیە بوونی نەبێت. کەچی لەشارەکاندا بەئاستێکی بەرز بڵاوبۆتەوە، خەڵکی عەوام لەشارەکان پێی دەڵێن" شیری شێر" زۆرێکیان شانازی بە خواردنەوەی مەی دەکەن و بەیەکێك لەرواڵەتکانی پیاوەتی دەزانن. لەوانەیە ستایشی پیاوێك بکەن بڵێن" **قاعد علی**

طبق"[٢٥٤] واتە( لەسەر خوانی تەبەق دادەنیشێت) مەی دەنۆشێ. ئەو کاتە تەبەق ڕەمزێك بوو بۆ مەینۆشی لەسەردەمی عوسمانییەکاندا، کە هێشتا خوانەکانی دیکە بەکار نەدەهات.

ئەوەی جێگای سەرنجە ئەفیون وحەشیش و ماددە هۆشبەرەکانی دیکە، لەسەر ئاستێکی فراوان لەعێراق بڵاونەبۆتەوە. هێشتا مەی ئەو خواردنەوە خۆشەویستە لەدڵی خەڵکی شارەکانی عێراق. ئەفیون لە ئێران زۆربڵاوبۆتەوە، زۆر لەمێژە هەر لە ئێرانەوە بەرێگای گەشتیار و ئەوانەی نیشتەجێی عێراقن بەرەو عێراق دەگوێزرایەوە، کەچی عێراقیەکان ئاڵودە نابن و مەیلیان بۆی نییە تەنها لەسنوورێکی زۆر دیاریکراو نەبێت .

وا لەلای عێراقیەکان باوە ئەفیون غیرەت و پیاوەتی لاواز دەکات، وەك دەردەکەوێت ئەمەش لەگرنگترین هۆکارە وایکردووە مەیلیان بۆی نەبێت، ئەوان شتێکیان دەوێ پیاوەتیان بەهێز بکات نەوەك لاوازی بکات، لەوانەشە ئەمەیان لە مەی دۆزیبێتەوە، لەبەر ئەمەشە لەمەینۆشی دەبن بەپاڵەوان، نیشانەی سەرخۆشی و ئاژاوە و شەڕیان لێ بەدەردەکەوێت. دەگمەن نییە لەشارەکانی عێراق سەرخۆشێك لەسەر شەقام و سەری کۆڵان بوەستێ، خەنجەری هەڵکێشێ، ڕێگە بە ڕێبواران بگرێت. وەك زانراوە هەندێك خۆیان سەرخۆش دەکەن بێئەوەی بەشێکی زۆریان خواردبێتەوە، لەوانەیە مەبەستیان دەرخستنی هێز وپاڵەوانێتی خۆیان بێت. هەندێك جاریش سەرخۆشێك لە مەیخانە هەڵدەسێتەوە گێچەڵ بە دانیشتوان دەکات و جنێودەدات، ئەمەش سەرەتای شەڕێکی گەرم دەبێت لەنێوانیان...

ئەگەر کۆمەڵێك برادەر لە مەجلیسێکی خواردنەوە دانیشتن، گرنگترین شت دەبێت ڕەچاوی بکەن ئەوەیە بە وشەیەك یان جوڵە و ئاماژەیەك یەکتر تووڕە نەکەن. ئەوان زۆر ئاگاداری ئەو خاڵەن، چونکە زۆرجار توڕەیەکی گەورە لەنێوان

[٢٥٤] ئێمە هەوڵمان داوە وێرای وەرگێڕانەکە هەندێك وشە و ئیدیۆیەمی عەرەبی وەك خۆی بگوازینەوە، بەبڕوای ئەوەی تام و چێژێك بە وەرگێڕانەکە دەدات، زۆرێك لەو وشە و ئیدیۆمانەش بەشێوەیەك لەشێوەکان لەناو کوردەواری هەیە، ئەمە سەرەڕای گرنگیەکەی لەڕووی مێژوویەوە– وەرگێڕ

سەرخۆشان هەڵدەگیرسێت، ئەنجامەکەی باش نابێت، تەنانەت قوربانیش دەبێت، لەبەر ئەمەش کۆمەڵگیْ ڕێسای ورد لەکاتی خواردنەوە دانراوە دەبێت ڕەچاوبکرێت، وایلێهاتووە کەسێك لەگەڵ هاوڕێیانی دەخواتەوە، دەبێت لەگفتوگۆیان وشیاربێت و هەستیان رابگرێت، وا باشترە ستایشیان بکات و ئاماژە بەمروەتیان بکات، ئەوانیش دەبێت بەهەمان شێوە هاودەمی بن و بەمەش خۆشی دەکەوێتە دڵی هەمووان.

یەکێك لەسروشتی سەرخۆشی ئەوەیە ناخی مرۆڤ بە بەها و گرێیە کپکراوەکانەوە ئاشکرا دەکات. زۆرێك لەخەڵکی وڵاتانی پێشکەوتوومان بینی بەهەموو شێوەیەك ئالودەی مەینۆشین، تەنانەت هەندێکیان لەمنداڵییەوە لەگەڵی راهاتوون، کەچی ئەوان مەیلیان بۆ لاساری و پاڵەوانێتی نییە لەکاتی سەرخۆشیدا. زۆر دەگمەنە ئەوەی لەخواردنەوەی شارەکانی عێراق دەبینرێت لەلای ئەوان هەبێت.

وەك دەردەکەوێت خەڵکی شارەکان لە مەینۆشی دەرفەتێك دەدۆزنەوە بۆ ئەو کپبوونەوەی لەژیانی کۆمەڵایەتیان بەدەستیەوە دەناڵێنن. ئەوان لەمنداڵی لەسەر بەهای خۆزاڵکردن راهاتوون، لەگەورەیی بۆیان دەرکەوتووە ئەم بەهایە هەندێکجار جێبەجێ ناکرێت، ئەمەش لەناخی خۆیان کپ دەکەن، کەواتە ئەوان لەخوارنەوە هەلێك دەدۆزینەوە بۆ ئەوەی قەرەبووی ئەو شتە بکەنەوە لەژیانی واقیعیدا لەدەستیان داوە.

ئەوەی لەوبارەیەوە شایەنی باسە، بەدو لە رۆژگاری جاهیلیەت ئالودەی مەی بوون، شانازیان بەمەینۆشی دەکرد، پێیانوابوو مەی تەنها شایەنی پیاوی ئازا وچەلەنگە، بەڵام پیاو ترسنۆك تەنها شایەنی ئەوەیە ( مەرگە) بخواتەوە، موسڵمان لەبەرەبەیانی جەنگی (بەدر) مەیان نۆشی، بۆئەوەی لەبەرامبەر موشەریکەکان ئازا وبوێر بن[٣٥٥].

چەندین ئاماژەیە بۆ ئەوەی بەدوەکان لەکاتی خواردنەوە مەیلیان بۆ سەرمەستیەکی توند هەبووە، ئەمەش لەگرنگترین ئەو هۆکارانەبوو وایکردووە

---

[٣٥٥] احمد محمد الحوفي (الحياة العربية في الشعر الجاهلي) ص ٣٤٩

ئیسلام مەی لەپەیڕەوکارانی حەرام بکات. ئەوەی جێگای سەرنجە بەدوەکان دوای ئـەوەی بوونـە موسـڵمان توانیـان واز لەخواردنـەوەی مـەی بهێـنن، ئەمـەش بەپێچەوانەی خـەڵکی شارەکان، ئـەوان لەخواردنـەوە بـەردەوام بـوون سـەرەڕای ئەوەی ئیسلام حەرامی کردووە، ئایا هۆکاری ئەمە چییە؟

من مەزندەی ئەوە دەکەم خواردنەوەی مەی لەلای بەدوەکان نەریتێکی راگوزەر بێت، لەوانەیە لەجاهیلیەت لە ئەنجامی تێکەڵبوونیان بەشارەکانەوە ئەو نـەریتیان بۆ هاتبێ، هاوشێوەی ئەوەی بتپەرستی و چەندین نـەریتی دیکـەی شارنشینیان وەرگرتـووە. بـەدو وەك خـەڵکی شـار پێویسـتی بەمـەی نییـە بـۆ نەفەسـدان بـە ئارەزووە کپکراوەکانی. زۆر دەگمەنە لـە بیابـان کەسـانی ترسنۆك و بێدەسـەڵات بدۆزیتەوە، سەرخۆشی بکەنە دەرفەتێك بـۆ دەرخسـتنی پاڵـەوانێتی وەك ئـەوەی لەلای خەڵکی شار بینیمان.

**نێربازی لەشارەکاندا:**

لەراسـتیدا نـەریتی نێربـازی لەسـەردەمی عوسمانیـەکان بەشـێوەیەکی فـراوان لەشارەکانی عێراق هـەبوو، دەکرێـت ئەمـەش بـۆ چـەندین هۆکـار بگێڕینـەوە، کـە گرنگترینیان ئەمانەی خوارەوە:

١-پـەروەردەی کـۆڵان: بینیمـان چـۆن منـداڵانی گـەڕەك نێربـازی بـە سـیمایەکی زاڵبوون دەزانن وشـانازی پێوەدەکـەن و بـە (چاوشـکاندنی ناودەبـەن). (بکـەر)ی کارەکە وا هەست دەکات بە سەر(بەرکار) زاڵ بـووە و چـاوی شـکاندووە، هـەردەم ئەمەی بەچاودەداتەوە، بەمەش کەسە (بەرکارەکە) تووشی گرێی دەروونی دەبێت و لـەلای هاوتەمەنـەکانی کەسـایەتی لاواز و تێکشـاو دەبێـت، هاوڕێیەکانیشـی دەیچەوێسننەوە و بەسەری زاڵ دەبن.

کاتێـك ئـەو منداڵانـە گـەورە دەبـن، ئـەو نەریتـە بەشـاراوەیی لـەناخی زۆرێکیـان دەمێنێتەوە، دەگمەن نییە پیاوانی گەورە ببینین شانازی پێوە بکەن، یان بیکەنە نازناوی خراپی هەندێکیان، وەك رۆژگاری منداڵنیان. هەربۆیـەش لـە نێـو خـەڵکی عـەوامی زۆربـەی شـارەکانی عێـراق دیاردەیـەك بـاوە بـە (الشـد: لاقـەکردن) ناودەبرێت، ئەگەر بیانەوێ تۆڵە لەیەکێك بکەنـەوە ئـەوا فێڵـی لـێ دەکـەن، دواتـر

گرنێی دەدەن و بەزۆری لاقەی دەکەن، بەمەش کەسی لاقەکراو هەموو تەمەنی بەچاوشکاوی دەمێنێتەوە، کەچی بکەری لاقەکردنەکە شانازی بەکارەکەی خۆی دەکات. یەکێك لە خانەدانەکانی ئەمرۆ دەناسم، لەرۆژگاری گەنجێتی سەرۆکی عەسابەی لاقەکردن، مەزندە دەکەم ئێستاش شانازی بە( سەروەرییەکانی!) رابردووی بکات.

٢- توندی حیجاب(دابڕانی ژنان): لەرووی زانستیەوە سەلمێنراوە، هەرچەندە دابڕانی ژنان لەکۆمەڵگا زیاد بێت ئەوا رێژەی نێربازی لەنێوان تاکەکانی زیاتر دەبێت، ئەمەش ئەنجامێکی سروشتیە، چونکە مرۆڤ ئارەزووی پەیوەندی سێکسی هەیە و دەیەوێ چێژی لێ وەربگرێت، ئەگەریش بینی بەهۆی هەر هۆکارێکەوە رەگەزی بەرامبەر جیاکراوەتەوە، ئەوا هەوڵ دەدات قەرەبووی بکاتەوە، بۆیە دەیەوێ لەگەڵ هاورەگەزی خۆی جووت بێت. ئەمەش وایکردووە هەندێك پیاو لەو کۆمەڵگایانەی ژنانی تێدا دابڕاو و حیجابی تێدایە، مەیلیان بۆ جووتبوونی مێرمنداڵی تازە پێگەیشتوو کە لەژنان دەچن، کاتێکیش ئەو منداڵە گەورە بوو مووی لێهات ئەوا وازی لێدەهێنن.

٣- کولتوری ئینکیشاری: لەبەشێکی رابردوو ئاماژەمان بۆ ئەوەکرد عێراق لەلایەن ئینکیشاریەکانەوە فرمانڕەوایی دەکرا، تا ئەو کاتەی لەساڵی ١٨٣١ لەنێوبران، تاکەکانی ئەو سوپایە هەر لەمنداڵیەوە لە قوتابخانە ناوخۆییەکان دانرابوون بۆ ئەوەی فێری هونەری جەنگ بن، ئەوەی زانراوە ئەو قوتابخانەنانە لەسەردەمێکی درەنگدا لەرووی ئاکارەوە دروست نەبوون، لەوانەیە قوتابیەکان لەنێوان خۆیاندا نێربازیان کردبێت، یان لەگەڵ مامۆستاکان ئەنجامیان داوە. مەمالیکیش (کولەمەندیەکان) لەمەدا هاوشێوەی ئینکشاریەکان بوون، وەك ئەوان لەمنداڵیەوە بۆ بەشە ناوخۆیەکان دەبران[٣٥٦]. مەمالیك نزیکەی ٨٠ ساڵ حوکمڕانی عێراقیان کرد، لەناوچوونیشیان هاوکات بوو لەگەڵ لەناوچوونی ئینکیشارییەکان.

[٣٥٦] علي الوردي (مهزلة العقل البشري) ص ٩-١٠

هەرچۆنێك بێت نێربازی لەنێو دەسەڵاتداری ئەو سەردەمە بڵاوبووە، ئەو کاتەش مەمالیك و ئینکیشارییەکان جڵەوی دەسەڵاتیان لەدەست بووە، ئەمەش وایکردووە نێربازی لەنێو خەڵك ئاسایی و رێزی هەبێت، ئەو لەبەرچاوگرتنە کۆمەلایەتیەش تا ماوەیەکی درەنگ لەشارەکانی عێراق باو بوو.

لەبارەی رادەی بڵاوبوونەوەی نێربازی لەشارەکانی عێراقدا لەسەردەمی عوسمانییەکان، ئامارێکمان لەبەر دەست نییە، بەڵام مەزندەیەك بەنزیکەیی هەیە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات نێربازی لەعێراق ئەوکات لە ٪٤٠ دانیشتوان هەبوو، ئەمەش رێژەیەکی زۆرە لەهەموو وڵاتانی دیکە زۆرترە، لە ئیماراتی کەنداو نەبێت.

رادەی بڵاوبوونەوەی نێربازی وەك نەریتێك لەچایخانەکان دەردەکەوێت. ئەمەش بابەتێکی ئاسایی بوو پیاو لەچایخانە دابنیشێت، غولامە تایبەتەکەی هەردەم لەگەڵ دابێت ماوەیەکی کەم نەبێت. خانەدان ودەوڵەمەدان وا راهاتبوون پارەیان لە غولامەکانیان خەرج دەکرد و پۆشاکی گرانبەهایان بۆ دەکرین، پێداویستی بژێویان بۆ دابین دەکردن، تەنانەت لەگەڵ کارەکانیان بەشداریان پێدەکرد. پیاوێکیش شەرمی لەمە نەدەکرد، لەوانەشە لەزۆر حاڵەت شانازی کردبێت، ئەم نەریتەش تا ئێستا ماوە.

توێژەران هاورەگەزبازی بۆ دوو جۆرە پۆلین دەکەن (لادانی سێکسی پۆزەتیف) و( لادانی سێکسی نێگەتیف). تێبینی ئەوە دەکرێت لادانی سێکسی بەهەردوو جۆرەکەیەوە نێگەتیف و پۆزەتیف لە هەموو کۆمەڵگاکانی مرۆڤایەتی هەیە. هافلۆك ئەلیسی توێژەر پێیوایە لە ٪٢ دانیشتوانی جیهان لەهەموو وڵاتان تووشبووی لادانی سێکسین کە ناتوانن لێی دەربازبن[٣٥٧]. ئەمەش لادانێکی سروشتیە لە ئەنجامی هەڵەیەك دەبێت لەپێکهاتەی جەستیانەوە، نێر حەزی لەنێرە، مێ حەزی لەمێیە. تاکێك لەوان جا نێگەتیف بێت یان پۆزەتیف بەپێی بارودۆخی دەوروبەری دەبێت کە لە سەرەتای هەبووە، زانستیش لەچارەسەرکردنی ئەوانە کەم توانا دەرچووە، تەنها کەمێك نەبێت. لادەرە سروشتییەکان بەوە لەلادەرەکانی دیکە جیادەکرێنەوە، خاوەن مەیلێکی

[٣٥٧] Havelock Ellis (psychology of sex)Vol. IV

سروشتی ریزپەڕن، پیاوحەزی بەپیاوێکی تەواو هەیە خاوەنی ماسولکەی بەهێز و مووی چڕ بێت، ژنیش حەزی بە مێیەك هەیە تەواو نەرم و ناسکۆڵە بێت. ئەمەش مانای ئەوەیە جیاوازیەکی زۆر لەنێوان لادانی سروشتی و لادانی وەرگیراو هەیە، یەکەمیان نەخۆشیە و زۆرجار چاك نابنەوە، کەچی دووەمیان خاوەنەکەی بەسروشتی خۆی لادەر نییە، بەڵکو لادانە سێکسیەکەی لە دەوروبەرە کۆمەڵایەتیەکەی وەرگرتووە، ئەو دەیکاتە قەرەبووکردنەوەیەك بۆ لەدەستدانی رەگەزی بەرامبەر، کەواتە ئەمجۆرەیان چارەسەری هەیە، رێژە وجۆرەکەی بەپێی بارودۆخی دەوربەر دەگۆڕێت.

بەهەرحاڵ دەتوانین بڵێین، لەرووی تووشبووانی لادانی سروشتی عێراق جیاوازی لەگەڵ وڵاتانی دیکەی جیهان نییە، ئەو کەسانەش بەپێی مەزندەکەی هاقلۆك رێژەیان لە ٪۲ی دانیشتوان زیاتر نییە، ئەوانیش وەك یەك لە بیابان و لادێ و شارەکان هەن، بەڵام تووشبووان بەلادانی وەرگیراو لەعێراق، لەشارەکان زۆرن، لەلادێکان کەمن، لەبیابان بوونیان دەگمەنە.

ئەوەی جێگای سەرنجە لادانی نیگەتیڤ (ئەو کەسەی دەیەوێ رەگەزبازی لەگەڵ بکرێت، نەوەك خۆی بکەر بێت) لەشارەکانی عێراق رێژەی زۆرکەمبووە، کەچی لادانی پۆزەتیڤ وەك پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد، دەگاتە ٪٤۰ . بەڵام رێژەی لادانی نیگەتیڤلە ٪۱ زیاتر نییە، ئەم جیاوازیەی نێوانیان بۆ ئەو بەها کۆمەڵایەتیە دەگەڕێتەوە کە لەشارەکان زاڵ بووە.

خەڵك لەوڵاتانی رۆژاو بەیەك چاو سەیری لادانی پۆزەتیڤ ونیگەتیڤ دەکەن و جیاوازی لەنێوانیان ناکەن. ئەوان هەردوو جۆر بەنەخۆشی دەروونی یان بەدژەباو دادەنێن، ئەگەر وەسفی کەسێکی تووشبوو بەلادانی سێکسی بکەن، ئاماژە بۆ جۆری لادانەکە ناکەن، گوێگریش نازانێ ئەو نیگەتیڤە یان پۆزەتیڤ. کەچی لە شارەکانی عێراقدا بابەتەکە پێچەوانەیە. خەڵك رقیان لە لادەری نیگەتیڤ دەبێتەوە، ئەو جۆرە کەسانەش لە خراپترین باری سووکایەتی و شەرمەزارییەن، کەچی لادەری پۆزەتیڤ شەرم لەلادانی خۆی ناکاتەوە، رەنگە زۆرجاری شانازی پێوە بکات، ئەو سەرکەوتووە توانیویەتی چاوی خەڵك بشکێنێ، بێئەوەی کەس

بتوانێ چاوی ئەو بشکێنێ، ئەمەش وایکردووە ڕێژەی لادانی پۆزەتیف لەنێو خەڵکی شار لە لادانی نێگەتیف زیاتربێت.

لەراستیدا ئەم تێڕوانینە بۆ لادەری پۆزەتیف بەشێوەیەکی بەرچاو بەمدواییە گۆڕاوە، چونکە خەڵك رقیان لە لادەری پۆزەتیڤە و بەقێزەوەنی دەزانن. دەتوانین بڵێین لادانی پۆزەتیف بەرە بەرە لەنێو نەوەی نوێ بەرەو نەمان دەچێت، لەمەشدا سفوری ژنان و دەرکەوتنی نوێیان هاوکاری کردوون. بۆیە دەبین گەنجان بەدوای کچانەوەن، جۆرەها هونەری غەزەل گوتن و دڵداری بەکاردەهێنن، بەدوای غولام راناکەن.

**شوێنی رابواردن لە شارەکاندا:**

مرۆڤ لەسەرتاسەری جیهان لەوە راهاتووە، پەنا بۆ رابوردن و سەرگەرمی ببەن، ئەمەش وەك نەفەسێك بۆ رزگاربوون لەمەینەتی کپکردنی ژیانی کۆمەڵایەتیان. ژیانی کۆمەڵایەتی بەشێوەیەکی گشتی لەژێر قورسایی کۆت وبەند و هەندێك نەریت بەرێوەدەچێت مرۆڤ تەنگەتاو دەکات و رێگری لێدەکات بەدوای شەهوەت و ئارەزووە سروشتیەکانی بێت، بۆ ئەمەش لە هەموو کۆمەڵگای مرۆیی جۆرەها رابورادن دانراوە و کاتی دیاریکراو هەیە بۆ چێژوەرگرتن لێیان.

لەبیابان و لادێکانی عێراق تێبینی دەکرێت پیاوان ئاهەنگی بووك گواستنەوە وبۆنەکانی دیکە دەکەنە هەلیك بۆخۆیان، بۆیە جۆرە سەمایەك دەکەن بە (چۆپی) ناسراوە، هەندێك جاریش ژنان بەشداری لەچۆپی دەکەن. زۆرجاریش کات بۆ سوارچاکی و پێشبرکێ شەرەشمێر و دارعەسا دەکەن، ژنان سەیریان دەکەن و هەلهەلەیان بۆ دەکەن، ئەوانیش هەست بەخۆشی وشادی دەکەن.

لەم لایەنەوە لەلادێکانی عێراق قەرەج رۆڵێکی گرنگی هەیە، ئەوان کچانی شارەزایان هەیە لەسەما وگۆرانی. قەرەجەکان لەنێو هۆزەکانی لادێ دەگەرێن و هەندێك سەرگەرمی و خۆشی ئەوان دابین دەکەن. کاتێك دێینە شارەکانی عێراق دەبینین ئەو رابوردنەی هەیە خەڵك تێر ناکات. جیاکردنەوەیەکی توند لە نێوان ژنان و پیاوان لەشارەکان هەیە، توندرەویەك بەرامبەر بە ژن هەیە، ئەمەش

وایکردووە کپکردنێکی سێکسی لەنێو دانیشتوانی شارەکان هەبێت، بەجۆرێك پەنا بۆ ئەو رابوردنانە دەبەن کە دروست نین و خاڵی نین لە بێئابڕوویی.

لەشارەکانی عێراق جۆرێك لەرابواردن هەیە، پێی دەگوترێت (الکسلە)[٣٥٨] ئەمە لەچەند رۆژێکی دیاریکراوی ساڵ روو دەدات. ژنان لەو رۆژانە دەچنە سەر مەزارێك لەمەزارەکان و ماوەی چەند کاتژمێرێك لەوێ دەمێننەوە، چا دەخۆنەوە و هەندێك خواردن دەخۆم. ئەو کاتەش گەنجان دێن ریشیان تاشیوە و نایابترین جلی خۆیان پۆشیوە، ئیدی دەوروخولی ژنان دەدەن، ئەوان چێژێکی گەورە لەمە دەدۆزنەوە، هەر یەکێك لەوان واهەست دەکات بەجوانیەکەی هۆشی ژنانی بردووە، گێچەڵ بەژنان دەکەن و چاوبازیان لەگەڵ دەکەن، بۆ ئەوەی یەکێکیان (راو) بکەن. هەندێك جار لەمەدا سەردەکەون.

دەتوانین بڵێین ئەو دیاردەیە، دەرفەتی بەهەندێك پیاوان دەدا بۆ کەمکردنەوەی کپکردنی سێکسیان. هەندێك کەسانی بەئیرەیی هەوڵیان دا مەزارگە پیرۆزەکان لەو دیاردەیەی خراپی ئاکار دووربخەنەوە، بەڵام سەرکەوتوو نەبوو، ئەوانە چەند خراپەیەکن لەسروشتی ئەو باردۆخە کۆمەڵایەتیە هەڵقوڵاوە کە خەڵکی شارەکانی تێیدا دەژین.

جۆرێکی دیکەی رابواردن هەیە لەکاتی ئاهەنگی بووك گواستنەوە و ئاهەنگی سوننەتکردن ئەنجام دەدرێت. پیاوان لەم رۆژەدا ئێوارە لەماڵی خاوەن ئاهەنگەکە کۆدەبنەوە، بەدەف گۆرانی دەڵێن، هەندێك غولام و پیاو هەڵدەستنەوە لەگەڵ گۆرانییەکان سەما دەکەن. وەك نەریتێك ژنان لەسەر بەلەکۆنی ماڵەوە یان لەسەربان سەیری ئاهەنگەکەن دەکەن، جا ئەو کاتە دەبینین پیاوی بەشدار بوو لەئاهەنگەکە کەسێتیەکی دیکەی دەبێت و کەسێتی ئاسایی نامێنێ، هەوڵ دەدات جێی سەرنجی ژنانی تەماشاکەر بێت، جوڵەی دەگۆڕێت و دەنگی لەگۆرانی بەرز دەکاتەوە، زۆرجاریش بەتوڕەیی هەڵدەچێ ئەگەر هەست بکات سوکایەتی پێدەکرێت، بۆیە تەقەیەك دەکات یان خەنجەرەکەی هەڵدەکێشێ، بەمەش

[٣٥٨] الکسلة: جۆرێك لە سەفەرەیە لەسەر مەزارەگان ژنان ئەنجامی دەدەن بەتایبەتی لەوەرزی بەهاردا. – وەرگێڕ

دەیەوێ پاڵەوانێتی خۆی بەژنان نیشان بدات وەك چۆن جوانیەکەی خۆی دەرخستووە، زۆرشەڕی توندیش لەئەنجامی ئەم دیاردەیە کەوتۆتەوە.

خەڵکی شار وەك بەدو و لادێیەکان بە سەمای میللی دڵخۆش نەدەبوون. تەنها سەمای تایبەت بەپیاوان هەبوو، ئەویش تاك تاکە وەك پێشتر باسمان کرد، لە ئاهەنگی بووك گواستنەوە و ئاهەنگەکانی دیکە ئەنجام دەدرا. هەندێك تاك لەو جۆرە سەمایان پسپۆڕ بوون بەیەکێك لەوان دەگوترا (الشعار) خەلکەکە وای بەلاوە پەسەند بوو ئەو کەسە مێرمنداڵێکی لوس بێت، رووخسار وجەستەی لەژنان بچێت، کاتێك ئەمە لەنێویان سەمای دەکرد سك و سمتی دەلەراندەوە. زۆرجار پیاوان عاشقی ئەو جۆرە غولامانە دەبوون، کێبرکێیان لەسەر دەکرد و شەڕیان لەپێناو دەکرد.

عەبدولکەرمی عەلاف لە یادەوەرییەکانی خۆی لەبارەی بەغدای دوارۆژەکانی عوسمانیدا، باس لەوە دەکات مێرمنداڵی بینیوە بەجلی ژنانەوە سەمیان کردووە و لەژنان دەچوون لەسەر ئەو تەختەی شانۆ کە لەیەکێك لەقاوەخانەکانی بەغدا بۆیان ئامادەکرابوو، ئەویش قاوەخانەی (سبع )بوو[٣٥٩].

قاوەخانەکان لەبەغدا:

شاری عێراقی بەوە ناوبانگی دەرکردووە، لەهەموو شارەکانی دیکە دونیا ژمارەی قاوەخانەکانی بەگوێرەی دانیشتوان زۆرە. یەکێك لەگەشتیارەکان وەسفی دەکات و دەڵێ" لەنێوان هەر دوو قاوەخانە، قاوەخانەیەك هەیە". وەك ئەوەی ئاماژە بۆ ئەوە بکات ژمارەی زۆری قاوەخانەکانی عێراق وەك زۆری کەنیسەکانی رۆمایە.

زۆری قاوەخانە، یەکێکە لەنیشانەکانی لاوازی ژیانی ماڵ لەشارەکانی عێراقدا، زۆربەی پیاوان کاتی دەستبەتاڵی خۆیان لەقاوەخانەکان بەسەردەبەن، کە پێشتریش لەدیوەخانەکان بەسەریان دەبرد. وەك دەردەکەوێت قاوەخانەکان لەسەرەتای دەرکەوتنیان لەعێراق کێبرکێی لەگەڵ دیوەخانەکان دەکرد بۆ راکێشانی پیاوان، دواجاریش بەسەر دیوەخان زاڵبوو.

---

[٣٥٩] عبدالكريم العلاف (بغداد القديمة) ص ١٢١

قاوەخانە بۆیە بەناو ناودەبرێت، چونکە شوێنێك بووە قاوەی تێدا پێشکەش کراوە، تەنانەت زۆرێك لەخەڵکی عەوامی عێراق قاوەخانە بە (القهوە : گەهوە) ناودەبەن. زۆرێکیش لەقاوەخانەکان ئێستا لەبری قاوە، چای تێدا پێشکەش دەکرێت، کەچی هێشتا ناوی قاوەی پێوە لکاوە.

یەکەم قاوەخانە لەبەغدا لەسەردەمی والی عوسمانی (جغالە زادە)، خاوەنی شوێنەکەش بەناوی " خان جغان" بەناوبانگ بووە، ئەمە نزیکەی ساڵی ١٥٨٣ بووە، شوێنەکەی ئێستا دەکەوێتە نزیك قوتابخانە موستەنسریەوە. دوای چەند ساڵێك قاوەخانەیەکی دیکە، لەسەردەمی والی حەسەن پاشا کرایەوە، شوێنەکەی نزیك بووە لەمزگەوتی وەزیر لە نزیك پردی کۆن[٣٦٠]. دواتر یەك بەدوای یەك لەسەرتاسەری بەغدا قاوەخانە دەکرایەوە و دواجاریش لەشارەکانی دیکە قاوەخانە دادەنرا.

مەزندە ئەوەی دەکەین لەسەرەتادا قاوەخانەکان تەنها کەسانی ئاست نزم و ئەهلی رابواردن هاموشۆیان کردووە. وەك باس دەکرێت هەندێك لەو قاوەخانانە غولامی جوانی داناوە بۆ پێشکەشکردنی قاوە بە میوانەکان و مۆسیقای تێدا ژەنراوە[٣٦١]، بەڵام کاتێك قاوەخانەکان بەپێی تێپەڕبوونی رۆژگار ژمارەیان زیادی کردووە، ئەوا جۆرێك لەتایبەتمەندی تێدا دەرکەوتووە، بۆیە هەر چین و توێژێکی خەڵك قاوەخانەی تایبەت بەخۆی هەبووە. دواجاریش هەندێکیان ناوبانگی چاکی وەرگرتووە پیاوانی بازارگان و خانەدانەکان هاموشۆیان کردووە، هەندێکی دیکەش ناوبانگی خراپی هەبووە، کەسانی ئاست نزم و ئەهلی رابوردن و ئارەزووبازی باڵندە و نێربازەکان سەردانیان کردووە. لەهەر گەڕەکێکیش قاوەخانەی تایبەت هەبووە، بەجۆرەیان دەگوترا (مقهی الطرف).

بەهەرحاڵ دەتوانین بڵێین زۆرێك لەقاوەخانەکان شوێنی بەدناکاری بووە، بۆیە پیاوانی ئایینی و موحافزکاران لەخەڵکی شار لەقاوەخانە وچایخانەکان دانەدەنیشتن. وەك نەریتێکیش قاوەخانە شوێنی دانیشتنی گەنجان نەبوو، تەنها

---

[٣٦٠] یعقوب سرکیس (مباحث عراقیة) ج ٢ ، ص ١٨٧-١٩٠
[٣٦١] المصدر السابق ، ج ٢، ص ١٧٩

ئەو کاتە نەبێت کە ریشی دەهات. ئەگەر گەنجێکی لوسکەی بێ موو لە چایخانە دانیشتبوایە ئەوا بە بەدرەوشت ناودەبرا.

هەندێك لەخاوەن قاوەخانەکان، هونەری راکێشانی موشتەریان هەبوو، جاران کەسانێکیان بەکرێ دەگرت بۆ ئەوەی گۆرانی بۆ موشتەریەکان بڵێ، یان چیرۆکی هاوشێوەی عەنتەرەی عەبسی و ئەبوزەیدی هیلالی و حمزەی پاڵەوانیان بۆ بگێڕێتەوە. دواتر قەوان هاتە عێراق بەکارهێنانی لە چایخانەکان زۆر باو بوو، بەکارهێنانی بەردەوام بوو تا رادیۆ دەرکەوت، ئێستا سەرەرای رادیۆ، تەلەفزیۆنیش لەقاوەخانەکان بەکاردێت.

## شوێنەکانی سەماکردن لەعێراق:

یەکەم سەماگە ( شوێنی سەماکردن) لەعێراق سەماگەی (سبع) بوو لەبەغدا. ئەم شوێنە لەسەرەتادا قاوەخانەبوو نەوەك شوێنی سەماکردن، خاوەنەکەی کە ناوی (سبع) بوو، هەوڵی دا بەسەر لەرکابەری بەسەر خاوەن قاوەخانەکان زاڵ بێت، بۆیە کۆمەڵێك غولامی هێنا سەمایان دەکرد، لەمەش سەرکەوتنێکی بێ وێنەی بەدەست هێنا.

عەبدولکەریم عەلاف رووداوێکی دڵتەزێن دەگێڕێتەوە، کە لەو قاوەخانەیە لەساڵی ١٩٠٧ روویداوە، ناوەڕۆکی رووداوەکە ئەوەیە: پیاوێکی جولەکە هەبوو ناوی سەلیم بووە، مێرمنداڵێکی مەسیحی بەناوی نەعیم هەڵخەڵەتاندووە، ئەو کورە زۆر جوان و قۆز بووە، دەیهێنێتە سەماگەکە بۆ ئەوەی لەوێ کار بکات، خەڵك هەموو شەوێك لەو شوێنە کۆدەبنەوە بۆ ئەوەی ئەو جوانیە بێ وێنەیە ببینن. هەندێك لەخەڵکی بەغدا خۆشیان دەوێت و دەیانەوێ خراپەی لەگەڵ بکەن، بەڵام دەروونی پاکە مێرمنداڵەکە ئەمە رەتدەکاتەوە. زۆر جار هەوڵیان داوە بەپارە و بەڵێنی گەورە فریوی بدەن، بەڵام سوودی نەبووە. تا شەوێك یەکێکیان بەسەر خۆشی دێت، سەماگەکەش سەدان کەسی تێدابووە، ئەو پیاوە تەقە لە غولامەکە دەکات، منداڵە هەتیوە فریودراوەکە دەکەوێتە سەرزەوی وخەڵتانی خوێن دەبێت، ئەوکاتە دەرێتە نەخۆشخانەی غەریبان (**مستشفى الغرباء**) لەوێ لەسەر جێگای دەکەوێت لەتاو ئازار وبەدبەختی خۆی، تا گیان لەدەست دەدات.

خوالێخۆشبوو مەعروف رەسافی شاعیر بە قەسیدەیەك بەناونیشانی( هەتیوێکی فریودراو) مێژووی ساڵی مردنەکەی تۆمارکردووە..."[٣٦٢].

یەکەم ژن لەسەر تەختی شانۆ لەعێراق سەما بکاتە پیشەی خۆی (رحلو جرادە) بوو، ئەو ژنە خەڵکی حەلەب بوو، لەساڵی ١٩٠٨ هاتۆتە بەغدا، ئەمەش لەسەروبەندی سەرکەوتنی بزووتنەوەی دەستووری بوو کە بەمەشروتیە ناسراوە. دوای ئەو زۆرێك لەسەماکەر هاتنە عێراق هەموویان لەسەر ئەو تەختانە سەمیان دەکرد کە لەهەندێك قاوەخانەی مەیدان بۆیان حازر کرابوو، وەك قاوەخانەی (سەبع) و (عەزاوی) و (سەواس).

زۆرێك لە خەڵکی بەغدا شەیدای ئەو سەماکەرانە بوون، بۆیە دەچوونە ئەو قاوەخانانەی ئەوان هەموو شەوێك سەمایان تێدا دەکرد و پارەی خۆیان لەوێ خەرج دەکرد، تەنانەت هەندێك لەو پیاوانە بەشێك لەماڵی خۆیان دەفرۆشت و کاروباری خۆ و خێزانیان فەرامۆش دەکرد. ئەو ماوەیەی ژیانی خەڵکی بەغدا لەرابردوودا نموونەی نەبووە، لەناکاویش ئەو ژنە جوانەنیان بینی سك و سمتیان دەلەراندەوە. کاتێك نازیان دەکرد و هونەری فریودانیان بەشێوەیەکی سەیر بەکاردەهێنا، پیاوان سەریان دەسوراند وەك ئەوەی دونیایان لەسەر کاوڵ بووبێت. مەعروف رەسافی لەقەسیدەیەك ئاماژە بۆ ئەمە کردووە و دەڵێ:

أرى بغداد تسبح في الملاهي     وتبعث في الاوامر و النواهي[٣٦٣]

( واتە: بەغداد دەبینم لە مەلهاکان مەلە دەکات، بەشێوەیەك یاری بە باشە و خراپە دەکات – وەرگێڕ)

کاتێك جەنگی یەکەمی جیهان بەرپابوو، ئەوا یەکسەر سەماگەکان دامرکانەوە، خەڵك ئەو کات سەرقاڵی ئەو کارەساتە بوو کە بەسەریان هاتبوو. پیاوان وەك مێگەڵ بۆ جەنگ دەبران، زۆرێکیش لەوان دەڕۆیشتن و نەدەگەڕانەوە، بەتایبەتی

---

[٣٦٢] عبدالكريم العلاف (المصدر السابق) ص ١٢١
[٣٦٣] عبدالكريم العلاف (المصدر السابق) ص ١٢٣

ئەوانەی رەوانەی بەرەی قەفقاسیا کرابوون؛ لەسەرما و برسێتی لەناو دەچوون، بەمەش پرسە و کرۆزانەوە سەرتاسەری شارەکانی گرتەوە[٣٦٤].

هێشتا جەنگ کۆتایی نەهاتبوو، سەماگەکان سەرلەنوێ دەرگاکانیان کردەوە، وەك دەردەکەوێ هەڵاوسانی دراو لەدوای جەنگ هۆکارێك بوو بۆ بووژانەوەی سەماگەکان، ئەوانیش لەگەڵ ئەمە ژمارەیان زۆربوو، ئەمە بەشێوەیەکی تایبەت لە بەغدا و بەسرا دەرکەوت. خاوەن تیاترۆکان سەماکەریان لە سوریا و لوبنان و میسر هاوردە دەکرد، بەمەش کاغەزی دراو وەك باران دەڕژایە ژێر پێی سەماکەرەکان.

دەسەڵاتی داگیرکەر لەعێراق پارەیەکی زۆری بۆ خۆراکی سەربازەکان و دروستکردنی سەربازگە خەرج کردبوو، بۆیە گیرفانی زۆرێك لەخەڵکی شار پڕ بوو لەپارە، بەمەش ژمارەیەکی زۆر (دەوڵەمەندی جەنگ) لەنێویاندا دەرکەوت، هەندێك لەوان، لە مەلهاکاندا، کیسەی ئەو پارانەیان بەتاڵ دەکرد کە لەپڕێکدا دەستیان کەوتبوو.

ئەو سەماکەرەی لەدەرەوە دەهات، عێراقی بە کانگەی زێر دەزانی، ئەگەر ئەو جوان بووایە خاوەن لەشێکی سفت و خروخۆڵ بوایە، لەکاتی سەماکردنیش لەوروژاندنی شەهوەت شارەزا بوایە، ئەوا دەیتوانی زۆرێك لەپیاوان بخاتە داوای خۆی و دەست بەسەر هەموو شتێکیان بگرێت. بۆیە کاتێك سەماکەر دەچووە سەرتەختەی سەماکردن ئەوا بەپێی رێکەوت غەمزە و زەردەخەنەی بەسەر ئامادەبووان دەبەخشیەوە. بەمەش هەر یەکێك لەئامادەبووان وا هەستی دەکرد غەمزە وزەردەخەنە بۆ ئەوە، وا هەستی دەکرد ئەو جوانترین کەسە و لەهەموویان شیکتر و سەرنجراکێشترە، بۆیە دەبێت سەماکەرەکە کەوتبێتە داوای دڵداری ئەو لەبەر جوان و نازداریەکەی، هەر لەبەر ئەمەش دیاری پێشکەش دەکرد بۆ ئەوەی گڕی دڵداری لەدڵی سەماکەرەکە بەگوڕتر بکات.

---

[٣٦٤] ئەوەی شایەنی باسە حکومەتی عوسمانی بریار بەسەربازکردنی ئیجباری تەنها بۆ خەڵکی شار دەرکردبوو، خەڵکی هۆزەکانی لادێ و بەدووەکانی نەدەگرتەوە، ئەوانیش بەم بریارە زۆر سوودمەندبوون، دەیانتوانی بەرهەمی کشتوکاڵی و ئاژەڵی خۆیان بەگرانترین نرخ بفرۆشن، بەمەش بژێویان بووژایەوە، دواجاریش ئەنجامی سیاسی و ئابووری گرنگی هەبوو کاریگەرییەکی دواتر دەرکەوت– عەلی وەردی

شێوازی باو لەپێشکەشکردنی دیاری بۆ سەماکەر ئەوە بوو پیاوەکە بوتڵێک یان چەند بوتڵێك لە خواردنەوە هاوردە بەنرخەکانی بۆ دەکڕێ، دواتر سەماکەرەکە نرخی بوتڵەکانی لەگەڵ خاوەنی مەلهەکە دابەش دەکرد. زۆرێك لەخەڵك لەم پێناوەدا شەو لەدوای شەو پارەیەکی زۆریان خەرج کردووە. چەندین بەسەرهات لەو بارەیەوە هەیە گوایە کەسانێك سامانێکی زۆریان لەباوکیان بۆماوەتەوە کەچی هەموویان لە مەلهاکان سەرف کردووە، ماوەیەکی دوور نییە هەندێك لەشێخی هۆزەکان ئەوانەی تێکەڵ خەڵکی شاربوون لەم دیاردەیەدا لاسایی ئەوانیان دەکردەوە. لەوانەشە لەوانیان تێپەڕاندبێت. ئەوان سامان بەزەحمەتی جووتیار لەلادێ کۆدەکەنەوە و دواتر لەسەماکەرەکانی شاری خەرج دەکەن[٢٦٥].

ئەوەی جێگای سەرنجە هەندێك لە هەژاران، لاسایی دەوڵەمەندەکان دەکەنەوە، هەوڵ دەدەن دیاری پێشکەشی سەماکەرەکان بکەن، بۆیە زۆرجاریش لەهەوڵەکانیان تووشی نائومێدی دەبن. نزیکەی سی ساڵ لەمەوبەر لە مەلهای جەواهیری ڕووداوێکم بینی، ئێستا شایەنی باسکردنە. ئەوکات گۆرانبێژ سەلیمە موراد لەو مەلهایە کاری دەکرد، بە گۆرانی و زەردەخەنە سەرنجراکێشەکانی عەقڵی دەبرد. نانەوایەکی هەژار هەبوو هاموشۆی ئەو مەلهایەی دەکرد. شەوێکیان ویستی دیارییەك پێشکەشی سەلیمە بکات بۆ ئەوەی دڵی رابگرێت. پارەی ئەو نانەی فرۆشتبووی کۆی کردەوە و قەرزەکانیشی نەدایەوە، بۆیە چوار دیناری لەلا بوو، جا هاتە مەلها و بەکەشوفشەوە دانیشت وەك ئەوەی بیەوێ دونیا داگیر بکات. کاتێك سەلیمە هاتە سەر شانۆ بوتڵ لەهەموو لایەکەوە بۆی دەڕۆیشت، کابرای نانەواش یەك بوتڵی نارد هەر ئەوەندەشی هەبوو، بەداخەوە دیارییەکەی لەنێو دیارییەکان ون بوو، لەمەش تەنها زەردەخەنەیەکی ڕاگوزەری دەست کەوت کە هیچ شتێکی ئەوتۆ نەبوو، بۆیە کابرا بەحەسرەت و ئازارەوە دەگەڕێتەوە ماڵەوە لەبەر دۆڕانی سەروەتەکەی کە زەحمەت قەرەبوو دەکرێتەوە[٢٦٦].

---

[٢٦٥] علي الوردي (أسطورة الادب الرفيع ) ص ٣٧١-٣٧٢

[٢٦٦] جارێك وا ڕێکەوت لە مەلهایەك لەتەنیشت پیاوێکی سەرخۆش دانیشتبووم، پیاوەکە دیارییەکی بۆ سەماکەرەکە نارد، کەچی سەماکەرەکە وایزانی من ناردوومە، بۆیە چەند زەردەخەنەیەکی پێ بەخشیم ، کابرای سەرخۆش، ئەتۆ خۆش ! — عەلی وەردی

## پەیوەندی پیاو بە ئافرەتەوە:

مەزندەی ئەوە دەکەم ئەو بارودۆخەی لە مەلهاکانی عێراق هەیە هاوشێوەی لە مەلهای وڵاتانی دیکە نییە، ئەمەش روخسارێکی کپبوونی سێکسییە کە بەشێوەیەکی گشتی قورسایی خۆی خستۆتە سەر عێراق و بەتایبەتی شارەکانی . نابێت ئەوە لەبیر بکەین، عێراق ئەو وڵاتەیە کەدیاردەی کوشتنی پاککردنەوەی شەرەفی تێدا هەڵقوڵاوە، بەرادەیەك هاوشێوەی لەوڵاتانی دیکە کەمە. سەبارەت بە شارە گەورەکانیش کە ئەو نەریتەی تێدا لاواز بووە، ئەوا نەریتی دیکە شوێنی گرتۆتەوە لەوانە دەستەبەرکردنی ئافرەت و چاودێریکردن و فەرزکردنی حیجاب بەسەریەوە.

لەراستیدا حیجاب لەدێرزەمانەوە لە زۆرینەی وڵاتانی ئیسلامی بڵاوبۆتەوە، بەڵام لەو وڵاتانە کاریگەریە کۆمەڵایەتیەی بەمشێوەیە نەبووە کە لەعێراق هەیە. لەعێراق چەندین نەریتی توند هەیە دەستی ناوەتە ئەوکی ئافرەتانەوە، زێدەڕۆیی ناکەم ئەگەر بڵێم تەواوی ئەو نەریتانە رەگوریشەی لە نەریتی پاککردنەوەی شەرەف وەرگیراوە و هێشتا پارێزگاری لەماناکانی ئەم نەریتە دەکرێت.

ئەمەش وایکردووە ژنی عێراقی زۆر بەحەیا و شەرم بێت، لەوانەیە لەسەر ئەم بابەتە لەهەموو ژنانی جیهان توندتر بێت. ئەو زۆر لەپیاو دەترسێ، بۆیە لەهەڵسوکەوتیدا لەبەرامبەر پیاو زۆرتوندە، ئەوا دەزانێ ئەگەر نەرمی بنوێنێ و قسەیان لەگەڵ بکات و تێکەڵیان بێت، ئەوا گومان و قسەوقسەلۆکی لەسەر دەکرێت، ئەمەش بۆ ئەو دەبێتە هۆی مردنێکی خێرا یان شەرمەزارییەکی هەمیشەیی.

پیاوان لەعێراق لەگەڵ ئەو توند و داخراویەی ژنان راهاتوون، پیاو پێشبینی دەکات ژن لەبەرامبەری سارودسڕ بێت چاوی لەبەرامبەری دابخات و هەرگیز زەردەخەنەی بۆ نەکات. کاتێك بینی یەکێك لەژنەکان نەرمی دەنوێنێ و زەردەخەنەی بۆ دەکات ئەوا وا دەزانێ دڵداری بەسەر دڵی ژنەکە زاڵبووە، بەشێوەیەك شەیدا بووە بایەخ بە قسەوقسەلۆکی رەقیب و سەرزەنشتکاران ناکات. لەوانەیە راست بێت ئەگەر بڵێن پیاوی عێراق لەبەردەم ژنان لاواز بووە،

ئەگەر ژنێك بیەوێ تەفرەی بدات ئەوا بە ناز ونوزێك دەتوانێ عەقڵی ببات و بەسەری زاڵ بێت، بێئەوەی توانای بەرگرکردنی فیروودانی هەبێت.

نکۆڵی لەوە ناکەین لاوازیی لەبەرامبەر ژنان لەلای هەموو پیاوانی دونیا هەیە، لەمەش کەسێك جیاناکەینەوە تەنها ئەوانە نەبێت کە لادانی سروشتیان هەیە، بەڵام ئەم لاوازییەش لەڕووی توندیەوە بەپێی بارودۆخی دەوروبەر دەگۆڕێت. زۆری ئەو لاوازییەکان لەلای خەڵکی شارەکانی عێراق بینی لەکاتی سەردانی مەزارگەکان و ئاهەنگەکان، هەروەها لەسەماگەکانیش تێبینی هەمان لاوازیمان کرد، لەوانەشە لەبواری دیکەش بتوانین تێبینی بکەین. پیاوی عێراقی هەرکە چاوی بەژنێك یان کۆمەڵە ژنێك دەکەوێ، ژنێکیش کە سەیری دەکات ئەوا هەست بەشانازی دەکات و جوڵەی دەگۆڕێت و بەقسە خۆی هەڵدەکێشێ، لەوانەیە نوکتەی کرچ وکاڵ بەدوای یەك بڵێت، ئەگەر بینی ژنێك بەنوکتەکانی پێدەکەنێ ئەوا دونیای بەبەرچاوی لێڵ دەبێت وکرچوکاڵی و خۆهەڵکێشی زیاتر دەبێت، ئەو وا دەزانێ بەسەر عەقڵی ژنەکە زاڵبووە، ناشزانێ ژنە عەقڵی ئەوی بردووە. ئەم لەدۆڵێك و ئەویش لەدۆڵێکی دیکە!

## هاوسەنگی کۆمەڵایەتی لەشارەکاندا:

لەم بەشەدا باسمان لەهەندێك لە رواڵەتەکانی بەدئاکاری کرد لەشارەکانی عێراقدا. لەوانەیە یەکێك رووبەڕوومان بێتەوە بڵێ ئێمە زێدەڕۆییمان لەو بابەتە کردووە، تەنها ئاکارە خراپەکانی خەڵکی شارمان کردووە، بێئەوەی باسی رەوشتە بەرزەکانیان بکەین.

ئەمە رەخنەیەکی بەجێیە. لەراستیدا هەموو کۆمەڵگای مرۆیی هەرچەندە بەدڕەوشت بێت لەهەندێك لایەنەوە، ئەوا دەبێت لایەنی چاکەشی تێدا بێت، بۆ ئەوەی هاوسەنگی کۆمەڵایەتی تێدا بەدی بێت، ئەگەریش ناهاوسەنگی هەبوو ئەوا چارەنووسەکەی بەرەو لەناوچوون دەچێت جا زوو یان درەنگ.

بەهەرحاڵ دەبێت ئیعتراف بەوە بکەین، شارەکانی عێراق خاڵی نییە لەخەسڵەتی چاك، وەك گیانی دراوسێ، هاریکاری خێزانی، جوامێریی، بەفریاکەوتن، چەندین خەسڵەتی دیکە. وەك لەبەشێکی پێشوودا ئاماژەمان بۆ کرد، ئەو خەسڵەتانە

خەڵکی شار لەبیابانئشینی وەرگیراوە، خەڵکی شار هەوڵیان داوە بەپێی هەلی رەخساوی شارستانیان پارێزگاری لێ بکەن. بەڵام پرسیارێك کە لێرەدا دێتەپێشەوە ئەوەیە: ئایا تەنها بەو خەسڵەتانە دەتوانرێت هاوسەنگی بۆ ئەو بەدرەوشتیانە بکرێت کە لە نێویان باوە؟

وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە قورسە، چونکە ملکەچی چەندین بۆچوونی جیاواز دەبێت. ئەگەر پێی تیۆری ئیبن خەلدون بێت، ئەوا دەڵێین هاوسەنگی کۆمەڵایەتی زیاتر بەلای بەدرەفتارییە نەوەك لایەنی چاکەخوازی. بە بۆچوونی ئیبن خەلدون بەدرەفتاری لەشارەکان نیشانەی دەرکەوتنی بەدرەفتاریە لە سیستەمی کۆمەڵایەتی و بەڵگەیە بۆ نزیکبوونەوەی کۆمەڵگاکە لە لەدارووخان ولەناوچوون[٣٦٧].

بەڵام کاتێك گوێبیستی لەبەساڵاچووانی نەوەی رابردوو دەبین، دەبینین ئەوان بۆ پێچەوانەکەی تیۆری ئیبن خەلدون دەچن، چونکە پێیانوایە شارەکانی عێراق لەسەردەمی عوسمانی پڕبووە لە ئاکاری چاك، پیاو ئەوکات بەمانای وشەکە پیاو بووە، پابەند دەبوون بەبەڵێنیان، دراوسێیان دەپاراست، کەسێك خۆی دەخیل دەکردن ئەوا پارێزگاریان لێ دەکرد، لەناخۆشیدا خۆیان فیدای خەڵك دەکرد.

بۆئەوەی لە سروشتی هاوسەنگی کۆمەڵایەتی لەشارەکانی عێراق تێبگەین، ئەوا تاوتوێی کەسێتی شەقاوەکان دەکەن. ئەوانە بەها کۆمەڵاتیەکانیان بەباش وخراپەوە دەنواند. شەقاوەکان لەزۆربەی کات پیشەیان دزی بوو، شانازیان بە پیاوکوژی و دەستدرێژی دەکرد، کەچی لەهەمان کات خاوەن خەسڵەتی پیاوەتی وشەهامەتیەکی بێ وێنەبوون، چونکە ئەوان پارێزگاریان لەخەڵکی گەڕەکی خۆیان دەکرد و بەرگریان لێ دەکردن، هیچ شتێکیان لەگەڕەکی خۆیان نەدەدزی. ئەگەر کەسێك هانای بۆ دەبردن ئەوا دەستیان بۆ سمێڵ دەبرد و بۆ شوێنی فریاکەوتنەکە دەچوون و باکیان بەمەترسی نەبوو.

چیرۆکی زۆر هەیە لەبارەی چاکەی شەقاوەکان، هێشتا خەڵکی شارەکان دەیگێڕنەوە. بۆ نموونە دەگوترێت : شەوێکیان دزێك دەچێتە سەرماڵێك، لەکاتی

[٣٦٧] ابن خلدون (المصدر السابق) ج٣، ص ٨٧٦-٨٧٧

دزیکردن بێ ئاگا تامی خوێ دەکات، کاتێك درك بەسروشتی کارەکەی دەکات ئەوا ماڵەکە بەجێدەهێڵێت وهیچ نادزێ، چونکە نمەکی ماڵەکەی کردووە، بەمەش پەیوەندی (الزاد و الملح: نان و خوێ) ی بۆدروست دەبێت وەك عەرەب دەڵێن، جا نابێت دەستدرێژیان بکاتە سەر و دزیان لێ بکات، بەڵکو دەبێت پارێزگاریان لێ بکات.

هەر لەسەر ئەم بابەتە چیرۆکێکی دیکە هەیە، زۆرجار لە نەوەی کۆنم بیستوە باسی دەکەن. گوایە کۆمەڵە دزێك شەوێکیان دەچنە سەر ماڵێك، دەست دەکەن بەکۆکردنەوەی هەندێك قاپ وقاچاخ و کەلوپەلی ناو ماڵ، خاتوونی ماڵ هەستیان پێدەکات و دەترسێ. کوڕەکەی لەخەو هەڵدەستێنێ و دەڵێ" هەستە هاوکاری خاڵەکانت بکە". سەردەستەی دزەکان گوێی لەو قسەیە دەبێت فرمان بەهاوڕییەکانی دەکات شتە دزراوەکان جێبهێڵن. ئەوان بوون بە برای ژنەکە و خاڵی منداڵەکە، لەڕێسای غیرەت و پیاوەتی رێگە بەوە نادرێت پیاو خوشك و خوشکەزاکەی تاڵان بکات.

ئەو چیرۆکانە وێنەی سروشتی ئەو هاوسەنگە کۆمەڵایەتیەمان بۆ دەکێشێ کە ئەو کات لە شارەکان باوبووە. خەڵك رێزیان لەشەقاوەی دز دەگرت بەمەرجێك خاوەن شەهامەت و پیاوەتی بێت، دوای ئەمەش بایەخیان بەوە نەدەدا و هەڵدەکوتێتە سەرماڵان و خەڵك دەترسێنێ. رەنگە ئەمەش بەبەڵگی ئازایەتی و بەهێزی ئەو بزانن.

دەکرێت بڵێین شەقاوە بووە نموونەیەك لەچاوی خەڵکی شار، پێگەیەکی بەرێزیان هەبوو، بۆیە خەڵکەکە خۆیان بە شەقاوە شوبهاندووە بۆئەوەی ئەو پێگەیە بەدەست بهێنن کەئەوان بەدەستیان هێناوە. دەگێڕنەوە هەندێك دەوڵەمەند هەبوون، هەندێك شەو دەچوونەسەر ماڵان، مەبەستی ئەوان دزی نەبوو، بەڵکو دەیانویست توانای خۆیان لەئازایی و شەقاوەیی دەربخەن.

وەك دەردەکەوێت ئەو بەها کۆمەڵایەتیە هێشتا بەسەر زۆرێك لە دانیشتوانی شارەکانی عێراق زاڵە، بەتایبەتی لەلای خەڵکی عەوامەوە. ئەوان لەمنداڵییەوە لەسەری راهاتوون، دەبینین باوانیان پەیڕەوی دەکەن و بەمەزنی دەزانن، هێشتا

پابەندن بەم بەهایەوە سەرەڕای گۆڕانی بارودۆخەکە. ئەوان هێشتا ڕێز لە (شێر)ی ترسناک دەگرن، ڕقیان لە لوسکەڵەی ملکەچی دەبێتەوە، بۆیە ئەوەی هەڵسوکەوتیان لەگەڵ دەکات، دەبێت لەمە بگات، بۆئەوەی لەگەڵیان سەرکەوتوو بێت.

ئەگەر تۆ بتەوێ رووبەرووی یەکێکیان ببیتەوە یان هەوڵ بدەی لەشتێك بەسەری زاڵ بیت، ئەوا دەبینی ئەو دەبێتە کەسێکی دڵرەق و توند و بەزەبر، بەڵام هەرکە کوشکێشیت لەبەرامبەر کرد، لەگەڵی نەرمونیان بیت، هانای بۆ بەریت ئەوا دەبێتە کەسێکی دیکە، ئەوکاتە جوامێر و بەخشندە دەبێت، بەهەموو کۆششی خۆی هاوکاریت دەکات. ئەمە لەکاتی قەرەباڵغی چوونەژوورەوەی شوێنێك یان لەرێگاوبان تێبینی دەکرێت، ئەگەر بتەوێ پێش یەکێك بکەویت، ئەوا بەتوندی لەدژت دەوەستێتەوە، لەوانەیە بتخاتە سەرزەوی و بەسەرت کەوێ، بەڵام ئەگەر وتت (فەرموو) ئەوا خێرا دەڵێ" فەرموو" دەیەوێ پێش ئەو بڕۆیت، لەمەش بەقەد تۆ پێداگری دەکات.

زۆر زەحمەتە رێسای رەوەستان لەرێزێکی درێژ جێبەجێ بکەن لەکاتی قەرەباڵغیدا، وەك ئەوەی لەوڵاتانی دیکە روو دەدات. ئەگەرهاتوو رێسایەکی وەهایان بەسەر فەرز بکرێت، ئەوا هەندێکیان لەرێز دەردەچن وهەوڵ دەدەن بەر لەکەسانی دیکە بگەنە پێشەوە، شانازیش بەمە دەکەن و بەنیشانەی هێز و زاڵبوونی دەزانن، لەوانەشە پاراستنی رێساکە بەجۆرێك لەلاوازی و بێدەسەڵاتی بزانن.

ئەوەی تێبینی دەکرێت شەڕ ودەمەقاڵێ لەکاتی قەرەباڵغی شوێنێك، لەنێوانیان دروست دەبێت. زۆرجار شەڕی نێوانیان بەهۆی شتێکی هیچ وپووچ دەبێت، دەکرێت بەو وشەیەکی سادە بەپۆزش وداوای لێبوردن تێپەرێت. لەراستیدا وشەی لێبوردن لەنێو ئەوان بڵاونەبووتەوە بەم نزیکانە نەبێت، تەنانەت هەندێکیان نایانەوێ ئەم وشەیە دەربڕن، لەتێڕوانینی ئەوان مانای بەدکاری و کەم پیاوەتییە، بۆیە کاتێك ببینی کەسێك پێشی دەگرێت یان بەرئەو دەکەوێت ئەوا بەتوڕەیی هاوار دەکات" ئایا کوێر بوویت!" کەسەکەش بەوشەیەکی توندتر

وەڵامی دەداتەوە، دواجار شەڕەکە بەهەڵکێشانی خەنجەر و خوێنڕشتن کۆتایی دێت، زۆرێکیش لەئامادەبوون بە پاڵنەری دەمارگیری و فریاکەوتنی یەکتر لەشەڕەکە بەشدار دەبن.

شایەنی باسە هێشتا رووخۆشی نێوان خەڵکی شارەکان هەندێك لەماناکانی خۆی لە شەقاوەیی کۆن وەرگرتووە. تۆ ئەگەر بەلای یەکێك تێپەڕیت و سلاوێکی گەرمت لێکرد، ئەوا بەسلاوێکی گەرمت وەلامت دەداتەوە و دەڵێ" مەرحەبا لەتۆش باوکی فلان" . بەلام ئەگەر لەگەڵی لووتبەرز بووی پێشبینی بکەی ئەو زووتر سلاوت لێ بکات، ئەوا شتێکت لەو دەست ناکەوێ، رق و رووگرژی نەبێت.

پێشتر باسی ئەوەمان کرد زۆرێك لەخەڵکی شار رێز لە مرۆڤی خۆبەزلزان دەگرن ورقیشیان لێ دەبێتەوە. وەك دیارە رێگایەکی مامناوەندی هەیە، مرۆڤ دەتوانێ بەو رێگایە رێز و خۆشەویستی ئەوان بەدەست بهێنێ، ئەمیش ئەوەیە تۆزێك بەدانایی خۆی لەوان بەگەورەتر بزانێت و بەو بڕەی کە لەگەڵیان سادە دەبێت، واتە دەبێت لێیان دوور بێت، لەهەمان کاتدا لێیان نزیك بێت. مرۆ دەبێت درك بە پاڵنەرەکانی بیابانشینی و شارستانی ئەوان بکات و رەچاوی ئەوەیان بکات کە لەگەڵی دەگونجێت.

بەهەرحاڵ ئەمەش بابەتێکی ئەستەمە، بەلام پێویستە بۆ کەسێك بیەوێ لەعێراق بژی و تێیدا سەرکەوتوو بێت!.

# بەشی سێزدەم

## سروشتی قۆناغی ئێستا

تەواوی لێکۆڵینەوەکەمان لەبەشەکانی رابردوودا، لەبارەی ئەو بارودۆخە کۆمەڵایەتیە بوو کە لەعێراقی سەردەمی عوسمانییەکان زاڵ بووە، ئێستاش دەمانەوێ لەدوایین بەش، تاوتوێی هەندێك رواڵەتی قۆناغی ئێستا بکەین لەعێراق دوای نەمانی سەردەمی عوسمانییەکان.

لەراستیدا بۆ تاوتوێکردنی قۆناغی ئێستا تەنها بەشێك بەس نییە، چونکە قۆناغێکی کۆمەڵایەتی زۆر گرنگە، لەوانەیە گرنگترین قۆناغ بێت کە عێراق بەدرێژایی مێژووە دوورودرێژەکەی پێیدا تێپەڕبووبێت، بۆیە بەوردی لەکتێبی داهاتوودا باسی دەکەین، کەچی ئێستا هەندێك هێڵی گشتی دەردەخەین کە ئەم قۆناغەی ئێستای پێ دەناسرێتەوە، ئەمەش بۆ ئەوەی لەزەینی خوێنەردا وێنەیەکی گشتی کۆمەڵگای عێراق تەواو بێت لەمیانەی گەشەککردنی لەرابردوو وئێستادا.

**کاریگەری جەنگی یەکەمی جیهان:**

دروستە ئەگەر بڵێین جەنگی یەکەمی جیهان گەورەترین رووداوی کۆمەڵایەتیە لە مێژووی عێراقی نوێدا. ئەم جەنگە وەك خاڵێ وەرچەرخانە، بەشێوەیەك چەندین ئاسۆی نوێ بەبەرچاوی عێراقییەکان کرایەوە پێشتر نەیاندەناسی. عێراق لەسەردەمی عوسمانیەکان لە نیمچە دابڕانێکی کۆمەڵایەتی دەژیا. خەڵك بەشێکی کەمیان نەبێت، ئەگینا هیچیان لەبارەی شارستانیەتی نوێ و رووداوەکانی جیهانی دەرەوە نەدەزانێ؛ ئەویش زانیاریەکی زۆر کەم نەبێت. دواتر شارستانیەتی نوێ بەکاریگەری جەنگەوە بۆ عێراق هات، هاتنیشی بە برێکی زۆر توند بوو، کە بووە هۆی گۆڕانێکی توند لە ئاستێکی فراوانی عێراق.

دەکرێت لەم لایەنەوە کۆمەڵگای عێراقی بە کەسێکی خەوتوو بچووێنین، کاتێك ئەو کەسە بێدار دەبێتەوە رووداوی سەیر دەبینی کەپێشتر نەیبینیوە، بۆیە سەرەتا هەموو جەستەی دەهەژێ و سەرسام و تووشی شۆك دەبێت. کۆمەڵگای عێراق پێشتر بە بەشی خۆی رازی بوو، دڵنیابوو لە دروستی خۆی، وەك ئەوە بوو غەیری خۆی هیچ نەناسێ، بەڵام لە ناکاو هەندێك بابەتی بۆهات لێی رانەهاتووە، بەمەش تووشی ململانێی دروونی وکۆمەڵایەتی بوو، ئێستاشی لەگەڵدابێت بەدەست ئەم ململانێیەوە دەناڵێنێ، تا ماوەیەکی درێژخایەنیش دەناڵێنێ.

بەرەنگاربوونەوەی شارستانیەت:

بەشێوەیەکی گشتی یەکێك لەخەسڵەتەکانی کۆمەڵگای مرۆیی ئەوەیە مەیلی بەلای بەرەنگاربونەوەی بۆ روودانی هەر گۆڕانێکی دژەباو هەیە. ئەمەش لەهەموو کۆمەڵگاکان تێبینی دەکرێت بە پێشکەوتوو وداڕووخاوەوە. ئەمەش لە کۆمەڵناسی بە ( بەردەوامی کولتوری: cultural inertia) ناودەبرێت . لەوانەشە هەر کۆمەڵگایەك بەپێی جیاوازی بارودۆخەکەی ئەم بەرەنگارەبوونەوەی توند یان لاواز دەبێت.

وەك دەردەکەوێت بەرەنگاربوونەوەی شارستانیەتی نوێ لە عێراقدا زۆر توندە، لەوانەشە بتوانین توندی ئەم بەرەنگاربوونەوەیە بۆ چەندین هۆکار بگێرینەوە لەوانە:

یەکەم: عێراق بەر لەهاتنی شارستانیەتی نوێ لە نیمچە دابڕانێکی کۆمەڵایەتی دەژیا، وەك پێشتریش باسمان کرد. سروشتی دابڕانی کۆمەڵایەتی ئەوەیە وا لەخەڵك دەکات بەتوندی دەست بەنەریتە کۆنەکانیان بگرن و ترسیان لەروودانی هەر گۆڕانکارییەك هەبێ. ئەگەرهاتوو گۆڕانکاری روویدا، ئەوا وا هەست دەکەن هەڕەشە بێت لەو پیرۆزیانەی کە ئەوان ماوەیەکی درێژە لەگەڵیان ئاسوودەن، ئەوا دەبینین بە پەرۆشی و بە توندی بەرگری لە نەریتەکانی خۆیان دەکەن.

دووەم: وەك باسمان کرد هاتنی شارستانیەت بۆ عێراق لە ناکاو بوو. سەرباری ئەمەش شارستانیەتەکە بەشێوەیەکی زۆر پێشکەوتوو هات، زۆر داهێنراوی سەیر و سیستەمی تێدا بوو، عەقڵی مرۆڤی دەبرد. ئەمەش دەتوانێ کاردانەوەیەکی توند

لەبەرامبەر شارستانیەتەکە دروست بکات، ئەگەر ئەو شارستانیەتە بەشێوەیەکی هێواش وپلە بەپلە دەهات، هاوشێوەی ئەوەی لە هەندێك ولآتانی عەرەبی وەك لوبنان ومیسر روویدا، ئەوا لەوانەیە کاردانەوەکە کاریگەری کەمتر دەبوو.

سێیەم: هاتنی شارستانیەت بۆ عێراق یاوەر بوو لەگەڵ داگیرکاری ئینگلیزەوە، ئەمەش کاریگەریەکی زۆر لەسەر دەروونی خەڵکەکە هەبوو، لەوانەشە ئەو هۆکارە کاریگەری لەهەر دوو هۆکارەکەی پێشوو زیاتر بێت، بۆیە شایەنی ئەوەیە تۆزێك وردتر قسەی لەسەر بکەین.

لەو بروایەدام زۆرێك لەخەڵکی عێراق شارستانیەتی نوێیان بەدەستکردی ئینگلیز و هاوشێوە (کافرەکانی) دەزانی، کەواتە دەبێت پێچەوانەی ئایینی ئەوان بێت و روخێنەری ئاین بێت. بێگومان هەرچەندە ئەمە بۆچوونێکی ساویلکانەیە، بەلام بەسەر عەقڵی عەوام وهەندێك لە پیاوانی ئایینی زاڵبووە. ئەوان وا سەیری ئەو شارستانیەتەیان کرد، ئینگلیز لەکاتی داگیرکردن لەگەڵ خۆیان هەڵگرتووە، بۆیە خەیاڵی ئەوەیان کرد ئینگلیز و شارستانیەت یەك شت بێت و ناکرێت لەیەکتر جیابکرێنەوە، لەبەر ئەمەش هەستیان بەوە کرد ئەرکێکی ئایینی ئەوەیە بە بەرەنگاربوونەوە بەسەر هەردووکیان زاڵ بن.

پروپاگەندەی عوسمانی لەکاتی جەنگ، بۆ خەڵك جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە، ئینگلیز هاتووە خەلافەت و ئیسلام لەناوبەرێت، خەڵکی عێراقیش بەو پروپاگەندەیە کاریگەربوون، پیاوانی ئایینی فەتوای جیهادیان دا و بەپێویستی زانی شەڕی (کافران) بکرێت، بۆئەوەی دەست بەسەر ولآت دانەگرن و ئایینەکە تێکنەدەن، زۆرێك لەخەڵکی شار و هۆزەکان خۆبەخشانە چوونە جەنگ بۆ ئەوەی بەرگری لەئایینی خۆیان بکەن و لەپێناو خودا بجەنگن.....

مەزندەی ئەوە دەکەین ئەم پروپاگەندەیەی عوسمانی دوای ماوەیەکی زۆریش لەنەمانی دەوڵەتی عوسمانی کاریگەری بەسەرخەڵکەوە مابێت، رۆڵێکی کاراشی هەبووە لەزیادبوونی بەرەنگاربوونەوەی شارستانیەتی نوێ. ئەو کەسەی شتێکی لە شارستانیەتی نوێ وەرگرتبێ لەتێروانینی زۆرێك لەعێراقییەکان وهەندێك

لەپیاوانی ئایینی بەدەرچوو لەئایین دادەنرا و بەهاوشێوەی کافران دادەنرا. ئەم کاتەش ئەو بنەمایە لەلای ئەوان باو بوو کە دەڵێ" هاوشێوەبوونی کافر حەرامە".

**ماوەی دوای جەنگ:**

ماوەی دوای جەنگی یەکەمی جیهان، لەهەموو روویەکەوە ماوەیەکی پڕ هەرا بوو. لە دیارترین رووخساری ئەو ماوەیە ئەوەبوو، هەموو شتێکی شارستانیەتی تێدا حەرام کرا، هەر لە بیرکردنەوە بگرە تا نەریت و جلوبەرگ. زۆرێك لەخەڵکی عەوام بەتیلەی چاوی تورەیی سەیری هەرشتێکی نوێیان دەکرد تەنانەت ئەگەر رەوا و بەسوودیش بووایە، بۆیە چوونە قوتابخانە حەرام بوو، خوێندنەوەی رۆژنامە حەرام بوو، فێربوونی هەر زمانێکی ئەوروپی حەرام بوو. هەروەها لە سەرنانی کلاو، خواردن بەکەوچك و لەوانەیە دانیشتن لەسەر کورسیشیان بەحەرام زانیوە، چەندین شتی دیکەیان حەرام کردبوو کە ناژمێردرێن.

برادەرێك بۆی گێرامەوە، لە رۆژانی گەنجێتیدا بەنهێنی رۆژنامەی خوێندۆتەوە، لەژێر عەباکەی شاردۆتەوە بۆ ئەوەی خەڵك نەیبینێ، دواتریش لەگەڵ کۆمەڵێك هاوڕێی لەماڵێك کۆبوونەتەوە بۆ ئەوەی رۆژنامە بخوێننەوە. نزیکەی چل ساڵ لەمەوبەر خۆم پیاوێکم لەخەڵکی عەوام بینی، هێرشی دەکردە سەر یەکێکی دیکە لەبەر ئەوەی وتویەتی باران لە هەڵم دروست دەبێت، لەو رۆژگاریشدا کتێبێك دەرچوو بەناونیشانی ( **السيف البتار على الكفار الذين يقولون المطر من البخار**) (واتە: شمشێری تیژ بۆ ئەو کافرانەی دەڵێن باران لەهەڵمە).

شایەنی باسە هەموو خەڵك بەمشێوەیە نەبووە، دەبێت لەبەرامبەر ئەو جەماوەرە زۆرەی خەڵك کەمینەیەك هەبێت پەرۆشی شارستانیەتی نوێ بێت و بانگەشەی بۆ بکات، لەم کاتەشدا دەبێت مشتومڕ وململانێ لەنێوان ئەو دوو گروپە دروست بێت. ململانێی نێوان موحافیزکاران و نوێخوازەکان لە بارودۆخێکی هاوشێوەی ئەوەی عێراق پێی تێپەڕبووە دیاردەیەکی کۆمەڵایەتیەو رووداني حەتمیە، بەڵام دەتوانم بڵێم ئەو ململانێیەی لەعێراق روویدا زۆر توند بوو، هەردوو لا توندڕەویان کرد ئەمەش چەندین ئەنجامی نەخوازراوی لەرووی فیکری و کۆمەڵایەتی لێکەوتەوە.

موحافیزکاران لەئەنجامی توندڕەوی خۆیان کەوتنە کۆمەڵێك هەڵەوە، نوێخوازەکانیش لەلایەن خۆیانەوە کۆمەڵێك هەڵەیان ئەنجام دا، دواجار هەقیقەتی مامناوەندی لەنێوان ئەملا و ئەولا ون بوو.

**کێشەی موحافیزکارەکان:**

کێشەی ئەو موحافیزکارانەی بەرەنگاری شارستانیەتی نوێ بوونەوە، ئەوە بوو نەیانتوانی بۆ ماوەیەکی زۆر لەسەر بەرەنگاربوونەوە بەردەوام بن. شارستانیەتەکە سەرنجراکێش ودلگیرە، بۆیە بینیمان ئەوەی بەرەنگاری بوونەوە خێرا بەرەوپیری رۆیشتن، جا چۆن پێشتر حەرامیان دەکرد، وەهاش وەریان دەگرت، ئەوان لە ماوەیەکی کورتدا دژی خۆیان وەستانەوە بێئەوەی هەست بکەن.

با بابەتی سفور وحیجاب بە نموونە وەربگرین. لەساڵی ١٩٢٤ لەعێراق هەرایەکی گەورە لەسەر ئەم بابەتە دروست بوو، تێیدا دەستەبژێری بیرمەندان بەشدار بوو، هەروەها خەڵکی عەوامیش لەو هەرایە بەشدار بوو، تەنانەت عەوام ئامادەبوون هێرش بکەنە سەر هەر کەسێك بانگەشە بۆ سفور بکات، چونکە بە کافریان دەزانی، گوایە دەیەوێ ئاکار وئایینی خەڵك تێك بدات، زۆرێك لە خوێندەواران پاڵپشتی خەڵکی عەوامیان دەکرد، کەچی ئەوانەی بانگەشەیان بۆ سفور دەکرد ئەوا ژمارەیان زۆر کەم بوو، زۆربەشیان لەئەفەندییە گەنجەکان بوون. ماوەیەك لەمەوبەر پرسیارم لەبارەی رووداوەکانی ئەوکات لەیەکێك لەو ئەفەندیە کرد کە چی روویداوە؟ ئێستا ئەو پیرێکی بەساڵاچووە، باسی ئەوەی بۆ گێرامەوە هەوڵی لێدانی دراوە کۆمەڵێك خەڵکی ئاست نزم لەسەر ئەوە رێکەوتوون و لە رێگاکان بەدوای گەڕاون، لەخۆشبەختی ئەو نەیاندۆزیوەتەوە، بەڵکو پیاوێکی هاوشێوەیان دۆزیوەتەوە، زۆریان لێداوە و سوکایەتیان پێکردووە....

زۆرینەی ئەو کەسانەی بانگەشەی حیجابان دەکرد لە خەڵکی عەوام بوون، دەگێڕنەوە یەکێك لەوان وتارێکی لەرۆژنامەیەکی بەغدا نووسیوە و وتویەتی" سفور دروستکراوی رۆژهەلاتناسەکانە ئەوانەی دەیانەوێ بە سفور رەوشت تێك بدەن". یەکێکی دیکە بەپرسیارکردنەوە دەڵێ:" چۆن دەبێت سفور لەوڵاتێکی

وەك وڵاتی ئێمەی ئیسلام بڵاوبێتەوە، ئیسلام فرمان دەکات ژن لەماڵەوە بێت و وەك جاهیلیەت خۆی دەرنەخات ".

ئەوەی جێگای سەرنجە زۆرێك لەوانەی ئەو جۆرە قسانەیان لەبارەی سفورەوە کردووە، کوێرانە دژایەتیان کردووە، ژیانیان هێندە بوو تا کچەکانی خۆیان بە سفوری بینی. لەراستیدا سفور لەنێو ماڵ و ژنانی ئەوانیش دەرکەوت وەك چۆن لەماڵی خەڵکانی دیکە هەبوو. ئەوان کەوتە بەر تەوژمی شارستانیەت بۆیە وایان لێهات رێگە بەو شتانە بدەن کەپێشتر رەتیان دەکردەوە. ئەمەش کێشەی زۆربەی موحافزکارەکانە لەسەرتاسەری جیهان، وەك دەریشکەوت لەعێراق ئەم کێشەیان لەوڵاتانی دیکە زیاتر بووە، چونکە ئەوماوەیەی لەنێوان دوو هەڵوێستەکەیان هەبوو زۆر کورت بوو، ئەمەش وایکرد بکەونە هەڵوێستی شەرمەزاریان، پاساو هێنانەوە بۆیان ئەستەم بوو.

**مەسەلەی کاری حکومی :**

بابەتێکی دیکە هەیە کێشەی موحافیزکارەکانی بەشێوەیەکی توندتر لە مەسەلەی حیجاب تێدا بەدەرکەوت، ئەویش بابەتی کاری وەزیفە بوو لە حکومەتدا. لەراستیدا ئەو مەسەلەیە گرنگیەکی کۆمەڵایەتی زۆری هەیە لە روودانی هەندێك رواڵەتی ئەو ململانێیە دەروونی وکۆمەڵایەتیەی لەقۆناغی ئێستادا گەلی عێراق بەدەستیەوە دەناڵێنێ.

کاری فەرمانبەری لەسەردەمی عوسمانیەکان لە لایەن چینێکی دیاریکراو قورخ کرابوو، ئەویش چینی ئەفەندییەکان بوو، ئەو چینە پێگەیەکی کۆمەڵایەتی بەرزی هەبوو، وەك لەبەشێکی پێشوودا باسمان کرد. کاتێك دەوڵەتی عێراقی لەدوای جەنگی یەکەمی جیهان دانرا، گۆرانکاری لە کار و وەزیفەی حکومی روویدا. ئینگلیز ئەوکات هەوڵی دا حکومەتی عێراقی بکاتە رووکەشێك لەداوەوەدا خۆیان حوکمران بن، لەبەر ئەمەش هەموو دەرگاکانیان لەبەرامبەر دانیشتوان کردەوە بەهەموو چین وتوێژەکانەوە، بۆ ئەمەش دەستیانکرد بە راکێشانی خانەدان وخوێندەوار بۆ چوونە ناو حکومەت بۆ ئەوەی پاڵپشتی ئەو سیستەمە حکومرانیە نوێیە بکەن کە خۆیان بونیادیان ناوە.

وەزیفەکانیش سەرنجراکێش بوون و دەسەلات و مووچەی زامنی تێدابوو، بەلام هەندێک لە پیاوانی ئایینی تەحریمیان کرد و وەزیفەیان بەهاریکاری کافران زانی، لێرەشەوە ململانێیەکی دەروونی لەلای هەندێک خەڵک دروست بوو، کەوتنە ناو دوو باڵەری دژبەیەکتر: یەکێکیان هانیان دەدات بۆ قبوڵکردنی وەزیفە و ئەویتریش رێگریان لێ دەکات.

ئەو ململانێیە لەسەرەتادا لاواز بوو، کاتێک بازارەکان برەویان هەبوو، پیشەگەری قازانجی بەدەست دەهێنا، بەلام چەند ساڵێک تێپەڕنەبوو تا بێ بازاری شوێنی برەوی گرتەوە، پیشە دەستیەکانیش ل ەبەردەم کەلوپەلی هاوردە بەرەو نەمان دەچوو، بەمەش خەڵک روویان کردە وەزیفە حکومیەکان سەرەڕای تەحریمکردنی، تەنانەت ئەوانەی لەسەرەتادا وەزیفەیان رەتکردەوە، لەکارەکەی خۆیان پەشیمان بوونەوە و گلەییان لەیەکتر دەکرد.

لەکاتی دامەزرانی حکومەتی عێراقی، وەزیفەی باش لەبەردەستی هەرکەسێک بوو ئەگەر شتێکی لەخوێندنەوە ونووسین دەزانی، دواتر بەرە بەرە زەحمەت بوو. هەرکە خەڵک زیاتر روویان تێدەکرد، ئەوا بەدەستهێنانی کاری وەزیفە زەحمەتتر دەبوو، کاتێکیش قەیرانە گەورەکەی ئابووری لەساڵی ١٩٢٩ وساڵانی دواتر هات، ئەوا وەزیفەی حکومەت ببوە خەونێکی دوور، تەنها ئەو کەسانە بەدەستیان دەهێنا کە خاوەن شانسێکی مەزن بوون.

زۆرێک لەخەڵک ئارەقەیان دەرشت بۆ بەدەسهێنانی وەزیفەیەکی نزم، تەنها بەماندووبوون دەستیان دەکەوت، لێرەوە فەرمانبەرانی پێشوو لوتیان بەرز بوو، خەڵکیش بۆ واسیتە و کاری تایبەتی خۆیان پەنایان بۆ دەبردن وماستاوچیەتیان بۆ دەکردن.

پیاوێک خانەدانی کازمەیە دەناسم لەسەرەتای دامەزراندنی حکومەتی عێراقی بوو بە وەزیر، بایەخی بەو حەرامکردنە نەدا کە پیاوانی ئایینی رایانگەیاندبوو، لەئەنجامی ئەمەش خەڵک جنێویان پێدەدا و نکۆڵیان لێ دەکرد، تەنانەت هەندێک رووبەرووی بوونەوە رێگەیان نەدەدا بچێتە(سەحنی شەریفەوە)، کەچی چەند ساڵێک تێپەڕنەبوو بارودۆخەکە پێچەوانە بۆوە، ئەو پیاوە بووە خاوەن

دەسەلآتێکی گەورە وپێگەیەکی بەرز، هەموو خەڵك بۆ داواکانیان روویان تێدەکرد و رەزامەندی ئەویان دەویست.

ئەوەی بووە هۆی سەرسامی خەڵك و تووشی شۆکی کردن، بینیان هەندێك لە موحافیزکاران و پیاوانی ئایینی ئەوانەی وەزیفەیان حەرام کرد بوو، خۆیان وەزیفەیان وەرگرت، یان منداڵە و کەسانی نزیکیان دامەزران، خەڵکیش لە ئەنجامی ئەمەدا تووشی نائومێدی و بەرپەرچدانەویەکی توند بوون، بۆیە باوەڕیان بەزۆر شتی پێشوو لاواز بوو.

**بابەتی قوتابخانەکان:**

بابەتی قوتابخانە نوێیەکان وەك بابەتی وەزیفەی حکومەت بوو. قوتابخانەکان لە کۆتایی دەسەلآتی عوسمانیەکان ژمارەیان زۆر کەم بوو، تەنها لەسەر منداڵی ئەفەندییەکان قەتیس بوو. خەڵکی عەوام بە گومان وتاوانبارکردنەوە سەیریان دەکرد، تەنانەت هەندێکیان بەسەرچاوەیەکی بەدڕەوشتی و لادانی سێکسیان دەزانی.

کاتێك حکومەتی عێراق لە سەرەتا قوتابخانەی دەکردەوە، هەندێك لەپیاوانی ئایینی، چوونە قوتابخانەیان بەحەرام زانی. ئەم تەحریمکردنەش بەدڵی خەڵکی عەوام بوو، بۆیە پێشوازی کردن لەکردنەوەی قوتابخانەکان زۆر لاواز بوو، تەنها ژمارەیەکی کەمی قوتابیان خرانە بەرخوێندنەوە، کەچی هێندەی نەبرد، لەماوەی چەند ساڵێکدا بارودۆخەکە زۆر گۆڕا و هەڵوێستی خەڵك بەشێوەیەکی سەیر پێچەوانەوە بووە.

ئارەزووی خەڵك بۆچوونە قوتابخانە بەپێی ئارەزووی بەدەستهێنانی وەزیفە زیادی دەکرد. ئەوەی شایەنی باسە زۆرێك لەو قوتابیانەی لەسەرەتاوە چوونە قوتابخانە، دواتر دەرچوون و دامەزران، لەنێو خەڵك پێگەیەکی دیاریان بەدەست هێنا، ئەمە سەرەرای مووچەیەکی زامنکراو. لێرەوە ئەو باوکانەی هەلی دامەزراندنیان لەکیس چوو ئەوا منداڵەکانیان نارده بەرخوێندن بۆ ئەوەی قەرەبووی ئەوە بکەنەوە کەخۆیان لەدەستیان چووە.

هەندێك لەباوكان هەر پابەند بوون بە مەبدەئی تەحریم كردنەوە، بۆیە رێگریان لەمنداڵەكانیان كرد بچنە قوتابخانەوە گوایە پارێزگاری لە ئاكار و ئاینی منداڵەكانیان دەكەن، كەچی بینیان منداڵەكیان لەلایەكی دیكەوە تووشی بەدئاكاری بوون، ئەوان تووشی گرێی دەروونی بوون، لەئەنجامی ئەوەی وەزیفە و پێگەیان لەدەستدابوو.

عەلی خاقانی لەو بارەیەوە بەسەرهاتێكی گرنگ دەگێرێتەوە، بەسەر گەنجێكی شاری نەجەف هاتووە. ئەو گەنجە ویستویەتی وەك هاورێكانی بچێتە بەر خوێندن بەڵام باوكی بەهۆی پەفەدانی یەكێك لەپیاوانی ئایینی رێگری لەكورەكەی كردووە. ئەو كورە دواتر دەبینی هەمان پیاوی ئایینی كورەكەی خۆی دەنێرێتە قوتابخانە و دواتریش دەبێتە پزیشكێكی بەرێز، بۆیە كورەكە تووشی گرێی دەروونی دەبێت و قین لەدڵ دەبێت لەخەڵك جنێو وسوكایەتی بە نەریتی خەڵك دەكات، دواجار لەسەر ئەم كارانەی دەچێتە زیندان، بەشێكی زۆر دەربەدەری و ئەشكەنجە و ناخۆشی و بێبەشی دەبینی .

**قوتابخانەی كچان:**

هەڵوێستی خەڵك لەبەرامبەر خوێندنی كچان توندتر بوو لەوەی لەبارەی خوێندنی كوران هەیانبوو. ژنانی عێراق وەك پێشتر ئامارەمان بۆكرد، زۆر پەیوەست كراوە بەنەریتی توندەوە، خەڵك لەسەردەمی عوسمانییەكان باوەریان وابوو تەنها ئافرەت فێری خوێندنەوە ونووسین بكرێت ئەوا دەبێتەهۆی بەدكاربوون و لادانی.

فەقیهێكی بەناوبانگی بەغدا كە ناوی شێخ نعمان كوری ئەبوسەنای ئالوسیە كتێبێكی لەساڵی ١٨٩٦ بەناونیشانی (الاصابة في منع النساء من الكتابة) (واتە: دروستی لە رێگرتنی ژنان لەنووسین) ئەو كتێبە هێشتا لە كتێبخانەی ئەوقاف لە بەغدا وەك دەستنووس ماوەتەوە، لەم كتێبەدا دەڵێ"... لەبارەی فێركردنی نووسین و خوێندنەوەی ئافرەتان، پشت وپەنامان خودا بێت، هیچ شتێك لەمە زەرەرتر نییە، ئەوان لەبەر ئەوەی خەسڵەتی غەدریان هەیە، ئەوا فێربوونی ئەم بەهرەیە بۆ ئەوان مەزنترین هۆكارە بۆ خراپە و بەدكاری. لەبارەی نووسینیشەوە هەر كە ژن

بتوانێ قسە بنووسێتەوە، ئەوا نامەیەکی بۆ زەید دەبێت، یەکێك بۆ عەمرو دەبێت، دێرە شیعرێکی بۆ سەڵتێك دەبێت، شتێکی دیکە بۆ پیاوێکی دیکە. بابەتی ژن و کتێب و نووسین، وەك ئەوەیە شمشێرێك بە پیاوێکی شەرانگێز وهیچ و پوچ بدرێت. یان بوتڵێك مەی بەسەرخۆشێك بدرێت، پیاوی عاقڵ ئەوەیە واز لەژنەکەی بهێنێ لە نەزانی وکوێرەوار بێت، ئەمە بۆ ئەوان چاکتر وبەسوودترە" .

لەراستیدا ئەو بۆچوونەی لەسەرەوە گواستمانەوە، بۆچوونێکی ریزبەڕ نەبووە، بەڵکو ئاراستە گشتیەکەی عێراق دەنوێنێ لەو رۆژگاردا. ئەم ئاراستەیەش تا ماوەیەکی درەنگ لەهەندێکی نێوەندی عێراقی زاڵ بوو. لەکاتێکدا هەندێك کەس بەرامبەر قوتابخانەی کوڕان نەرمیان دەنواند، ئەوا لەبەرامبەر قوتابخانەی کچان هێشتا توندبوون، بۆیە لە دەیەی دووەم ئەم سەدەیەدا دوای کردنەوەیان هەندێك لەقوتابخانەی کچان داخران لەبەرئەوەی باوکان رەتیان کردەوە کچەکانیان (لەترسی عەیبە) بنێرنە بەرخوێندن، بەڵام دواتر بەرەبەرە ئەم راستەیە لاواز دەبوو، تەنانەت دواجار نەما و ئاراستەیەکی پێچەوانە بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر شوێنی گرتەوە.

سەیرە ئەم خەڵکە، لەسەرەتا شتێکی نوێ قەدەغە دەکەن، کەچی دواجار هەڵپەی بۆ دەکەن، سەبیحە شێخ داود باس لەپیاوێکی توندڕەو دەکات کە پێشتر کچەکەی لەسەردانی دراوسێ بێبەش کردبوو، تەنها ئەو کاتە بەدوو عەباوە پێچرا بێت، دواتر هەوڵی دەدا کچەکەی بخاتە کولێژێکی تێکەڵاو، بۆ ئەوەی لەلایەن کاربەدەستان واسیتەی دەکرد. کاتێك پرسیاری لەبارەی ئەو جیاوازیە لێکرا گوتی" ئەویان زەمانێك بوو، ئەمەیان زەمانێکی دیکەیە"[٣٦٨] . لەکردارەکەی گلەیی لەم پیاوە ناکرێت، چونکە لەرابردوودا بەپێی بەها کۆمەڵایەتیەکانی زاڵبوو هەڵسوکەوتی کردووە، کەچی دواتر بەپێی بەها هەنوکەیەکان هەڵسوکەوتدەکات، ئەو لە رەفتارەکەی نەگۆڕاوە بەڵکو بەها کۆمەڵایەتیەکان گۆڕاوە.

وەك دەردەکەوێت ئەو گۆڕانە خێرایەی بەها کۆمەڵایەتیەکان، زۆرێك لەقوربانی لێکەوتەوە. ئەو کچەی باوکی لەچوونە قوتابخانە رێگری لێدەکات، بێگومان

---

[٣٦٨] صبيحة الشيخ داود (المصدر السابق) ص ١٠٨

تووشی تاڵی بێ ئومێدی و ئازار دەبێت، دەبینی دراوسێ و هاوڕێکانی دەچنە قوتابخانە وەك ئەوەی بۆ جیهانێکی نایابی پڕ شانازی و سەرکەوتن بچن، کەچی ئەو لەنێو دیوارەکانی ماڵەوە دەمێنێتەوە گلەیی لەبەختی دەکات.

ماوەیەکی زۆر دوور نییە لەشاری نەجەف مشتومڕێکی توند لەنێوان پیاوماقوڵێك و پیاوێکی توندڕەوی ئایینی لەمەجلیسێکی گەورە دروست بوو، پیاوماقوڵەکە سەرزەنشتی پیاوە ئایینیەکەی دەکرد و دەیگوت" ئەوەی دامەزراندنی قوتابخانەی کچان قەدەغە بکات ئەوا زاڵم و زۆرداره، وازبێنن ئێوە سەرەتا دەستخەڕۆتان کردین بەوەی قوتابخانەی کوران بیدعە وبەدڕەوشتیە، کەچی کوڕەکانی خۆتان چوون و بوون بە پارێز کوڕانی ئێمەشتان وەك کۆیلە کردە فەڕاش لای ئەوان، کەچی کچەکانم ئەوا قبوڵ ناکەم ببنە خزمەتکاری کچانی ئێوە"[٣٦٩].

## سروشتی پەرچەکردارەکە:

ئەو هەڵوێستی هەڵپەکراوەی موحافیزکاران لەبەرامبەر نوێکردنەوەیان هەبوو، ئەوا کاریگەیەکی خراپی لەسەر نەوەی نوێ هەبوو، وایکرد لەژیان ڕێگایەکی لاواز بگرنەبەر.

نەوەی نوێ خەسڵەتیان ئەوەیە لەگەڵ تەوژمی شارستانیەتی نوێ بڕۆن، نەریتە کۆنەکان بەسەر دەروونیان زاڵ نەبووە، وەك ئەوەی بەسەر باوانیان کاریگەربووە. ئەو نەوە نوێیە تەفرەدانێك بەهێز لەو نوێبوونەوەیە دەدۆزنەوە کەبەرەو خۆی کێشیان دەکات، بەڵام کاتێك بینیان موحافیزکاران بەناوی ئایینەوە لەبەرەوچوونی ئەو شارستانیەتە ڕێگریان لێدەکات ئەوا لەیەك کاتدا هەستیان بەدوورکەوتنەوە کرد لەموحافیزکاران وئایین. دەکرێت بڵێین ئەوان لەدژی ئایین تووشی گرێیەکی دەروونی بوون، بەمەش ناتوانن بابەتیانە سەیری ئایین بکەن. وا خەیاڵیان دەکرد ئەوە ئایینە پاڵ بەموحافیزکارانەوە دەنێت ئەو کارانە ئەنجام بدەن، کاتێکیش بینیان موحافیزکاران دژی خۆیان دەوەستنەوە، سەرەتا بەرەنگاری شارستانیەت دەبنەوە دواتریش لەگەڵی دەڕۆن، ئەوا نەوەی نوێ

---

[٣٦٩] علي الخاقاني (المصدر السابق) ج١٠، ص ١٥٩

واتێگەیشت ئەوە خودی ئایینیش وایە، بۆیە لەئایین دوورکەوتنەوە و شانازیان بەوە دەکرد رەخنە و سوکایەتی پێ بکەن.

زۆرێك لەنەوەی نوێ وا بیریان دەکردەوە رۆشنبیری نوێ پێویست بەوە دەکات خاوەنەکەی دیندار نەبێت، ئەوان پێیانوابوو مرۆڤ ناتوانێ لەیەك کاتدا دیندار ومەدەنی بێت، بۆیە دەبێت یەکێکیان هەڵبژێرێت و یەکێکیان بەدوور بخاتەوە، لەبەرئەمەش کاتێك یەکێکیان دەبینی هەوڵی ئەو دەدات لەیەك کاتدا مەدەنی ودیندار بێت، ئەوا بەسەرسورمانەوە سەیریان دەکرد، تەنانەت گاڵتەشیان پێدەکرد و پێی پێدەکەنین.

نامەوێ بەمە بەرگری لە ئایین بکەم، بەڵکو ئیعترافی بەمەش دەکەم ئەو بیروباوەڕە ئاینیانەی لەسەردەمی عوسمانیەکان باو بوو، پێویستی بە چاکسازی و رێکخستنەوە هەبوو. ئەوەی دەمەوێ بڵێم ئەوەیە توندڕەوی نەوەی نوێ لەدوورکەوتنەوەی ئایین وایکرد بۆشاییەك لەزەینیان دروست بێت ، ئەمەش تووشی زۆرێك لەسەرسامی و دڵەڕاوکێ و نارۆشنی کردنەوە.

توندی وابەستەبوون بە ئایین ئەنجامەکەی خراپ دەبێت، بەڵام توندی دوورکەوتنەوەش لە ئایین ئەنجامەکەی خراپترە. بیروباوەڕی ئایینی بەشێوەیەکی گشتی یەکانگیری و ئاسوودەیەکی زۆر بەمرۆڤ دەدات، بەڵام کاتێك لەپڕێکدا مرۆڤ لێی دوور دەکەوێتەوە ئەوا دەکەوێتە ناو ئارەزوو و بەدوای رێبازە دژبەیەکەکانەوە دەبێت، ئەمرۆ پەرۆشی بۆ پرەنسیپێك دەبێت، سبەی پەرۆشی بۆ پێچەوانەکەی دەبێت، ئەمەش یەکێکە لەکێشەکانی نەوەی نوێ لەعێراقدا.

قوتابخانەکان و کرانەوەی چینایەتی:

خوێنەر سەرسام دەبێت، کاتێك دەزانێت ژمارەی قوتابیانی سەرەتایی لە ساڵی ١٩٢٠-١٩٢١ نزیکەی ٨ هەزار کەس بووە، کەچی لە ١٩٦٣-١٩٦٤ دا نزیکەی ٩٥٨ هەزار بووە[٣٧٠]. لەوانەشە ئێستا لەملیۆنی تێپەڕاند بێت، شاراوە نییە ئەمەش بازدانێکی گەورەیە، ساڵ لەدوای ساڵێك ئەم ژمارەیە لەبەرزبوونەوەدایە، ئایا ئەنجامە دەروونی وکۆمەڵایەتیەکانی ئەمە چییە؟

---

[٣٧٠] بۆ ئەم دوو ژمارەیە پشتمان بە فەرمانگەی ئاماری وەزارەتی پەروەردە وفێرکردن بەستووە- عەلی وەردی

بێگومـان ئـەم بازدانـە ئاماژەیـە بـۆ خێرایـی ڕۆیشـتنی نـەوەی نـوێ بـەرەو شارستانیەتی نوێ، بەڵام لەهەمان کاتیشدا ئاماژە بۆ بڕی مەینەتی کۆمـەڵگای عێراق بەدەست نیگـەرانی و تەنگـەژەوە. قوتـابی کـە دەچێتە قوتابخانـە بـەر لەهەموو شتێك حەز دەكات ببێتـە ئەفەندیـەکی بـەناوبانگی گـەڕەك وشارەکەی، دایکی و باوکی لەمەدا هانی دەدەن. دایکیشی دەیەوێ لەنێو دراوسێکانی شانازی بە کوڕەکەی بکات لەچاوی حەسود و دوژمنان.

ئەگـەر وا ڕێکـەوت یـەکێك لـەکوڕانی گـەڕەك سـەرکەوت و وەزیفەیـەکی بـەرز و ناوبانگی بەدەستهێنا، ئەوا دەبێتە هۆی بەدبەختی بۆ هەموو کوڕانی گەڕەك، هـەر دایکێـك لەگـەڕەك دەیـەوێ کوڕەکـەی وەك ئـەو بێت، بۆیە بـەزمانێکی زبـر پێـی دەڵـێ" بۆچـی کـوڕی فـلان سـەرکەوت، تـۆ سـەرناکەوی؟ ئایـا چـاو و گوێچکەت نییە؟!". بەتێڕوانینی ئەو دایکە کوڕەکەی لەوانی دیکـە زیـرەکتر وباشـترە، بۆیـە پێشبینی ئەوەی لێدەکات لەقوتابخانە لەسەرووی هاوڕێیـانی بێـت و بـە بـەرزترین پۆست بگات، ئەگەریش لەمە سەرنەکەوت، ئەوا گلەیی لەبەختی خۆی و کوڕەکەی دەکات (ئای دڵەی نائومێدم !).

قوتابی لەژێر ئەو فشارە توندەی دەوروبەری زانستخوازی بـەلاوە گـرنگ نـەبوو، هێندەی بەرزبوونەوەی لا گرنگ بوو. ئەو سیستەمێکی چینایەتی نـوێی لەبـەردەم کرایەوە، دەیەوێ بە پلـەکانی سـەرفرازی بەسـەر چینەکەی باوکیـەوە هەڵکشـێ. ئەگەر لەقۆناغی سەرەتای دەرچوو ئەوا هەموو کۆششی بۆ ئەوەی دەبێـت بچێتە ناوەندی، ئەگەر لەوێش دەرچوو کۆششەکەی بۆ زانکۆ دەبێت. بەمشێوەیە. هـەر قۆناغێك قۆناغێکی دیکەی بەدواوە دێت، ئەو پێشبینی دەکات ڕێگاکەی لەبەردەم کراوە بێت تا کۆتایی، هیچ کۆسـپ و ڕێگریـەك نـەبێت، ئـەگـەر هـەر کۆسپێکیشـی هاتــە ســەر ڕێگــا ئــەو گلــەیی دەکــات و دەچــێتە ریــزی تووڕەبــووان و سەرزەنشتکارانەوە.

ئەگەر ئەم بارودۆخەی خەڵك بەسەردەمی عوسمانیەکانەوە بەراورد بکـەین ئـەوا جیاوازیـەکی زۆر لـەنێوانیان دەدۆزینـەوە. سیسـتەمی چینایەتی لەسـەردەمی عوسمانیەکان داخراو یان نیمچە داخراو بوو، زۆر زەحمەت بوو تاکێك بـە چینێکی

ئابووری و کۆمەلایەتی بەرز بێتەوە لەهی باوکی بەرزتر بێت. دەگمەن بوو منداڵ بیر لە پیشەیەك یان پێگەیەك بکاتەوە لەدەرەوەی ئەو چوارچێوەیە بێت کە کۆمەڵگا بەسەری سەپاندبوو. شایەنی ئاماژەپێدانە بارودۆخێکی وەهاش خەڵك لەسەر قەناعەت و رازیبوون بە (قسمەت و نسیب) رادەهێنێ: ئەوەی بەسەر مرۆڤ دادێت لەژیانی دا لە منداڵییەوە لەچارەی نووسراوە، کەواتە کۆشش، هەوڵدان، چاوتێبڕین بێسوودە.

کەچی ئێستا پەندەکە پێچەوانە بۆتەوە، بۆیە دروشمی خەڵك بۆتە" ئەوەی کردی، بردی"یان" ئەوەی رێگای گرتبەر گەیشت"... قوتابخانەکان هاوشێوەی ئەم جۆرە وتانە دەخنە مێشکی قوتابیانەوە بۆیە هەریەکەیان چاودەبڕێتە ئەوەی ببێتە وەزیرێکی گەورە، رێبەرێك خەڵك هوتافی بۆ بکێشن، سەرۆکێك شۆرش بەرپا بکات. منداڵانی گەرەکەکەی یان چینەکەی بوون بەشت، ئەی بۆ ئەو نەبێت؟ ئایا ئەوانی دیکە لەو چاکترن؟!

جا پرەنسیپی خەڵك لە رابردوودا لەو وتەیە پوخت دەکرایەوە: (هەموو شتێك قسمەت و نسیبە)؛ کەچی ئێستا بنەماکە ئەوەیە:( ئەوەی کردی، بردی). هەر یەکە لەم دوو بنەمایەش لایەنی خراپە وچاکەی خۆیان هەیە. یەکەمیان کۆمەڵگا تووشی داکەوتن وچەسپاوی دەکات، بەلام ئاسوودەیی و قەناعەت بەتاك دەبەخشێ. دووەمیان کۆمەڵگا دەجوڵێنێ و بەرەو پێشەوەی دەبات، کەچی لەلایەکی دیکە وا لە تاك دەکات چاوتێبڕینەکانی توند بێت و هەردەم لە هەڵپەدا بێت بەهیچ شتێك ئاسوودە و رازی نەبێت.

**قۆچی قوربانی:**

شایەنی باسە پرەنسیپی (ئەوەی کردی ،بردی) بەمدواییانە لەنێو خەڵك بلاوبۆتەوە، زیاد لەپێویست بۆتە جێگەی بایەخ و باوەڕیان، کەچی ئەم بنەمایە دروستە بە منداڵ بگوترێت، لە پێناو هاندانیان لە پێناو کۆشش وهەوڵدان، بەلام بەشێوەیەکی واقیعی سروشتی ژیان نیشان نادات.

لەراستیدا مرۆڤ بە تەنها بە کۆشش و هەوڵ و هێزی ئیرادە ناتوانێ بە خواستەکانی بگات، بەڵکو دەبێت بەهرە سروشتیەکانی لەلایەك و بارودۆخە

دەروونـی وکۆمەڵایەتیەکـەی لەلایـەکی دیکـە هاوکـاری بـن. ئەگـەرهاتوو بـەهرە و بارودۆخەکەی هاوکار نەبوو، ئـەوا هەوڵـدان سـوودێکی نابێـت، کـەمێك نـەبێت. لـە توانای هەر یەکێکمان نییە بۆ نموونە ببێت بە یـەکێك لـە ( بسمارك)، (بیتهـۆڤن)، (ئەدیسۆن)، (جاحین)، (ئیبن خەلدون)، جا هەرچـەندەش هـەوڵ و کۆشش بـدات، خەبات بکات، چونکە ئـەم جۆرە کەسانە و بلیمەتـەکانی دیکـە مرۆڤایـەتی بـەهۆی بەهرە تایبەتەکانیان لە خەڵکانی دیکە جیاکراونەتەوە، لە بارودۆخێکی شارستانی گونجاو ژیـاون، هـەلی کرانـەوە وگەشـەکردنی بـەهرەکانیان بـۆ رەخسـاوە. ئەگـەر ئـەوان لـەبارودۆخێکی دەژیـان، ئـەوا بـەهرەکانیان هاوشـێوەی ونبـوونی خـاکی یۆرانیوم لەلای گەلانی سەرەتایی ون دەبوو.

دەکرێـت ئـەم قسـانەی سـەرەوە لـەبارەی هـەموو سـەرکەوتنێك بکـەین لەبوارەکانی دیکەی ژیانـەوە. هـەر سـەرکەوتویەك هەرچـەندە لاوازیـش بێـت ئـەوا دەبێت چەندین هۆکـاری جۆراوجۆر هاوکـاری بکـەن بـۆ سـەرکەون. ئێمـە لێـرەدا ناکرێت نکۆڵی لە (کۆشش) بکەین لەم دەرفەتەدا. لەوانەیـە راسـت بێـت بگوترێـت (کۆشش)پێویستە بۆ سەرکەوتن، بەڵام بەتەنها بەس نییە[٣٧١].

کێشەی نەوەی نـوێ لەعێراقـدا ئەوەیـە، باوەڕیـان بەدروسـتی (ئـەوەی کـردی ، بـردی) هێنـاوە، باوەڕەکەشیان سـنووردار نییـە، بـەڵکو بـە کلیلـی سـەرکەوتن و رێگای مەزنێتی دەزانن لەهەر بوارێکدا. ئـەوان کاتێـك دەچـنە قوتابخانـە هیوایـان زۆر گـەورە دەبێـت، بـاوك ودایکیـان هانیـان دەدەن بـۆ ئـەوەی بـەترۆپك بگـەن مامۆستایانیش شیعر وسرود و ئامۆژگاری پڕ خرۆشیانیان پێشکەش دەکەن، کە وا نیشـان دەدەن ئاینـدە لەبەردەسـتیان کراوەیـە، بۆیـە هوتـاف دەکێشـن" بـۆ پێشەوە، بۆ پێشەوە". بـەڵام زۆرێـك لـەو هیوادار و گەشبینانە زوو یـان درەنـگ سەریان بەر بـەردی واقیـع دەکـەوێت، هەندێك لـە قۆنـاغی خوێنـدن سـەرناکەون، هەندێکی دیکە لەکاتی دەرچوونیان بۆ ژیان، ئـەو وێنـە نایابـەی کـە لـە خـەیاڵیان

---

[٣٧١] ئەمە بابەتێکی ئاڵۆزە، لە کتێبی (خوارق اللاشعور) هەوڵی لێکۆڵینەوەیم داوە، ئەم کتێبەش لەساڵی ١٩٥٢ بڵاوکراوەتەوە، ئەگەر خوێنەر وردەکاری زیاتری دەوێ لەم بابەتە با بچێتەوە سەری- عەلی وەردی

کێشراوە بەرەبەرە سیس و ژاکاو دەبێت. کاتێکیش هەست بە نائومێدی دەکەن، ئەوا بەدوای هۆکارێك دەگەڕێن کە سەرنەکەوتنی خۆیان بدەنە پاڵی. نابێت ئەوەش لەبیر بکەین مرۆڤ بەشێوەیەکی گشتی کاتێك سەرناکەوێ، حەز ناکات سەرنەکەوتنەکەی بداتە پاڵ خودی خۆی، بەڵکو هەردەم بەدوای هۆکارێکی درەکی دەگەڕێت. بۆ نموونە ئەگەر قوتابییەك بەدحاڵی بێت، زۆر زەحمەتە ئیعتراف بە بەدحاڵی بوونی خۆی بکات، لەوانەیە خۆی بەزیرەکترین کەس بزانێ، وەك ئەو شێتەی کە خۆی بەتاکە عاقڵی ناو خەڵك دەزانی. جا قوتابیەکە کاتێك لەخوێندن سەرناکەوێ ئەوا گلەیی لەدوژمنایەتی مامۆستا و خراپی وانەگوتنەوەی دەکات. ئەگەر لەخوێندن دەرچوو، نەیتوانی وەزیفەی خوازراو بەدەستبهێنێ ئەوا هەست بەرقبوونەوە دەکات لەواسیتەچیەکان ئەوانەی هاوکاری خەڵکی دیکەیان کردووە، کەچی هاوکاری ئەویان نەکردووە، دواجار دەبێت نەفەسێك لە بواری سیاسەت بدۆزێتەوە، ئەوا دەنگی هوتافی بەرز دەکاتەوە بۆ کەوتنی حکومەت و ئیستعمار.

ئەو باوەڕی بە" ئەوەی کردی ،بردی " دەبێت، بەڵام لەسەرخۆی جێبەجێ ناکات، ئەو خۆی دەبینی لەهەموو کەسێك زیاتر کۆششی کردووە، تەقەڵای داوە، وەك ئەمەش خۆی بەزیرەکترین و بیلمەترین دادەنێ، ئەو بڕوای یەکلاکەرەوەی بەوە هەیە باوردۆخە ریزیەڕەکان ڕێگەی سەرکەوتنیان لێگرتووەن ئەگەر وانەبووایە ئەوا زیاتر دەیتوانێ خزمەتی گەل و نیشتیمان بکات، کاتێکیش بلیمتەیەکەی لەناوچوو، ئەمەش لەناوچوونێکی کوشندەیە !.

دروستە بڵێین قوتابخانەکان لەعێراقدا وەك کاریگەری بەرهەمهێنانی ناڕەزایی سیاسی لێهاتووە. قوتابی کاتێك کۆسپ لەبەردەم سەرکەوتنی خۆی دەبینێتەوە، ئەوا لەپێناو نیشتیمان پەرۆش دەبێت، پەرۆشیەکەی بەجۆرێك دەبێت واخەیاڵ دەکات بۆتە ڕێبەرێکی سیاسی دیار خەڵك بەدەوریەوەن ئەویش دەستی سڵاوکردن و شادی بەرزدەکاتەوە، ئەگەر بینی کەسێکی دیکە بەسەرۆکایەتی گەیشتووە، ئەوا ئەو نیگەران دەبێت و پێیوایە وڵات بەرەو داروخان دەڕوات.

**توندی هۆشیاری سیاسی :**

زێدەڕۆیی نییە ئەگەر بڵێم گەلی عێراق لە قۆناغی ئێستادا لە زۆربەی گەلانی جیهان، پەرۆش و سەرقاڵی بۆ سیاسەت هەیە. بەنزیکەیی هەر تاکێك پیاوێکی سیاسی لە ئاستی یەکەم. تۆ هەرکە قسە بۆ بەقاڵ و عەتار دەکەی دەبینی بەدەم کێشانی شتومەکەکانەوە باسی سیاسەتت بۆ دەکات وپرسیارت ئاراستە دەکات. حەمباڵ شتەکانت بۆ هەڵدەگرێ لەڕێگای ناچارت دەکات قسە لەسەر سیاسەت بکەیت، پێیوایە کاتێك ئەو جڵەوی دەسەڵات دەگرێتەدەست ئەوا بەیەك کەڕەت چاکسازی لە سیستەمی سیاسی دەکات.

لەراستیدا ئەو سەرقاڵبوونە توندە بەسیاسەتەوە لە سەرەتای ئەم سەدەیە بوونی نەبوو. خەڵك ئەو کات لە بەرامبەر رووداوەکان پرەنسیپی " بەمن چی" هەبوو، ئەمەش مانای ئەوەبوو بابەتەکە هەقی بەمنەوە نییە و من تەدەخولی ناکەم. باوك کاتێك ئامۆژگاری کوڕەکەی دەکرد فێری پیشەیەك بێت بژێوی پەیدا بکات و لە سیاسەت دوور بکەوێتەوە، چونکە (سیاسەت نانێك بە مرۆڤ نادات).

لەبارەی پیاوێك دەگێڕنەوە، گوایە لە سەروبەندی جەنگی یەکەمی جیهان رۆژێك لە کوڕەکەی تورە دەبێت، چونك زۆر بە هەواڵی ئەو شەڕانەوە سەرقاڵ بووە کە لە ئەورووپا هەبوو. ئەم رۆژە کوڕەکە بەدڵخۆشی دەچێتە لای باوکی و هاوار دەکات " وارشۆ کەوت". باوکە ویستی وانەیەك بەکوڕەکەی بدات، بۆیە کوڕەکەی دەباتە بازاڕ لای ژنێکی درکفرۆش (ئەوانەی درك و داری سوتان دەفرۆشن) بەژنەکە دەڵێ" دەستێك درك بە هەواڵی کەوتنی وارشۆ دەفرۆشی؟" بێگومان ژنە رازی نابێت، ئەوکاتە باوکە بەکوڕەکەی دەڵێ" سەیری بەهای ئەو هەواڵە بکە کە تۆ هێناوتە، دەستێك درك ناکات".

ئەم چیرۆکە ئەو ئاراستە گشتە دەنوێنێ کە ئەو کات بەسەر زەینی خەڵکەوە زاڵبوو. لەگەڵئەوەش دەزانرێت جەنگ ئەو کات کارەساتی هێنا بوو، گەنجان وەك مێگەڵ دەبرانە جەنگەکان و دەکوژران. دیارە خەڵکی ئەو کات وا سەری کارەسات و نەهامەتیەکانیان دەکرد کە چارەنووسێکە خوا لەبەلای خراپەکانیان بەسەری هێناون.

ئەمەی سەرەوە حاڵی زۆرینەی عێراقییەکان بوو لەجەنگی یەکەمدا، بەڵام لەجەنگی دووەمدا بوون زۆرترین پەرۆشیان بۆ هەواڵی جەنگ و ئەو رووداوە سیاسیانە هەبوو کە لە هەموو شوێنێکی جیهان رووی دەدا، مشتومڕیان لەبارەوە دەکرد، دەکەوتنە شەڕ وملململانێیەوە لەگەڵ یەکتر، بازاڕ و چایخانە و ماڵەکان پڕبوو لە مشتومڕی توند. ئەمانەش کاریگەری بەسەر ئەو هۆشیاریە هەبوو کە لەبەرامبەر رووداوی سیاسی ناوخۆ هەیانبوو.

لەوانەیە یەکێك بڵێ: ئەو پروپاگەندە و رادیۆیانەی لەجەنگی دووەمی جیهان گوڕوتینی هێنابوو، کاریگەری لەسەر ئەم دیاردەیەوە هەبوو. ئەم قسەیە خاڵی نییە لە هەقیقەت، بەڵام نابێت ئەوە لەبیر بکەین کە پروپاگەندە و رادیۆکان ئاراستەی زۆرێك لەولاتان هەبوو، بۆچی کاریگەری بەسەر عێراق توندتر بوو لەولاتانی دیکە؟

لەراستیدا ئەو گرژیەی لە هۆشیاری سیاسی عێراق هەبوو تەنها لە ماوەی جەنگی جیهانی دووەم نەبوو، ئەمە لە ناکاو لەبەینی شەو ورۆژێك دروست نەبوو. ئەو پێشتر دروست بوو دواتر جەنگی بەسەرداهات و بۆ هۆی فراوانبوون و زیاتر کاریگەربوونی بەسەر خەڵکەوە. کاتێك لەدوای جەنگیش جیهان بوو دوو بەرەی دژبەیەکتر، ئەمەش کاریگەری بەسەر عێراقەوە هەبووە، دانیشتوانی بوون بە دوو کۆمەڵەی دوژمن و هەریەکەیان دەیەویستێ ئەوی دیکە هەڵۆشێ و خوێنی فڕبکات.

گومانی تێدانییە کۆمەڵێك هۆکار رۆڵیان لەهەڵگیرسانی ئەو دابەشبوون ودژایەتیە هەبوو، بەڵام من مەزندەی ئەوە دەکەن، رەوتی جەدەلی کەعێراقیەکان لەپێشووی خۆیان بۆیان مابۆوە ئەوا لە نێو ئەو هۆکارانە بوو، لەگرنگترینیان بوو. لەبەشێکی پێشوو ئاماژەمان بۆ ئەوەکرد رەوتی جەدەلی لە دێرزەمانەوە کاریگەری بەهێزی لە سەر کۆمەڵگای عێراق هەبوو، کەچی ئەم رەوتە تەنها لە بابەتە ئاینیەکانەوە قەتیس بوو، کەمێك نەبێت ئەگینا پەیوەندی بە بابەتە سیاسیەکانەوە نەبوو. ئەو کات خەڵك لەبارەی بیروباوەڕە ئاینیەکانەوە جەدەلیان دەکرد، هەر کۆمەڵێك

بانگەشەی ئەوەی دەکرد ئەو لەسەر هەقە و دواتریش بەڵگەی عەقڵی و نەقڵی دەهێنایەوە بۆ پاڵپشتی کردنی خۆی.

کاتێک قۆناغی هونەکەیی عێراق هات، ئەوا سیستەمی چینایەتی کرایەوە، باوەڕی ئایینی لەلای نەوەی نوێ لاواز بوو، بەمەش رەوتی جەدەلی وجەدەلکردن لەبوارە ئایینەکەوە بۆ بواری نوێی سیاسەت گوێزرایەوە. ئەوەی شایەنی باسە قۆناغی ئێستا بە چەندین رووداوی گەورەی سیاسی جیادەکرێتەوە. چەندین شۆڕش و راپەڕین و قەڵەمڕەوی یەک بەدوای یەک تێدا هاتووە. هەر رووداوێکیش لەمانە وەک قوتابخانەیەکی میللی بوو زەینی خەڵکی بەرەو سیاسەت دەبرد و ژمارەی پەرۆشانی سیاسی زیاد دەکرد. کۆمەڵگای عێراق گۆرەپانێکی لێهاتبوو خەڵک تێیدا ململانێیان بە پرەسیپە سیاسیەکانەوە دەکرد، وەک چۆن پێشتر لەسەر پەرەنسیپە ئایینیەکانەوە چرت وفرتیان بوو، حەسانەوە وئاسوودەبوونیان بۆ نەبوو.

رووداوە سیاسیەکان وەک بوارێک نەفەسدان بوو، تاک دەیتوانی لەو بوارەدا ئارەزووی خۆی لە نارەزایی بهێنێتەدی و گلەیی سەرکەوتنی خۆی لێ بکات، بۆیە بینیمان خەڵک بەهەر کۆدەتایەکی سەر سیستەمی سیاسی دڵخۆش دەبوون، ئەوان موژدەیان بەیەکتر دەدا و دەکەوتنە هوتاف و چەپڵەلێدانەوە، بەو باوەڕەی رێگای ئومێدیان بۆ بکاتەوە. بەتێپەڕبوونی رۆژگار کاتێک تروسکایی ئومێد لە چاویان نامێنێ، بەو شتە ناگەن کەچاویان لێی بوو، ئەوا داوای کۆدەتایەکی نوێ دەکەن، لێرەوە ئەم وتەیە راستە کە دەڵێ" هەر کۆدەتایەک تۆی دژی خۆی هەڵدەگرێت".

هەر کۆدەتایەک، تەنانەت ئەگەر فریشتەش ئەنجامی بدات، ئەوا ناتوانێ سەرجەم داواکاریەکانی خەڵک جێبەجێ بکات، بەتایبەت ئەگەرهاتوو ئەوەمان لەبەرچاو ژمارەیەکی زۆری نەوەی نوێ هەیە رێگای هەڵکشانیان لەبەردەم کراوەتەوە هەموویان بەرز دەڕوانن، دەبێت زۆرێک لەوانە هەست بەنائومێدی بکات لەبەرامبەر کۆدەتا، جا لەماوەیەکی درێژخایەن بێت یان کورت خایەن، ئەوان

دەبینن غەیری خۆیان ئەوانەی کەمتر دڵسۆز و خەباتیان کەمتر بووە بەخواستەکانی خۆیان گەیشتوون، ئەی ئەوان بۆ نەگەیشتن؟!

سروشتی دووفاقی نوێ:

ئەو بارودۆخەی قسەمان لەسەرکرد دووفاقیەکی نوێ بە کەسێتی نەوەی نوێ دەدات، لەهەندێك رووەوە بە دووفاقی باوانیان دەچێ کە لە سەدەی رابردوو بینیمان.

نەوەی نوێ لەوە رانەهاتووە وەك باوانیان بە ئامۆژگارییە ئاینیەکانەوە کاریگەر بن، بەڵکو ئەوان بە جۆرێکی نوێی ئامۆژگاری راهاتوون کە لەقوتابخانە و هۆکارەکانی راگەیاندن و پروپاگەندەی نوێ وەك رۆژنامە و رادیۆ و حزبەکان پێیان دەدرێت. نابێت ئەوە لەبیر بکەین زۆرێك لەوان لە ژینگەی گەڕەك پەروەردە کراون، لە کۆڵانەکان یاریان کردووە، ئەوان لە بەهاکانی زاڵبوو و دەمارگیری و شەقاوەیی رەهاتوون. کاتێك گەورە دەبن فێری بیرۆکە و زاراوەی نوێ دەبن، ئەمەش مانای ئەوەیە ئەوان دەکەونە ژێر کاریگەری دوو کولتووری جیاوازەوە، لەم حاڵەتەش بەلاوازیی یان توندی دووفاقی کەسێتیان تێدا دەردەکەوێت. یەکێك لەوان دەبینی گرنگترین بنەما و چەمکی شارستانیەتی دێتە سەرزار، بەلام ئەمە تەنها رووکەشە لەژێریدا کەسێتی کۆڵان هەیە، هەرکە دەستت بەچەند ژێیەکی هەستیاری کەوت ئەوا دەبێتە دڕەندەیەك وەك شەقاوەکانی دێرزەمانی لێ دێت.

هەرچۆنێك بێت هەموو رۆڵەکانی نەوەی نوێ لە یەك ئاستی ئەم دووفاقیە نین، هەندێکیان بەشێوەیەك لەناو رۆشنبیری نوێ تواوەتەوە، بەشێوەیەك رووخسار وناوەرۆکی لەیەکتر نزیکە، وەك دەردەکەوێت ئەوانە لەمنداڵیان لەگەڵ ژیانی کۆڵان تەبانەبوون، بەڵکو بەهەر هۆکارێك بێت رقیان لەو ژیانە بوە، بۆیە لە کۆڵان دوورکەوتوونەتەوە و سەرقاڵی خوێندن وئارەزووە گۆشەگیرەکانیان بوون، بۆیە کاتێك گەورە دەبن ئەوا زیاتر لەخەڵکی دیکە لەگەڵ رۆشنبیری نوێ دەگونجێن.

کەچی ئەوانەی لەمنداڵیان پاڵەوانی گەڕەك بوون و سەرکردەی شەڕە گەڕەك بوون، زۆر زەحمەتە لە گەورەبوونیان خۆیان لە کاریگەری بەهاکانی کۆڵان نەجات

بدەن، ئەوان هەر شەقاوەن، بەڵام شەقاوەیی خۆیان بە هەندێك زاراوەی نوێ پەردەپۆش دەکەن، ئەوان ئەم زاراوانە وەك چەکێك لەدژی نەیارەکانیان بەکاردەهێنن، وەك چۆن لەمنداڵی دارعەسا و بەردیان بەکاردەهێنا.

بوونی ئەو کەسە دووفاقیانە یەکێکە لەکێشەکانی کۆمەڵگای عێراقی نوێ، چونکە ئەوان بڕوانامەی بەرز بەدەست دەهێنن، یان پێگەیان لەدەسەڵات وسەرۆکایەتی دەبێت. کاتێك شت دەنووسن یان وتار دەخوێننەوە بنەمای بریقەدار بەسەر خەڵکەوە دەبارێنن، کەچی کاتێك دەبینن یەکێك لەگەڵ ئەوان نییە، ئەوا رەفتاری واقیعیان جیاوازی لەگەڵ کەسانی دیکە نییە، لەوانەشە زۆرترین لادانیان بۆ ئەو بنەمایانە هەبێت کە خۆیان بانگەشەیان بۆ کردووە.

ئەم پرەنسیپە نوێیانە بەراگوزەر هاتۆتە عێراق، واتە لە سروشتی رۆشنبیری کۆمەڵایەتی رەسەنیەوە هەڵنەقوڵاوە، بۆیە شێوەی سرود و هوتاف و دروشم و ماددە ئەزبەرکراوەکانی وەرگرتووە، کە تاك لەقوتابخانە فێریان دەبێت، لەیان لە رۆژنامە و کتێبەکان دەیناخوێنێتەوە، لەرادیۆکان گوێبیستی دەبێت، لە خۆپیشاندان و ئاهەنگەکان دەگوترێتەوە، کەواتە ئەو پرەنسیپانە لەبواری قسەکردن وجەدەل و رەخنەگرتن کاریگەریان هەیە، زەحمەتە بۆ ناخی دەروونیان شۆڕبێتەوە، تاکێك لەسەر یەکێك لەو پرەنسیپانە مشتومڕت لەگەڵ دەکات، کەچی ناتوانێ رەفتاری خۆی بگۆڕێت لە ئاستێکی زۆر بەرتەسك نەبێت.

نکۆڵی لەوە ناکەین بەتێپەڕبوونی رۆژگار ئەمانە کاریگەریان بەسەر رەفتاری کەسەکانەوە دەبێت، نەوە دوای نەوە کاریگەریەکەشی زیاتر دەبێت. بەڵام ئەمە یەك کەرەت روونادات، بەڵکو زۆر بەهێواشی و پلە بەپلە دەبێت، لەوانەشە چەندین نەوە بخایەنێ. کاتێك ئێمە سروشتی قۆناغی هەنوکە تاوتوێ دەکەین ئەوا دەبێت ئیعتراف بەوە بکەین جۆرێك لە دووفاقی کەسێتی تێدایە، بەشێوەیەك خەڵك راهاتووە، گوفتار و رەفتاریان وەك یەکتر نەبێت.

**کێشەی واستەکردن:**

کۆمەڵگای عێراقی لەئێستادا بەدەست کۆمەڵێك کێشەوە دەناڵێنێ، ئێمە ناتوانین هەموویان بژمێرین یان بەوردی قسەیان لەسەر بکەین، بەڵام لەوانەیە گونجاو بێت

لەو بارەیەوە باس یەکێك لەکێشەکان بکەین ئەویش کێشەی واستەیە، لەوانەیە دروست بێت بڵێین ئەم کێشەیە نموونەیەکە بۆ ئەو دووفاقیەی نەویّ نویّ لە ئەنجای دژبەیەکتری رۆشنبیر کۆن و نویّ لەکەسێتی خۆی دا تووشی بووە.

مەبەست لەواستە ئەوەیە مرۆڤ پەنا بۆ ناوەندگیری ببات لەلای کەسانی کاربەدەستەوە بۆ ئەوەی کارەکانی لە فەرمانگەکانی حکومەت بڕوات. لەراستیدا ئەو واستەیە لە رۆشنبیری کۆنی کۆمەڵایەتیمان راگوزەر نییە، بەڵکو لە ناوەخنی ئەو رۆشنبیریە وەرگیراوە و رەگوریشەی قوڵی لەویّ داکوتاوە. تاك کاتێك پەنا بۆ واستەکردن دەبات، ئەوا دەبێت بەپێی بەهاکانی کۆنی گەرەك، یان بەناوی خزمایەتی و دراوسێتی و نەمەك قسە لەگەڵ کەسەکە بکات، یان هەر مافێکی دیکە دەمارگیری و شەهامەت و خۆدەخیل کردن و ئەم جۆرە شتانە، بۆیە هەر کاتێك بیەویّ لەدەرگای ئەو کەسە دەدات کە واستەی لەلا دەکات، ئەوکاتە داواکەی لێ دەکات و پێداگری لەسەر دەکات. ئەم کاربەدەستەش ناتوانیّ تکاکە رەت بکاتەوە یان بێزاری دەربڕیّ، بەڵکو دەبیّ بەخێرهاتنی میوانەکە بکات و لەگەڵی رووخۆش بێت، ئەگەر وا نەکات ئەوا خەڵك وا وەسفی دەکات کە گوایە سەرپێچی جوامێری و مروەتی کردووە، بەمەش قسەوقسەڵۆکی لەبارەوە دەکات و زۆر زەمی دەکەن، بۆیە دەبێت واستەکە بکات و بەپەرۆشی ئەنجامی بدات، بۆ ئەوەی بسەلمێنیّ ئەو جوامێر و شێر و کوڕی باشە.

لێرەوە ئەم کەسە تێوەدەگلیّ، نازانیّ چۆن لێی دەرباز بێت، ئەگەر فەرمانبەرێکی گەورە یان وەزیرێك بێت ئەوا دەکەوێتە نێوان دوو پاڵنەری دژ بەیەکترەوە، لەلایەك پەیوەستە بە بنەماکانی دادپەوەری و یەکسانی کە نابێت جیاوازی لەنێو هاولاتیان بکات، لەلایەکی دیکەوە دەبێت پابەند بێت بەواستەکەوە سەرپێچی بنەماکانی دادپەروەری بکات، بۆیە ئەگەر لەگەڵ واستەکە بێت ئەوا ئەوانەی بانگەشە بۆ بنەماکان دەکەن هێرشی دەکەنەسەر، ئەگەر لەگەڵ بنەماکانیش بێت ئەوا کەسانی واستەکە هێرشی دەکەنە سەر، لەئەنجام دا ئەو پیاوە کاربەدەستە دەکەوێتە نێوان دوو بەرداشەوە نازانیّ چی بکات.

ئەگەر یەکێك لە کاربەدەستان ناوبانگی بە جوامێر و مروەت پەیداکرد، ئەوا خەڵك لە بەردەرگاکەی دەکەونە هەڵپە و ڕێگای پێدەگرن، تا ناوبانگیشی زیاتر بێت ئەوا خەڵك زیاتر دەوری دەدەن، هەر کەسێك لەوان پێویستی بە شتێکەو باوەڕی وایە ئەم داوایەی ئەو لەگەڵ بەرژەوەندی گشتی و خزمەتی وڵات یەکدەگرێتەوە، ئەگەر داواکەشی جێبەجێ بکرێت ئەوا پێی ڕازییە، ئەگەریش لەداواکەی بێئومێد کرا ئەوا دەست دەکات بەزم کردن و دەبێتە سەرسەختترین دوژمن.

ئەوان سەرجەمیان بانگەشە بۆ بنەماکانی دادپەروەری ویەکسانی و ڕێزگرتن لە یاسا دەکەن، بەڵام لەبواری گوتار و هوتافکێشان، لەبواری ڕەخنە و نارەزایی، کەچی کاتێك خۆیان کارێکیان لە فەرمانگەکانی حکومەت دەبێت ئەوا ئەم بنەمایانە لەبیر دەکەن و دەکەونە ستایشکردنی بەهای جوامێر و مروەت. ئەوان نکۆڵی لەواسیتە دەکەن کاتێك کەسانی دیکە لێی سوودمەند دەبێت، بەڵام ستایشی دەکەن ئەگەر بەرژەوەندی خۆیان لەسەر واستە وەستابێت.

ئەوان دووفاقین، شاراوەش نییە ئەو خاوەن پۆستەی ئەوان پەنای بۆ دەبەن ناچارە وەك ئەوان دووفاقی بێت، چونکە خۆی بەر لەوەی پۆستێکی بەرز وەربگرێت ڕەخنەی توند لەو کەسانە دەگرت کە پێش ئەو پۆستیان هەبووە، هێرشی دەکردە سەرئەوان و ڕەخنەی لێدەگرتن لەبەر ئەوەی ڕەچاوی واستەیان دەکرد، داواشی لێدەکرن دادپەروەر بن لە مامەڵەی خەڵك یەکسانی تەواو ڕەچاو بکەن، کەچی هەرکە خۆی پۆستی وەرگرت ئەوا خۆی لەوە دۆزیەوە کەوتۆتە هەمان هەڵەوە کە پێشتر ڕەخنەی لێ گرتووە.

لەڕاستیدا لەسەردەمی عوسمانییەکان واستە هەبوو کاریگەری بەهێزی لەسەر دەمەزراوەی دەوڵەت هەبوو، بەڵام لەگەڵئەوەشدا بەکێشەیەکی کۆمەڵایەتی نەدەزانرا. خەڵك ئەوکات هێشتا فێری بنەماکانی دادپەروەری و یەکسانی نەبوون، تێڕوانینیان بۆ فەرمانبەر وەك خاوەن ماڵ بوو، کە دەتوانێ لەماڵەکەی خۆی بدات یان بێبەشت بکات بێ لێپرسینەوە وچاودێری، بۆیە کاتێك فەرمانبەر واستەکەی بۆ دەکردن ئەوا ستایش دەکرا و بە پیاوێکی بەخشندەیان دەزانی.

لەو سەردەمدا ئەو شتە نەبوو کە ئێستا بە(رای گشتی) دەناسرێت، رای گشتیش چاودێری حکومەت و هەڵسوکەوتەکانی دەکات، یانیش فەرمانبەر بە خزمەتکاری گەل دەزانرێت و لەبەرامبەری بەرپرسیارە. رای گشتی دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی نوێیە[٣٧٢]، لەعێراقیش بەکاریگەری قوتابخانە و هۆکارە نوێیەکانی راگەیاندن و بلاوکردنەوە گەشەی کردووە. لێرەوە فەرمانبەر وایلێهاتووە کەم تا زۆر لە چاودێری رای گشتی بترسێ، بە شێوەیەك لەشێوەکان ناچارە لەبەرچاوی بگرێت، لەگەڵ ئەوەشدا ناچارە رەچاوی بەهاکانی گەرەکیش بکات، لێرەشەوە کێشەکە سەرهەڵ دەدات.

ئێمە نکۆڵی لەوە ناکەین رای گشتی لەگەشەکردنێکی بەردەوام دایە، کەچی بەهاکانی گەرەك لە لاوازبوون دایە. درەنگ یان زووش کاتێك دێت رای گشتی بەسەر بەهاکانی گەرەك زاڵ دەبێت و کاریگەرە کۆمەڵایەتیەکەی خاڵی دەکاتەوە، بەلأم لە ئێستادا هەردووکیان بەیەکەوە بوونیان هەیە، بۆیە تاك ناچارە رەچاوی هەردووکیان بکات، هەر یەکێکیان کاریگەری بەسەر تاکەوە هەیە و فەرامۆشکردنی ئاسان نییە.

با گریمانەی ئەوە بکەین پیاوێکی پۆستی وەزارەت یان هەر پۆستێکی گەورەی وەرگرت. ویستی ئەوەشی هەبوو لە مامەڵەکردن لەسەر ئەو بنەما ئایدیاڵیانە بڕوات کە رای گشتی بانگەشەی بۆ دەکات. هات هەموو واستەچییەکانی دەرکرد و یاسایەکی توندی پەیرەوکرد کە نەرمی نواندنی تێدا نەبێت، سەرەڕای ئەمەش مافەکانی دەمارگیری، دراوسێی، هاوڕێیاتی، نەمەکی رەچاو نەکرد، ئەگەر کەسێك هات بەپێی یەکێك لەو مافانە قسەی لەگەڵ کرد ئەوا سەرزەنشتی بکات و دەرگاکەی بەروو دابخات و پێی بڵێت" تۆ بە بەرچاوی من جیاوازیت لەگەڵ خەڵك نییە". ئایا چارەنووسی ئەم وەزیرە چی دەبێت؟ ئەم پرسیارە بۆ خوێنەر جێدەهێڵم با خۆی وەلأمی بداتەوە.

---

[٣٧٢] William Albig (public opinion) p. 17-25

## بۆشایی نێوان گەل و حکومەت:

کەلێنی نێوان گەل و حکومەت دیاردەیەکی کۆمەلایەتییە، لەنێو هەموو نەتەوەکانی کۆن هەبووە، ئەم بۆشاییە یان کەلێنە لە ئەنجامی رقی گەلان بۆ دەسەلاتدارەکان دروست دەبێت. دەسەلاتداران باج دەخەنە سەر هەلك و بە قامچی لێیان دەدەن، لەبەر بچووکترین هەلّە فرمانی کوشتیان دەدەن، لێرەشەوە دەبێت گەل کەم یان زۆر رەقی بۆ دەسەلاتداران هەبێت.

بەلاّم ئەم بۆشاییەی نێوان دەسەلاتدار و گەل خەسلّەتێکی نێگەتیڤی هەبوو، مەبەستم ئەوەیە نەبووە هۆی پێکهێنانی رای گشتی تا چاودێری دەسەلاتداران بکات و بەرپەرچیان بداتەوە لەکاتی ئەنجامدانی چەوساندنەوە وستەم، دەسەلاتداران لە ستەمی خۆیان بەردەوام بوون و رەعیەتیش لەرق و کینەیان.

رەعیەت دەسەلاتداریان بە خزمەتکاری خۆیان نەدەزانی وەك ئەوەی ئێستا لەنێوگەلانی نوێ هەیە، بەڵکو بەسەردایان دەزانی، بۆیە ئەوان گریمانەی ئەوەیان نەدەکرد دەسەلاتداران بەهیچ کارێکی بەسوود ئەنجام بدەن، ئەگەرهاتوو یەکێك لە دەسەلاتداران کارێکی بەسوودی ئەنجام دا، ئەوا ئەم کارەیان بە چاکە و خێر زانیوە و باسیان کردووە، شاعیرانیش چەندین قەسیدەیە بەپێزیان لەبارەی ستایشکردنی نووسیوە.

هەر ئەمەش حالّی خەلکی عێراق بوو لەسەردەمی عوسمانییەکاندا، بەلاّم دواتر زۆر خێرا گۆڕا کاتێك هۆشیاری سیاسی و رای گشتی لەنێویاندا گەشەی کرد، بەم گۆڕانکاریەش بۆشایی نێوان حکومەت و گەل لە خەسلّەتی نێگەتیڤەوە بووە خەسلّەتی پۆزەتیڤ و نوێی.

لامان شارەوە نییە، حکومەتی عێراقی تووشی کۆمەلّێك کەموکوڕی و نەخۆشی بۆتەوە. حکومەت لەو کۆمەلگایە هەلّقولاّوە کە تێیدا دەژیت، خەسلّەتەکانی کۆمەلگا وەردەگرێت، جا کاتێك کۆمەلگا تووشی کەموکوڕی و نەخۆشی بێتەوە

ئەوا دەبێت حکومەتیش تووش بێت[٣٧٣]، کەچی رای گشتی لەو نەریتە ناگات، ئەو وا گەریمانە دەکات حکومەت دەبێت هاوشێوەی حکومەتە پێشکەوتووەکان کارەکانی ئەنجام بدات، ئەمەش بێگومان سوودێکی گەورەی هەیە، چونکە وا لەحکومەت دەکات بەردەوام بێت لە ئەنجامدانی نۆژەنکردنەوە و چاکسازی بەپێی توانای خۆی. ئەگەر ئەمەش نەبێت ئەوا حکومەت دەچێتەوە سەر نەریتە کۆنەکەی خۆی وهیچ شتێك نەزانێ زیاتر لە ئاوادنکردنەوەی مزگەوت و کاولکردنی وڵات.

ئێمە نکۆڵی لەوە ناکەین حکومەتی عێراقی زۆر لە حکومەتی عوسمانی باشترە. ئەوەی حکومەتی عێراقی لەنیوسەدە ئەنجامی داوە، حکومەتی عوسمانی نەیتوانیوە لە نزیکەی چوارسەدە ئەنجامی بدات، بەڵام کێشەکەی حکومەتی عێراقی ئەوەیە رووبەرووی هۆشیاریەکی سیاسی توند دەبێتەوە پێشتر بوونی نەبووە، رای گشتی داوای شتێکی زۆر لەحکومەت دەکات، کەچی حکومەتیش پەیوەستە بەو واقیعە کۆمەڵایەتیەوە کە تێیدا دەژیت، ناشتوانێ بەیەکجار لێی دەرباز بێت، تا بەو شێوەیە بێت کە رای گشتی دەیخوازێ.

خەڵك لە سەردەمی عوسمانییەکان پێیانوابوو هەموو بەڵاکان لەلایە خوداوە دێت، ئەمەش لەئەنجامی گوناهەکانیانەوە. ئەمەش وایدەکرد یەکتر ئامۆژگاری بکەن، بۆئەوەی واز لە گوناه بهێنن و تۆبە بکەن، کەچی ئێستا خەڵك خودایان بیرچووە و نەهامەتیەکانیان دەدەنە پاڵ حکومەت، ئەمەش وا دەکات رەخنە لەحکومەت بگرن و هوتافی بۆ رووخانی بکێشن.

هەندێك خەڵك لەعێراق گەیشتونەتە ئەو حاڵەتەی حکومەت لەهەموو ئەو شتانە بە بەرپرسیار بزانن کەبەسەریان دێت، تەنانەت ئەگەر شتەکە زۆر بچووکیش بێت. بۆ نموونە ئەگەر غوبار لەدەموچاویان نیشت ئەوا قسە بەحکومەت دەڵێن لەبەر ئەوەی لەچۆڵەوانی درەخت نانێژێ. ئەگەر قەرەباڵغی دروست بوو ئەوا دەڵێن:

---

[٣٧٣] خوێنەر توێژینەوەیەکی ورد لەبارەی کەموکورییەکانی حکومەتی عێراقی دەکەوێتە بەردەست، لەگەڵ باسکردنی تەواو ئەو دەردانەی لەحکومەت هەیە، ئەمەش لە کتێبی داهاتوودا، خوا پشتیوان بێت! – عەلی وەردی

ئەمە چ حکومەتێکە ناتوانێ ڕێگاوبان ڕێك بخات. ئەگەر زیانێکی گەورەیان بەرکەوت ئەوا جنێو بۆ کومەت دەچێت لەهەموو شتێکدا.

دەتوانین بڵێین ئەم (کەلێنە پۆزەتیڤە)ی نێوان گەل و حکومەت ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زیاتر دەبێت. حکومەت کاتێك دەیەوێ کارە سوودبەخشەکان ئەنجام بدات، ئەوا دەیەوێ ڕای گشتی ڕازی بکات، کەچی نازانێ ڕقی ئەوان لەبەرامبەر خۆی زیاد دەکات. بۆ نموونە کاتێك حکومەت قوتابخانەیەك دەکاتەوە، ئەمە مانای ئەوەیە چەندین کەسی پرخواست ونارازی دروست دەبێت، کاتێك نەخۆشخانە دروست دەکات ئەوا خەڵك ئاپوورە لەوێ دروست دەکەن و دواتریش دەست دەکەن بەرەخنەگرتن لەحکومەت لەبەر کەموکوڕیەکانی. ئەگەرهاتوو کۆدەتا ڕوویدا ئەوان پێشبینی دەکەن ئەو کۆدەتایە موعجیزە بێت باروودۆخی گشتی چاك بکات، هەست بە نارەزایی دەکەن کاتێك ئەو خواستانەیان بەدەست نایەت کە هیواخوازی بوون.

سروشتی مرۆۋ ئەوەیە نارەزایی لەشتێك دەرنابڕێ تەنها ئەو کاتە نەبێت هەست بکات مافی تێدا هەیە، کۆیلە لەسەردەمی کۆیلایەتی نارەزایی لە دڵرەقیەکانی خاوەنەکەی نەبوو، ئەو وایدەزانی خاوەنەکەی وەك گوێدرێژ بە پارەی خۆی کڕیویەتی، کەواتە مافی ئەو لەلای خاوەنەکەی وەك بەقەد مافی گوێدرێژەکەیە، بەڵام کاتێك دەزانێ ئەو وەك مرۆڤەکانی دیکەیە، وەك ئەوان مافی هەیە، ئەوا نارەزایی دەبڕی و لەوانەشە شۆڕشی بەرپاکردبێت. هەستکردن بە ستەم زیاتر لەخودی ستەم مرۆۋ دەوروژێنێ!

**بەراورد لەنێوان دوو سەردەمەکە:**

بەشێوەیەکی گشتی دەتوانین بڵێین عێراقییەکان لە قۆناغی ئێستایاندا فێری جۆرە بیرکردنەوەیەك بوون زۆر بەرزترە لە ئاستی باروودۆخی خۆیان و بەها کۆمەڵایەتیەکانیان. بەمەش لە بیرکردنەوەیان بازێکی گەورەیان بەرەو پێشەوە دا، لەگەڵئەوەشدا دەزانرێت ئەو کۆمەڵگایەی لەناوی دەژین نەیتوانی لەگەڵ بازدانی ئەوان بڕوات، پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی بە سروشتی خۆی هێواش و پلە بە پلەیە، بۆیە ناتوانێ وەك بیرکردنەوەی ئەبستراکت بازبدات.

لەوانەیە دروست بێت قۆناغی ئێستا لەهەندێك رووەوە لەو قۆناغە بشوبهێنرێت کە لەسەرەتای ئیسلام عێراق پێی تێپەڕیوە. ئەوکات لەعێراق بنەما بەرزەکانی ئیسلام بلاّوبۆوە، خەڵك یەکتریان پێ ئامۆژگاری دەکرد و بەو بنەمایانە رەخنەیان لەیەکتر دەگرت و تەنانەت وەك چەکێك لەدژی نەیارەکانیان بەکاریان دەهێنا، کەچی لەژیانی واقیعی خۆیان بەپێی بەها کۆنەکانی بیابانشینی دەڕۆیشتن.

مێژوو باسی ئەوەمان بۆ دەکات یەکەم کلّپەی شۆڕش لەدژی عوسمان لە کوفە بوو ئەوکاتە سەرداری کوفە وتبووی ( انما السواد بستان قریش) ئەوا ئامادەبووان هەڵدەچن و نارەزایی دەردەبرن و رەخنە دەگرن. لەوکاتەوە تا ئێستا بازنەی نارازیبوون و رەخنەگرتن لەنێو موسڵمانان لاواز دەبێت و تا زۆرێك لەولاّتانی دیکەی ئیسلامی دەگرێتەوە، بەمەش موسڵمانان دەبنە دوو کۆمەڵەی دژ بەیەکتر، هەر کۆمەڵەیەکیان لەلایەن خۆیەوە توندڕەو دەبێت، توندڕەویش بەرە بەرە زیادە دەبێت تا دواجار بووە هۆی کوشتنی خەلیفە....

لێرەدا بابەتی ئێمە نییە لە رووداوەکانی ئەو شۆڕشە بکۆڵینەوە، بەلاّم دەتوانم بڵێم هەرچۆنێك بێت ئەو شۆڕشە وەك هەموو شۆڕشەکانی دیکە مێژووی گەلان بانگەشەی بۆ بنەماکانی دادپەروەری و یەکسانی دەکرد. شۆڕشگێران رەخنەیان سیاسەتی جیاوازیکردن و نایەکسانی عوسمانی دەگرت، داوایان لێدەکرد یەکسانی لەنێوان موسڵمانان بەرقەرار بکات و توێژێك بەسەر توێژێکی دیکە فەرز نەکات. ئێمە بەلامانەوە گرنگ نییە ئەوان لەو تۆمەتانە لەسەرهەق بوون یان ناهەق، بەڵکو بەلامانەوە گرنگە ئەوە بزانین کە ئەوان بانگەشەیان بۆ ئەو شتانە دەکرد و ئەمە داوکارییەکانیان بوو.

لەدوای کوژرانی عوسمان، عەلی کوڕی ئەبوتاڵب خەلافەتی گرتەدەست. وەك دەزانرێت ئەم پیاوە نموونەیەکی زیندوو بوو بۆ ئەو بنەمایانەی شۆڕشگێران بانگەوازیان بۆ دەکرد. بارودۆخەکە خواستی، عەلی و شۆڕشگێران بێنە عێراق، لێرەوە دژایەتی معاویەیان دەکرد، کە خۆی بە شوێنگرەوەی عوسمان و تۆڵەسێنی ئەو ناساندبوو، ئەم بابەتەش گرنگیەکی کۆمەلاّیەتی هەیە چونکە هەر ئەوە بوو عێراقی بەوشێوەیە ئاراستە کرد کە ئێستاش پێی ناسراوە.

تێبینی ئەوە کرا زۆربەی وڵاتانی ئیسلامی دواتر بەرە بەرە، بۆ ژیانی ئارامی و گوێڕایەڵی دەگەڕانەوە، بەڵکو خەریك بوون بنەماکانی شۆڕشیان بیر دەچۆوە، لەگەڵ ڕەوتی گشتی دەڕۆیشتن، کەچی عێراق لەمەدا بە روونی ریزپەڕبوو. دروستە بڵێم زۆرێك لەعێراقییەکان ئەوانەی لەسەرەتاوە بەشداری شۆڕشیان کرد لە ناخی دەروونیانەوە جیاوازیان لەگەڵ عەوامی خەڵك نەبوو، ئەوان لەدژی سیاسەتی جیاوازیکردن راپەڕین چونکە لەبەرژەوەندی ئەوان نەبوو، ئەگەر لەبەرژەوەندی ئەوان بووایە ئەوا رانەدەپەڕین. دیارە ئەوان داوایان لەعەلی کوڕی ئەبوتالب ئەوەبوو چاودێریان بکات و بەرژەوەندیان رەچاو بکات، وەك چۆن عوسمانی بەرژەوەندی کەسانی خۆی لەبەرچاوگرتبوو، بەڵام کاتێك بینیان عەلی رێگای یەکسانی و دادپەروەری دەگرێت ئەوا لێی بێزاربوون و لێی دوورکەوتنەوە، تا لە دوایین رۆژەکانی کەسانی دڵسۆزی بەدەورەوە نەمابوو، چەند کەسێك نەبێت، لەعەلی دەگێڕنەوە ئەو کات گوتویەتی" بەهەق بێ، برادەرێکم نەماوە".

نامەوێ بەمە گلەیی لەخەڵکی عێراق بکەم، ئەمە سروشتی زۆرێك لەخەڵکە لە هەموو سەردەم و شوێنێکدا. کاتێك تاوتوێی سروشتی جەماوەر دەکەین ئەوانەی لە قۆناغە جیاجیاکانی مێژوودا بەشداریان لەشۆڕشەکان کردووە، دەبینین جیاوازییەکی بنەڕەتیان لەگەڵ خەڵکی عێراق نییە. بەشێوەیەکی گشتی مرۆڤ کاتێك بانگەشە بۆ بنەما بەرزەکان دەکات، یان کاتێك لەپێناوی شۆڕش دەکات، ئەوا مەبەستی بەرژەوەندیە گشتیەکەیەتی، کەچی ئەوانەی بۆ بەرژەوەندی گشتی لەسەرووی بەرژەوەندی خۆیان دادەنێن ئەوا ژمارەیان زۆر زۆر کەمە.

هەرچۆنێك بێت بنەماکانی شۆڕش لەعێراق لەنێو دانیشتوان عێراق جێگیر بوو، زیاتر لەوڵاتانی دیکە بەناو دانیشتوانی عێراق شۆڕبۆوە. کاتێك دوای مردنی عەلی عێراق بووە مەڵبەندی دژایەتیکردنی دەوڵەتی ئەمەوی، خەڵکی عێراق ئەم بنەماکانی دادپەروەری ویەکسیانیان کردە چەکێك دژی دەسەڵاتدارانی ستەمکار، ئەمەش وایکردووە حەجاج کوڕی یوسفی سەقەفی کردووە بە وتە بەناوبانگەکەی قسە لەگەڵ عێراقییەکان بکات " اهل الشقاق والنفاق" (واتە: خەڵکی دووبەرەکی و دووڕوویی) ئەمەش بۆتە سیفەتێکی پەیوەست بەعێراق تا رۆژگاری ئێستامان.

بۆچوونێك:

مێژوونووسانی موسڵمان وا راهاتوون، ئەو وتەیە لەنێو خۆیان بڵێنەوە، کە حەجاج لەوەسفی خەڵکی عێراق کردویەتی، تەنانەت باوەڕیان بە دروستی وتەکەش هەیە، بێئەوەی دیقەت لە هۆکارە کۆمەڵایەتیە شاراوەکانی دواوەی وتەکە بدەن. هەندێك پێیانوایە کەش و هەوای عێراق و خاك و ئاواکەی وا لە خەڵکەکە کردووە بەوشێوەیە بێت ( کە حەجاج وەسفی کردووە)، بۆیە بەتێڕوانینی ئەوان ئەمە لە عێراقیەکان سروشتێکی جێگیرە و ناتوانن لێی دەربازن، ئەم بیرۆکەیە تا ئێستا لەناو خەڵك باوە، بۆیە کاتێك کەشوهەوای عێراق لەناکاو دەگۆڕێت ئەوا دەڵێن: سەیرکەن ئەمەیە سروشتی خەڵکی عێراق!.

چیرۆکێکی خۆش لەمبارەیەوە هەیە، پوختەکەی ئەوەیە ئەسکەندەر مەکدۆنی دوای داگیرکردی عێراق نامەیەك بۆ ئەرستۆ تالیسی مامۆستای دەنووسیّ ودەڵیّ" خەڵکی عێراق تووشی مەینەتیان کردووم، هەر پیلانێکیان بۆ دادەنێم ئەوا بەر لەمن خۆیان نەجات دەدەن، ناتوانم بیانخەمە پیلانەکەوە، چارەیەکم نییە تەنها ئەوە نەبێت هەموویان لەناوبەرم". ئەرستۆ تالیس وەڵامی دەداتەوە ودەڵیّ" لەبەرژوەندیت نابێت بیانکوژی، تەنانەت ئەگەر هەمووشیان لەناوبەری... ئایا دەتوانی هەواکەی ئەوان لەناوبەری کە ئەو خەسڵەت و زیرەکیەی پێداون؟ بۆیە ئەگەر ئەوان بمرن ئەوا لەشوێنی ئەوان هاوشێوەیان دەردەکەوێتەوە، وەك ئەوەی هیچ شتێکت نەکردبێت!".

وەك دەردەکەوێت ئەو چیرۆکە هەڵبەستراوە، لەلایەن مێژوونووسانی موسڵمان دانراوە و دواتر دراوەتە پاڵ ئەسکەندەر و ئەرستۆتالیس بۆ ئەوەی خەسڵەتێکی دانایی فەلسەفی پێبدەن کە فەیلەسوفانی گریکی کۆنی پیّ ناسراوە، بەڵام ئەوەی تێبینی دەکەین خەڵکی عێراق بە زیرەك وەسف دەکات، دیارە جاحیز توێژەرە بەناوبانگەکەی عەرەب کە لەسەردەی سێیەمی کۆچی ژیاوە، سوودی لەو چیرۆکە بینیوە، بۆیە هاتووە هۆکاری سروشتی خەڵکی عێراق لێك دەکاتەوە و بۆچوونی ئەرستۆ و بۆچوونی حەجاج بەیەکتر دەبەستێتەوە.

جاحیز دەڵێ" هۆکاری یاخیبوونی خەڵکی عێراق لە دەسەڵاتداران ئەوەیە خەڵکی عێراق خاوەن بیروبۆچوونی ژیرانەن، لەگەڵ ئەمەش وردبوونەوە و گەڕان دروست دەبێت، لەگەڵ وردبوونەوە و گەڕانیش تانەدان و ناوزڕاند و هەڵسەنگاندنی پیاوەکان دروست دەبێت، سەرۆکەکان لەیەکتر جیا دەکرێنەوە و کەموکوڕی میرەکان دەردەکەوێت.... بۆیە هێشتا عێراق بەکەمی گوێڕایەڵی و بەدووبەرەکی لەسەر سەرۆکایەتی وەسف دەکرێت"[٣٧٤].

ئەو بۆچوونەی جاحیز زۆر لەوە دەچێت کە پێشتر لەبارەی بڵاوبوونەوەی ڕەوتی جەدەلی لەنێو خەڵکی عێراق باسمان کردووە. ڕەوتی جەدەلی کاتێك لە نێوا گەلێك بڵاو دەبێتەوە و خەست دەبێتەوە، ئەوا لایەك وا دەکات گەلەکە زیرەك و زەینی کراوە بێت، کەچی لەلایەکی دیکەوە وا دەکات بەرەو ئاژاوەگێڕی و هەڵگەڕانەوە لەدەسەڵاتداران بچێت، ئەمەش دوو سیفەتی پەیوەستن بەیەکترەوە زۆر کات ناتوانرێت لەیەکتر جیابکرێنەوە.

ئەگەر بەراوردی نێوان خەڵکی عێراق وشام بکەین لەسەردەمی ئەمەوییەکاندا ئەوا دروستی ئەم بۆچوونەوەمان بۆ دەردەکەوێت. خەڵکی شام وا ڕاهاتووە خاوەن گوێڕایەڵی بن و باوەڕ بەو قسەی سەرکردەکانیان بکەن و فەرمانی ئەوان هەڵسوکەوت بکەن، بۆیە هێزێکی یەکگرتوو بوون دەوڵەت سوودی لەوان بینی و ئەوانیش سوودیان لەدەوڵەت بینی، بەڵام لەهەمان کاتدا خاوەن بیرکردنەوەیەکی سست بوون هیچیان لەکاروباری دین و دونیا نەدەزانێ تەنها ئەوە نەبێت کە پێیان دەگوترا وفرمانیان پێدەکرا.

کەچی خەڵکی عێراق پێچەوانەی ئەوان بوون، مشتومڕ لەسەر هەموو شتێك دەکەن و دەکەونە ململانێیەوە، کەچی لەلایەنی سیاسیەوە خۆیان لاواز دەکەن، بەڵام لە ڕووی فیکریەوە بەهێزن و هاوتایان نییە. تاکیش لەم حاڵەتەدا کەسێتیەکەی دووفاقی دەبێت، لەلایەکەوە بیرکردنەوەی زۆر لەئاستی ژینگە کۆمەڵایەتیەکەی بەرزتر دەکاتەوە، بەڵام لەهەمان کاتدا دەبێت چاوکراوە و زۆر هۆشیار و بەئاگا بێت، ئەو باوەڕ بەوە ناکات کە پێی دەگوترێت، بەڵکو مشتومڕ

---

[٣٧٤] عمرو بن بر الجاحظ (البيان و التبين) ج٢ ، ص ٩٤

و کەلەڕەقی دەکات، لەتوانای کەس نییە فیلّی لیّ بکات و گویّچکەکەی وەك گویّچکەی بەرخ رابکیّشیّ!

سروشتی جەدەل ئەوەیە پرسیارکردن و تێڕوانین لەلای خەڵك دروست بکات، داکەوتنی فیکریش لاواز دەکات، ئەو جەدەلەی لەنێوان دوو کەس دروست دەبێت وا هانی گوێگران دەدات زۆر یان کەم بەشداری بکەن، بازنەی جەدەل بەرە بەرە فراوان دەبێت تا دواجار وا دەکات خەلکی عەوام تێیدا بەشداری بکەن، بەمەش کۆمەلگا دەبێتە بۆتەیەکی فیکری بەهێز هەردەم شتی تەڕەوتازەی لیّ بەرهەم دێت!

**لەنێوان رابردوو و ئێستادا:**

وەك زانراوە عێراق لەمێژووی ئیسلامدا سەرچاوەی دروست بوونی زۆرێك لە مەزهەب و جولاّنەوە کۆمەلاّیەتیەکان بووە، لەوێشەوە بۆ ولاّتانی دیکەی ئیسلامی چووە، لەوانە خەواریج و شیعە و موعتەزیلە تێدا دەرکەوتووە، هەروەها جوولاّنەوەکانی مەوالیەکان و شعوبیەکان و زندیقەکانی تیدا بووە، لەدوای ئەمانیش جولاّنەوەی زەنج و قرامیتە و عەیاریەکان پەیدابووە. هەر لەعێراق یەکم شێوازی سۆفیگەری لەسەر تەریقەی قادری دەرکەوتووە لەگەلّ تەریقەتی (الفتوة) و چەندین رێبازی دیکەش...

زۆرێك لەو جولاّنەوە ومەزهەبانە لەلای هەندێك لەتوێژەران بە (روخێنەر) دادەنرێن، بەلاّم هەرچۆنێك بێت لە ئەنجامی کارلێکردن و بەیەکگەیشتنی بیرکردنەوە جیاوازەکان و مشتومڕی توندی نێوانیان دروست بووە؛ ئەمەش یەکێك لە گرنگترین هۆکارەکانی چالاکی داهێنارانە بووە کە رۆشنبیری ئیسلامی پیّ ناسراوەتەوە، ئەگەر ئەمەش نەبووایە ئەوا رۆشنبیری ئیسلامی بەرەو وەستان و چەقبەستوویی دەڕۆیشت.

خەریکە بێمە سەر ئەو باوەڕەی گەلی عێراق لە قۆناغی ئێستادا هەولّ دەدات لە پێشینانی کۆنی بچێت، چونکە ئێستا ئەو لەحەزکردن بەجەدەل و ململانیّ لەسەر بنەما فیکریە جیاوازەکانەوە هیچی لەوان کەمتر نییە، هەروەها لەرووی کارانەوەی زەین و ژیریش لەوان کەمتر نییە، بەلاّم ئێستا وەك پێشوو نییە مەزهەب داهێنراو

بێت، وەك پێشنیان دەیانکرد، بەڵکو لە دەرەوە هاوردە دەکرێت و ململانێی لەسەر دەکرێت، دیارە هەڵکشانی شارستانیەتی نوێ وایکردووە ئێستا مەزهەبەکان برژێنە عێراقەوە، نەوەك لەعێراقەوە هەڵقوڵێ، کێ دەزانێ لەوانەشە لە رۆژانی ئاییندەدا وەك زەمەنی پێشوو عێراق ببێتەوە سەرچاوەی مەزهەبەکان.

ئێستا عێراق بەوە وەسف دەکرێت کە ( شتی سڕاوە دەخوێنێتەوە) لەوانەیە ئەو وەسف دروست یان هەڵە بێت، بەڵام دەزانین گەلێکی خوێنەرە، ئەو زۆرترین رۆژنامە و گۆڤار و کتێب دەخوێنێتەوە، زیاتر لەهەر ولاّتێکی عەرەبی. دەزگاکانی چاپیش لە قاهیرە و بەیروت هەستیان بەمە کردووە و حسێبی بۆ دەکەن، بۆیە بەشی( شێر) لە بلاّوکراوەکانیان بۆ عێراق تەرخان دەکەن.

دەتوانم بڵێم کەسێك لە عەوامی عێراق زۆر شت لە هەقیقەتی سیاسی و رووداوەکانی جیهان تێدەگات، هاوشانی خۆی لە زۆر ولاّتانی پێشکەوتوو بەقەد ئەو تێناگەن، ئەو پرسیار دەکات و مشتومڕی لەسەر دەکات وەك ئەوەی بابەتەکە پەیوەندی راستەوخۆی بە ژیانی تایبەتی ئەوەوە بێت.

**ئایا ئەوان خائینن:**

یەکێك لەو وتانەی بە ئێستاشەوە لەبارەی خەڵکی عێراقەوە باوە، ئەوەیە ئەوان خائینن، بەڵێن دەدەن و دواتر پاشگەز دەبنەوە، وەك ئەوەی لەگەڵ حوسێنی کوڕی عەلیان ئەنجام داوە، بەدوایان نارد و داوایان دەکرد، دواتریش کوشتیان. عەلی بازرگان دەگێڕێتەوە لەساڵی ١٩٢١ لەمیوانداری مەلیك حوسێن بووە، کاتێك بروسکەیەك لەهەندێك سەرۆکەکانی عێراق بۆ مەلیك نێردراوە داوا دەکەن فەیسەڵی کوڕی وەك مەلیکی عێراق دابنێن، مەلیك پرسیار لەمیوانەکەی دەکات و دەڵێ" ئەی شێخ، من لەوە دەترسم خەڵکی عێراق بەو جۆرە مامەڵە لەگەڵ فەیسەڵ بکەن کە پێشتر لەگەڵ حوسێنی باپیرەیان کردووە"[٣٧٥].

من پێموایە ئەو وتەیە کە لەبارەی خەڵکی عێراقەوە دەکرێت خاڵی نییە لەهەڵە، ئێمە کاتێك رووداوی حوسێن بەوردی تاوتوێی دەکەین دەبینین زۆرێك لەوانەی بەدوای حوسێنیان ناردووە، بەشدارنەبوون لەکوشتنی، زۆرێکیش لەوانەی

---

[٣٧٥] علي ال بازركان (الوقائع الحقيقية في الثورة العراقية) ص ٢٣٠

بەشداربوون لەکوشتنی بەدوای حوسێنیان نەناردووە، ئەوکاتە عێراق دوو چینی دژبەیەکتر بوو: یەکێکیان لەگەڵ حوسێن بوو، ئەویتریان لەدژی حوسێن بوو، زۆرێک لەچینی یەکەم هات بۆ ئەوەی پاڵپشتی حوسێن بکەن، بەڵام بینیان کوژراوە، ئەگەر چەند رۆژێک کوشتنی حوسێن دوا دەکەوت ئەوا لەوانەبوو ئاراستەی رووداوەکان بگۆڕێت.

ئێمە نکۆڵی لەوە ناکەین، ئەوانەی بەدوای حوسێنیان نارد، خەڵکی کوفە بوون و کەمتەرخەم بوون لەپاڵپشتی کردنی و لەماڵەوە مانەوە، بەڵام دوای کوژرانی حوسێن هەستیان بەپەشیمانیەکی توند کرد، بۆیە رۆیشتن بۆ ئەوەی تۆڵەی بکەنەوە و هەمووشیان لەناوچوون، ئەوان لەمێژوو بە (تۆبەکاران) ناسراون، نموونەیەکی وەفاداری نایابان نیشان داوە.

دروستە خەڵکی عێراق بەوە وەسف بکەین لەناوخۆیان پەرتوبڵاون، بەڵام دروست نییە بڵێین ئەوان خائینن وەك ئەوەی لەبارەیان بڵاوبۆتەوە. دیارە عێراقیەکان جیاوازیان لەگەڵ خەڵکانی دیکە نییە، وەك چۆن ناپاك و خائینیان تێدایە، کەسانی وەفاداریشیان هەیە، بەڵام دووبەرەکی نێوانیان هەندێك جار وادەکات وەك ناپاك دەربکەون، چینێك لەنێوانیان دەردەکەوێت داوای شتێك دەکات ئەگەرهاتوو ئەم شتە هاتەدی، ئەوا چینێکی دیکە دەردەکەوێت داوا شتێکی پێچەوانە دەکەن، لێرەشەوە هەقیقەت ون دەبێت و ناویشیان دەزڕێت.

دەتوانین هەمان شت لەکاتی ئێستادا لەبارەی عێراقییەکان بڵێین، لێرەشەوە نهێنیەك لەگرنگترین نهێیەکانی کۆمەڵگای عێراقی خۆی حەشارداوە !

## دوا بەشی کتێبەکە

ئیعتراف بەوە دەکەم، ئەم کتێبەی لەبەردەستی خوێنەرە، بەس نییە بۆ پێدانی وێنەیەکی تەواو لەبارەی کۆمەڵگای عێراقەوە، مەبەستم لەدانانی ئەم کتێبە ئەوەبوو، بیکەم بە پێشەکیەکی گشتی بۆ ئەو کتێبانەی لەدواوەی دێن. کۆمەڵگای عێراقی وەك هەموو کۆمەڵگاکانی دیکە مرۆڤایەتی چەندین لایەنی هەیە، هەر لایەنێکیش پێویستی بەتوێژینەوەیەکی سەربەخۆ هەیە.

لەم کتێبەدا هەوڵم داوە گریمانەیەك روون بکەمەوە، کە بۆ توێژینەوەی کۆمەڵگای عێراقم بەکارهێناوە. دەشێ ئەو گریمانەیە گونجاو بێت یان نەگونجاو، بەڵام هەرچۆنێك بێت هەوڵێکی سەرەتاییە، لەوانەیە هاندەر بێت بۆ کەسانی دیکە بۆ ئەوەی بچنە ناو ئەو بابەتە ئاڵۆزەوە، دواتریش بەئەنجامی بەسوود بگەن. لەبارەی کتێبەکانی دیکەشمەوە، هەوڵ دەدەم توێژینەوە لەچەند لایەنێکی کۆمەڵگای عێراق بکە بەتێڕوانینی من پێویستە بۆ تێگەیشتن لەم کۆمەڵگایە. لەراستیدا من لەم کتێبەی ئێستامدا بەخێرایی بەلای کۆمەڵێك لەو بابەتانە تێپەڕیووم، بێئەوەی توێژینەوەیەکی تێروتەسەلیان لەبارەیەوە بکەم، کەواتە لەداهاتوودا دەگەڕێمەوە سەریان بۆ ئەوەی وردتر توێژینەوەیان لەبارەوە بکەم.

ناتوانم بانگەشە بۆ ئەوەی بکەم دەتوانم هەموو ئەو کتێبانە تەواو بکەم، کە بەنیازی نووسینیانم، لەمەشدا چەندین کۆسپ لەنێوان من و ئەم ویستەم هەیە، لەوانەش ئاستەنگی تەندروستی وهەندێکیش پەیوەندی بەتەندروستیەوە نیە.. لەخوێنەری ناشارمەوە بەساڵاچووم، وام لێهاتووە لەکاتی دەرچوونی هەرکتێبێکم بۆ خەڵك ماندووبوونێکی زۆر ببینم. لەوانەشە مەرگ پێم رابگات، بێئەوەی فریای تەواوکردنی کارەکانم بکەوم.

بەهەرحاڵ تاکە کتێبێك هەیە دەستم بەنووسینی کردووە، بەناونیشانی (مێژووی ململانێی تایفی لەعێراقدا). خوازیارم بارودۆخ لەباربێت بۆئەوەی بەزووترین کات بڵاوی

بکەمەوە. بەبڕوای من ئەم کتێبە تاوتوێی لایەنێکی گرنگی لایەنەکان کۆمەڵگای عێراقی دەکات، لەوانەشە گرنگترین لایەن بێت، ئەم بابەتەش مێژوویەکی درێژی لەعێراق هەیە و رەگوریشەیەکی قوڵی لەپێکهاتەی کەسێتی ورۆشنبیری کۆمەلایەتی عێراق داکوتاوە.

من دڵنیام لەوەی توێژینەوە لەبارەی ململانێی تایفی، بەدڵی زۆرێك لەخەڵكی عێراق نابێت، چونکە ئەوان وا راهاتوون لایەنگرانە سەیری ئەم ململانێیە بکەن، هەر تایفەیەك لەوان وا دەزانێ خۆی خاوەن هەقیقەتی رەهایە و بێگومان ئەویتریش ناهەقە، ئەمەش لەواقیعدا تێڕوانینی زۆرێك لەخەڵکە کاتێك ململانێی لەسەر بابەتێك لەبابەتەکان دەکەن.

سروشتی خەڵك وایە کاتێك لەسەر شتێك ململانێیان بوو، هەر لایەك لەسەر تێڕوانینی خۆی توندڕەویی دەکات، هەرچەندەش ململانێیەکە زیاتر بێت ئەوا هەر لایەنێك بۆ خۆی توندڕەویەکەی زیاتر دەبێت، ئەمەش بەتێپەڕبوونی رۆژگار کەلێنی نێوانیان فراوانتر دەکات. ئەم کاتەش هەر توێژەرێکیان دەویَ لەگەڵ توندڕەویەکەی ئەوان بێت، بەتێڕوانینی ئەوان سەیری هەقیقەت بکات، ئەوکاتەی توێژەر پاڵپشتی ئەوانی کرد ئەوا بە دادپەروەری دەزانن وریَزی دەگرن، ئەگەریش پێچەوانەی ئەوان بوو، ئەوا لێی تورەدەبن و جنێوی پیَ دەدەن، تەنانەت هێرشیشی دەکەنەسەر.

یەکێك لەپێویستیەکانی توێژینەوەی زانستی ئەوەیە توێژەر چەندە بتوانیَ دەبێت بێلایەن بێت، ئەگەریش بێلایەنی خۆی لەدەست دا، ئەوا لەوە دەردەچێت توێژەر بێت، بەڵکو دەبێتە بانگخوازێك. جیاوازیش لەنێوان توێژەر وبانگخواز هەیە، وەك دەردەکەوێت هەندێك لەنووسەر ورەخنەگرەکانمان بەروونی جیاوازی لەنێوانیان ناکەن. هەر لایەنێك بەدوای کەموکوری نەیارەکەی دەگەرێت و پەردەپۆشی کەموکورییەکانی خۆی دەکات، هەوڵیش دەدات بە بەڵگەی عەقڵی ونەقڵی پاساو بۆ کەموکورییەکانی خۆی بهێنێتەوە، بە هوتافکێشانەوە دەڵێ" ئەمە هەقە کە لەرێگای توێژینەوەی زانستی پێی گەیشتووم".

ئێمە ئێستا زۆر پێویستمان بەتوێژینەوەیەکی زانستی هەیە لەبارەی ململانێی تایفیەوە، چونکە تایفەگەری بۆتە یەکێك لەدەردە کوشندەکان کە کۆمەڵگای عێراقی بەدەستیەوە دەناڵێنیَ، لەوانەیە دروست بێت بڵێین شێوەی گرێیەکی شاراوەی لەکەسێتی تاکی عێراق وەرگرتووە. سروشتی گرێیە دەروونیەکانیش ئەوەیە هەرچەندە

لەقوڵایی دەروونەوە بمێنێتەوە ئەوا زیاتر هەڵدەقوڵێ، رۆژ لەدوای رۆژیش مشتومڕی لایەنگرانی لەسەر دەکرێت. دەبێت ئەم گرێیە بخەینە بەر رووناکی وبەهۆشیاریەوە توێژینەوەی بابەتیانەی لەسەر بکەین، بەمەش هیواخوازین لە رووێك لەرووەکانەوە بگەینە چارەسەرێك.

**لەبارەی رێبازی توێژینەوە:**

دەبێت لێرەدا ئاماژە بۆ ئەوە بکەم ، دوو رێباز (میتود)ی جیاواز لەیەکتر بۆ توێژینەوەی دیاردە وکێشە کۆمەڵایەتیەکان هەیە: یەکێکیان کۆن و ئەویتریان نوێ. دەتوانین یەکەمیان بە رێبازی (عەقلانی) ناو ببەین، ئەمەیان تێڕوانینێکی ئایدیالی و ئامۆژگاری بۆ کۆمەڵگا هەیە، ئەم تێڕوانینەش بەسەر زۆرێك لەبیرمەند وفەیلەسوفانی کۆن زاڵبووە، تەنها ئیبن خەلدون و ژمارەیەکی کەم نەبێت.

لێرەدا بواری قسەکردن نییە لەبارەی کەموکوڕیەکانی ئەم رێبازەوە، من لەکتێبێکی پێشووم بەوردی توێژینەوەم لەسەر کردووە[٣٧٦] . لێرەدا هێندە بەسە ئاماژە بۆ ئەوە بکەین رێبازی (عەقلانی) لەگەڵ رێبازی نوێی زانست ناگونجێ، یان دوو جەمسەری دژەیەکترن، کەچی جێگای داخە دەبینم هەندێك لەخوێندەوارانمان هێشتا ئەو هەقیقەتە نازانن، ئەوان پێیانوایە هەردوو رێباز یەك شتە، یان هەردووکیان ئەنجامی هاوشێوە بەدەست دەهێنن: ئەوەی عەقڵ بەبیرکردنەوەی ئەبستراکت بەدەستی دەهێنێ، ناکرێت پێچەوانەوەی ئەنجامەکەی زانست بێت. رۆژێکیان مشتومڕێکی درێژ لەنێوان من وکەسێك لەوان لەسەر ئەم بابەتە دروست بوو، چەندین بەڵگەی عەقڵی جۆراوجۆری هێنایەوە بۆ ئەوەی بۆچوونەکەی من پووچەڵ بکاتەوە، ئەو سەرکەوتوو بوو، لەبەر ئەوەی لەجەدەل لەمن بەتواناتر بوو، بەڵام هەقیقەت وەك خۆی مایەوە، ئەویش بریتیە لەوەی هەقیقەتەکە لەنێوەندە نوێیەکانی زانست باوە لەسەرتاسەری جیهاندا، ئەو کاتەش زاڵبوونی ئەو یان زاڵبوونی من سوودی نییە.

خاوەنەکانی رێبازی (عەقلانی) وا راهاتوون بە بیرکردنەوە کۆمەڵایەتیەکەیان لە کۆشکی بلوورین بژین، ئەگەر لەدەرفەتێکدا بە کۆڵان وبازاڕەکان تێپەڕین، تێکەڵی عەوام بوون، ئەوا بەتێڕوانینی خۆبەزلزانین و بەفیزەوە سەیریان دەکەن، نەرێتە هیچ

[٣٧٦] (منطق ابن خلدون في ضوء حضارته و شخصيته) القاهرة ١٩٦٢

وپوچەکانی و باوەڕە بەتاڵەکانیان بەقێزەوەن دەزانن. ئەوان پێیانوایە خەڵك لەبەر نەزانی وخراپی بیرکردنەوەیان وایان لێهاتووە، بۆیە توانایان هەیە خۆیان چاك بکەنەوە، ئەمەش ئەگەرهاتوو عەقڵیان بەکارهێنا وبەدروستی بیریان کردەوە.

شاراوە نییە ئەم بۆچوونە لەنێو کۆی ئەو کولتورە فیکریە هەیە، کە لەموعتەزیلەکان و کەلامییەکان بۆمان ماوەتەوە. ئەم کولتورەش لەفەلسەفەی گریکەوە وەرگیراوە، کە باوەڕی ڕەهای بەعەقڵ هەبوو، بەسەرچاوەی هەموو باش وخراپەکانی کۆمەڵگای دەزانی. کۆمەڵگا بەتێڕوانینی ئەم فەلسەفەیە شتێك نییە جگە لەکۆمەڵێك تاك، هەرتاکێك عەقڵی هەیە لەڕێگای ڕاست و گومڕابوون ڕێنمایی دەکات، کەواتە دەبێت کێشە کۆمەڵایەتیەکان لەپلەی یەکەمدا کێشەی عەقڵی بن، ئەگەرهاتوو عەقڵی تاکەکان چاك بوو، ئەوا ئاکاریان چاك دەبێت و سیستەمی کۆمەڵگاکە دروست دەبێت، نەکێشەیان دەبێت و نە دڵتەنگ دەبن!

لێرەوە ئەم پەندە هاتووە کە دەڵێ" ئەگەر خەڵك دادپەروەر بێت، دادوەر ئاسوودە دەبێت". لەراستیشدا خەڵك ناتوانن دادپەروەر بن بەپێی ئەو مانایەی بیرمەندانی کۆن تێگەیشتوون، چونکە دادپەروەری بابەتێکی ڕێژەییە، هەر کۆمەڵەیەك لەخەڵك پێیوایە زیاتر لەخەڵکانی دیکە دادپەروەرن، قورئانیش ئاماژەی بۆ ئەمە کردووە کە دەفەرموێ" کل حزب بما لدیهم فرحون".

## گاڵتەجاری عەقڵی مرۆڤ:

لەساڵی ١٩٥٥ کتێبێکم بلاوکردەوە بەناوی (گاڵتەجاری عەقڵی مرۆڤ). لەوانەیە من لەدانانی ناونیشانەکە هەڵە بووبم، یان بەلایەنی کەمەوە زێدەڕوییم لەناوەکە کردووە، بەڵام من ئەم ناوەم بۆ ئەوە بوو کەموکوڕیەکانی ڕێبازی (عەقڵانی) دەربخەم، کە بەسەر بیرکردنەوەی زۆرێکمان زاڵە.

گومان لەوە دانییە عەقڵی گرنگیەکی مەزنی لەژیانی مرۆڤایەتی هەیە، عەقڵ گرنگترین جیاوازیە کە مرۆڤ لە ئاژەڵی برای جیا دەکاتەوە، بەڵام لەهەمان کاتیشدا عەقڵ توانایەکی دیاریکراوی هەیە. هەڵەیە نکوڵی لەگرنگی عەقڵ بکەین، هەڵەیەکی دیکەش ئەوەیە تەواو متمانە بەعەقڵ بکەین، بۆیە دەبێت ئاستێکی ناوەندی لەنێوان ئەم دوو لایەنە هەبێت.

عەقڵ لەهەقیقەتی خۆیدا بەرهەمی کۆمەڵایەتییە، دروستکراوی ئەو رۆشنبیرییە کۆمەڵایەتییەیە کە مرۆڤەکەی تێدا دەژیت، ئەگەرهاتوو مرۆڤێك لەو چوارچێوە دەرچوو کە رۆشنبیرە کۆمەڵایەتیەکەی بەسەری فەرز کردووە، ئەوا ئەمەیان بەهۆی کاریگەربوونیەتی بە رۆشنبیری دیکەوە، لەم کاریگەریەشدا بەپێی چەند رێسایەك دەڕوات ناتوانێ لێ ئازاد بێت، کەمێك نەبێت. ئەگەر ئەو کەسە لەژینگەیەکی دابڕاو بووایە هیچی دیکە نەزانیبوایە ئەوا دەمانبینی تارادەیەکی زۆر لەگەڵی گونجاوە.

با گریمانەی ئەوە بکەین کەسێك لەنێو خەڵکانێك پێگەیشتووە بۆ نموونە سەگ دەپەرستن، ئەو کەسە لەژیانیدا جگە لەو پەرستنە هیچی دیکە نازانێ، ئەوا ئێمە ناتوانین پێشبینی بیرکردنەوەیەکی دروستی لێ بکەین لەبارەی سەگەوە، ئەگەر ئەو کەسە توانای جەدەلی هەبوایە ئەوا پەنای بۆ چەندین بەڵگەی عەقڵی دەبرد بۆ ئەوەی بسەلمێنی پەرستنی سەگ چاکترین دینداریيە لە (بوون)دا !

ئەم سروشتەی عەقڵی مرۆیی تەنها لە بەرامبەر بیروباوەڕەکان وا نییە، بەڵکو سروشتەکەی لەبەرامبەر هەموو بیرۆکەو سیستەم و ئەو نەریتانە وایە کە باوەڕی بەراستیەکەیەتی. زانایان توێژینەوەیان لەبارەی سەرجە گەلانی جیهان کردووە، بۆیان دەرکەوتووە، ئەوانەی هەندێکیان بەهەقی دەزانن، لەلای ئەوانی دیکە نادروستە، ئەواویش لەخۆیان دڵنیان وەك چۆن ئێمە لەشتەکانی خۆمان دڵنیاین[٣٧٧].

پوختەی قسەکان ئەوەیە کاتێك ئێمە دەبینین خەڵك لەنێو نەریتی هیچ وپوچ و بیروباوەڕی نادروست نقوم دەبن، تەنها ئەوەندە بەس نییە بانگهێشتیان بکەین بۆ بیرکردنەوەی دروست، چونکە ئەوان کاتێك بیریش بکەنەوە ناتوانن بەشتێك بگەن لەوە جیاواز بێت کە لێی راهاتوون. لەهەمان کاتیشدا باوەڕێکی یەکلاکەرەوەیان هەیە کە بیرکردنەوەیان زۆر دروستە و ئەوە ئێمەین بیکردنەوەمان بێکەڵکە.

مرۆڤ هەردەم وادەزانێ ئازادە لەبیرکردنەوەدا، کەچی لەراستیدا ئەو تا رادەیەکی زۆر کۆت وبەند کراوە، لە ئازادی بیرکردنەوەیدا دەکەوێتە ژێر کاریگەری کۆمەڵێك هۆکارەوە بەڵام زۆر کات هەستی پێ ناکات و لە نەستی ئەو دا هەیە، تورەش دەبێت ئەگەر کەسێك لەمەدا ئاگاداری بکاتەوە.

---

[٣٧٧] William Sumner(folkways )p.521

**یاساکانی کۆمەڵگا:**

ئیبن خەلدون دەڵێ):کۆمەڵگای مرۆیی چەندین ڕێسای هەیە، بەڕێوەی دەبەن، وەك یاساکانی سروشتە). ئەوەی دەیەوێ کۆمەڵگا چاك بکات، ئەوا دەبێت ڕەچاوی ئەو ڕێسایانە بکات، ئەگینا سەرناکەوێت. ئەم بۆچوونەی ئیبن خەلدون خاڵی نییە لە زێدەڕۆیی لەهەمان کاتیشدا خاڵی نییە لە هەقیقەت. کۆمەڵگا تەنها کۆمەڵێك تاك نییە، وەك بیرمەندانی کۆن تێگەیشتوون، بەڵکو لەمە زیاترە، قەوارەیەکی سەربەخۆیە بەسەر ئەو تاکانە زاڵ دەبێت کە لێیوە پێکهاتوون، بەشێوەیەك لەشێوەکانیش ڕێسای خۆی هەیە لەسەری دەڕوات.

نکۆڵی لەوە ناکەین جیاوازی زۆر هەیە لەنێوان ڕێساکانی ماددە وڕێساکانی کۆمەڵگا. یەکەمیان یەکلاکەرەوەیە هەموو گەردیلەکانی ماددە بە تەواوی ملکەچی دەبن، ڕێزپەڕ ویاخیبوونی تێدا نییە، کەچی ڕێساکانی کۆمەڵگای ئەو یەکلاکەرەوەیەی نییە، لەتوانای هەندێك لە تاکەکانی هەیە زۆر یان کەم ڕیزپەڕ بن، بەڵام دەبێت ئەوەش لەبیر نەکەین ئەو تاکانە لەخۆیانەوە ڕیزپەر نابن یان تەنها بەهۆی بیرکردنەوەی ئەبستراکتەوە (المجرد) نییە، بەڵکو دەکەونە ژێر کاریگەری بارودۆخێکی دیاریکراوەوە، جا کۆمەڵایەتی یان دەروونی یان هەرشتێکی دیکە بێت. ئەمەش وادەکات ڕەفتاریان لەکەسانی دیکە جیاواز بێت، ئەگەر بارودۆخیان وەك بارودۆخی ئەوانی دیکە بووایە ئەوا لەزۆرترین حاڵەتدا جیاوازیان نەدەبوو.

ئێمە لەوانەیە ببینین تاوانبارێکی خوێنڕێژ خەڵك ئازار بدات ورەچاوی هیچ هەقێکیان نەکات، ئێمە مەزندە دەکەین ئەمەی بە خواستی خۆی کردووە، کەچی لەراستیدا ئەمەی بەپاڵنەری کۆمەڵێك هۆکارەوە کردووە ویستی خۆی لەو هۆکارانەوە نەبووە، بۆیە دەبینین گەلانی پێشکەوتوو هەوڵی چارەسەکردنی تاوانبار دەدەن نەوەك سزادانی، چونکە بەتێڕوانینی ئەوان ئەو کەسە لە ڕەفتارە ڕیزپەڕەکانی بەرپرسیارێتی تەواوی نییە. بەرپرسیارێتی زیاتر دەکەوێتە سەر بارودۆخەکەوە دەبێت، لێرەشەوە ئەو وتە بەناوبانگە هاتووە:(ئەگەر هەموو شتێك بزانی ئەوا لە مرۆڤ کەسێك خۆش دەبیت).

تکام لەخوێنەر ئەوەیە وا تێنەگات مرۆڤ لە هەموو کارەکانی ناچارکراوە و مەجبورە بیکات وەك ئەوەی غوبار بێت بکەوێتە دەم هەڵکردنی (با) وە. ئەمە توندڕەوییە وەك توندڕەوی ئەو کەسانەی دەڵێن مرۆڤ سەرپشك و ڕێگەپێدراوە لەهەموو کارەکانی.

لە ئیمامی جەعفەری کوڕی محەمەد دەگێڕنەوە گوتویەتی" نە ناچاری و نەسەرپشتی، بەڵکو بابەتەکە نیوە بەنیوەیە". بەراستی ئەمە وتەیەکی گرنگە سروشتی مرۆڤمان بە جوانترین شێوە بۆ پوخت دەکاتەوە. مرۆڤ بڕێك لە ئازادی لەکارەکانی هەیە، بەڵام ئەو ئازادیە سنووردارە و لەکاتی سەرسامبوونی ڕوودەدات، بەمەش سەرسامبوون وئازادی پەیوەستن بەیەکترەوە.

گەردیلەکانی مادە لەجوڵەکانیان سەرسام نابن، ئاژەڵیش هەروایە، کەچی لەلای مرۆڤ چەندین پاڵنەر دەکەونە ململانێی یەکترەوە، هەندێکیان بەرەو ڕێگایەکی دیاریکراوی دەبن وبەشێکی دیکەش بۆ ڕێگایەکی تر، ئەمیش لەوکاتەدا دوودڵ و سەرسام دەبێت نازانێ بەرەو کێ بچێت، لێرەدا ژیرییەکەی هاوکاری دەبێت لەگونجاندی هەردوو ڕێگەکە یان دۆزینەوەی ڕێگای سێیەم و باشتر. ئەمەش حاڵەتی سەرکەوتوو وبلیمەتەکانە، لەوانەشە مرۆڤ لەو ڕێگایە لابدات و تووشی شێتی و تاوان بێت.

شایەنی باسە ئەمەش ڕوونادا تەنها لەنێو کەسانێکی کەم نەبێت، کەچی زۆرینەی خەڵك لەژیانیان لەسەر ڕێگایەك دەڕۆن خاڵییە لە هەر سەرسامی و ململانێیەك. ئەمەش لەنێو خەڵکی عەوام هەیە، بەتایبەتی لەنێو ئەوانەی ڕۆشنبیرییەکی کۆمەڵایەتی داکەوتوو دەژین، ئەوان لەگەڵ تەوژمی گشتی دەڕۆن وشتێك نازانن تەنها ئەوەی نەبێت نەوە دوای نەوە لێی ڕاهاتوون وتێیدا ئاسوودەن. ئەوان وا دەزانن نەریت وبەها وباوەڕەکانیان هەموو کێشەیەکی بۆ چارەسەرکردوون هەموو ناڕۆشنیەکی ڕوونکردۆتەوە، بۆیە بێ هیچ گومان و سەرسامیەك لەسەری دەڕۆن، تاکیش لەنێویاندا وا خەیاڵ دەکات سەرپشکە لەکارەکانی کەچی لەڕاستیدا ئەو تاڕەدایەکی زۆر ناچارە لەئەنجامدانی کارەکانیدا.

مرۆڤ کاتێك ململانێ دەکەن یان هاریکاری یەکتر دەبن، کاتێك باوەڕدەهێنن یان کافر دەبن، کاتێك تورە دەبن یان ڕازی دەبن، کاتێك پێشکەوتوون یان دواکەوتوون، هەر لەدێرزەمانەوە تا ئێستا بینیومانە لەسەر یەك هێلی هاوشێوە دەڕۆن، لەوانەیە ئەوان لە

شێوەی رووکەشدا جیاواز دەبن، جلیان گۆڕاوە وچەکیان گۆڕاوە و شارستانیەتیان پێشکەوتووە، کەچی لەناخیاندا وەك هەموو مرۆڤەکانی دیکەن کە لەمێژوودا هەبوون.

**نموونەکانی یوتوپیا:**

زانستە سروشتیەکن توانیویەتی لەزاڵبوون بەسەر ماددە سەربکەوێت، بەوەی وزەکەی بەکاربهێنێ، ئەمەش لەرێگای توێژینەوەی بابەتەی ئەو رێسایانی کار بەماددەوە دەکەن، بۆنموونە ئەوەی دەیەوێ وەزی ئاوی تاڤگە بەکاربهێنێت، دەبێت شارەزاییەکی زۆری لە سروشتی رێڕەوی ئاو و رێساکانی هەبێت، کەچی ئەگەر ویستی بەنداوێك دروست بکات، ئەوا بێ ئەزمونەکەی پێشووی، کارەکەی فەشەلێکی گەورەی دەبێت.

ئەم قسەیەمان بۆ ئەو کەسانەش راستە کە دەیانەوێ رێڕەوی کۆمەڵگا بگۆڕن، یان وزەکانی بەکاربهێنن. دیارە کەسانی خاوەن رێبازی (عەقڵانی) درك بەم هەقیقەتە ناکەن، یان حەزناکەن درکی پێ بکەن، چونکە لەرەگ وریشەوە پێچەوانەی رێبازەکەی ئەوانە. ئەوان وا راهاتوون خەیاڵی چەندین نموونەی یوتوپیا بۆ کۆمەڵگا بکەن، دواتریش ئامۆژگاری بریقەدار دەخنە مێشکی خەڵکەوە بەچاوپۆشین لە سروشتی ئەو کۆمەڵگایە ئەو خەڵکانە تێیدا دەژین، کاتێکیش لەمە سەرکەتوو نابن ئەوا خۆیان لەخەڵك لوتبەرز دەکەن وقێز لە کۆمەڵگا دەکەنەوە، گلەیی لەخەڵك دەکەن کەچی خۆیان شایەنی گلەیین.

ئەفلاتون کەیەکێك بوو لەفەیلەسوفانی گریك نموونەی کۆمەڵگایەکی چاکەخوازی لەکۆمارەکەی وێنا کردووە، فارابیش کە لە فەیلەسوفانی ئیسلام بووە لە (شاری چاکەخوازی) لەسەر رێگای ئەفلاتون رۆیشتووە. کاتێك کتێبەکەی فارابی دەخوێنینەوە دەبینین شاری چاکەخوازی بەوە وەسف دەکات خەڵکەکە هاریکاری یەکترن بۆ بەدەسهێنانی کامەرانی راستەقینە. کاتێك هەر کەسێك بە کاری خۆی هەڵبستێ و لەپیشەکەی کارامە بێت وکارەکەی تەواو کرد ئەوا کۆمەڵێك کۆششی رێکخراو و گونجاو وخۆشیەکی بێ ئەندازە بەدەست دەهێنێ کە هەموو مرۆڤایەتی خەونی پێوەدەبینی. ئەو دەڵێ هەماهەنگی نێوان ئەندامانی شاری چاکەخوازی وەك هاوسەنگی نێوان ئەندامەکانی لەشە، جیاوازیش لەنێوان پێکهاتەی لەش و پێکهاتەی شارەکە ئەوەیە

ئەندامانی لەش سروشتێ و ناچارکراون هیچ درککردن و هەڵبژاردنیان بۆ نییە، کەچی ئەندامی شار بەپێی کارو ڕەزامەندی خۆیان یەکدەگرن، جا ئەگەر بیانەوێ یەکگرتوو بن، یان پەرت وبڵاو بن، ئەگەر ویستیان بەدوای دانایی وکامەرانی دەچن، ئەگەریش نا ئەوا بەدوای نەزانی و گومڕایی دەچن[٣٧٨].

فارابی ئەو بۆچوونە (مەزنە)ی هێنا وئاسوودەبوو، وەك ئەوەی دەرمانێکی سیحری بە مرۆڤایەتی دابێت، دەتوانن بەو دەرمانە هەموو ئەو کێشە ودەردانە چارەسەر بکەن کە بەدەستیەوە دەناڵێنن، کەواتە هیچیان لەسەر نییە تەنها بەکاری بهێنن و ئیتر هەتا هەتایە لەنیعمەت دەژین. ئەو بۆ چرکەساتێك نەوەستاوە تا سەیری سروشتی مرۆڤایەتی بکات کە ناچاری کردووە، ئایا ئەوان بەم سروشتە دەتوانن لەخودی خۆیان ئەو هاوکاری و گونجانە دروست بکەن تەنها بەوەی ویستی خۆیان ئاراستە بکەن.

ئەمە هاوشێوەی ئەو چیرۆکە ڕەمزئامێزە ناسراوەیە، گوایە کۆمەڵێك مشك کۆبوونەوە، بۆئەوەی بەدوا ڕێگایەك بگەڕێن لە مەترسیەکانی پشیلە نەجاتیان بدات. دواجا لەسەر ئەوە ڕێکەوتن بە پەتێکەوە زەنگوڵێك بخەنە ملی پشیلەکەوە، جا ئەگەرهاتوو هەڵیکوتایە سەریان گوێبیستی دەنگەکە دەبن، ئەوا دەتوانن لەکاتێکی گونجاو رابکەن. وەك شاراوەن نییە ئەو پێشنیارەی لەسەری ڕێکەوتوون زۆر دروست لەرووی تیۆریەوە، کەچی تاکە کەموکوریەکەی ئەوەیە کرداری نییە، چۆن دەکرێت مشکەکان گردەنی مشەکە بگرن و زەنگوڵەکەی بۆ ببەستن بێئەوەی بیانخوات؟!

کتێبی نووسەرێکی عێراقیم خوێندەوە بەم نزیکانە دەرچووە، تێیدا هاتووە:

"... بەڵێ ئەگەر موسڵمانان درکیان بە ئاسانترین خەسڵەتی برایەتی نێوانیان بکردایە، کاریان پێدەکرد، ئەوا ستەم و دوژمنایەتی لەسەر زەوی نەدەما، ئەو کاتە مرۆڤەکان وەك برا دەبینی وکامەرانی کۆمەڵایەتی لەنێوانیان دەبوو، خەونی فەیلەسووفانیش لە شاری چاکەخوازی دەهاتەدی. کاتێك خۆشەویستیان لەنێوان دەبوو ئەوا پێویستیان بە حکومەت و دادگا نەدەبوو، پێویستیان بە پۆلیس ، زیندان، یاسای سزادان ، بڕیاری سزادان نەدەبوو، ملکەچی داگیرکەر وزۆردار نەدەبوون، ستەمکار ئەوانی

---

[٣٧٨] الیاس فرح (الفارابي) ص ٩٩

نەدەچەوساندەوە، ئەوکاتە زەوی، زەویەکی دیکە دەبوو، بەهەشت و ماڵی کامەرانی دەبوو".

دەمەوێ لەو نووسەرە بەرێزە بپرسم: چۆن دەکرێت مرۆڤەکان برای یەکتر بن و هەموو ئەو رق و کینەیان لەبیر بکەن کەپێشتر لە دەمارگیری و گۆتەگۆتەوە لەسەری راهاتوون؟ ئایا نووسەر دەتوانێ خۆی ئەمە لەبەرامبەر نەیارەکەی بکات، مرۆڤ ناتوانێ ئەمە بکات، تەنها ئەو کاتە نەبێت لە مرۆبوونی خۆیان دەربچن و وەك فریشتە لەقورێکی دیکە بن!

(عەقلانییەکان) لەوە راهاتوون نموونەی ئایدیالی بەرز دابنێن، بێئەوەی بایەخ بەشێوازی کردەیەکەی بدەن، وا هەستدەکەم ئەوان حەزناکەن لەمەدا بەبیرکردنەوە خۆیان نیگەران بکەن، چونکە ئەم رێگایە فراهەمە، مادەمەکی مرۆڤەکان عاقڵن، چاکە و خراپە لەیەکتر جیادەکەنەوە،کەواتە لەگەڵ یەکتر هاوکار دەبن وهەماهەنگیان دەبێت، بۆ ئەوەی درك بە سوودەکەی بکەن.

**سروشتی دەمارگیری( عەقلانی ):**

کاتێك کەسێکی (عەقلانی) بیرۆکەیەکی هەبوو، بۆی پەرۆش بوو، وادەزانێ هەموو خەڵك هەمان پەرۆشیان دەبێت، خەون بەوە دەبین بۆ بیرۆکەکەی هانیان بدات و فێریان بکات. بەتێڕوانینی خۆی بیرۆکەکەی روونە وهیچ گومانی تێدا نیە، بۆیە وا دەزانێت لەتێڕوانینی هەموو مرۆڤەکانی دیکەوە وایە، ئەمە ئەگەر عەقڵێکی دروستیان هەبێت. کاتێك کەسێکی (عەقلانی) پۆستێکی بەرزی دەبێت یان دەسەڵاتی دەبێت ئەوا هەموو کوشکێشەکان(موجامەلەچییەکان) لەدەوری دەبن، چەپڵەی بۆ لێ دەدەن وبەرەو پیری دەچن، ئەو وا خەیاڵ دەکات خەڵك هەمووی باوەڕی بە بیرۆکەکە هێناوە، ئەو کاتە بۆ خۆیان کامەرانی وخۆشگوزەرانی بەدەست دەهێنن، هەرکە کەسێك پێچەوانەی بۆچوونی ئەو بوو، ئەوا تورە دەبێت و وادەزانێ ئەوکەسە دەبێت کەلەڕەق یان بەئیرەیی و نەزان بێت، بەهەرحاڵ قورپەسەری [٢٧٩].

زۆرێك لە دژایەتیە توندەکانی نێوان بیرمەندان وخوێندەواران لەسەر ئەم بنەمایەوە دەبێت، ئەوان لەمەدا جیاوازیان لەگەڵ عەوام وخەڵکی نەزان نییە، تەنها لەرووخسار

[٢٧٩] Schiller (formal logic)p. 393-399

نەبێت. کەسی نەزان کاتێك هێرش دەکاتە سەر نەیارەکەی و دڵرەق دەبێت ئەوا بەپێی نەریت وئەو باوەڕە دەبێت کە لەسەری پەروەردە کراوە، کەچی خوێندەوار نەریت وباوەڕی دیکەی هەلگرتووە بەپێی بارودۆخە جیاوازەکەی، بەڵام لەگەڵئەوەشدا وەك کەسێکی نەزان دەمارگیر دەبێت، جیاوازییەکە تەنها ئەوەیە لەبیرکردنەوەی بەلگەی عەقڵی دەهێنێتەوە بۆ پشتگیری بۆچوونەکەی، ئەویتریان نازانێ بەلگەی عەقڵی چییە بەڵکو لەرەفتارەکەی بە زگماکی و ساویلکەیی هەڵسوکەوت دەکات.

**چەند وانەیەکی بەسوود:**

لەعێراق برێکی زۆری لەم جۆرە ململانێیەمان لەئەنجامی (لەرزینەکەی) چواردەی تەمموز بینی، لەراستیدا ئەم (لەرزینە) کۆمەڵگای عێراقی هەڵتەکاند، ئەوەی شارەوە بوو دەریخست و ئەوەی نارۆشن بوو روونی کردەوە، بۆیە دروستە ئەگەر بڵێین چەند قوربانی بە ئێمە داوە، هێندەش وانەی فێرکردووین.

گەلی عێراق لەسەردەمی عوسمانییەکان بەدەست ململانێیەکی توندی نێوان توێژە جیاوازیەکانیەوە دەیناڵاند، بەڵام ئەو ململانێیە لەسەر بنەمای دەمارگیری و هۆزگەری و شارچیەتی و تایفی و هاوشێوەی ئەو شتانە بوو، وەك لەبەشەکانی پێشوشدا ئاماژەمان بۆکرد. دوای نەمانی عوسمانی نزیکەی (٤٠) ساڵ ماوەیەکی دیکە هات، وەك دەرکەوت ئەم ماوەیە بەس نەبوو بۆ ئەوەی گەل ململانێی کۆنەکانی لەیاد بکات. کاتێکیش (لەرزینەکەی ١٩٥٨ ) روویدا ئەوا گەلی عێراق سەرلەنوێ کەوتەوە ململانێ.

ئەم ململانێیە نوێیە بە دروشم و بنەمای نوێ رەنگ کرابوو، کەچی لەناخەوە رەگوریشەی کۆنی هەبوو. لەراستیشدا نەیتوانی خۆی لەوە دەرباز بکات کە لە نەستەوە هەبوو بۆیە هەوڵی تەقینەوەی دەدا لەکاتی رەخساندی هەلێك. بۆیە بینیمان جووتیار لە لادێ و کوڕی سەرشەقام لە شار، جۆرەکانی دیکەی عەوام کە زۆرینەی گەلی عێراقیان پێك دەهێنا، خۆپیشاندانیان دەکرد وهەڵپەیان دەکرد وپەرۆشبوون بۆ دەرفەتەکە، بەڵام لەقوڵایی دەروونیانەوە مەبەستیان هەر ئەوەبوو کە لە هەراوهۆسەکانی کۆن ئەنجامیان دەدا.

هەندێك لەخوێندەواران هاتن هانی عەوامیان دەدات لەم ئاراستەیەدا، بەبەلگەی عەقڵی پاڵپشتیان دەکردن، هەر کەسێکیش پێچەوانەی ئەوان بووایە ئەوا دەبوایە (خائین) یان

نۆکەری ئیستعمار بێت. بۆیە ئاژاوەگێڕان بەدوای خائینەکان دەگەڕان بۆ ئەوەی لێیان بدەن، وەك چۆن لەساڵی ۱۹۰۸ بەدوای لایەنگرانی (مەشروتیە) و لە ساڵی ۱۹۲٤ بەدوای لایەنگرانی (سفور) دەگەڕان، کەواتە ئەوان نەگۆڕابوون بەڵکو ئەو دروشم و بنەمایانە گۆڕابوون کە خۆپیشاندانیان بۆ دەکرد.

لێرەدا مەبەستم جەماعەتێکی دیاریکراو و یان حزبێك نییە، بەڵکو هەموویان وەك یەکن، هەموویان لەیەك چوارچێوەی فیکری دەست پێدەکەن ولەبارودۆخێکی هاوشێوە دەژین، بۆیە کاتێك کۆمەڵێك بەسەر نەیارەکەی دەکەوێت هەمان ئەو کارانە دەکاتەوە کە نەیارەکەی ئەنجامی داوە، یان لەوێش تێپەڕدەکات[۳۸۰].

## وەبیرهاتنێکی گرنگ:

ئەوەی لێرەدا شایەنی باسە ڕەوتی(عەقلانی) تەنها تایبەت نییە بەعێراقەوە، بەڵکو ڕەوتێکی جیهانیە لە گریکی کۆنەوە دەستی پێکردووە، دواتر بەنێو زۆربەی گەلانی شارستانیەتی کۆن بڵاوبۆتەوە، تەنانەت هەتا ئێستاش لێرە ولەوێ بڵاوە. تێبینی دەکرێت لەئەوروپا لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەم وسەرەتای سەدەی نۆزدەهەم بوژاوەتەوە. ئەم ڕەوتە یەکێك بوو لەهۆکارەکانی هەڵگیرسانی شۆڕشی فەرەنسا، ئەو شۆڕشەی کە یەکێك لەسەرۆکەکانی سەماکەرێکی شۆخی هێنایە سەر تەختی هۆڵێکی گشتی وەك ڕەمزێکی عەقڵ ئەم سەماکەرەی نیشان دا و داواشی لە خەڵك کرد لەبری خودا بیپەرستن.

ئەم هەڵچونە فیکریە لە ئەوروپا هاوکات بوو لەگەڵ کۆمەڵێك شۆڕشی دیکە کە ناوە ناوە بەدوای یەکەوە دەهاتن، لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەمیشەوە عەقڵ دەستی کرد بەوەی لە بەرزاییەکانی خۆی بێتەخوارەوە[۳۸۱]. لەوکاتەشەوە توێژینەوە زانستیەکان کەموکوڕیەکانی عەقڵی مرۆیان ئاشکرا دەکرد لەگەڵ ئەو (دەبەنگیانە)ی زۆرجار عەقڵ تێیوەدەگلێ.

[۳۸۰] سەیری کتێبی (الاحلام بین العلم والعقیدة) بکە کە لەساڵی ۱۹۵۹ بڵاوم کردۆتەوە، لاپەرە ۲۷۲ و دواتری – عەلی وەردی

[۳۸۱] William Albig (Public Opinion)p. 9-11

ئەو توێژینەوە زانستیانە لە ئەوروپا کاریگەریەکی زۆریان لەسەر رای گشتی هەبوو. بەشێوەیەك وایکرد بەرەو پێگەیشتن و دروستی بچن، بەمەش ململانێی توندی نێوانیان بووە ململانێیەکی هێمن، خوێنی تێدا نەدەڕژا و پێشێلی بەهاکان نەدەکرا.

خەڵك لەوێ هێشتا ململانێی لەسەر بۆچوون و مەزهەب وحزب دەکەن، بەڵام ململانێیان لەسەر بنەمای رێزگرتنی هاوبەشە تارادەیەکە گاڵتەی پێ ناکرێت. تاکێك لەوان کاتێك بۆچوونێکی دەبێت هەوڵ نادات بەهێز بەسەر خەڵکی دیکەی بسەپێنێ، بانگەشەش بۆ ئەوە ناکات، تەنها ئەو خاوەن هەقی رەهایە.

ئەو سیستەمە دیموکراسیەی ئەوان پەیڕەوی دەکەن، لەسەر ئەم بنەمایە وەستاوە. گومان لەوە نییە ئەنجامدانی ئەوە لەدوای ئەوە وایکردووە لەسەری رابێن و ببێتە بەشێك لە نەریتی کۆمەڵایەتیان بەشێوەیەك لەماڵ وقوتابخانە و کۆڕ وکۆبوونەوەکان لەسەری بڕۆن.

لەوانەیە شیاو بێت بڵێم گەلی عێراق ئێستا لە هاوشێوەی ئەو چوارچێوە فیکریە دەژیت کە ئەوروپا بەر لەدوو سەدە، یان بەلایەنی کەمی بەر لەسەدەیەك تێیدا ژیاوە! لەوانەشە زیاتر بەو چوارچێوە فیکریەوە سەرقاڵبوو‌بێت لە ئەنجامی ئەو رەوتە جەدەلیە بەهێزەی لە فەیلەسوفانی کۆن بۆیان ماوەتەوە.

تاکی عێراقی بۆی قبوڵ ناکرێت کەسێك پێچەوانەی بۆچوون و بیروڕای ئەو بێت. درك بەوە ناکات کەسی دیکە بۆ بۆچوون و باوەڕی خۆی وەك ئەو دڵسۆزە، ئەگەر لە ماڵی ئەو یان گەڕەك و لەنێو تایفەی ئەو گەورە بوایە، ئەوا بیرکردنەوەی لەگەڵ ئەو جیاوازیەکی زۆری نەدەبوو، وەك دەردەکەوێت تاکی عێراقی درك بەم هەقیقەتە ناکات، بۆیە دەبینین مەیلی دوژمنایەتی بۆ ئەو کەسانە هەیە کەپێچەوانەی ئەون و خۆشی بەراست دەزانێ.

**پرسیار و وەڵامێك:**

لەوانەیە کەسێك بپرسێت: تاکەی گەلی عێراق بەمشێوەیە لەژێر دەسەڵاتی رەوتی (عەقڵانی) توندڕەو دەمێنێتەوە و بۆئەوەی بەمشێوەیە بەرەو ئەم ئاراستە توندەی بەرێت؟!

من پێموایە گەلی عێراق دەبێت بیرکردنەوەی خۆی بەرەوپێش ببات، وەك چۆن گەلانی ئەورووپا پێشیان خستووە. لەوانەیە هی عێراق هێواش بێت ئەمەش لەبەر توندی دەسەلاتی رەوتی (عەقلانی) بەسەریەوە، بەلام زوو یان درەنگ دەبێت بگۆردرێت، ئەو ئەزمونە سەختانەی پێیدا تێپەریوە، چەندین وانەی رەوانی فێرکردووە، ئەگەر ئەو لەو وانانە نەگات ئەوا تووشی ئەزمونی سەختتر دەبێت، لەوانەشە کارەسات و نەهامەتی بەدواوە بێت، ئەمەش هەر ناچاری دەکات چوارچێوەی بیرکردنەوەکەی بگۆرێت.

لێرەوە رووبەرووی پرسیارێکی دیکە دەبینەوە: ئایا واز لەگەلی عێراق بهێنین بۆ ئەوەی جار لەدوای جار تووشی ئەزمونی سەخت بێتەوە تا لەخۆیەوە وانەی لێوەربگرێت، یان دەبێت دەستی بگرین و رێگای دروستی نیشان بدەین؟

دەتوانین بلێین بارودۆخی ئێستای عێراق پێویستی بەپلاندانان و چارەسەرکردنی بابەتیانە هەیە، بەگوێرەی ئەوەی بارودۆخە ناوخۆیەکەی بەرگەی دەگرێت. خەیالی ئەوە دەکەم هۆکاری بەسوود بۆ ئەم مەبەستە ئەوەیە گەلی عێراق لەژیانی دیموکراسی رابهێنرێت، تا بەشێوەیەکی کردەیی جێبەجێی بکات، بەشێوەیەك رێگا بەهەر توێژێك بدرێت ئازادانە رای خۆی دەربرێت و دەنگ بدات، بێئەوەی توێژێکی دیکە بۆچوونی خۆی بەهێز بەسەر ئەوانی دیکە فەرزبکات. تەنها ئەوەندە بەس نییە گەلێك لەرووی تیۆریەوە هەڵەکانی خۆی بدۆزێتەوە، بەڵکو پێویستە لەرووی کردارەوە شێوازی دروست جێبەجێ بکات و لەو کاتە درك بەئەنجامەکانی دەکات.

لەوانەیە یەکێك رەخنەمان لێ بگرێت و ئەو بۆچوونەمان بە یوتوپیا وەسف بکات، چۆن دەکرێت گەلی عێراق واز لەبەهاکانی گەرەك و دەمارگیریەکانی بهێنێ، لەژیانێکی دیموکراسی بێ توندوتیژی ودوژمنایەتی بژیت؟ ئایا ئەوە لەبیر بکەین دوای چواردەی تەمموز بەخەلك گوترا (ئێوە ئازادن لەوەی دەیڵێن و دەینووسن) کەچی ئەوان شەریان لەگەلْ یەکتر دەکرد و یەکتریان دەکوشت؟

بەراستی ئەمە رەخنەیەکی دروستە، بەلام ئەوەی دەمەوێ سەرنجی بۆ رابکێشم ئەوەیە، ئەوکات خەلك لەبارێکی دەروونی و کۆمەلایەتی ناسروشتی دابوون، بارودۆخەکە دیموکراسی نەبوو، بەلکو ئاژاوەگێری بوو، خەلك بەشێوەیەك خەیالیان کرد کە دونیا کۆتایی پێهات و ئەوەی ئێستا دەیکەن، بەیانی لێپرسینەوەی لەسەر نییە.

وەك دەردەکەوێت زۆرێك لەوانەی لەو ئاژاوەگێڕییە تێوەگلان، ئێستا هەست بەپەشیمانی دەکەن، ئەوان درکیان بەوە کرد لە وەهمدا بوون کاتێك خەیاڵیان کرد دونیا کۆتایی پێهاتووە، ئەوەی ستەم لەکەسانی دیکە دەکات ئەوا ئەمڕۆ ستەمی لێ دەکرێتەوە؛ ڕۆژگارە بەمشێوەیە دەسوڕێتەوە: ڕۆژێك بۆ تۆیە و ڕۆژێك لەدژی تۆیە !

دەبێت ئەو هەلە بقۆزینەوە کە ڕەخساوە، ئێستا عێراق لەدووڕیانێك وەستاوە، ئێستا کاتی ئەوەهاتووە دەست بەجێبەجێکردنی سیستەمی دیموکراسی بکرێت، ئەگەر ئەم هەلەمان لەدەست بچێت ئەوا بۆماوەیەکی دوور لەدەستی دەدەین.

نکۆڵی لەوە ناکەین جێبەجێکردنی سیستەمی دیموکراسی لە ئێستادا بەتەواوی خاڵی نابێت لە توندوتیژ و هەرا، گەلی عێراق لەتوانای نییە لەشەو وڕۆژێکدا ببێتە گەلێکی دیموکراسی جێگیر هاوشێوەی گەلانی دیکە پێشتر بە دیموکراسی گەیشتوون، بەڵکو پێویستی بە ماوەیەك جاری لەدوای جار سیستەمی دیموکراسی جێبەجێ بکات، لەهەر جارێکدا توانستی زیاتر دەبێت و زیاتر لەجاری پێشوو لێی ڕادێت.

دیموکراسی بیرۆکەیەکی ئەبستراکت نییە، تا لەقوتابخانەکان بگوترێتەوە یان لە وتار و هوتاف باس بکرێت، بەڵکو ڕاهاتن و جێبەجێکردنە لەڕووی کردارەوە، ئەگەرهاتوو بە گوفتار دیموکراسی دەرکەوتین و لەڕووی کرداریشەوە ئەنجاممان نەدا، ئەوا بەمشێوەیە دەمێنینەوە هەندێکمان بەسەر هەندێکی دیکەوە زاڵ دەبێت و ئەمەش کۆتایی نایەت!

لەوانەیە لەکاتی جێبەجێکردنی دیموکراسی هەندێك بیانەوێ ساختە لەهەڵبژاردن بکەن و یاری بە دەنگەکان بکەن، وەك کەسانی پێشتر ئەنجامیان داوە، لەوانەیە جارێك یان چەند جارێك لەمەدا سەربکەون، بەڵام زوو یان درەنگ هەست بەوە دەکات کە کاری ئەو زۆرناخایەنێ؛ ئەوەی ئەمڕۆ ئەو ئەنجامی داوە پێشبینی دەکرێت سبەی کەسانی دیکە ئەنجامی بدەن، ئەمەش زنجیریەکی چەپەڵە لە چەند ئەڵقە پێکهاتووە، هەر ئەڵقەیەکیش دەبێتە هۆی هاتنی ئەڵقەیەکی دیکە، جا لەبەرژەوەندی ئەوە ئەم زنجیرەیە لەئێستاوە بپچڕێنێت و خۆی ئاسوودە و دڵنیا بکات!

## پوختە:

گەلی عێراق لەناو خۆیدا دابەشبووە، چەندین ململانێی هۆزگەری و تایفی و نەتەوەیی، زیاتر لەهەر وڵاتێکی دیکەی عەرەبی تێدایە، جگە لەلوبنان. ڕێگاچارەیەك نییە بۆ ئەم دابەشبوونە، لە جێبەجێکردنی سیستەمی دیموکراتی باشتر بێت، بەشێوەیەك هەر توێژێك بەپێی ڕێژەی خۆی بەشدار لەحوکمڕانی بکات.

پێویستی خەڵکی عێراق وانە لەئەزمونی ڕابردوویان وەربگرن، ئەمە کاتی لەبەرچاوگرتنە! ئایا کەسێك هەیە گوێبیست بێت؟!

٢٢/١٠/ ٢٠١٥

**وەرگێڕانەکەی تەواو بوو**

پێرست


پێشکەش ........................................ ٣
پێشەکی ........................................ ٤
بەشی یەکەم
ململانێی نێوان بیابانشینی و شارستانێتی .............. ١٣
بەشی دووەم
بیابانشینی چییە؟ .................................. ٣٧
بەشی سێیەم
بیابانشینی ومەیلی شەڕخوازی ......................... ٥٨
بەشی چوارەم
قولاییەکانی رۆشنبیری بیابانشینی ...................... ٨٩
بەشی پێنجەم
عێراق لە سەردەمی عوسمانیدا ........................ ١٢٦
بەشی شەشەم
ململانێی رۆشنبیری لە عێراقدا ........................ ١٥١
بەشی حەوتەم
جەنگی هەمیشەیی لە عێراق ............................ ١٧٥
بەشی هەشتەم
پێکهاتەی کەسێتی لە لادێدا ............................ ٢٠٢
بەشی نۆیەم
رووخسارەکانی دینداری لەعێراقدا ....................... ٢٣٤
بەشی دەیەم
بارودۆخی کۆمەلایەتی لە شارەکاندا ..................... ٢٧٢
بەشی یازدەم
دووفاقی کەسێتی لەشارەکاندا ........................... ٣٠٠
بەشی دوازدەم
بەدناکاری لە شارەکاندا ............................... ٣٢٦
بەشی سێزدەم
سروشتی قۆناغی ئێستا ................................ ٣٥٨
دوا بەشی کتێبەکە ..................................... ٣٩٢
پوختە ............................................. ٤٠٧

